# تویشووی قیامەت لە

مختصر زاد المعاد

في هدي خير العباد

# ژیاننامەی پێغەمبەری خوا

محمد صلى الله عليه وسلم

لەکرداری ڕۆژانە





نووسینی: ئیبن قەییم ئەلجەوزییە

کورتکردنەوە و تەخریجکردنی فەرموودەکان:

د. احمد بن عثمان المزيد

وەرگێڕانی: عبدالله گەرمیانی



ناوەندی ڕاقە

تیشک

مُختصر
زاد المعاد
في هدي خير العباد

# تووێشووی قیامەت

# ژیاننامەی پێغەمبەری خوا

محمد صلی الله علیه وسلم


نووسینی:

ئیبن قەییمی ئەلجەوزییە (کۆچکردووی ٧٥١)ی کۆچی) .

کورتکردنەوەی:

د. أحمد بن عثمان بن عبد العزيز المزيد

وەرگێڕانی:

عبدالله گەرمیانی

بسم الله الرحمن الرحيم

# ژیاننامەی پێغەمبەری خوا محمد ﷺ

نووسینی: ئیبن قەییمی ئەلجەوزییە

کورتکردنەوەی:

د.أحمد بن عثمان بن عبد العزيز المزيد

وەرگێڕانی : عبدالله گەرمیانی

تیراژ: ١٠٠٠

چاپ: یەکەم



لە بەڕێوبەرایەتی کتێبخانە گشتی یەکان دا ژمارەی سپاردنی ( ١٨٢٧ )

ی ساڵی ٢٠٢٢ ی پێدراوە



"د.أحمد" 11 كانون الثاني

إلى أنا

وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته السلام عليكم و رحمة الله ورحمة الله وبركاته

لا مانع لدي من ترجمتكم لمختصر زاد المعاد لابن القيم إلى اللغة الكردية مع الحرص على الجودة في الترجمة وكذلك طباعته

وفقكم الله وسددكم وأعانكم وبارك فيكم ورفع قدركم

أخوكم أحمد بن عثمان المزيد

## پێشکەشە بەو کەسەی:

**ئامانجی ئەوەیە لەبەهەشتدا بێ لەگەڵ پەیامبەری خوادا( صلى الله عليه وسلم )**

**تایبەتمەندی و خەسڵەتی کەماڵ و بالآیی لەموحەممەد( صلى الله عليه وسلم )دا**

(ئەگەر یەکێ لە ئێمە شەرفمەندبووبێ بە تایبەتمەندییەك یان دوو تایبەتمەندی کەماڵ و بالآیی، ئەی چی گومان و چاوەڕوانییەك دەکەی بەقەدر گران و مەزنێکی وەك موحەممەد (صلى الله عليه و سلم) لەوەی هەموو ئەم تایبەتمەندییانەی تێدا کۆبووەتەوە: فەزیڵەت و گەورەیی پەیامدارێتی و دۆستایەتی و خۆشویستن و پاکڕاگرتن و شەوڕەوی و نزیکایەتی لەخوا و شەفاعەت و وەسیلە و فەزیڵە و مەقامی مەحمود و بوڕاق و شەوڕەوی و پێشنوێژیکردن بۆ پەیامبەران و شایەتییدان لەنێوان پەیامبەران و ئوممەتان و گەورەیی و سەرۆکایەتیکردنی نەوەی ئادەم و ئالآی حەمد و بەزەیی بۆ جیهانیان و پێدانی رازیبوون و داوا و کەوسەر و تەواو و کاملکردنی نیعمەت و لێخۆشبوون لەکردەوەی پێشتری و دواتری و پاککردنەوەی سنگ و دڵ و لابردنی ناڕەحەتی و بەرزڕاگرتنی ناو و یاد و شکۆی سەرکەوتن و پاڵپشتیکردنی بەفریشتە و پێدانی(الكتاب و الحكمة و السبع المثاني) و قورئانی پیرۆز و سەلآتی خوا و فریشتان لەسەری و سوێندخواردن بەناوی و وەلآمدانەوەی پاڕانەوەی و دواندنی لەلایەن دار و بەردەوە و، هەڵتۆقینی ئاو لەنێو پەنجەکانی و لەتبوونی مانگ و سەرکەوتنی بەتۆقاندنی دوژمن و سێبەری هەور و تەسبیحاتی بەرد و پاراستنی لەخەڵکیی تاوەکو ئەو شتانەی تر کە لێرەدا جێگەیان نابێتەوە و تەنیا خوای گەورە خۆی دەیانزانی کە بەخشەر و رێزلێگرێتی و تەنیا خۆی هەموو ئەو شتانەی پێ بەخشیووە).

(مختصر الشفا)ی ئەلقازی عەییاز



## پێشەكى وەرگێڕ

**بەناوى خواى گەورەى ميهرەبان**

سوپاس و ستايش تەنيا بۆ خواى گەورە وا هەلێكى ترى پێم بەخشى تاوەكو بتوانين كتێبێكى ديكە لەكتێبە دانسقەكانى ئيبن قەييمى جەوزيى وەربگێڕين، كتێبى(زاد المعاد في هدي خير العباد) كە ئێمە لەكوردييەكەدا وەرمانگێڕاوە بۆ(تووێشووى قيامەت.... ژياننامەى پێغەمبەرى خوا محمد ﷺ).

ئەم كتێبە تايبەتە بەژياننامەى پەيامبەرى خوا(ﷺ) و تيشكخستنە سەر لايەنە فيقهييەكانى ژيانى سەروەرى مرۆڤايەتى. لەڕێگەى ئەم كتێبەوە خوێنەر ئاشنا دەبێ بەژيانى پێشەواى ئازيز و ئاشناش دەبێ بەبوارە فيقهييەكان و ئەو ميتۆد و بەرنامەيەى لەكتێبە فيقهييەكاندا پەيڕەو كراوە و چۆنێتى ڕێكخستنى ناوەڕۆكى ئەو بوارە.

ئەو نوسخەيەى ئێمە وەرمانگێڕاوە، ئەو كتێبەيە كە زانايەكى پايەبەرز بەناوى (د.أحمد بن عثمان بن عبد العزيز المزيد) هەڵساوە بەكورتكردنەوە و پاڵفتەكردنى. خواى گەورە پاداشتى بداتەوە، كورتكردنەوەيەكى ئەنجام داوە بێ ئەوەى كتێبە بنچينەييەكە بشێوێنێ و گيانى نووسينى ئيبن قەييمى عەللامەى شێواندبێ، بەڵكو هاتووە لەنێو كۆمەڵێ فەرموودەى تايبەت بەباس و بوارێك،دوو فەرموودە و هەندێ زياترى هێناوەتەوە لەنێو سەحيحەكاندا و ئەو فەرموودانەى تر كە ئەگەرچى لەخوارەوەى سەحيحدا بن، بەڵام كاريان پێ دەكرێت و لاى شەرعناسان پەسەندكراون.

لەوەرگێڕانەکەدا لەتەفسیری ئایەتەکاندا، تەفسیری پوختەی قورئانمان بەکارهێناوە، هەتا ئەوەی پێمان کرابێ، بۆ فەرموودە پیرۆزەکان هەوڵماندا فەرموودەی بەحەرەکات(سەر و بۆر)دار دابنێین، ئەگەرچی ئەوە کاتی زۆری لێمان دەگرت، بەڵام گرنگ و پێویستە تاوەکو جوان بخوێنرێتەوە و خوێنەرانی کورد بتوانن مافی خوێ پێ بدەن و هاوکارییەکی چاکە بۆ جوان خوێندنەوە، چونکە بەشێکی زۆر لەو فەرموودانە وەك ویرد و زیکر لێرەدا دانراون، وشەیەك ئەگەر جوڵەی ئیعرابیی(شیکردنەوەیی) پێ بدرێت، زوو لەبەر دەکرێت.

زیاتر لەسەر گرنگیی ئەم کتێبە نادوێین کە باس و گێڕانەوەی ژیاننامەی سەرداری پەیامبەرانە، خوێندنەوە و رامان بۆ خوێنەری بەڕێز بەجێدەهێڵین، تکام وەهایە خوای گەورە بۆ ئێمە و ئێوەی بکاتە تووێشووی قیامەت و مایەی حەشرکردنمان لەڕیزی ئوممەتی ئەو پەیامبەرە ئازیزە(صلى الله عليه وسلم)، شەفاعەتی بەدەستبهێنین. خوای گەورە لەهەموو سەختییەکاندا خۆمان و دایك و باوك و هاوسەر و منداڵ و نزیکانمان پارێزراو بکات، ئێوەی بەڕێز لەدوعای خێری خۆتان بێ بەشمان مەکەن.

عبدالله فازڵ حەسەن(عبدالله گەرمیانی)

١٥/ ٣/ ٢٠٢٢

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

## ناساندنی مەوسوعەی موحەممەد( صلی الله علیه وسلم )

سوپاس و ستایش تەنیا شایستەیە بەخوای گەورە، سەلأت و سەلامیش بۆ سەر پەیامبەر و خۆشەویستمان موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) و یار و یاوەرانی و ئەوانەی شوێن ڕێبازەکەی دەکەون و پەیڕەوی دەکەن، پاشان: ئەم مەوسوعەیە کە نزیکەی دوو ساڵ کارکردنی خایاند، تایبەتمەندە بەکۆکردنەوەی تەواوی زانست و هونەرەکانی ژیاننامەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەیەك هەگبەدا، پوختەکردنی باشترین ئەو کتێبیانەیە کە پێشەوایان و زانایانی پێشینمان لەهەموو بوارەکاندا نووسیویانەتەوە و بەناوبانگ بوونە و لای ئوممەت پەسەند کراون، من هەڵساوم بەپوختە و پاڵفتەکردنی ئەو کتێبانە، بۆ ئەوەش داوای ئیخلاس و قبوڵکردن دەکەم لەخوای گەورە.

بەرنامە و کاری من لەکورتکردنەوەی ئەو کتێبانەدا، ئەوەیە لەسەر باشترین چاپێکی پشت پێ بەستراوی هەر کتێبێك کار بکەم، بەسڕینەوەی لاواز و خوارەوەی لاواز و ئەوەی بۆ زیاد کراوە و پێویست نین، یان دووبارە بوونەتەوە لەو کتێبەدا، هەروەها ڕشتە و سەنەدی فەرموودەکان تەنیا هاوەڵ و خوار هاوەڵ نەبێ کە پێویستیان بەوە هەبووە، وردبوونەوە و قسەیان لەبارەوە بکرێت، هەوڵمداوە شێوەی وشە و ڕێکخستنی دانەر بپارێزم، جا ئەگەر لەناونیشانەکانیانیدا شتێکم زیاتر کردبێ، ئەو زیاترکردنەم خستووتە نێو کەوانەوە، یان ئەگەر لەیەکێك لەو چاپانەدا بێ کە من پشتم پێ نەبەستوون، هەموو ئەوانەم خستووتە نێو کەوانەوە.

ئامانجم لەو کارەدا، نزیکخستنەوە و ئاسانکردنەوەی ژیاننامەی پەیامبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) تاوەکو تێکڕای زانست و هونەرەکانی لەکتێبی زانایانی پێشینی چاکەکار و ڕەسەنماندا بزانرێ و ئێمەش لەعەقیدە و پەرستش و موعامەلە

و رەوشتدا چاو لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بکەین، بەو هۆیەوە لەدونیادا بەختەوەر بین و لەئاخیرەتیشدا براوە.

لەپەراوێزەکاندا تەخریجێکی کورتی فەرموودە و قسەی هاوەڵانم کردووەو وشە نارِوونەکانم روونکردووەتەوە.

ئەم مەوسوعەیە شەش لەزانستەکانی ژیاننامەی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ی لەخۆگرتووە لەشەش بەرگی سەربەخۆدا کە تێکرِایان هەشت بەرگن، بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەرگی یەکەم: لەزانستەکانی بەڵگەدا(کتێبی"دلائل النبوة")ی ئەبو نوعەیم، کۆچکردووی٤٣٠کۆچی).

بەرگی دووەم: لەزانستی سەربووردە و ژیاننامەی پەیامبەرایەتییدا(کتێبی" السيرة النبوية")ی ئیبن هیشام، کۆچکردووی(٢١٨)ی کۆچی.

بەرگی سێیەم: لەزانستی تایبەتمەندییەکان(کتێبی"غاية السُّول في خصائص الرسول")ی ئیبن ئەلمولەقین، کۆچکردووی٨٠٤ی کۆچی.

- لەزانستی رەوشتەکان، کتێبی(شمائل النبي(صلى الله عليه وسلم))ی ترمیزی کۆچکردووی٢٧٩ی کۆچی.
- کتێبی(موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) و ماف و بەها و رەوشت و چارەسەری کێشەکانی جیهانی ئەمرِۆ)ی د. ئەحمەد بن عوسمان ئەلمەزید.

بەرگی چوارەم: کتێبی(زاد المعاد في هدي خير العباد)ی ئیبن قەییمی ئەلجەوزییەی کۆچکردووی ٧٥١ی کۆچی.

بەرگی پێنجەم: لەزانستی مافەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)، کتێبی(الشفا بتعريف حقوق المصطفى)ی ئەلقازی عەییازی کۆچکردووی٥٤٤ی کۆچی.

بەرگی شەشەم: لەزانستی فەرموودەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)دا، کتێبی(رياض الصالحين)ی نەوەوی کۆچکردووی٦٧٦ی کۆچی.



## لەگوڵزاری هیدایەت و ڕێنیشاندەرایەتی پەیامبەرایەتییدا

گرنگیی ڕێنیشاندەرایەتی پەیامبەرێتی: ئەوە سەربووردە و ژیانی موحەممەدی هەڵبژاردەیە(صلی الله علیه وسلم) و ئەوەی لەگوفتار و کردار بۆ ئێمەی داناوە، بەشێکە و جیانابێتەوە لەزانستی ڕەوشت و ئاکاری پەیامبەرایەتی، گومان لەوەشدا نییە کە کارە گەورە و پیرۆزەکان، بەرهەمی ڕەوشت و ئاکاری جوانن.

پاشان گرنگی ناسین و لێکۆڵینەوەی ڕێنیشاندەرێتی پەیامداریی لەوەدایە، کە مرۆڤ ئەو ڕێگەیە دەناسێ کە بەهۆیەوە خوای گەورە لەسەرەتای وەحییەوە تاوەکو ئەو ڕۆژەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) تیایدا کۆچی کرد، شەریعەتی دابەزاند.

یەکێك لەفەزڵ و بەخششەکانی خوای گەورە، ئەوەیە مرۆڤی موسڵمان لەهەموو کاروبارێکی ژیانی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)دا ڕێنمایی وەردەگرێت، سیفەتی هەڵسان و دانیشتن و لەخەو هەڵسان و شێوەی پێکەنینی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) و خواپەرستیی ڕۆژ و شەوی فێر دەبێت، فێر دەبێت کە موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) چۆن خۆی شۆردووە و ئاوی خواردووەتەوە و نانی خواردووە و چۆن بەرگی پۆشیووە و حەزی بەچی ڕەنگێك کردووە و سواری چی ئاژەڵێك بووە و هتد.

گومان لەوەدا نییە، ژیان لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) بەتێکڕای ئەو شتانە، یارمەتیدەر دەبێ بۆ چاوکردن لەو پەیامبەرە و جێبەجێکردنێکی کردارانەی هیدایەت و ڕێنماییەکانی، وەك ئەوەی نەوەی یەکەم لەسەر دەستی پەروەردە بوون و پێش قسەکردن، بەئاکار و ڕەوشتیان، ئیسلامیان بڵاوکردەوە.

## ناساندنی ئیبن قەییمی ئەلجەوزییە (کۆچکردووی٧٥١ )ی کۆچی( بەڕەحمەت بێ)..

### ناو و ڕەچەڵەکی:

موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی ئەیوبی کوڕی سەعدی کوڕی حەریز، ئەلزورعی، ئەلدیمەشقی، شەمسودین، ئیبن قەیمی ئەلجەوزییە.

### مێژووی لەدایکبوونی:

لەحەوتی مانگی سەفەری ساڵی(٦٩١)ی کۆچی، لەدایکبووە.

### مامۆستاکانی:

ئیبن قەیمم گوێبیستی ئەم زانایانە بووە: ئەلتەقی سولەیمان و ئەبو بەکری کوڕی عەبدولدائیم و ئەلموتعیم و ئیبن ئەلشیرازی و ئیسماعیلی کوڕی مەکتوم، زمانی عەرەبیی لای ئیبن ئەبی ئەلفەتح و ئەلمەجد ئەلتونسی خوێندووە، فیقهی لای ئەلمەجد ئەلحەڕانی و ئیبن تەیمییە خوێندووە، لەسەدریە وانەی وتووەوەو لەئەلجەوزییە پێشنوێژیی کردووە، باوکی لەزانستی فەرائیزدا دەستی باڵای هەبووە و لەباوکی ئەو زانستەی وەرگرتووە، ئوسوڵی لای ئەلسەفی ئەلهیندی و ئیبن تەیمییە خوێندووە.

### زوهد و ڕەوشت و زانستی:

ئیبن ڕەجەب(بەڕحمەت بێ) ئەڵێ: (بەڕەحمەت بێ، خاوەن پەرستش و شەونوێژو نوێژکردنی درێژ و زیکر بوو، پڕبوو بەخۆشویستنی خوا و تەوبە و پەشیمانی بۆ خوا و خۆ زەلیلکردنی بۆ خوای گەورە و مانەوە لەپەرستش کە نمونەیم نەبینیبوو، کەسێکم نەبینیووە لەزانستی

ئەو، زانستی فراوانتر بووبێ و شارەزاتربووبێ بەواتاکانی قورئان و فەرموودە و حەقیقەتەکانی ئیمان، ئەو مەعسوم نەبوو، بەلاَم نمونەی ئەوم نەبینیووە)[1].

ئیبن کەسیر(بەرەحمەت بێ) لەبارەیەوە ئەڵێ: ((خوێندنەوەیەکی جوان و رەوشتێکی جوانی هەبوو، زۆر بەسۆز و نەرم بوو، حەسوودیی بەکەس نەدەبرد و ئازاری کەسی نەدەدا و کەسی عەیبدار نەدەکرد، رقی لەهیچ کەسێك نەبوو، من نزیکترین هاورێ و خۆشەویسترین کەسێك بووم بەلایەوە، هیچ زانایەکی سەردەمی ئێمە ناناسم لەو زیاتر خواپەرستیی هەبووبێ))[2].

## کتێب و دانراوەکانی:

ئیبن قەییم(بەرەحمەت بێ) دانراوی زۆری هەبوو، لەوانە:إعلام الموقعین، بدائع الفوائد، طریق السعادتین، شرح منازل السائرین، القضاء والقدر، جلاء الإفهام في الصلاة والسلام علی خیر الأنام، مصائد الشیطان، مفتاح دار السعادة، الروح، حادي الأرواح، الصواعق المرسلة علی الجهمیة والمعطلة و کۆمەڵێك دانراوی دیکە.

## کۆچی دوایی کردنی:

شەوی پێنجشەممە۱۳ی رەجەبی ساڵی(۷٥۱)ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد و لەکەژاوەیەکی گەورەدا نێژرا[3].

---

[1]- ذیل طبقات الحنابلة لابن رجب(٢/٤٤٨).

[2]- البدایة والنهایة لابن کثیر(١٨/٥٢٣).

[3]- الدرر الکامنة لابن حجر(٥/١٣٧-١٤٠بەکورتکراوەیی)، هەروەها بروانە: ذیل طبقات الحنابلة لابن رجب(٥/١٧٠)، العبر في خبر من غبر للذهبي(٤/١٥٥)، الوافي بالوفیات للصفدي(٢/١٩٥).

## ناساندنێکی کتێبی

**( زاد المعاد فى هدى خير العباد )ی ئیبن ئەلقەییم( کۆچکردووی٧٥١ )ی کۆچی**

## گرنگیی ئەم کتێبە:

ئیبن ئەلقەییم لەکتێبی(زاد المعاد في هدي خير العباد) گرنگیی لەپێشینەی داوەتە لایەنی رێنیشاندەرێتی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)لەپەرستشەکانی، گرنگی گەورە و زۆری بەو بوارە داوە، لەپاڵ ئەوەشدا باسی مامەڵەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) و بەپێی دابەشکردنی فیقهی، دابەشی کردووە بۆ پەرستش(عبادات) و مامەڵەکان(معاملات).

هەروەها ئەم کتێبە تایبەتمەندە بەدەربڕینی کورت و پوخت و زمان و شێوازی جوانی نووسینەوە و هەمەجۆرکردنی، بۆیە دەبینی هەندێجار بەشێوەی رەوانەکردن(مرسل) شت دەگێڕێتەوە و هەندێجاریش بەنمونەی جوانترین چیرۆکخوان باس دەکات، هەندێجاریش بەبەڵگەوە قسە دەکات، هەندێجاریش بەکورت و پوخت و کۆمەڵە دەستەواژەیەك کە کۆی باسەکەی لەخۆی کۆکردووەتەوە ئەگەرچی قەبارەی ئەم کتێبە گەورەیە، رێژەییانەیە.

لەوانە: بەڕەحمەت بێ ئەڵێ: ((پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەخۆی لەپێشەوەی هەموانەوە بوو، دەجەنگا، بەخۆی نەعلی خۆی چاك دەکرد و بەخۆی بەرگ و پۆشاکی خۆی دەدوورییەوە و مەڕی دەدۆشی، بەرگی خۆی دەشۆرد و خزمەتی هاوسەرانی خۆی و خۆی دەکرد، لەگەڵ هاوەڵاندا خشتی هەڵدەگرت بۆ دروستکردنی مزگەوت، جارێك لەبرسا بەردی دەخستە سەر سکی و جارێك تێر بوو، میوانداریی کەسی دەکرد و خۆیشی میوانداریی دەکرا، لەناوەڕاستی سەری و

پشتەوەی قاچی و لەنێو شانیدا حیجامەی دەکرد، تیماری دەکرد و داخی دەکرد بۆ خەڵك و بۆ خۆی نەیکرد، کۆیلەی هەبوو بەڵام خۆی بەکۆیلە نەکرا، نەخۆشی دەپاراست لەشتێ ببوایەتە هۆی ئازاردانی))[1].

هەروەها ئەم کتێبە کۆمەڵێ سوود و بەسەرهاتی خۆشی لەخۆ گرتووە و لەهەموو تەوەر و بەشێکدا ئەوە دەبینرێت، ئەمە و سەرباری بارسەنگ دانان و هەڵبژاردەکانی خۆی و وەرگرتنی حیکمەت و بڕیارەکانی شەریعەت و هێنانەوەی هۆکاری حوکمە شەرعییەکان.

ئیبن رەجەبی حەنبەلی(کۆچکردووی٧٩٥)ی کۆچی ئەڵێ: کتێبی(زاد المعاد في هدي خير العباد) چوار بەرگە و کتێبێکی زۆر مەزنە[2].

ئەلحافز ئیبن حەجەر(کۆچکردووی٨٥٢)ی کۆچی ئەڵێ: تەواوی دانراوەکانی ئیبن ئەلقەییم لای هەموو توێژ و کۆمەڵەکان پەسەند کراوە.

ئەلسەخاوی(کۆچکردووی٩٠٢)ی کۆچی ئەڵێ: ئیبن ئەلقەییم کتێبی(الهدي النبوي) هەیە کە هاوێنەی نییە[3].

---

[1] – لەم کتێبەدا باس کراوە.

[2] – ذيل طبقات الحنابلة لابن رجب(٥/١٧٥).

[3] – الدرر الكامنة لابن حجر(٥/١٣٩).

## ڕێکخستنی ئەم کتێبە و بەرنامەی نووسەر تیایدا:

ئیبن ئەلقەییم بەکۆمەڵێ پێشەکی دەستپێکردووە کە تیایدا ڕوونی کردووەتەوە، واجیە شوێن پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بکەوین، بەختەوەریی هەردوو دونیاش بەشوێنکەوتنی ئەو پەیامبەرەوە گرێ دراوە، پاشان دێتەسەر باسی ئەوەی، تەنیا خوای گەورە مەخلوقاتی داهێناوە و لەنێو مەخلوقاتدا هەندێکیانی هەڵبژاردووە و بەندەکان ناچارن بۆ ناسینی خوای گەورە.

پاشان ئەم کتێبەی دەستپێکردووە بەڕوونکردنەوەی ڕەچەڵەکی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و خەتەنەکردن و دایکانی و ئەوانەی دایەنییان بۆ کردووە و بەپەیامبەربوون و بانگەوازەکەی و قۆناغەکانی بانگەواز و ناو واتاکانی و هەردوو کۆچیش. پاشان هاتووەتە سەر باسی منداڵەکانی و مام و خزمەتکار و نووسەران و بانگبێژان و ئەمیر و پاسەوان و شاعیر و ئەوانەی وشترەکەیان بۆ جڵەو کردووە.

پاشان باسی جیهاد و سریە و چەك و تفاق و وڵاخ و بەرگ و خۆراك و هاوسەرگیری و خەو و سواربوونەکانی.

پاشان بەشێکی تایبەت کردووە بۆ باسی وەرگرتنی دەسکەوت و کۆیلە و گرێبەست و جەنگ و مامەڵە و ڕۆیشتن و دانیشتن و سەرناوکردنەوە و ڕێنیشاندەریی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسووننەتی فیترەت و قسەکردن و بێدەنگبوونی، پێکەنین و گریان و وتاردانی.

پاشان بەشێکی دوورودرێژی داناوە بۆ ڕێنیشاندەرێتی ئازیز(صلی الله علیه وسلم) لەپەرستشەکاندا: دەستنوێژ و نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و عومرە و دیاری و قوربانی و ویرد و پاڕانەوە و جیهاد. پاشان هاتووەتەسەر ڕێنیشاندەریی

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەبواری چارەسەرکردن کە بەکاری هێناوە بۆ چارەسەرکردنی خۆی و وەسفیکردووە بۆ کەسانی تر، پاشان بەهێنانەوەی هەندێ بەش لەبواری قەزاوەتکردن و ژن و ژنخوازی و کڕین و فرۆشتن، کۆتایی بەم کتێبە هێناوە.

### ئەو چاپەی لەم کورتکردنەوەیەدا پشتمان پێ بەستووە:

لەم کورتکردنەوەیەدا پشتمان بەستووەتە چاپی(دار الوفاء، المنصورة، مصر، و دار ابن حزم، بیروت، لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٣٢ه، ٢٠٠١م، تحقیق: أور الباز، پشتی بەستووەتە شەش لەبەرگیراوی دەستیی، یەکێکیان بەتەواوەتیی بوونی هەیە و لەگەنجینەی گشتیی لەڕیبات پارێزراوە.

## پێشەکی دانەر

### بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

سوپاس و ستایش تەنیا شایستەیە بەخوای گەورە، سەرەنجامی چاك بۆ باوەڕداران و دۆڕان بۆ ستەمکاران، شایەتی دەدەم بەوەی هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە(الله)، کە وشەیەکە زەوی و ئاسمەکانەکان پێیەوە راوەستاوە و لەو پێناوەشدا تەواوی بوونەوەران داهێنراون، ئەوە وتە و دروشمی ئیسلامە، کلیلی بەهەشتی شوێنی ئارامی و خۆشییە، هەر لەبارەی ئەو وتەیەوە پرسیار لەتەواوی مرۆڤەکان دەکرێت. شایەتی دەدەم بەوەی موحەممەد بەندە و نێردراوی خوایە، دەستپاکی وەحی و باشترینی نێو مەخلوقاتی خوایە، نێردراوی نێوان خوا و بەندەکانی خوایە، نێردراوە بەئایینی راست و ڕێك و ڕەوان، خوای بەبەزەیی و سۆز ناردوویەتی بۆ جیهانیان و پێشەوا بۆ لەخواترساوان و بە بەڵگەش بۆ تەواوی مەخلوقات.

پاشان، خوای گەورە تەنیا خۆی مەخلوقاتی داهێناوە و لەنێو مەخلوقاتیشدا هەڵبژاردەی کردووە،پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ﴾ **القصص: ٦٨** ، واتا:پەروەرگارت (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بیەوێ دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت[١].

لێرەدا مەبەست بە(الاختيار): واتا پاڵفتەکردن و هەڵبژاردن، هەڵبژاردنە لەدوای دروستکردن، هەڵبژاردەی گشتی هەڵبژاردەی پێش دروستکردنە، کە گشتگیرتر و لەپێشترە، بەڵام ئەمی تر تایبەتتر و دواترە، هەڵبژاردنی نێو مەخلوقاتە.

---

[١] – بۆ تەفسیری ئایەتە پیرۆزەکان، سوودمان لە(پوختەی تەفسیری قورئان)وەرگرتووە – وەرگێڕ.

جا ئەگەر لەکاروباری ئەم دروستبوونە بڕوانی و رابمێنی، دەبینی ئەم هەڵبژاردن و تایبەتکردنە بەڵگەیە لەسەر پەروەردگارێتی الله و کەماڵی حیکمەت و زانست و توانای الله، ئەو خوایە(الله)یە کە تەنیا ئەو هەیە و هیچ هاوبەشێکی نییە نمونەی ئەو دروست بکات و هەڵبژاردە بکات و گەردوون بەڕێوە ببات، بۆیە ئەو هەڵبژاردن و تایبەتکردنەی کە لەم جیهانەدا شوێنەوار و کاریگەریی دەبینرێت، یەکێکە لەگەورەترین بەڵگەکانی پەروەردگارێتی الله و سیفاتی کەماڵ و راستگۆیی پەیامبەرانی، جا ئێمەش لێرەدا هەندێ شتی کەم باس دەکەین، کە وریاکەرەوەیە بۆ ئەودیوو مەبەست و بەڵگەشە بۆ غەیری خوا.

خوای گەورە ئاسمانی بەحەوت چین دروستکردووە، خۆی بەرزترینی هەڵبژاردو فریشتە نزیکەکانی لەوێدا داناوە، تایبەتی کردوون بەنزیکبوون لەکورسی و عەرشی خۆی، چی ویستبێ لەنێو مەخلوقاتیدا بۆ ئەوێی هەڵبژاردووە، ئەو چینە بەرزەی ئاسمان تایبەتمەندی و فەزڵی بەسەر چینەکانی تری ئاسمانەکاندا هەیە، هەر نزیکبوونی لەخوای گەورە ئەوەی بۆ بەسە.

یەکێکی تر لەوانە، فەزڵدانانی بەهەشتی فیردەوسە بەسەر بەشەکانی تری بەهەشتدا، عەرشی خۆی تایبەت کردووە ببێتە بنمێچی ئەو بەشەی بەهەشت.

یەکێکی تر، هەڵبژاردنی هەندێ فریشتەیە بەسەر ئەوانی تردا، وەك جیبریل و میکائیل و ئیسرافیل، هەروەها خوای گەورە لەنێو نەوەکانی ئادەمدا هەڵبژاردەی کردووە و پەیامبەرانی لێ هەڵبژاردوون، لەنێو پەیامبەرانیشدا ئولولعەزمی هەڵبژاردووە، لەنێو ئولولعەزمیشدا دوو خۆشەویستی هەڵبژاردووە کە ئیبراهیم و موحەممەدە(سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ).

یەکێکی تر لەهەڵبژاردەکانی، ئەوەیە لەنێو نەوەکانی ئادەمدا کوڕانی ئیسماعیلی هەڵبژارد، لەنێو ئەوانیشدا نەوەی کینانەی کوڕی خوزەیمە، پاشان لەنێو کوڕانی کینانەدا قورەیشی هەڵبژارد، لەنێو قورەیشیشدا نەوەی هاشمی هەڵبژارد، لەنێو نەوەی هاشمشیدا موحەممەدی گەورەی کوڕانی ئادەمی هەڵبژارد(صلی الله علیه وسلم). لەنێو تێکڕای خەڵکییشدا هاوەڵانی هەڵبژارد، ئوممەتەکەشی بەسەر تێکڕای ئوممەتانی تردا فەزڵ دا.

یەکێك لەنمونەکانی هەڵبژاردنی خوای گەورە، ئەوەیە لەنێو شوێن و وڵاتاندا باشترین و بەڕێزترین شوێنی هەڵبژارد کە مەککەیە(البلد الحرام). هەروەها هەندێ ڕۆژ و مانگی فەزڵداوە بەسەر ڕۆژ و مانگەکانی تردا، ڕۆژی قوربانیکردن، بەلای خوای گەورەوە باشترین ڕۆژەکانە، ڕۆژی حەجی گەورەیە هەروەك لەسووننەتی پەیامبەری خوادا هاتووە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"أفضَلُ الأيَّامِ عِندَ الله يومُ النَّحْرِ، ثُم يَوْمُ القَرِّ"[1]،واتا: باشترینی ڕۆژەکان بەلای خوای گەورەوە، ڕۆژی قوربان و ڕۆژی دواترێتی.

هەروەها خووی پەسەندکردنی باشترین و پاکترین کارێکی داناوە، ئەو کارانەی کە فیترەتی ساغ لەگەڵ شەریعەتی پەیامبەرایەتیدا بەجوانی دەبینێ و عەقڵە ساغەکان پوختیان کردووەتەوە و بەپاکی دەزانن، بۆیە شەرع و عەقڵ و فیترەت یەکدەنگن لەسەر جوان بینینی، نمونەی ئەوەی خوای گەورە بەتاك و تەنیا و بێ هیچ هاوبەشییەك بپەرسترێت و مرۆڤ ڕازیبوونی خوای گەورە بخاتە پێش هەوا و ویستی خۆی.

هەروەها لەخواردندا تەنیا پاکەکانی هەڵبژاردووە، ئەو خواردنە حەڵاڵ و جوان و چاکەی کە بەباشترین شێوە خۆراك دەداتە جەستە و، ڕوح و سەلامەتیی بەندەی تێدا هەیە.

---

[1] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١٧٦٥).

لەژن و ژنخوازییشدا تەنیا جۆرە پاکەکەی هەڵبژاردووە، لەبۆنیشدا پاك و پوخت و لەهاوڕێ و هاودەمیشدا تەنیا چاکەکان.

لێرەدا دەردەکەوێ کە مرۆڤ لەسەرووی هەموو پێویستییەکەوە، پێویستیی ناچارانەی هەیە بەناسینی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و ئەوەی هێناویێتی و ئەوە بەڕاستبخاتەوە کە پەیامبەر هەواڵی لەبارەوە داوە و گوێڕایەڵیی فرمانەکانی بکات، چونکە هیچ رێگەیەك بۆ بەختەوەری و سەرفرازیی نییە لەدونیا و قیامەتدا تەنیا بەوە نەبێ کە پەیامبەران هێناویانە، ورد و درشتی ناسینی چاك و خراپ و پاك و پیس تەنیا لەڕوونکردنەوەی ئەواندا دەناسرێتەوە، لەسەر دەستی ئەوان، رازیبوونی خوای گەورە بەدەستدەهێنین.

لەبەرئەوەی بەختەوەریی بەندە لەهەردوو دونیادا پەیوەستە بەڕێنمایی و رێنیشاندەریی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بۆ کەسێك خۆی خۆشبووێ و سەرکەوتن و سەرفرازیی بۆ خۆی بووێ، پێویستە رێنیشاندەری و سەربووردەی ئەو پەیامبەرە بناسێ و پێیەوە لەڕیزی نەفام و نەزانان دەربچێ و بچێتە ریزی شوێنکەوتووان و کۆمەڵەکەیەوە، جا لەنێو خەڵکییدا هەیە فریای خۆی دەکەوێ و هەیە بێ بەشە، فەزڵ و بەخشندەییش لای خوایە و بەکێی بووێ دەیبەخشێ، خوای گەورە خاوەن فەزڵی مەزنە.

ئەوە هەندێ وتە و وشەی کەم بوو بەس نییە بۆ کەسێك کەمترین هیممەت و جۆشوخرۆشی هەبێ بۆ ناسینی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)، بەس نییە بۆ کەسێك هەموو شتێکی بەسەردا تێکچووە و بیەوێ لەبەندیخانەی دونیا رزگاری بێ کە دەرگاکانی بەڕوودا داخراوە و شوێنی کۆڵوبار پێچانەوەیە و دڵ پێیەوە لەت لەت بووە و هیممەتیش پەرش و بڵاوبووەتەوە.

**بەشی یەکەم:**

## شەمائیل(سیفەت و رەوشت)ی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)

### ١- بەشێك لەبواری رەچەڵەكیدا (صلی الله علیه وسلم):

لەڕووی رەچەڵەکەوە، بەڕەهایی باشترینی نێو خەڵکی سەر رووی زەوییە، دوژمنانیشی لەوەدا شایەتییان بۆ داوە.

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵەی کوڕی عەبدولموتەڵیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبد مەنافی کوڕی قوسەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالیبی کوڕی فیهری کوڕی مالیکی کوڕی نەزری کوڕی کینانەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مودریکەی کوڕی ئیلیاسی کوڕی موزەری کوڕی نیزاری کوڕی مەعدی کوڕی عەدنانە.

لەنێو رەچەڵەکناساندا ئەو رەچەڵەکە راستە و یەکدەنگیی لەسەر هەیە و بەهیچ جۆرێك بۆچوونی جیاواز بوونی نییە، لەسەرووی عەدنانەوە جیاوازیی لەسەر هەیە، گومان لەوەشدا نییە کە عەدنان یەکێکە لەکوڕانی ئیسماعیل(سەلامی خوای لەسەربێ)، ئیسماعیلیش بەوتەی دروست لای زانایانی هاوەڵان و تابیعین و دوای ئەوانیش خاوەن نازناوی(سەربڕاو— الذبیح)ە.

جیاوازیی لەوەدا نییە لەنێو مەککەدا لەدایکبووە، لەدایکبوونەکەشی لەساڵی فیلدا بووە، رووداوی فیل، پێشەکییەك بووە خوای گەورە بۆ پەیامبەرەکەی وماڵەکەی پێشیخستووە.

جیاوازیی هەیە لەبارەی مردنی عەبدوڵڵەی باوکییەوە، ئاخۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسکی دایکی بوو مردووە، یان دوای لەدایکبوونی پەیامبەر(صلی الله

علیه وسلم)؟ دروستترین بۆچوون: ئەوەیە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسکی دایکیدا بووە، عەبدواللەی باوکی مردووە.

جیاوازیی لەوەدا نییە کە ئامینەی دایکی لەنێوان مەککە و مەدینەدا مردووە لە(الأبواء)، لەسەردانی براکانی گەڕابووە کە دەکەنە خاڵوانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و لەگەڕانەوە بۆ مەککە لەوێدا کۆچی دوایی کرد، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) حەوت ساڵەی تەمەنی تەواو نەکردبوو.

ئینجا عەبدولموتەڵیبی باپیری ئەرکی بەخێوکردنی گرتەئەستۆ، عەبدولموتەڵیب مرد و پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نزیکەی هەشت ساڵ تەمەنی هەبوو، پاشان ئەبو تاڵیبی مامی ئەرکی بەخێوکردنی گرتەئەستۆ، ئەو ئەرکەی بەردەوام بوو تاوەکو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گەیشتە تەمەنی دوانزە ساڵ، ئەبو تاڵیبی مامی لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ شام، وتراوە: تەمەنی نۆ ساڵان بووە. لەو دەرچوونەدا بوحەیرای راهیب، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دەبینێ و فرمان بەعەبدولموتەڵیبی مامی دەکات نەیبات بۆ شام نەوەك جولەکە زیانی پێ بگەیەنن، بۆیە مامەی لەگەڵ هەندێ لەخزمەتکارەکانیدا ناردی بۆ مەدینە.

کە گەیشتە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی، لەبازرگانییەکدا دەرچوو بۆ شام، گەیشتە بوسرا، پاشان دوا بەدوای گەڕانەوەکەی، خەدیجەی کچی خوەیلدی مارە کرد.

پاشان حەزی کرد بەخەڵوەت و پەرستنی پەروەردگاری، لەئەشکەوتی حیرائدا خەڵوەتی دەکرد و چەند جارێك شەوان تێیدا مایەوە، رقی دەبوویەوە لەبت و بتپەرستیی قەومەکەی، ئەوەندە رقی لێبوو رقی لەهیچ شتێکی تر نەبوو بەو ئەندازەیە. کە چل ساڵەی تەمەنی تەواو کرد، نوری پەیامبەرایەتیی بۆی هەڵهات و خوای گەورە بەپەیامی خۆی رێزی لێنا.

جیاوازیی لەوەدا نییە کە لەڕۆژی دووشەممەدا بەپەیامبەر کراوە، بەڵام جیاوازیی لەمانگەکەیدا هەیە.

خوای گەورە بەچەند قۆناغێك پلە و مەقامی وەحی بۆ کامڵ کرد:

یەکەمیان: خەوی ڕاست، بنەمای وەحی بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بەوەحی بوو، لەخەودا چی ببینایە، وەك بەربەیان ڕووی دەدا.

دووەم: ئەوەی فریشتەیەك دەیخستە دڵییەوە بەبێ ئەوەی فریشتەکە ببینێ.

سێیەم: ئەوەی فریشتە لەشێوەی پیاوێکدا دەهاتە لای و قسەی لەگەڵدا دەکرد و هەموو ئەوەی فریشتەکە بۆی باس دەکرد، تێیدەگەیشت و ئەزبەردەی دەکرد، هەندێجار هاوەڵانیش لەم پایە و مەقامەدا بینیویانە.

چوارەم: ئەوەی لەنمونەی دەنگی زەنگێکدا بۆی دێت و سەختترین شێوەی وەحیی بوو بۆی، فریشتەکە توند دەیگرت تاوەکو لەڕۆژی زۆر ساردیشدا نێوچەوانی عەرەقی دەکرد، ئەگەر لەسەر وڵاخ بوایە وڵاخەکە بەچۆکدا دەکەوت، جارێکیان بەو شێوەیە وەحی بۆ هات کە ئەژنۆی لەسەر ئەژنۆی زەیدی کوڕی سابت بوو، وەخت بوو ئەژنۆی زەید بشکێنێ.

پێنجەم: هەندێجار فریشتەی لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی بینیووە، بەو شێوەیەی کە خوا دروستی کردبوو، خوای گەورە ویستی چی هەبووە، ئەو فریشتەیە بەوەحی بۆی هێناوە، ئەمە دوو جار ڕووی داوە وەك ئەوەی خوای گەورە لەسورەتی(النجم)دا باسی کردووە.

شەشەم: ئەوەی خوای گەورە لەشەوڕەوییدا لەسەرووی ئاسمانەکانەوە وەحی بۆ کرد، لەنمونەی فەرزکردنی نوێژ و شتانێکی ترەوە.

حەوتەم: فەرمایشتەی راستەوخۆی خوای گەورە بۆ پەیامبەر بەبێ ئەوەی فریشتەیان لەنێواندا هەبێ، وەك دواندنی موسای کوڕی عیمران، بەدەقی قورئان، ئەو پلەیە تەنیا بۆ موسا بووە، بۆ پەیامبەری خۆشمان(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە لەفەرموودەی شەوڕەوییدا[1].

## ٢- ئەو دایکانەی کە شیریان پێ داوە:

لەوانە: سوەیبەی خزمەتکاری ئەبو لەهەب کە بۆ چەند رۆژێك شیری پێ داوە، هەروەها لەگەڵ مەسروحی کوڕیدا شیری بەئەبو سەلەمە عەبدوڵلاهی کوڕی عەبدولئەسەدی ئەلمەخزومیی داوە، هەروەها حەمزەی عەبدولموتەلیب کە مامی بووە، شیری لەگەڵدا خواردووە.

پاشان حەلیمەی سەعدییە شیری پێ داوە بەشیری عەبدوڵلاهی کە کوڕی بووە و برای ئەنیسە و جدامە بووە، کە شەیمائە، منداڵەکانی ئەلحاریسی کوڕی عەبدولعوزای کوڕی رەفاعەی ئەلسەعدیی بوون، لەگەڵیدا مامیشی شیری خواردووە کە ئەبو سوفیانی کوڕی ئەلحاریسی کوڕی عەبدولموتەڵیبە و دوژمنی سەرسەختی پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم)، پاشان لەساڵی فەتحدا بەجوانترین شێوە بووە موسڵمان. حەمزەی مامی لەبەنی سەعدی کوڕی بەکر شیری پێ دەدرا، رۆژێکیان لای حەلیمەی دایکی، شیری بەپەیامبەری خواش دا(صلی الله علیه وسلم). حەمزە لەدوو لاوە شیری لەگەڵ پەیامبەری خوادا خواردبوو: لەلایەنی سوەیبە و لەلایەنی حەلیمەی سەعدییەوە.

---

[1] - بوخاری(٧٥١٧) و موسلیم(١٦٢) ئیخراجیان کردووە.

## ٣- دایەنەکانی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ):

لەوانە: دایکی کە ئامینەی کچی وەهبی کوڕی عەبد مەنافی کوڕی زوهرەی کوڕی کیلاب بوو، هەروەها سوەیبە و حەلیمە و شەیمائی کچی کە لەشیردا خوشکی بوو لەگەڵ دایکیدا دایەنیی بۆ دەکرد، ئەو بوو لەنێو شاندی هوازندا هاتەلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و پەیامبەریش عەباکەی خۆی بۆ راخست و لەسەری دانیشت و وەك مافێك رێزی لێگرت.

لەوانە، خاتوونی بەڕێز ئوم ئەیمەن بەرەکەی حەبەشی و لەباوکییەوە بەمیرات بۆی مابوویەوە، لەخۆشەویستی خۆی مارەی کرد کە زەیدی کوڕی حاریسە بوو، ئوسامەی بۆ هێنایە دونیاوە.

## ٣- بە پەیامبەر ناردن و یەکەمین دابەزاندنێك بۆی:

خوای گەورە لەتەمەنی چل ساڵییدا بەپەیامبەری کرد، کە ساڵی کامڵبوونە، وتراوە: لەو تەمەنەدا پەیامبەران نێردراون، ئەوەشی لەبارەی مەسیحەوە باس دەکرێت کە لەتەمەنی سی و سێ ساڵییدا بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، تەمەنێکە شوێنەوارێك ناناسرێتەوە ئەوە پشتڕاست بکاتەوە لەو تەمەنەدا بووبێ.

یەکەمین شتێك بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبابەت پەیامبەرایەتی رووی دابێ، خەو بوو. پاشان خوای گەورە بەپەیامبەرایەتی رێزی لێنا، لەئەشکەوتی حیرائدا بوو فریشتە هاتەلای، چونکە پەیامبەری ئازیز(صلى الله عليه وسلم) حەزی دەکرد لەوێدا خەڵوت بگێڕێ، یەکەمین ئایەتێك بۆی دابەزیبێ، ئەم ئایەتە بوو: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ ﴾ **العلق: ١** ، واتا: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە.

### ٥- پلە و ڕیزبەندیی بانگەواز:

پلەی یەکەم: پەیامبەرایەتی.

دووەم: وریا و ئاگادارکردنەوەی خزمان و نزیکەکانی.

سێیەم: وریاکردنەوەی قەومەکەی.

چوارەم: وریاکردنەوەی عەرەب.

پێنجەم: وریاکردنەوەی تەواوی ئەوانەی بانگەوازی پێ گەیاندن لەمرۆڤ و جنۆکە و ئەوانەی تاوەکو کۆتا ڕۆژی سەر ڕووی زەوی، بانگەوازی ئەویان پێ دەگات.

شەشەم: دوای ئەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ بەنهێنی بانگەوازی دەکرد بۆ ئایینی خوا، پاشان ئەم ئایەتەی بەسەردا دابەزی: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ ﴾ العلق: ١ ،

واتا: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی ئاشکرا کرد، قەومەکەی دوژمنایەتیی خۆیان پێ ڕاگەیاند و سەختترین سزایەکی خۆی و موسڵمانانیان دا تاوەکو خوای گەورە مۆڵەتی پێ دان ئەو دوو کۆچە ئەنجام بدەن.

### ٦- ناوەکانی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ):

هەموو ئەوانە وەسف و سیفەتن و ناوەی تایبەت نین، کۆمەڵە ناوێکن لەهەندێ سیفەتەوە داڕێژراون و هەموو پیاهەڵدان و کەماڵی پێ دەبەخشن.

لەوانە: ناوی موحەممەد کە بەناوبانگترین ناوێکە بۆی و لەتەوراتیشدا بەو ناوەوە ناوبراوە.

لەوانە: ئەحمەد، ئەو ناوەیە کە مەسیح پێی ناساندوویەتی.

هەروەها: ئەلموتەوەکیل، ئەلماحی، ئەلحاشیر، ئەلعاقیب، ئەلموقەففی، پەیامبەری رەحمەت، پەیامبەری داستان(مەلحەمە)، ئەلفاتیح، پەیامبەری تەوبە، دەستپاك(الأمين).

جوبەیری کوڕی موتعیم ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەچەند ناوێك خۆی بە ئێمە ناساند و ناوبرد و فەرمووی:"أَنَا مُحَمَّدٌ وَأَنَا أَحْمَدُ وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِيَ الْكُفْرَ وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي وَأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدِي نَبِيٌّ "[1]،واتا: من موحەممەدم، من ئەحمەدم، من رامالێنەرم(الْمَاحِي) کە خوای گەورە بە من، بێباوەڕیی رادەماڵێ، من کۆکەرەوەم کە خەڵکیی لەبەر پێی من کۆ دەکرێنەوە و کۆتا پەیامبەریشم کە لەدوای من هیچ پەیامبەرێکی تر نایەت.

موحەممەد، ناوی بەرکارە بۆ کەسێك پیاهەڵدان و ستایشکراوبێ، کە تایبەتمەندیی چاکەی زۆر بێ و بەهۆیەوە ستایش بکرێت، بۆیە گرنگترە لەمەحمود، ناوی مەحمود سێ پیتییەکی موجەڕەدە، بەڵام موحەممەد ناوێکە لەڕیزی سیغەی موبالەغەدایە.

هەرچی ئەحمەدە، ئەوە لەسەر کێشی(أفعَل)ە و تەفزیلە(بەراوردە) و لە(الحمد)ەوە داڕێژراوە.

ناوی(المُتوكِّل)، لەسەحیحی بوخارییدا هاتووە لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ئەڵێ: لەتەوراتدا سیفەتی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)م خوێندووەتەوە کە هاتووە: موحەممەد پەیامبەری خوایە، بەندە و نێردراوی منە، ناوم ناوە ئەلموتەوەکیل، زبر و تووڕە نییە و لەبازاڕەکاندا هات و هاوار ناکات، بەخراپە وەڵامی خراپە ناداتەوە،

---

[1]- بوخاری(٣٥٣٢) و موسلیم(٢٣٥٤) ئیخراجیان کردووە.

بەڵکو دەبووریٚ و دەبەخشیٚ، نایمرێنم هەتاوەکو میللەتی چەوت راست نەکاتەوە و نەڵێن: لا إله إلا الله[1].

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) شایستەترین کەسێکە بەو ناوە، چونکە لەڕاپەڕاندنی ئاییندا بەجۆرێك پشتی بەستە خوای گەورە ، هیچ کەسێك هاوبەشی نەبووە لەو پشت بەستنەدا.

(الماحِي): ئەوە پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) خوای گەورە بێباوەڕیی پیٚ سڕییەوە و رامالّی، ئەوەی بەموحەممەد (صلى الله عليه وسلم) رایمالّی، بەهیچ مرۆڤێکی تر راینەمالّییوە.

هەرچی(الحاشِر)ە،ئەوە ئەوە لەبەر پێی ئەو حەشری خەڵك دەكرێت، وەك ئەوەی بۆ گردکردنەوەی خەڵك نێردرابیٚ.

العاقب: ئەوەیە کە لەدوای پەیامبەرانی ترەوە هاتووەو لەدوای ئەو، هیچ پەیامبەرێکی تر رەوانە ناکرێت، العاقب واتا کۆتا.

المُقفِّي: ئەوە کە شوێن پێی پەیامبەرانی پێش خۆی گرتووەتەبەر.

نبي التوبة: ئەوە کە خوای گەورە پێیەوە دەرگای تەوبەی بۆ مرۆڤەکان کردەوە، بەجۆریٚ لێیان خۆش بوو بۆ مرۆڤەکانی پێش خۆی بەدینەهاتبوو.

نبي التوبة: ئەو کەسەیە کە خوای گەورە پێیەوە دەرگای تەوبەی بۆ خەڵکی سەر زەوی کردەوە و بەجۆرێك لێیان خۆش بوو لەپێش ئەو بۆ خەڵکانی تر رووی نەدابوو.

---

[1] - بوخاری(٢١٢٥) ئیخراجی کردووە.

نبي المَلحَمَة: ئەو پەیامبەرەیە کە خوای گەورە ناردی بۆ جیهادی دوژمنانی خۆی، هیچ پەیامبەر و ئوممەتێك نییە ئەو جیهادەی کردبێ، کە موحەممەدی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و ئوممەتەکەی ئەنجامیان داوە.

الفاتِح: ئەو پەیامبەرەیە کە خوای گەورە پێیەوە دەرگای هیدایەتی کردەوە لەدوای ئەوەی داخرابوو، چاوە نابیناکان و گوێیە کەڕ و دڵە داخراوەکانی پێ کردەوە.

الأمین: ئەو پەیامبەرەیە کە مافدارترین کەسێکە بەو ناوە، ئەمین و دەستپاکی خوا بوو بۆ وەحی و ئایینی خوا، دەستپاك و راسپاردە پارێزی ئاسمان و زەوی بوو، بۆیە لەپێش ئەوەی ببێتە پەیامبەر، بە ئەلئەمین ناویان دەهێنا.

### ٧- منداڵەکانی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ):

یەکەمیان ئەلقاسم بوو، بۆی بووە کونیە و بە ئەبا ئەلقاسم بانگیان دەکرد، بەمنداڵیی مرد.

پاشان زەینەب، وتراوە: لەئەلقاسم گەورەتر بووە، پاشان روقیە و ئوم کەلسوم و فاتیمە، باس کراوە لەئیبن عەباسەوە کە روقیە لە سێ خوشکەکەی تری گەورەتر بووە، ئوم کەلسوم بچووکترینیان بووە.

پاشان عەبدوڵڵای لەدایکبووە، هەموو ئەوانە لەخەدیجە هاتنە دونیاوە. پاشان لەمەدینەدا لەماریەی قیبتییەی جاریەی لەساڵی هەشتی کۆچییدا، ئیبراهیمی بووە، ئەبو رافیعی خزمەتکاری مزگێنی لەدایکبوونی ئەو منداڵەی پێ داوە، ئەویش کۆیلەیەکی بۆ کردووەتە دیاری، بە منداڵی و پێش لەشیر برینەوە مردووە.

جگە لەفاتیمە، هەموو منداڵەکانی تری پێش خۆی کۆچی دواییان کردووە، فاتیمە بەشەش مانگ لەدوای خۆی، کۆچی دوایی کردووە.

## ٨- باسی مام و پوورەکانی( خوشکەکانی باوکی ):

لەوانە شێری خوا و پەیامبەر، گەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب و ئەلعەباس و ئەبو تاڵیب کە ناوی عەبد مەناف بووە، هەروەها ئەبو لەهەب کە ناوی عەبدولعوزا بووە، هەروەها ئەلزوبەیر و عەبدو لکەعبە و ئەلموقوم و زیرار و قوسەم و ئەلموغیرەی خاوەن نازناوی حجل و ئەلغەیداق کە ناوی موسعەب بووە، وتراوە: نەوفەل، هەندێکی تر (ئەلعەوام)یش زیاد دەکەن، تەنیا حەمزە و عەباسیان موسڵمان بوون.

هەرچی پوورەکانێنی(خوشکانی باوکی)، ئەوە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەندێ پووری هەبوو، لەوانە سەفیە دایکی زوبەیری کوڕی عەوام و عاتیکە و بەرە و ئەروا و ئومەیمە و ئوم حەکیم ئەلبەیزاء، سەفیەیان موسڵمان بوو، جیاوازیی هەیە لەبارەی موسڵمانبوونی عاتیکە و ئەروا.

## ٩- هاوسەرانی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ):

یەکەمینیان خەدیجەی کچی خوەیلدی قورەیشی ئەلئەسەدی، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) پێش ئەوەی ببێتە پەیامبەر، مارەی کرد، ئەوکاتەی کە مارەی کرد، خەدیجە تەمەنی چل ساڵ بوو، هەتاوەکو کۆچی دوایی کرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ژنی بەسەردا نەهێنا، پشتگیریی پەیامبەری خوای کرد لەبوونە پەیامبەر و

لەگەڵیدا تێکۆشا و بەخۆی و سەروەت و سامانێوە هاوکاریی کرد، خوای گەورە لەگەڵ جیبریلدا سەلامی بۆ نارد، ئەوەش تایبەتمەندییەکە نازانرێ بۆ هیچ ئافرەتێکی تر هاتبێتە پێش، بەسێ ساڵ پێش کۆچکردن بۆ مەدینە، کۆچی دوایی کرد.

پاش کۆچی دوایی کردنی بەچەند رۆژێك، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سەودەی کچی زەمعەی قورەیشیی مارە کرد، ئەو بوو کە رۆژەکانی خۆی بەخشییە عائیشە.

پاشان پەیامبەری خوا لەدوای ئەو، دایکی عەبدوالله عائیشەی راستگۆی کچی راستگۆی مارەکرد، ئەو عائیشەیەی کە خوای گەورە لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە بێ تاوانیی ئەوی دەرخست، خۆشەویستی پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم)، عائیشەی کچی ئەبو بەکری سدیق، کە فریشتە لەپێش ئەوەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مارەی بکات، لەسەر پارچە ئاورێشمێك پیشانی دا و وتی:"هذه زَوجتُكَ"[1]،واتا: ئەمە هاوسەری تۆیە. لەمانگی شەوالدا مارەی کرد و تەمەنی شەش ساڵان بوو، لەشەوالی ساڵی یەکەمی کۆچییدا گواستییەوە کە تەمەنی نۆ ساڵ بوو، لەنێو هاوسەرەکانیدا تەنیا ئەو بوو بەکچێنی مارەی کردبوو، لەنێو جێگەی ئەودا وەحی بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دابەزی و لای خێزانەکانی تری ئەوە رووی نەدابوو. خۆشەویسترین کەسێك بوو بەلای پەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)، لەئاسمانەوە پاکبوونی دابەزی و ئوممەتیش یەکدەنگ بوونە لەسەر بێباوەڕ دانانی ئەو کەسەی تۆمەتی داوێنپیسی ئەخاتەپاڵ. پاشان حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتابی مارە کرد(خوای لێ رازیی بێ)، پاشان زەینەبی کچی خوزەیمەی کوڕی ئەلحاریسی

---

[1] - بوخاری(٥١٢٥) و موسلیم(٢٤٣٨) ئیخراجیان کردووە.

ئەلقەیسیی مارە کرد لەنەوەی هیلالی کوڕی عامر، دوو مانگ لای پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم)، کۆچی دوایی کرد.

پاشان ئوم سەلەمەی مارە کرد، هیندی کچی ئوممەیەی قورەیشی مەخزومی، کۆتا هاوسەرێکی پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد.

پاشان زەینەبی کچی جەحشی مارە کرد لەنەوەی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە، کچی ئومەیمەی پووری بوو، لەبارەی ئەوەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا ﴾ الأحزاب: ٣٧ ، واتا: ئەمجا کاتێ زەید پێویستی بە(زەینەب) نەماو تەلاقیدا ئێمە(زەینەب)مان لێ مارەکردیت.

بەوە شانازیی دەکرد بەسەر هاوسەرانی تری پەیامبەری خوادا و ئەیووت: ئێوە کەسوکارتان ئێوەی بەمێرد داوە، بەلام من لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە خوای گەورە لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) مارەی کردووم[١]. لەیەکەمین ساڵی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتابدا کۆچی دوایی کرد.

هەروەها جوەیرییەی کچی ئەلحاریسی کوڕی ئەبی زراری ئەلموستەلیقیی مارە کرد، جاریەی نەوەی ئەلموستەلیق بوو، هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و نووسراوی ئازادیی ئیمزا کرد، پارەی ئازادیی خۆی دا و پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) مارەی کرد.

ئوم حەبیبەشی مارە کرد، ناوی رەملەی کچی ئەبو سوفیان سەخری کوڕی حەربی قورەیشی ئومەویی بوو،وتراوە: ناوی هیند بووە، لەوڵاتی حەبەشە کۆچەر بوو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) مارەی کرد و نەجاشی مارەییەکەی دا کە

---

[١] - بوخاری(٧٤٢٠) ئیخراجی کردووە.

چوارسەد دینار بوو، لەوێوە رەوانەی لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کرا، لەڕۆژگاری موعاویەی برایدا کۆچی دوایی کرد.

سەفیەی مارە کرد کە کچی حویەی کوڕی ئەختەبی گەورەی بەنی نەزیر بوو لەکوڕانی هارونی کوڕی عیمرانی برای موسا(سەلامی خوا لەسەر هەردووکیان بێ)، کچی پەیامبەر و خێزانی پەیامبەر بوو.

پاشان مەیمونەی کچی حاریسی هیلالیی مارە کرد کە کۆتا ئافرەتێك بوو مارەی بکات، لەعومرەی قەزادا لەمەککە مارەی کرد، بەدروست پێش لێبوونەوەی لەعومرە.

جیاوازیی لەوەدا نییە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد، نۆ ژنی لەدوای خۆی بەجێهێشت. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کاتەکانی لەنێوان هەشت هاوسەریدا دابەش دەکرد: عائیشە و حەفسە و زەینەبی کچی جەحش و ئوم سەلەمە و سەفیە و ئوم حەبیبە و مەیمونە و سەودە و جوەیرییە.

یەکەمین هاوسەرێکی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەدوای کۆچی دوایی پەیامبەری ئازیز پێیگەیشتبێ، زەینەبی کچی جەحش بوو لەساڵی بیستدا کۆچی دوایی کرد، کۆتا کەسیشیان ئوم سەلەمە بوو لەخیلافەتی یەزیددا کۆچی دوایی کرد.

## ١٠- جاریەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم):

ئەبو عوبەیدە ئەڵێ: چوار جاریەی هەبوو: ماریە کە دایکی ئیبراهیمی کوڕی پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) ، رەیحانە و جەمیلە کە لەنێو کۆمەڵێ جاریەدا کەوتە بەشی، جاریەیەکی تر کە زەینەبی کچی جەحش بۆی کردە دیاری.

### ١١- مەوالی و ئەوانەی بەردەستی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ):

لەنێویاندا زەیدی کوڕی حاریسەی کوڕی شەرحەبیل بوو، خۆشەویستی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئازادی کرد و ئوم ئەیمەنی خزمەتکاری بۆ کردە هاوسەر و ئوسامەی بۆ هێنایە دونیاوە، هەروەها لەنێویاندا ئەسلەم و ئەبو رافیع و سەوبان بوون، لەژنانیشدا: سەلما ئوم رافیع و مەیمونەی کچی سەعد.

### ١٢- خزمەتکارەکانی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ):

لەوانە: ئەنەسی کوڕی مالیك کە ئاوی سەرئاوی بۆ دەهێنا و عەبدوڵڵەی کوڕی مەسعود کە نەعل و سیواکەکانی بۆ دەهێنا و عوقبەی کوڕی عامری ئەلجوهەنی کە ئێسترەکەی بۆ رادەگرت و لەگەشت و گەڕانەکاندا جڵەوی دەگرت، ئەسلەعی کوڕی شورەیك کە کۆڵوبارەکانی بۆ رێکدەخست و بیلالی کوڕی رەباح کە بانگبێژی بوو هەروەها سەعد کە هەردووکیان کۆیلەی ئەبو بەکری سدیق بوون، ئەبو زەڕی غەفاری و ئەیمەنی کوڕی عوبەید و ئوم ئەیمەنی دایکیشی کە خزمەتکاری پەیامبەری خوا بوون(صلى الله عليه وسلم).

### ١٣- نووسەرانی پەیامبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ):

ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و زوبەیر و عامری کوڕی فوهەیرە و ئوبەی کوڕی کەعب و عەمری کوڕی عاس و عەبدوڵڵەی کوڕی ئەرقەم و سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس و حەنزەڵەی کوڕی رەبیع ئەلئەسەدی و موغەیرەی کوڕی شوعبە و عەبدوڵڵەی کوڕی رەواحە و خالیدی کوڕی وەلید و خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس- وتراوە: خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس یەکەمین

کەسێك بووە بۆی نووسیووە، هەروەها موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و زەیدی کوڕی سابت کە لەو بوارەدا لەهەمووئەوانی تر پابەندتر و تایبەتر بووە.

## ١٤- نووسراوەکانی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بۆ موسڵمانان لەبارەی شەریعەتەوە:

لەوانە، نووسراوی زەکات کە لای ئەبو بەکر بووە، هەروەها ئەو نووسراوەی کە ئەبو بەکر بۆی نووسی بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك کاتێك ئاراستەی کرد بۆ بەحرەین و کۆڕای زانایان کاری لەسەر دەکەن.

هەروەها نووسراوی بۆ خەڵکی یەمەن، ئەو نووسراوەی کە ئەبو بەکری کوڕی عەمری کوڕی حەزم لەباوکییەوە ئەویش لەباپیرەیەوە دەیگێڕێتەوە.

## ١٥- نێردراو و نامەکانی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) بۆ پادشایان:

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە لەحودەیبییە گەڕایەوە، نامەی بۆ پادشایانی زەوی نووسی و نێردراوی خۆی نارده لایان، نامەی بۆ ڕۆم نووسی، پێی وترا: ڕۆمەکان نامەی مۆر نەکراو ناخوێننەوە، بۆیە مۆرێکی زیوینی دروست کرد و لەسەری سێ دێڕی نەخش کرد، لەدێڕێکدا نووسی محمد، لەدێڕێکیشدا رسول و لەدێڕێکی تریشدا نووسی الله، بەو مۆرە نامەی نارد بۆ پادشایان، لەیەك ڕۆژدا لەموحەڕەمی ساڵی حەوتی کۆچییدا شەش کەسی وەك نێردراوی خۆی ڕەوانە کرد.

یەکەمینیان عەمری کوڕی ئومەییەی ئەلزەمەریی بوو ناردی بۆلای نەجاشی.

دوحیەی کوڕی ئەلخەلیفەی ئەلکەلبیی نارد بۆلای قەیسەری پادشای ڕۆم کە ناوی هیرقەل بوو، نزیکبوو موسڵمان ببێ، بەڵام هەنگاوی هەڵنەگرت.

عەبدوڵلەی کوڕی حوزافەی ئەلسەهمیی نارد بۆلای کیسرا کە ناوی ئەپەرویزی کوڕی هورموزی کوڕی ئەنوشیروان بوو، نووسراوەکەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی دڕی و پارچە پارچەی کرد، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"اللَّهُمَّ مَزِّقْ مُلْكَهُ"،واتا: خوایە گیان پادشایەتییەکەی پارچە پارچە بکەی. خوای گەورە پادشایەتیی خۆی و قەومەکەی پارچە پارچە کرد[1].

حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەی نارد بۆلای موقەوقیس کە ناوی جورەیجی کوڕی مینائی پادشای گەورەی ئەسکەندەرییە و پادشای گەورەی قیپتییەکان بوو، چاکی وت و جوان مامەڵەی کرد و موسڵمان نەبوو، ماریە و سیرین و قیسرای خوشکانی ماریەی بەدیاریی بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نارد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ماریەی بۆ خۆی هێشتەوە و سیرینیشی کردە دیاریی حەسسانی کوڕی سابت، هەروەها جاریەیەکی تری بۆ کردە دیاری و هەزار مسقاڵ ئاڵتوون و بیست بەرگ لەقیپتییەکانی میسر و ئێسترێکی خۆڵەمێشیی کە دولال بوو، گوێدرێژێکی دێز کە عوفەیر بوو، هەروەها خزمەتکارێکی خەسێنراو پێیدەوترا: مابور. وتراوە: کوڕە مامی ماریە بووە، هەروەها ئەسپێك کە لزاز بوو، هەروەها پەرداخێکی شووشە و هەنگوینی بەدیاریی بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) نارد.

لەزیلقەعدەی ساڵی هەشتی کۆچییدا، عەمری کوڕی عاسی ناردەلای جیفر و عەبدوڵلە کە کوڕانی ئەلجولەندی ئەزدیی بوون لەعوممان، بوونە موسڵمان و

---

[1] – بوخاری(٦٤) ئیخراجی کردووە.

زەکاتیان دا و لەدەسەلاتی خۆیاندا مانەوە و زەکاتیان کۆدەکردەوە و بەو شێوە مانەوە تاوەکو هەواڵی کۆچی دوایی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ی پێگەیشت.

عەلائی کوڕی ئەلحەزرەمیی ناردە لای ئەلمونزیری کوڕی ساوا ئەلعەبدیی پادشای بەحرەین پێش ئەوەی لەجیعرانەوە بڕوات، وتراوە: لەپێش فەتحی مەککە بووە، بوویە موسڵمان و زەکاتی دا.

ئەلموهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییەی ئەلمەخزومیی ناردە لای ئەلحاریسی کوڕی عەبد کولال ئەلحیمیری لەیەمەن، ئەویش وتی: چاوەڕێ بکە با بیرێکی لێ بکەمەوە.

لەکاتی رۆیشتنی لەتەبوك،ئەبو موسای ئەشعەری و موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن. تەواوی خەڵکەکەی سەربەستانە بەبێ شەڕ بوونە موسڵمان.

### ١٦- بانگبێژانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم):

چوار بانگبێژی هەبوو: دووانیان لەمەدینە بوون: بیلالی کوڕی رەباح کە یەکەمین بانگبێژی پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم)، دووەمیش عەمری کوڕی ئوم مەکتوم ئەلقورەیشی ئەلعامریی نابینا بوو، لەقوبائیشدا: سەعد ئەلقەرەزی خزمەتکاری عەمماری کوڕی یاسر هەبوو، لەمەککەشدا: ئەبو مەحزورە، کە ناوی ئەوسی کوڕی موغیرەی ئەلجومەحیی بوو.

### ١٧- ئەمیرەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم):

لەوانە: بازانی کوڕی ساسان کە لەکوڕانی بەهرامی کوڕی جور بوو، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەدوای مردنی کیسرا، ئەوی کردە ئەمیری تەواوی خەڵکی

یەمەن، یەکەمین ئەمیرێکی یەمەن بوو لەئیسلامدا و یەکەمین کەسێك بوو لەپادشایانی عەجەم بوویە موسڵمان.

ئەبو موسای کردە ئەمیری زوبەید و عەدەن و ساحیل(کەناراوەکان).

موعازی کوڕی جەبەل بوویە ئەمیری ئەلجەنەد. ئەبو سوفیان سەخری کوڕی حەرب بووە والیی نەجران، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش بووە والیی کۆکەرەوەی پێنجیەك لەیەمەن و بەڕێوەبردنی قەزاوەتیی ئەو شوێنە.

عەمری کوڕی عاسیش بووە والیی عومان و دەورووبەری. کۆمەڵێکی زۆر بوونە ئەمیری کاروباری زەکات، چونکە هەر هۆزێك والیی تایبەت بەخۆی هەبوو بۆ کۆکردنەوەی زەکات و بەو هۆیەوە کارمەندانی زەکات زۆربوونەوە. ئەبو بەکر ساڵی نۆی کۆچی کاروباری حەجی ڕاپەڕاند، عەلی نارد تاوەکو بۆ خەڵکیی سورەتی(بَراءة)بخوێنێتەوە.

### ١٨- پاسەوانەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم):

لەوانە: سەعدی کوڕی موعاز کە لەڕۆژی بەدردا کاتی خەوتنی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، پاسەوانێتیی بۆ کرد، هەروەها موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کە لەڕۆژی ئوحوددا پاسەوانێتیی بۆ کرد، هەروەها زوبەیری کوڕی عەوام لەڕۆژی خەندەقدا پاسەوانێتیی بۆ کرد.

لەوانە: عەببادی کوڕی بیشر کە پاسەوانێتیی بۆ کرد، کۆمەڵێکی تریش پاسەوانێتییان بۆ کرد تاوەکو ئەم ئایەتە دابەزی:﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ ﴾ **المائدة: ٦٧** ، واتا: خوا تۆ دەپارێزێت لەخەڵکی(کە بتکوژن).

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەرچووە لای خەڵك و هەواڵی پێدان بەو ئایەتە و ئەوانیش بڵاوەیان لێ کرد.

### ١٩- ئەوانەی لەبەردەمیدا لەگەردنیان دەدا:

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و زوبەیری کوڕی عەوام و میقدادی کوڕی عەمر و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە و عاسمی کوڕی سابتی کوڕی ئەبی ئەلئەقلەح و زەحاکی کوڕی سوفیانی کیلابی. قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنساری، لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەجێی پلەی ئەمیری پۆلیس بوو، موغیرەی کوڕی شوعبە لەرۆژی حودەیبییەدا بەشمشێرەوە لەسەر سەری راوەستابوو.

### ٢٠- ئەوانەی سەرپەرشتی خەرجی و مۆر و نەعل و سیواك و بانگدانیان بۆ دەکرد:

بیلال سەرپەرشتی خەرجییەکانی بۆ دەکرد، موعەیقیبی کوڕی ئەبی فاتیمەی ئەلدەوسیش سەرپەرشتی مۆری بۆ دەکرد، کوڕی مەسعودیش سەرپەرشتی سیواك و نەعلەکەی بۆ دەکرد، ، رەباح ئەلئەسوەد و ئەنسەی خزمەتکاری بانگیان دەکرد، هەروەها ئەنەسی کوڕی مالیك و ئەبو موسای ئەشعەرییش.

### ٢١- شاعیر و وتاربێژانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم):

ئەو شاعیرانەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە بەرگرییان لەئیسلام دەکرد، ئەمانە بوون: کەعبی کوڕی مالیك و عەبدوڵلەی کوڕی رەواحە و حەسسانی

کوڕی سابت. لەهەموویان سەختتر بۆ سەر بێباوەڕان، حەسسانی کوڕی سابت و کەعبی کوڕی مالیك بوون، بەبێباوەڕیی و هاوبەش پەیداکردن، ئەوانیان عەیبدار دەکرد، وتاربێژەکەشی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بوو.

## ٢٢- وشترەوانەکانی کە لەسەفەردا جڵەوی وشترەکەیان بۆ دەگرت و وشتریان بۆ بەڕێدەخست:

لەوانە: عەبدوڵلای کوڕی رەواحە و ئەنجەشە و عامری کوڕی ئەلئەکوەع و مامەکەی کە سەلەمەی کوڕی ئەلئەکوەع بوو، لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)وشترەوانێکی دەنگخۆشی هەبووە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)پێی فەرمووە:"رُوَيْدًا يا أنجَشةُ لا تَكسرِ القَواريرَ"،واتا: ئەی ئەنجەشە لەسەر خۆت بە بەدەنگت کار لەوشترەکان مەکە خێرا بەڕێدا بڕۆن و ئافرەتەکان ماندوو بکەن.

## ٢٣- غەزا و شاند و سریەکانی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ):

هەموو غەزا و شاند و سریەکانی لەماوەی دە ساڵدا بووە لەدوای کۆچکردن بۆ مەدینە، غەزا و جیهادەکانی بیست و حەوت غەزا بووە، وتراوە: بیست و نۆ، وتراوە ژمارەیەکی تر بووە.

خۆی لە نۆ جیهاددا بەشدار بووە: بەدر و ئوحود و خەندەق و قورەیزە و موستەلیق و خەیبەر و فەتح و حونەین و تائیف.

هەرچی سریەکانێتی، نزیك بەشەش سریە بووە، جیهادە گەورەکانیش حەوت دانە بوون: بەدر و ئوحود و خەندەق و خەیبەر و فەتح و حونەین و تەبوك. لەبابەت ئەو غەزایانەدا ئەم سورەتانە دابەزین: سورەتی ئەلئەنفال و بەدر و لەئوحودیش کۆتایی ئالی عیمران تاوەکو کەمێ پێش تەواوبوونی ئەو سورەتە: ﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَـٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾ ﴾ **آل عمران: ١٢١.**

لەباسی خەندەق و قورەیزەشدا سەرەتای سورەتی ئەلئەحزاب دابەزی، لەبەنو نەزیریشدا سورەتی ئەلحەشر، لەباسی حودەیبییە و خەیبەریشدا سورەتی ئەلفەتح، لەسورەتی ئەلنەصردا راشکاوانە باس لەفەتح و رزگاریی کراوە.

تەنیا لەیەك غەزادا پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بریندار بوو، ئەویش لەئوحود بوو، لەبەدر و حونەیندا فریشتە لەگەڵیدا دەجەنگان، لەڕۆژی خەندەقدا فریشتە دابەزین، بۆیە هاوبەش پەیداکەران هاتنە لەرزین و دۆڕان، بەرد و چەویان دەدا بەنێو چەوانی هاوبەش پەیداکەراندا و هەڵهاتن. لەدوو غەزادا فەتح هەبوو: بەدر و حونەین.

تەنیا لەیەك غەزادا بەمەنجەنیق جەنگا، ئەویش لەتائیف بوو، یەك جار لەسەنگەردا خۆی پاراست، ئەویش لەشەڕی ئەحزاب و کۆمەڵەکان بوو، سەلمانی فارسی(خوای لێ رازیی بێ) ئاماژەی ئەوەی بۆ کرد خەندەق لێ بدات.

## ٢٤- چەك و ناو ماڵەکەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم):

نۆ شمشێری هەبوو،مأثور یەکەمین شمشێرێکی میراتیی بوو لەباوکیەوە بۆی مابوویەوە،العضب و ذو الفقار و هەمیشە پێی بوو هەمووی لەزیوو بوو. هەروەها القلعي و البَتَّار و الحَتْف والرُّسوب و المخذم والقَضيب کە زۆربەی زیوو بوو.

شمشێری زولفیقاری لەڕۆژی بەدردا کاریگەر بوو، تیایدا خەونی پیشان درا و لەڕۆژی فەتحی مەککەدا کە چووە مەککەوە، شمشێرەکەی ئاڵتوون و زیووی پێوە هەبوو.

حەوت قەڵغانی هەبوو: ذات الفُضول کە بۆ کڕینی جۆ بۆ کەسوکارەکەی، کردبووە رەهن لای ئەبی ئەلشەحمی جولەکە، بڕی جۆیەکە سی ساع بوو، قەرزەکە بۆ ساڵێك بوو، قەڵغانەکەش لەئاسن دروست کرابوو. ذات الوِشاح و ذات الحَواشِي و السَّعْدية وفِضَّة والبَتراء والخِرنِق.

شەش چەکی(قِسيّ)هەبوو: الزَّوْراء، الرَّوْحاء، الصَّفْراء، البَيْضاء، الكَتوم کە لەڕۆژی ئوحوددا شکا و قەتادەی کوڕی نوعمان هەڵیگرت، هەروەها السداد.

هەگبەیەکی هەبوو پێیدەوترا: الكافور.

تورسی(قەڵغان)ی بەرگریی هەبوو پێیدەوترا: الزلوق، دانەیەکی تر پێیدەوترا: الفتق، دانەیەکی تر لەشێوەی پەیکەرێکدا بەدیاریی پێی درا، دەستی خستەسەری، خوای گەورە ئەو پەیکەرەی لەسەر لابرد.

پێنج تیری هەبوو، بەیەکێك دەوترا: المثوي و بەیەکێکی تریان دەوترا: المثني، حەربەیەکی هەبوو پێیدەوترا: النبعة. دانەیەکی تری هەبوو پێیدەوترا: البَيْضاء، بچووکێکی تری هەبوو شێوە گۆچان بوو پێیدەوترا: العَنَزة و لەجەژنەکاندا لەبەردەستی خۆی پێیدا دەڕۆیشت بەڕێگەدا، ئەیکردە سترەی بەر نوێژکردن و هەندێجاریش لەڕێکردندا بەکاری دەهێنا.

کڵاوێکی ئاسنینی هەبوو پێیدەوترا ئەلموەششەح، دانەیەکی تری هەبوو پێیدەوترا ئەلسسەبوغ یان زو ئەلسسەبوغ.

سىٚ عەبای هەبوو لەجەنگدا لەبەری دەکرد، ئالأیەکی رەشی هەبوو پێیدەوترا ئەلعوقاب. ئالأیەکی سپی هەبوو،رەنگە رەشی تیٚ کردبیٚ. راخەرێکی هەبوو پێیدەوترا ئەلکن، گالۆکێکی هەبوو بەئەندازەی بالٚ یان درێژتر بۆ رێکردن و سواربوونی ولأخ بەکاریدەهێنا و لەبەردەستی خۆی دایدەنا بۆ بەرێخستنی وشترەکەی و کورتە گالۆکێکی هەبوو پێیدەوترا ئەلعورجون و دانەیەکی تریش پێیدەوترا ئەلمەمشوق. وتراوە: ئەلمەمشوق ماوەتەوە لەدەستی خەلیفەکاندا بووە. پەرداخێکی هەبوو پێیوتراوە ئەلرەیان و ناوبراوە بەموغیس، دانەیەکی تریشی هەبوو کەنارەکەی لەزنجیرەیەکی زیوو دروستکرابوو. پەرداخێکی شووشەی هەبوو، هەروەها پەرداخێکی لەدار خورما دروستکراوی هەبووە لەژێر سەرینەکەی دایناوەو و لەشەودا میزی تێدا کردووە، قاپێکی لەپێست دروستکراوی هەبووە پێیووتراوە ئەلصادر و قاپێکی بەردین و پەرداخێکی گەورە پێیدەوترا ئەلسسەعە و دەستشۆرێکی مس و چوار گۆشەیەکییش کە ئاوێنە و شانەی تێدا دادەنا. کلدانێکیش شەوان سیٚ جار چاوی پیٚ کل کردووە و سنوقێکی هەبووە مەقەست و سیواکی تێدا داناوە.

قاپێکی گەورەی هەبووە پێیوتراوە ئەلغەڕاء و جیٚ خەوێك قاچەکانی لەساج دروستکرابوو، هەروەها جێگەیەکی لەپێست دروستکراو کە ناوئاخنی ریشالٚ بووە. ئەوانەی باسکران، بەجیاواز و پچڕ پچڕ لەفەرموودەکاندا باس کراون.

### ٢٥- باسی ولأخەکانی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم )

لەئەسپدا ئەمەی هەبووە: (السکب). وتراوە: یەکەمین ئەسپێك بووە خاوەنداریی کردبێت، ئەسپێکی تەوێلٚ سپی و قاچ رەنگی سپیی بوو، رەنگی جەستەی سووری رەش باو بوو. هەروەها ئەلمورتەجز کە دێز بووە و خوزەیمەی کوڕی سابت

شایەتیی لەسەر داوە. ئەللەحیف و ئەللەزاز و ئەلزەریب و سوبحە و ئەلوەرد، ئەوانە حەوت دانەن و یەکدەنیگییان لەسەر هەبووە کە ئەو حەوت ئەسپەی هەبووە. زینەکەی ناواخن ریشالْ بوو.

لەئێستریش دولدالی هەبووە، دێز بووە و موقەوقیس بەدیاریی بۆی ناردووە، ئێسترێکی هەبووە پێیوتراوە فضة کە فەروە ئەلجوزامی بەدیاریی پێی داوە، ئەسپێکی تریش کە فەرمانڕەوای ئەیلە بەدیاریی پێی دابوو، دانەیەکی تریش کە فەرمانڕەوای دومەتولجەندەل بەدیاریی پێی دابوو.

لەگوێدرێژدا: عوفەیری هەبوو، دێز بوو، موقەوقیسی پاشای قیبت بەدیاریی بۆی ناردبوو، گوێدرێژێکی تریش فەروەتولجوزامی بەدیاریی پێی دابوو.

لەوشتردا: ئەلقوسوائی هەبوو، وتراوە: بەو وشترە کۆچی کردووە، هەروەها ئەلعەزبائو ئەلجەدعاء کە هیچ وشترێك پێشیان نەدەکەوت، بۆیە بەو ناوە ناوبران، ئەلعەزباء بەو وشترە دەوترێت کە هیچ وشترێکی تر پێشی ناداتەوە، هەتا ئەوەی رۆژێك دەشتەکییەك هات و بەوشترەکەی پێشی دایەوە، ئەوە بەلای موسڵمانانەوە سەخت بوو، بۆیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ حَقًّا عَلَى اللَّه أَلَّا يَرْفَعَ مِنَ الدُّنْيَا شَيْئًا إِلَّا وَضَعَهُ"[1]،واتا: حەق و مافە بەسەر خوای گەورەوە، هەرشتێکی لەدونیادا بەرز کردەوە، نزمی بکاتەوە.

لەڕۆژی بەدریشدا وشترێکی مەهریی دەسکەوت کە هی ئەبو جەهل بوو، لوتەوانەیەکی زیوی لەلووتدا بوو، لەڕۆژی حودەیبییەدا کردیە قوربانیی تاوەکو بەوە هاوبەش پەیداکەران تووڕە بکات.

چل و پێنج وشتری شیردەر و ئاوسی هەبوو، هەروەها موهرییەك کە سەعدی کوڕی عەبادە لەبەنی عەقیل بۆی ناردبوو.

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٥٠١).

سەد مەڕی هەبوو نەیویستووە زیاد بکەن، هەر مەڕێك سکی کردبێ، مەڕێکی لەشوێندا سەر بڕیووە، حەوت بزنی هەبووە ئوم ئەیمەن بەخێوی کردوون.

## ٢٦- باسی بەرگ و پۆشاکی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)

مێزەرێکی هەبووە پێیوتراوە ئەلسسەحاب، عەلی لەبەری کردووە، کڵاوێکی خستووەتە ژێر، هەندێجاریش کڵاوی بێ مێزەری لەسەر کردووە، هەروەها مێزەر بەبێ کڵاو.

کە مێزەرەکەی ئەخستەسەر، بەسەر شانیدا شۆڕدەبوویەوە، هەروەك موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەعەمری کوڕی حورەیسەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوام بینی(صلى الله عليه وسلم) لەسەر مینبەر بوو، مێزەرێکی رەشی بەسەرەوە بوو هەردوو چمکی بەسەر شانیدا هاتبووە خوارەوە[1].

هەر لەموسلیمەوە ئەویش لەجابری کوڕی عبداللەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کاتێ چووەتە مەککەوە، مێزەرێکی رەشی بەسەرەوە بووە[2].

لەو فەرموودەیەی جابردا باسی ئەوە نەکراوە هەمیشە شۆڕی کردبێتەوە.

قەمیسی لەبەر کردووەو خۆشەویسترین بەرگێك بووە بەلایەوە،قۆڵی قەمیسەکەی تاوەکو مەچەکی بووە و جوبەی لەبەر کردووە، هەروەها کەواو لەگەشتیشدا جوبەی کوممەینی لەبەر کردووە کە تەنگ بووە، هەروەها بەرگی بالاپۆشی لەبەر کردووە.

عەبا و پەشتەماڵی سووری لەبەرکردووە، هەڵەی کردووە ئەو کەسەی وەهای زانیووە تەنیا سوور بووە و هیچ رەنگێکی تری تێکەڵ نەبووە، بەڵکو دوو عەبای یەمەنیی بوونە و وەك تەواوی عەبای یەمەنی، سوور و رەش تێکەڵ کرابوون.

---

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣٥٩).

[2]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣٥٨).

بەرگی خەمیصەی لەبەر دەکرد، شەروالّی کڕیووە، لەزیاتر لەفەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە کە شەروالّی لەپێ کردووە و بەمۆڵەتی ئەو شەروالّیان لەپێ کردووە.

خوفەی لەپێ کردووە، ئەو نەعلەشی لەپێ کردووە کە پێیوتراوە ئەلتاسومە.

ئەلقەی لەدەست کردووە، فەرموودەکان جیاوازن ئایە لەدەستی راستی کردووە یان چەپ؟ هەموو فەرموودەکانیش لەڕووی سەنەدەوە دروستن.

خوزەی لەسەر ناوە، قەلّغانی بەستووە کە پێیوتراوە: ئەلزردیە، لەڕۆژی ئوحودیشدا لەنێوان دوو قەلّغاندا خۆی پیشان دا.

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە(خوای گەورەی لێ رازیی بێ) ئەڵێ: ئەمە عەبای پەیامبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم)، عەبایەکی تەیالیسیی کیسرایی دەرکرد کە دوو قۆڵی کراوەی لەئاورێشم دروستکراوی هەبوو، لای عائیشە بوو هەتاوەکو کۆچی دوایی کرد، کە عائیشە کۆچی دوایی کرد، کەوتە لای من، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبەری دەکرد، ئێمە بۆ نەخۆشمان دەشۆرد و شیفایان پێ وەردەگرت[1].

دوو عەبا و بوردەی هەبوو سەوز بوون، هەروەها عەبایەك(کیسائێ) رەش و دانەیەکی تری سووری تاریك و دانەیەکی لەموو دروستکراو. قەمیسەکەی لەلۆکە دروستکرابوو، قۆڵ کورتبوو. خۆشەویسترین بەرگ و پۆشاکێك بەلایەوە، قەمیس و عەبا حیبەکەی بوو کە رەنگی سووری تێدا هەبوو.

رەنگی سپی خۆشەویسترین رەنگێك بوو بەلایەوە و فەرموویەتی:"هي مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، فَالبسوها، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكم"[2]،واتا: ئەمە لەباشترین بەرگێکی ئێوەیە بۆیە بیپۆشن و لەبەری بکەن و مردووەکانتانی پێ کفن بکەن. لەسەحیحدا هاتووە:

---

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٦٩).

[2]- ئەبو داوود(٤٠٦١) و ترمیزی(٩٩٤) و ئیبن ماجە(١٤٧٢) ئیخراجیان کردووە.

له عائیشەوە کە عەبایەکی سووری تۆخ و بالاپۆشێکی زبری دەرکردو وتی: لەنێوان ئەم دوو بەرگەدا بوو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد[1].

زۆربەی ئەوەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان دەیانپۆشی، لەلۆکە چنرابوو، ئەکرێ لەخوری و کەتان چنراویشیان لەبەر کردبێ.

هەر بەرگێکی نوێی هەبووایە، ناوێکی لێ دەنا و ئەیفەرموو: "اللَّهُمَّ أَنْتَ كَسَوْتَنِي هَذَا الْقَمِيصَ، أَوِ الرِّدَاءَ، أَوِ الْعِمَامَةَ، نَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ"[2]،واتا: خوایە گیان تۆ ئەم قەمیس و عەبایەت پێ بەخشیووم، داوات لێ دەکەین خێری ئەمەمان پێ ببەخشی و خێر و چاکەی ئەوەی بۆی دروستکراوە، پەنات پێ دەگرم لەشەڕ و خراپەی و شەڕ و خراپەی ئەوەی بۆی دروستکراوە. کە قەمیسەکەی لەبەر دەکرد، لەلای راستەوە دەستیپێدەکرد و لەمووی رەشی لەبەر دەکرد، هەروەك موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەرچوو عەبایەکی لەبەر بوو بەمووی رەش نەخشێنرابوو[3].

لەسەحیحەیندا هاتووە لەقەتادەوە: بە ئەنەسمان وت: چی بەرگێك بەلای پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) خۆشەویسترین بوو؟ وتی: عەبای حیبرە[4].

حیبرە جۆرە عەبا و بوردەیەکی یەمەن بوو، زۆربەی چنراوەکانیان هی یەمەن بوو، چونکە لێیانەوە نزیك بوو، ئەکرێ ئەو بەرگ و پۆشاکانەشیان پۆشیبێ کە لەشام و میسرەوە ئەهێنران، لەنمونەی قوپاتیی(القُباطي) لەلۆکە چنراو کە قیپتییەکان دەیانچنی.

---

[1]- بوخاری(٥٨١٨) و موسلیم(٢٠٨٠) ئیخراجیان کردووە.

[2]- ئەبو داوود(٤٠٢٠) و ترمیزی(١٧٦٧) ئیخراجیان کردووە.

[3]- موسلیم(٢٠٨١) ئیخراجی کردووە.

[4]- بوخاری(٥٨١٢) و موسلیم(٢٠٧٩) ئیخراجیان کردووە.

سەرینەکەی پێست بوو، ناواخنی ریشاڵ بوو.

بۆیە ئەوانەی خۆیان بەدوور دەگرن لەو شتانەی خوای گەورە حەلاڵیکردوون لەبەرگ و پۆشاك و خواردن و ژنهێنان وەك کارێکی زوهد و خواپەرستی، ئەوە بەرانبەر بەوان کۆمەڵێك هەن باشترین بەرگ لەبەر دەکەن و خۆشترین خواردن دەخۆن و لەبەرکردنی زبر و خواردنی زبر بەخۆبەلزانی و زۆر کردن نابینن، بۆیە رێگەی هەردوو کۆمەڵ پێچەوانەی هیدایەتی پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم)، لەبەر ئەوە لەپێشبین بووە وتوویەتی: ئەوان حەزیان بەدوو شتە بەناوبانگەکە نەبوو، لەبەرگی بەرز و بەرگی ئاست نزم.

## ٢٧- رەوشتی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەخواردندا:

رەوشتی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەخواردندا ئەوە بووە، شتێك لەبەردەست بووبێ رەتی نەکردووەتەوە و داوای شتی نەبووی نەکردووە، هەر خواردنێکی حەلاڵی نزیك بکرابایەتەوە دەیخوارد، ئەگەر لێیشی نەخواردبایە دوورکەوتنەوەی حەرامانە نەبوو، هەرگیز عەیب و ناتەواویی لەخواردنێك نەگرتووە، ئەگەر حەزی لێ بکردبایە دەیخوارد و ئەگەر حەزی لێ نەبووایە وازی لێ دەهێنا.

چی هەبووایە ئەوەی دەخوارد، ئەگەر خواردن نەبوایە ئارامی دەگرت، هەتا ئەوەی لەبرساندا بەردی بەسکییەوە دەبەستەوە، مانگێك و مانگێك و مانگێك تێپەڕ دەبوو، لەماڵیدا ئاگری کوانووی خواردن نەدەکرایەوە.

زۆربەی خواردنەکەی لەسەر خوان بوو، بەسێ پەنجەی نانی دەخوارد، کە لێی دەبوویەوە پەنجەکانی دەخستە دەمی، ئەوە بەرێزترین جۆری خواردنە، چونکە مرۆڤی خۆبەزلزان بەیەك پەنجەی نان دەخوات، مرۆڤی برسیش بەهەر پێنج پەنجەی نان دەخوات و پشوو لەخۆی دەبرێت.

پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بەپاڵدانەوەوە نانی نەدەخوارد. لەسەرەتای خواردندا(بسم الله)ی دەکرد، کە لێی دەبوویەوە(الحمد لله)ی دەکرد و ئەیفەرموو:"الْحَمْدُ للهِ حَمداً كَثِيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيهِ غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلاَ مُوَدَّعٍ وَلاَ مُسْتَغْنَىً عَنْه رَبُّنَا"[1]،واتا: سوپاس و ستایشی زۆر بۆ خوای گەورە، بەرەکەتداری بکات ئەو خوایەی کە پێویستی بەکەس نییە و مرۆڤەکان پێویستیان بەو هەیە و بێ خوا نایانکرێ.

زۆربەی خواردنەوەی بەدانیشتنەوە بوو، بەڵکو رقی دەبوویەوە لەخواردنەوە بەپێوە، یەك جار بەپێوە ئاوی خواردووەتەوە، راست لەو بابەتەدا ئەوەیە: نەهیکردووە لەخواردنەوە بەپێوە، جائیزە بەپێوە بخورێتەوە ئەگەر کەسەکە نەیتوانی دابنیشێ، فەرموودەکان لەوەدا کۆکن، خوای گەورە خۆی زاناترە.

کە خۆی دەیخواردەوە، دەیدایە کەسی رووی دەستە راستی، ئەگەر کەسی لای دەستە چەپی لەتەمەندا گەورەتر بووایە، ئەوە بەوی دەدا.

## ٢٨- رێنمایی و رەوشتی لەهاوسەرگیریکردن و مامەڵەی لەگەڵ خێزانەکانیدا

دروست لێیەوە هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسدا(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمُ النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ"[2]،واتا:لەدونیای ئێوەدا خۆشویستنی ئافرەت و عەترم پێ دراوە، نوێژیش بۆم کراوەتە جێی ئارامی و سوکنایی.

خوای گەورە لەوەدا شتانێکی بۆ حەڵاڵکردووە بۆ هیچ کەسێکی ئوممەتەکەی حەڵاڵی نەکردووە. لەشەومانەوە و خەرجییدا پشکی بۆ دیاریی کردبوون، ژنی تەڵاق

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٤٥٨).

[2] – نەسائی ئیخراجی کردووە(٣٩٣٩).

داوەو گەڕاندوویەتییەوە و سوێندی خواردووە بەکاتیی بۆ مانگێ نزیکی هەندێ لەخێزانەکانی نەبێتەوە، هەرگیز زیهاری نەکردووە.

سەربوودەی ئەو لەگەڵ هاوسەرەکانیدا رەوشت جوانانە بوو. کچانی ئەنساری دەنارد بۆلای عائیشە یارییان لەگەڵدا دەکرد. ئەگەر عائیشە حەزی بەشتێك بکردبایە و تاوان نەبوایە، بۆی جێبەجێ دەکرد، کە عائیشە لەقاپ و پەرداخدا شتێکی بخواردبایەتەوە، لەشوێن دەمی عائیشەی دەخواردەوە، لەژوورەکەی عائیشەدا دەمایەوە و قورئانی دەخوێندەوە و سەری لەکۆشیدا بوو، رەنگە لەحەیزیشدا بووبێ. عائیشە لەسوڕی مانگانەدا بوو فەرمانی پێ دەکرد داوێنی داپۆشێت و یاریی لەگەڵدا دەکرد، بەڕۆژوو بوو عائیشەی ماچ دەکرد. لەنمونەی رەوشت جوانی و نەرموونیانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خێزانەکانی، ئەوە بوو عائیشەی دەخستە سەر شان و یاریی حەبەشەکانی پیشان دەدا کاتێ لەمزگەوتەکەیدا یارییان دەکرد.

کە ویستی گەشتی هەبووایە، لەنێو هاوسەرەکانیدا تیرو پشکی دەکرد، هەرکەسێ دەربچووبایە ئەوی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. کە نوێژی عەسری دەکرد، سەردانی ماڵی هاوسەرەکانی دەکرد و لەحاڵ و ئەحواڵیانی دەپرسی، کە شەو بهاتبایە دەچووە لای ئەو هاوسەرەی کە نۆبەی بوو.

لەکۆتایی و سەرەتای شەودا دەهاتە لای خێزانەکانی، سەرەتای شەو جووت دەبوو، ئەکرێ خۆی شۆردبێ و خەوتبێ و هەندێجاریش دەستنوێژی دەشۆرد و دەخەوت. کە لەگەشت بگەڕابایەتەوە، لەشەودا لەدەرگای نەدەدا.

## ٢٩- سەربووردە و ڕەوشتی لەخەو و بەئاگاهاتنەوەدا

هەندێجار لەسەر جێگە دەخەوت، هەندێجاریش لەسەر جێگەی لەپێست دروستکراو و هەندێجاریش لەسەر حەسیر و هەندێجاریش لەسەر خۆڵ دەخەوت، جاری وەهاش هەبوو لەسەر عەبایەکی ڕەش دەخەوت.

عەببادی کوڕی تەمیم لەمامییەوە دەگێڕێتەوە ئەڵێ: جارێکیان پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)م بینی لەنێو مزگەوتدا ڕاکشابوو، قاچێکی خستبووە سەر قاچەکەی تری[1].

کاتێ دەچووە نێو جێگە بۆ خەوتن، دەیفەرموو: "بِاسْمِكَ اللهُمَّ أَحْيَا أَمُوتُ "[2]،واتا: بەناوی خوا دەژیم و دەمرم.

هەردوو لەپی کۆدەکردەوە و پاشان فووی پێیاندا دەکرد و ئەمانەی دەخوێندەوە: (قل هو الله أحد) و (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس)، پاشان بەوەی بیتوانیبایە بەجەستەی خۆیدا دەستی دەهێنا، سەرەتا لەسەر و دەموچاو و ڕووی جەستەی و سێ جار ئەوەی دەکرد[3].

بەلای ڕاستدا دەخەوت و دەستی ڕاستی دەخستە ژێر گۆنای ڕاستی و پاشان دەیفەرموو: "اللهمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ"[4]، واتا:خوایە گیان لەسزای خۆتم بپارێزە لەو ڕۆژەی کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

کە دەچووە نێو جێگە دەیفەرموو: "الحمدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا، فَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ له وَلاَ مُؤْوِيَ "،واتا: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و

---

[1] - بوخاری(٤٧٥) و موسلیم(٢١٠٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٣٢٤).

[3] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٠١٧).

[4] - ئەبو داوود(٥٠٤٥) و نەسائی(٢٣٦٧) ئیخراجیان کردووە.

خواردنەوەی پێ داین و چاو لەدەستی کەسی نەکردین و داڵدە و پەنای داین، ئاخۆ چەندان کەس هەن بێ یارمەتیدەر و خواردن و پەناگەن. موسلیم باسیکردووە[1].

هەروەها باس دەکات کە لەکاتی چوونە جێگەدا ئەیفەرموو:،واتا:"اللهم رب السَّمَاوَاتِ والأرْضِ، وَرَب العَرْشِ العَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كلِّ شَيءٍ، فَالِقَ الحَبَ وَالنَّوى، منزلَ التَّوْرَاةِ وَالإنجيلِ، وَالفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ كُلِّ ذي شَرّ أَنتَ آخذ بِنَاصيته، أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيس قَبْلَكَ شَيءٌ، وَأَنتَ الآخِرُ، فَلَيْس بَعْدَكَ شَيءٌ، وَأَنتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شيءٌ، وَأَنْتَ البَاطِنُ، فَلَيْسَ دُونَكَ شَيءٌ، اقضِ عَنَّا الدَّينَ، وَأَغْنِنَا مِنَ الفقْر"[2].

خوایە گیان، ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و خاوەن عەرشی مەزن، پەروەردگاری ئێمە و پەروەردگاری هەموو شتێك، ئەی ئەو خوایەی تۆی دانەوێڵە دەتەقێنی و ڕۆکیان لێ دەردەهێنی، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنات پێ دەگرم لەشەڕی خاوەن هەموو خراپەیەك، تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا هەیە و لەژێر ڕکێفی تۆدان، تۆ یەکەم و سەرەتای و لەپێش تۆ هیچ شتێك بوونی نەبووە، تۆ کۆتایت و لەدوای تۆ هیچ شتێك نامێنێتەوە، تۆ دیاری و هیچ شتێك لەسەرووی تۆوە بوونی نییە، تۆ ئەو باتن و نادیارەی کە لەودیوو تۆوە هیچ شتێك بوونی نییە، خوایە گیان قەرزمان لەسەر لابدە و هەژارییمان لێ لابدە.

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) کە شەوان لەخەو هەڵدەستا ئەیفەرموو:"لاَ إِلَه إِلاَّ أَنْتَ سبحَانَكَ، اللهمَ إِنِّي أستغْفِركَ لِذَنبِي، وَأَسْأَلُكَ رَحمَتَكَ، اللهُمَّ زِدْني علماً، وَلاَ تُزِغ قَلبي بَعْدَ إِذ هَدَيتَني، وَهَبْ لي مِن لَدنكَ رَحْمَةً، إِنَّكَ أنتَ الْوَهاب "[3]،واتا:خوایە گیان پاك و بێگەردیی بۆ تۆ، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە تەنیا تۆ نەبێ، خوایە گیان داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم بۆ گوناهەکانم، داوای بەزەیی خۆت دەکەم،

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧١٥).

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧١٣).

[3] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٠٧١).

خوایه گیان زانستی زیاترم پێ ببەخشە، لەدوای ئەوەی هیدایەتی منت داوە، دڵم لەسەر ئیمان لانەدەی، لەلای خۆتەوە بەزەییم پێ ببەخشە بەڕاستی هەر تۆ بەخشەری.

که لەخەو رادەپەڕی دەیفەرموو:"الحَمْدُ للهِ الذِي أحْيَانَا بَعْدَ مَا أمَاتَنَا وَإلَيْهِ النُّشُورُ"[1]،واتا: سوپاس بۆ خوا کە زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی مراندنی و گەڕانەوەمان هەر بۆ لای خۆیەتی. پاشان سیواکی دەکرد، دە ئایەتی کۆتاییەکانی(آل عمران)ی دەخوێند لە: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩٠ ﴾ آل عمران: ١٩٠ هەتاوەکو کۆتایی[2].

فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الحَمْدُ أنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالْأرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أنْتَ الحَقُّ، وَوَعْدُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإلَيْكَ أنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أخَّرْتُ، وَمَا أسْرَرْتُ وَمَا أعْلَنْتُ، أنْتَ إلهي، لَا إلَهَ إلَّا أنْتَ"[3]،واتا:خوایە گیان سوپاس و ستایش تەنیا بۆ تۆ، تۆ رووناکیی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی کە تیایاندایە، سوپاس و ستایش تەنیا بۆ تۆ کە راگری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەشی کە تیایاندایە، سوپاس و ستایش تەنیا بۆ تۆ کە حەقی و بەڵێنت حەق و راستییە و دیدارت حەقە، بەهەشت حەق و راستییە و دۆزەخیش حەق و راستییە، پەیامبەران حەقن، موحەممەد حەقە، قیامەت حەقە،

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٣١٢).

[2] – بوخاری(١٨٣) و موسلیم(٧٦٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بوخاری(٧٤٩٩) و موسلیم(٧٦٩) ئیخراجیان کردووە.

خوایە گیان من موسڵمان بووم و باوەڕم بە تۆ هێناوە و پشتم بە تۆ بەستووەو بۆ لای تۆ گەڕاومەتەوە، گازندەم بۆلای تۆ هێناوەتەوە و بڕیارم بە تۆ سپاردووە، بۆیە لێم خۆشبە لەوەی پێشتر ئەنجامم داوە و لەوەی دواتر لەتاوان لە منەوە روو دەدات و لەوەش بەنهێنی بووەو لەوەشی بەئاشکرا رووی داوە، تۆ پەروەردگاری منی، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە تەنیا تۆ نەبی.

سەرەتای شەو دەخەوت و لەکۆتایی شەودا هەڵدەستا، رەنگە لەبەر بەرژەوەندیی موسڵمانان سەرەتای شەو نەخەوتبێ، چاوانی دەخەوتن و دڵی بەئاگا بوو، قەت نەبوو یەکێك لەخەو هەڵیبستێنێ، بەڵکو خۆی بەئاگادەهاتەوە.

ئەگەر بەشەو بخەوتبایە، ئەوە لەسەر لای راست دەخەوت، ئەگەر کەمێك پێش بەیانی بخەوتبایە، ئەوە باڵی رادەخست و سەری ئەخستە ناو لەپی.

### ٣٠- رەوشتی لەسواربووندا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سواری ئەسپ و وشتر و ئێستر و گوێدرێژ دەبوو، سواری ئەسپی زین کراو و زین نەکراو بووە، هەندێجار رەشمەی راکێشاوە، بەزۆریی بەتەنیا سەرکەوتووە، لەسەر وشتر کەسی تری لەپشتەوە سەرخستووە، جاری وەهاش رووی داوە یەکێك لەپشتەوەی خۆی و یەکێکی تری لەپێشەوە بووە لەسەر وشتردا، هەندێ لەخێزانەکانیشی لەپشتەوەی خۆی سەرخستووە، بەزۆریی ئەسپ و وشتری بەکارهێناوە.

### ٣١- کۆی رەوشتەکانی تر

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کڕین و فرۆشتنی کردووە، لەدوای ئەوەی خوای گەورە بەپەیامدارییەکەی رێزی لێنا، زیاتر کڕینی ئەنجام دا نەك فرۆشتن،

لەدوای کۆچکردن بۆ مەدینە، زۆربەی فرۆشتنەکانی بۆ خەڵکانی تر بوو، وەك فرۆشتنی پەرداخی زیادە و فرۆشتنی یەعقوب ئەلمودەبیری خزمەتکاری ئەبی مەزکور و فرۆشتنی کۆیلەیەکی رەش بەدوو کۆیلەی تر، بەڵام کڕینەکانی زۆرتر بوو. بەکرێ کاری کردووە و کرێیشی داوە، بەکرێگرتنی کەسانی تری زیاتر بووە لەوەی خۆی بەکرێ کار بکات، ئەوە روونە لەپێش پێغەمبەرایەتییدا بەکرێ، مەڕی لەوەڕاندووە، بەکرێ کاری بازرگانیی بۆ خەدیجە ئەنجام داوە لەشام.

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) هاوبەشیی کردووە، جارێکیان هاوبەشەکەی دێت بۆلای و ئەڵێ: ئایە نامناسیتەوە؟ ئەویش ئەفەرمووێ:"كُنْتَ شَرِيكِي؟ فَنِعْمَ الشَّرِيكُ كُنْتَ لَا تُدَارِي وَلَا تُمَارِي"[1]،واتا:بەڵێ تۆ هاوبەشەکەم نەبووی؟ تۆ باشترین هاوبەشێك بووی، بێ کێشە و مشتومڕ و دوور لەفرتوفێڵ بووی.

بریکاری بەخەڵك داو خۆیشی دەکرایە بریکار و وەکیل، وەکیلیی کردنی بۆ خەڵك زۆرتر بوو لەوەی خەڵك بۆ خۆی بکاتە وەکیل. دیاریی پێ دەدرا و قبوڵی دەکرد و پاداشتی لەسەر دەدایەوە، خۆیشی دیاریی بەخەڵك ئەدا و داوای دیاریی دەکرد، سەلەمەی کوڕی ئەلئەکوەع جارییەیەکی بەرکەوتبوو، بەسەلەمەی فەرموو:"هَبْها لي"،واتا: پێمی ببەخشە. ئەویش بەخشییە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەهۆیەوە موسڵمانان کۆمەڵێ دیلیان ئازاد کرد[2]. بەڕەهن و جگە رەهن کەلوپەلی خواستووە، بەحازر و قەرز شتی کڕیووە. قەرزی قەرزدارانی موسڵمانی مردووی داوەتەوە کە کەسێ نەبووە ئەو قەرزەی بداتەوە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) زەوییەکی خۆی کردووەتە وەقف و کردوویەتییە سەدەقە لەپێناو خوای گەورە. تکای بۆ کەسی تر کردووە و تکای لا کراوە، لەلایەن بریرەوە تکای رەتکرایەوە کە بگەڕێتەوە لای موغیس، بەڵام

---

[1] – ئەبو داوود(٤٨٣٦) و ئیبن ماجە(٢٢٨٧) ئیخراجیان کردووە.
[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٧٥٥).

بەرانبەر بەو ئافرەتە نە تووڕە بوو، نە سەرزەنشتیشی کرد، پەیامبەر پێشەنگ و نمونە بوو.

زیاتر لەهەشتا جار سوێندی خواردووە، هەندێکی جێبەجێ کردووە و لەجیاتی هەندێکی تر، کەفارەتی داوە، لەبەر ئەوەیە خوای گەورە ئەو کەفارەتەی ناولێناوە(تَحِلَّةً).

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گاڵتە و سوعبەتی کردووە، بەڵام گاڵتە و سوعبەتەکەشی حەق و راستیی بووە، درکەی بەکارهێناوە و هەر مەبەستی حەق و راستیی بووە. راوێژی کردووە و راوێژیشی بەخەڵك داوە. سەردانی نەخۆشی کردووە و بەدوای تەرمدا رۆیشتووە، بەدەم دەعوەتەوە رۆیشتووە، لەگەڵ بێوەژنان و هەژار و لاوازاندا رۆیشتووە و پێویستییەکانیانی بۆ بەجێهێناوە، گوێبیستی پیاهەڵدانی شاعیران بووە و پاداشتی داون، بەلأم ئەوە هەیە، هەرچەندە ستایشی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) کرابێ بەشیعر، هەر کەمە لەچاو گەورەییەکانیدا، بەلأم پیاهەڵدانی خەڵکانی تر، زۆربەی درۆی تێدایە، ئا لەبەر ئەوەیە فەرمانی داوە، کەسێ پیاهەڵدانی کردی، خۆڵ بکەی بەدەموچاویدا[١].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەخۆی کاروبارەکانی راپەڕاندووە، نەعلی خۆی دووریووەتەوە، بەرگی خۆی بەدەستی خۆی دووریووەتەوە، سەتڵە ئاوی لەبیر هەڵکێشاوە و مەڕی دۆشیوە و بەخۆی خزمەتی ماڵ و خۆی کردووە، لەگەڵ هاوەڵاندا خشتی هەڵگرتووە بۆ دروستکردنی مزگەوت، جاری وا هەبووە لەبرساندا بەردی لەسەر سکی بەستووەتەوە، هەندێجاریش تێر بووە، میوانداریی کەسی کردووە و میوانداریش کراوە، لەناوەڕاستی سەری و پشتەوەی پێی کەڵەشاخی کردووە، لەسەر گۆنا و ناوشان کەڵەشاخی کردووە، تیماری کردووە و بۆ کەسانی

---

[١]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٣٠٠٢).

تر داخی بەکارهێناوە و خۆی داخ نەکراوە، روقیەی بۆ خەڵك کردووە و روقیەی بۆ نەکراوە و تای نەخۆشی دابەزاندووە.

## ٣٢- رەوشتی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەمامەڵەکانیدا

لەهەموو کەسێکی تر مامەڵە جوانتر بوو، کە شتێکی بەئەمانەت و سەلەف وەردەگرت، باشتر لەوەی ئەگەڕاندەوە. وشترێکی بەقەرز وەرگرت، خاوەنەکەی هات و زبر مامەڵەی کرد، هاوەڵانی پەلاماری کابرایان دا، بۆیە فەرمووی: "دَعُوهُ فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالًا"[1]،واتا:وازی لێبهێنن، چونکە خاوەن حەقە و قسەی هەیە.

کابرایەکی جولەکە شتێکی پێ فرۆشتبوو، ماوەیەکی دانابوو پارەکەی لێ وەربگرێتەوە، پێش ئەو ماوەیە هات، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"لم يَحِلَّ الأجَلُ"،واتا: جارێ کاتی دانەوەی نەهاتووە. کابرای جولەکە وتی: ئێوەی نەوەی عەبدولموتەڵیب هەر قەرز دوادەخەن. هاوەڵان پەلاماری کابرایان دا، بەڵام پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) رێگریی لێکردن. بەو کارە نەرمتر و شیرینتر بوو، بۆیە کابرای جولەکە وتی: من هەموو نیشانەکانی پەیامبەرایەتیی تۆم زانی تەنیا یەك نیشانە مابوویەوە، ئەویش ئەوە بوو بەنەرمونیانییەوە وەڵامی نەفامیی دەدەیتەوە، ویستم ئەوە بزانم وا زانیم. کابرای جولەکە بووە موسڵمان[2].

---

[1] - بوخاری(٢٣٠٦) و موسلیم(١٦٠١) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئیبن حیبان ئیخراجی کردووە١/٥٢١، ٥٢٣(٢٨٨) و ئیبن ئەبی عاصم لە(الأحاد والمثاني)٤/١١٠(٢٠٨٢) و ئەلتەبەرانی لە(الكبير) ٥/ ٢٢٢- ٢٢٣،(٥١٤٧) و ئەلحاكم٣/٧٠٠-٧٠١(٦٥٤٧) و ئەلبەیهەقی لە(دلائل النبوة)٦/٢٧٨- ٢٨١.

## ٣٣- ڕەوشت و ئاکاری پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) لەڕۆیشتنی بەتەنیا و لەگەڵ هاوەڵانیدا

نەرم دەچوو بەڕێگەدا،لەهەموو خەڵکی تر خێراتر و نەرمتر و جوانتر دەچوو بەڕێگەدا. ئەبو هورەیرە ئەڵێ: هیچ شتێکی ترم نەبینیووە لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) جوانتر بووبێ، وەك ئەوە بوو خۆر لەڕووی ئەودا هەڵبێ، هیچ کەسێکیشم نەبینیبوو لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) خێراتر بێ، وەك ئەوە بوو زەویی بۆ پێچدرابێتەوە و لوول درابێ، ئێمە خۆمانمان ماندوو دەبینی کەچی ئەو ماندوو نەدەبوو[1].

سەبارەت بەڕۆیشتنی لەگەڵ هاوەڵاندا، ئەوە لەدوایانەوە دەڕۆیشت و ئەیفەرموو: "دَعُوا ظَهْرِي لِلْمَلَائِكَةِ"[2]،واتا: پشتەوەم بۆ فریشتەکان بهێڵن.
بەپێی پەتی و بەنەعلیشەوە بەڕێگەدا دەڕۆیشت، بەتەنیا و بەکۆمەڵ لەگەڵ هاوەڵانیدا ڕێگەی دەکرد، لەسەفەردا ئاوی بەهاوەڵانی دەدا و لاوازانی لەپشتەوەی خۆی سەر دەخست و بۆیان دەپاڕایەوە. ئەبو داوود باسی کردووە[3].

## ٣٤- ڕەوشتی دانیشتن و پاڵدانەوەی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم )

لەسەر زەوی و لەسەر حەسیر و ڕاخەر دادەنیشت، هەندێجار بەدرێژبوونەوە و هەندێجار قاچێکی دەخستەسەر قاچەکەی تری، لەسەر سەرین شانی دادەدا، ڕەنگە لەسەر چەپی پاڵی دابێتەوەو هەندێجاریش لەسەر لای ڕاست، لەکاتی نەخۆشییدا ئەگەر ویستی دەرەوەی هەبووایە، هەندێ لەهاوەڵانی دەچوونە ژێر باڵی.

---

[1] - ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٦٤٨).
[2] - ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٢٤٦).
[3] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٦٣٩).

## ٣٥- ڕەوشتی لەسەرئاوکردندا

کە دەچووە سەرئاو دەیفەرموو: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ"[١].

کە دەردەچوو ئەیفەرموو: "غُفْرَانَكَ"[٢]، بەئاو خۆی پاك دەکردەوە، هەندێجاریش بەبەرد، هەندێجاریش بەبەرد و ئاو.

لەسەفەردا ئەگەر ویستی سەرئاوکردنی هەبووایە، دەچوو تاوەکو لەچاو هاوەڵانی دیار نەدەما. هەندێجار بۆ سەرئاوکردن، شوێنێکی پەنای بەکار دەهێنا تاوەکو دیار نەبێ، هەندێجاریش دیوار و چڕیی دارخورما و هەندێجاریش دار و درەختی دەشت و دەر.

لەشوێنی نەرمدا میزی دەکرد، لەسەر خۆڵی نەرم، بەزۆرییش بەدانیشتنەوە.

ئەگەر لەکاتی میزکردندا یەکێك سەلامی لێ بکردبایە، وەڵامی نەدەدایەوە، موسلیم ئەمەی باسکردووە لەسەحیحەکەیدا لەئیبن عومەرەوە[٣]. ئەگەر بەئاو تەهراتی بکردبایە، دواتر دەستی ئەدا بەزەوییدا. کە دابنیشتبایە بۆ سەرئاوکردن، لەزەوی نزیکدەبوویەوە ئینجا بەرگەکەی هەڵدەماڵی.

## ٣٦- ڕەوشت و ئاکاری لەفیترەتدا

حەزی دەکرد لەنەعل لەپێکردن و ڕۆیشتن و دەستنوێژ و وەرگرتن و بەخششدا دەستی ڕاستی بەکاربهێنێ، دەستی ڕاستی بۆ خواردن و خواردنەوە و دەستنوێژی بوو، دەستی چەپیشی بۆ سەر ئاو و لابردنی شتی پیس بوو.

لەسەرتاشیندا یان هەمووی دەهێشتەوە یان هەمووی دەبڕی، هەندێکی نەدەبڕی و هەندێکی تری بهێڵێتەوە، تەنیا لەحەج و عومرەدا هەندێکی دەبڕی.

---

١- بوخاری(١٤٢) و موسلیم(٣٧٥) ئیخراجیان کردووە.

٢- ئەبو داوود(٣٠) و ترمیزی(٧) ئیخراجیان کردووە.

٣- موسلیم ئیخراجی کردووە(٣٧٠).

حەزی بەسیواك كردن هەبوو، بەڕۆژوو بووایە یان نە، ئەوە سیواكی دەكرد، لەكاتی لەخەوهەڵسان و دەستنوێژ و نوێژ و چوونە ماڵ سیواكی بەكاردەهێنا. زۆر بۆنی بەكاردەهێنا و حەزی بەبۆن لەخۆدان بوو.

قژی شانە دەكرد و پاشان دەیكرە دوو بەشەوە.

هاوەڵان لەخنەكردنیدا جیاوازن: ئەنەس ئەڵێ: خەنەی بەكارنەهێناوە. ئەبو هورەیرە ئەڵێ: خەنەی كردووە.

حەزی بەزەیت دان لەقژی هەبوو، هەندێجار بەخۆی ئەنجامی دەدا و هەندێجاریش عائیشە بۆی ئەنجام دەدا،قژی هەتا نەرمینەی گوێی بوو، ئەگەر درێژبووایە، ئەوە ئەیكردە چوار پەلك. شیرینترین بۆنێك بەلایەوە، میسك بوو.

### ٣٧- ڕەوشتی لەكورتكردنەوەی سمێڵ

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"جُزُّوا الشَّوَارِبَ وَأَرْخُوا اللِّحَى، خَالِفُوا الْمَجُوسَ"[1]، واتا:سمێڵتان كورت بكەنەوە و ریش بەربدەنەوە و پێچەوانەی مەجوس بكەن. لەسەحیحەیندا هاتووە لەئیبن عومەرەوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، وَوَفِّرُوا اللِّحَى، وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ"[2]،واتا: پێچەوانەی هاوبەش پەیداكەران بكەن، ریش بەربەدنەوەو سمێڵ كورت بكەنەوە. لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەنەسەوە ئەڵێ: ((پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) كاتی بۆ ئێمە دانا بۆ كورتكردنەوەی سمێڵ و نینۆك كردن، ئەوەش ئەوەی لە چل شەو زیاتر تێنەپەڕێ"[3].

پێشین(سەلەف) جیاوازن لەبارەی كورتكردنەوەی سمیڵ و تاشینی، ئایە كامەیان باشترە.

---

[1]- موسلیم ئیخراجی كردووە(٢٦٠).

[2]- بوخاری(٥٨٩٢) و موسلیم(٢٥٩) ئیخراجیان كردووە.

[3]- موسلیم ئیخراجی كردووە(٢٥٨).

## ٣٨- ڕەوشتی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەقسەکردن و بێدەنگی و پێکەنین و گریانی

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) پاراوترین مەخلوقی خوا بوو، لەهەمووان قسەی شیرینتر و گەیاندنی خێراتر و لۆژیکی شیرینتربوو، قسەکانی، دڵەکانی دیل دەکرد، ئەمە دوژمنانیشی شایەتییان بۆ داوە، کە قسەی دەکرد، قسەیەکی ڕوون و ڕەوان و پوخت بوو، فرەوێژ نەبوو، سەر زمانی نەدەگرت، لەنێو قسەکاندا ڕانەدەوەستا هەر جارە و وشەیەك بڵێت، بەڵکو ڕەوشتی قسەکردنی، کامڵترین ڕەوشت و ئاکارێك بوو.

عائیشە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وەك ئێوە قسەی نەدەکرد، کە قسەی دەکرد، قسەکردنێکی پوخت و ڕوون و ڕەوان بوو کەسی گوێگر یەکسەر وەریدەگرت و ئەزبەردەی دەکرد، زۆرجار سێ جار وشەکەی دووبارە دەکردەوە تاوەکو بفامرێ چی دەڵێ، کە سەلامی دەکرد سێ جار سەلامی دەکرد، بەزۆریی بێدەنگ بوو، بۆ پێویستییەك قسەی دەکرد، کە قسەشی دەکرد، پوخت و تێر و تەسەل بوو، نە زیادەڕۆ و نە کورتکەرەوە، لەشتێکدا قسەی نەدەکرد پەیوەندیی بەوەوە نەبووایە، لەشتێکدا قسەی دەکرد سوود و پاداشتی هەبووایە، ئەگەر حەزی بەشتێك نەبوایە، لەڕوومەتیدا دەبینرا، قسە زبر و پیس و هاوارکەر نەبوو، پێکەنینەکانی بەزۆری زەردەخەنە بوو، بەڵکو هەمووی بزە بوو، کۆتایی پێکەینینی دەرکەوتنی ددانی ژێریی بوو.

گریانەکانیشی وەك پێکەنینەکانی بوو، بانگی لێ بەرز نەدەبوویەوە و ناڵەی نەبوو هەروەك چۆن لەپێکەنیندا قاقای نەبوو، بەڵام ئەوەندە فرمێسك لەچاوی دەهاتە خوار، زەوی بەردەمی تەڕ دەبوو، لەسنگیدا گڤە و نرکە دەهات.

هەندێجار گریانی بۆ سۆز و بەزەیی بوو بۆ مردوویەك، هەندێجار بۆ ترس و سۆز بۆ ئوممەتەکەی، هەندێجاریش لەبەر ترسی خوا و هەندێجاریش لەکاتی گوێگرتن لەقورئان دەگریا، گریانی تامەزرۆیی و خۆشویستن و بەرزڕاگرتن بوو لەگەڵ ترسدا، کە ئیبراهیمی کوڕی مرد، چاوەکانی پڕ فرمێسك بوو وەك بەزەییەك بۆی گریا و فەرمووی: "تَدْمَعُ الْعَيْنُ وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَا يَرْضَى رَبُّنَا، وَ إِنَّا بِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ"[1]،واتا: چاو فرمێسك ئەڕێژێ و دڵ خەفەتبار ئەبێ، تەنیا ئەوە ئەڵێین کە خوا پێی رازییە، ئێمە بۆ لەدەستدانی تۆ خەفەتبارین ئەی ئیبراهیم.

هەندێجار لەشەونوێژدا دەگریا.

## ٣٩- ڕەوشت و نمونەی وتارەکانی

لەسەر زەوی، لەسەر مینبەر، لەسەر وشتر وتاری داوە، کە وتاری دەدا چاوی سوور دەبوویەوە و دەنگی بەرز دەکردەوە و تووڕەیی زیاتر دەبوو، وەك ئەوەی هۆشداریی بدات لەهاتنی سوپایەك و بڵێ: "صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ"[2] ،واتا:ئەو سوپا گەورەیە لەبەیانی یان ئێوارە ئەگاتە لاتان. ئەیفەرموو: "بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ"[3]،واتا: من رەوانەکراوم و هاتنی من و قیامەت وەك ئەم دوو پەنجەیە وەهاین. ئاماژەی دەکردە پەنجەی دۆشاومژە و پەنجەی ناوەڕاست(زەڕنەقوتە) و ئەیفەرمو: " أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ"[4]،واتا:پاشان،بزانن باشترین و چاکترین باس و گێڕانەوەیەك بریتییە لەقورئان، باشترین رێنمایی و رێنیشاندەرییەکیش بریتییە

---

[1] - بوخاری(١٣٠٣) و موسلیم(٢٣١٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٦٧).

[3] - بوخاری(٦٥٠٤) و موسلیم(٢٩٥١) ئیخراجیان کردووە.

[4] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٦٧).

لەهیدایەتی موحەممەد، خراپترینی کاروبارەکان بریتییە لەشتە داهێنراوەکان، هەموو داهێنراوێکیش(بیدعەیەك)،گومڕاییە.

هەر وتارێکی دابیٚ،بە(الحمد لله) سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەستپێکردووە، بەڕاوەستانیشەوە وتاری دەدا، بەداوای لێخۆشبوون(استغفر الله) کۆتایی پێدەهێنا و زۆرجار بەقورئان وتاری دەدا. چەقی وتارەکەی لەسەر ستایشی خوای گەورە و وەسفی کەمالی خوای گەورە بوو، هەروەها فێرکردنی ڕێنماییەکانی ئیسلام و باسی بەهەشت و دۆزەخ و قیامەت و فرمان کردن بەلەخواترسان و روونکردنەوەی سەرچاوەکانیٚ تووڕەبوون و رازیکردنی خوای گەورە. هەرچکاتیٚ پێویستیی خەڵك هەبووایە بۆ وتار و بەرژەوەندییەکانیان، وتاری دەدا.

مینبەرەکەی سیٚ پایە(پلیکانە)ی هەبوو، کە لەسەری رادەوەستا و رووی دەکردە خەڵك، بانگبێژ تەنیا بانگی دەخوێند، نە پێشتر و نە دواتر هیچی نەدەوت، کە دەستیدەکردە خوێندنەوەی وتار، نە بانگبێژ و نە هیچ کەسێکی تر بەوتنی هیچ شتێك دەنگیان بەرز نەدەکردەوە.

هەموو وتارەکانی بەستایشی خوا و وتنی وشەی شایەتومان دەستپێدەکرد، بەناوی خۆی ناوی خۆی دەهێنا، لێیەوە سەلماوە فەرموویەتی:"كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيهَا تَشَهُّدٌ فَهِيَ كَالْيَدِ الْجَذْمَاءِ"[1]،واتا:هەر وتارێك شایەتومانی تێدا نەبیٚ، وەك دەستی بۆگەن و گەنیوە.

ئەگەر لەکاتی وتارەکەیدا ڕێگرییەك دروست ببوایە و ناچار بەپچڕاندنی وتارەکە ببووایە، کارەکەی تەواو دەکرد و دەگەڕایەوە سەر وتارەکەی، جارێکیان وتاری دەدا و حەسەن و حوسەین هاتن دوو سوریان لەبەردا بوون و دەکەوتن، قسەکەی بڕی و دابەزی و هەردووکیانی هەڵگرت پاشان گەڕایەوە سەر مینبەر و پاشان

[1] – ئەبو داوود(٤٨٤١) و ترمیزی(١١٠٦) ئیخراجیان کردووە.

فەرمووی: "صَدَقَ اللهُ العَظيمُ" خوا راستی فەرموو، ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ ﴾ **التغابن: ١٥** واتا: بێگومان سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵتان هۆی تاقیکردنەوەتانن لەکاتێکدا خوا پاداشتی زۆر گەورەی لەلایە.
ئەم دووانەم بینی لەنێو قەمیسەکەیاندا دەکەوتن، خۆمم پێ رانەگیرا هەتا ئەوەی قسەکەمم بڕی و هەڵمگرتن"[١].

هەندێجار وتارەکەی کورت دەکردەوە و هەندێجاریش درێژی دەکردەوە، ئەوەش بەپێی پێویستیی خەڵك بوو، وتارەکانی کاتی پێویستی زیاتر بوو لەوتارە رەواتبەکان.

لەجەژنەکاندا بەتەنیا وتاری بۆ ژنان دەدا و هانی دەدان بۆ خێر و سەدەقەکردن، خواش زاناترە.

[١]- ئەبو داوود(١١٠٩) و ترمیزی(٣٧٧٤) ئیخراجیان کردووە.

## بەشی دووەم

# کۆمەڵە بەشێک لەبابەت ڕەوشت و ڕێنماییەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەپەرستشەکاندا

## یەکەم: تەهارەت

### ١- ڕێنیشاندەریی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لە دەستنوێژ شۆردندا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەزۆری بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەشۆرد، هەندێجاریش بەیەك دەستنوێژ هەموو نوێژەکانی ئەنجام داوە، هەندێجار بەمودیّ[١] ئاو دەستنوێژی شۆردووە و هەندێجار بەدوو لەسەر سێی مودێك و هەندێجاریش بەزیاتر لەمودێك دەستنوێژی شۆردووە.

دروست لێیەوە هاتووە کە یەکجار ئەندامێکی جەستەی شۆردووە لەدەستنوێژدا، هەندێکی دووجار دووجار، هەندێجاریش یەکێکیان دووجار و یەکێکی تریان سیّ جار بووە.

ئاوی لەدەم و لووتی وەردەدا، یەکجار و هەندێجار دووجار و هەندێجار سیّ جار، هەندێجار ئەو ئاوەی کە لەدەمی وەردەدا، بەشی لووتیشی لیّ دەهێشتەوە، لەفەرموودەی دروستدا هیچ فەرموودەیەك نەهاتووە کە ماوەی خستبێتە نێوان ئاو وەردان لەدەم و لووت.

بەدەستی ڕاستی ئاوی لیّ وەردەدا و بەدەستی چەپی لووتی پاك دەکردەوە، هەموو سەری مەسح دەکرد، هەندێجار بەدەستی رووی سەری مەسح دەکرد تاوەکو پشتەسەری، لەوەدایە تێبینی دەکرێت لەوەی ئەڵیّ: دووجار مەسحی سەری

[١] - مودیّ ئەکاتە ٦٢٨ملیلیتر، چنگی پیاوێکی مامناوەند ئەکات.

کردووە. دروست ئەوەیە مەسحی سەری دووبارە نەکردووەتەوە، تەنیا یەك جار بووە.

لەیەك فەرموودەشدا بەدروست نەهاتووە کە هەندێ لەسەری مەسح کردبێ، بەڵکو ئەگەر پێشە سەری مەسح کردبێ، ئەوی تری لەسەر مێزەرەکەیەوە تەواو کردووە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) هەر دەستنوێژێکی شۆردبێ، ئاوی لەدەم و لووتی وەرداوە، بۆ یەکجاریش بێ ئەوەی واز لێ نەهێناوە و نەیکردبێ. دەستنوێژەکەی رێك و یەك لەدوای یەك بووە، هەرگیز بۆ یەکجاریش بێ ئەو ریزبەندییەی تێك نەداوە.

هەندێجار لەسەر سەری مەسحی کردووە، هەندێجار مەسحی مێزەرەکەی کردووە، هەندێجاریش پێشەسەر و مێزەرەکەی، بەڵام ئەوەی تەنیا پێشەسەری مەسح کردبێ، ئەوە شتی لەو جۆرەی لێیەوە نەهاتووە.

هەردوو قاچی دەشۆرد ئەگەر خوف و گۆرەوەییان لەپێ نەکرابێ، ئەگەر خوف(یان گۆرەوەی)لەپێدا بووایە تەنیا مەسحی لەسەریان دەکرد.

لەگەڵ ئاوی مەسحی سەریدا گوێی مەسح دەکرد، رووی دەرەوە و ناوەوەی مەسح دەکرد، لێیەوە نەسەلماوە بەئاوێکی نوێ مەسحی گوێی کردبێ، بەڵکو بەدروست ئەوە لەئیبن عومەرەوە هاتووە.

بەدروست لەهیچ فەرموودەیەکدا نەهاتووە گەردنی مەسح کردبێ، نەسەلماوە بەجگە لە(بسم الله) وتن، لەدەستنوێژدا هیچ شتێکی تری فەرمووبێ، هەموو ئەوەی لەبابەت ئەزکار و ویردی دەستنوێژدا هاتووە، درۆیە و هەڵبەستراوە و پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) ئەوانەی نەوتووە و ئوممەتەکەشی فێر نەکردووە.

سەلماوە لەسەرەتای دەستنوێژدا(بسم اللە)ی کردووە و لەکۆتاییشدا فەرمویەتی:"أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ"[1].

نە خۆی و نە هاوەڵێکی لەسەرەتای دەستنوێژدا نەیانفەرمووە: نويت رفع الحدث ولا استباحة الصلاة، بەیەك پیت ئەوەی لێ نەسەلماوە نە لەسەنەدێکی راست و نە لەسەنەدێکی لاوازیشدا.

لەسێجار زیاتر شوێنێکی نەشۆردووە، نەش سەلماوە کە ماوەی خستبێتە نێوان ئانیشك و پاژنە پێیەوە.

پەیامبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) نەریتی نەبووە لەدوای دەستنوێژگرتندا ئەندامەکانی دەستنوێژی،ئەندامەکانی وشك کردبێتەوە، بەهیچ فەرموودەیەك ئەوەی لێ نەسەلماوە، بەڵکو پێچەوانەی ئەوە هاتووە.

لەڕێنیشاندەریی پەیامبەر(صلی اللە علیە وسلم) نەبووە لەهەر دەستنوێژێکدا ئاوی بەسەردا برێژرێ، بەڵکو هەندێجار بەخۆی ئەوەی کردووە، هەندێجاریش لەبەر پێویستی، کەسی تر هەبووە هاوکاریی کردووە لەوەدا.

هەندێجار دەستی بەنێو ریشیدا هێناوە، بەڵام لەوەدا بەردەوام نەبووە، پێشەوایانی فەرموودە لەوەدا جیاوازن، لەپەنجە خستنە نێو پەنجەکانی دەست و پێیشەوە بەردەوام نەبووە.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٣٤).

## ٢- ڕێنیشاندەریی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەمەسحی سەر خوف

دروست لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ەوە هاتووە لەمەدینە و لەسەفەریشدا مەسحی کردووە، هەتاوەکو کۆچی دوایی کرد، ئەوە نەسخ نەبووەتەوە، ڕۆژ و شەوێکی بۆ کەسێك داناوە کە لەشار و شوێنی خۆیدایە، سێ ڕۆژ و شەویش بۆ ڕێبوار، ئەوە لەهەندێ فەرموودەی سەحیح و حەسەنیشدا سەلماوە. ڕووی خوفەکەی مەسح دەکرد، تەنیا لەیەك فەرموودەی مونقەتیعدا هاتووە کە ژێر خوفەکەی مەسح کردووە، ئەگینا لەفەرموودە دروستەکاندا پێچەوانەیە و تەنیا ڕووی سەرەوەی مەسح کردووە.

لەسەر گۆرەوی و نەعلیش مەسحی کردووە، لەسەر مێزەریش مەسحی کردووە لەگەڵ تەوێڵیدا، لێیەوە سەلماوە لەچەند فەرموودەیەکدا کە خۆی ئەنجامی داوە و فەرمانیشی داوە ئەنجام بدرێت.

حاڵەتی پێی چۆن بووە، ئاوەهای کردووە و زۆری لەخۆی نەکردووە، خوف لەپێدا بووبێ مەسحی لەسەر کردووە و داینەکەندوون، کە هیچی لەپێدا نەبووبێ، هەردوو پێی شۆردووە، خوفی لەپێ نەکردووە تاوەکو مەسحیان لەسەر بکات، ئەمە مامناوەند و دروسترین بۆچوونە لەبابەت ئەوەی کامەیان باشترە، مەسح یان شۆردن، مامۆستاکەمان ئەمەی وتووە[١]، خواش زاناترە.

## ٣- ڕێنیشاندەریی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەتەیەموم کردندا

بەیەك لێدان لەزەوی، تەیەمومی بۆ ڕوومەت و هەردوو دەستی کردووە، لێیەوە نەهاتووە دوو لێدانی زەوی کردبێ یان هەتا مەچەکی تەیەموم کردبێ. تەیەمومی کردووە بەو زەوییەی نوێژی لەسەر کردووە، جا شوێنەکە خۆڵ بووبێ یان شوێنی

---

[١]- الفتاوی الکبری لابن تیمیة٥/٣٠٤.

شۆرەكات(شوێنی خوێدار) یان چەو و لم، دروست لێیەوە هاتووە فەرموویەتی: "حيثما أَدْرَكَتْ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي الصَّلاةُ فَعِنْدَهُ مَسْجِدُهُ وَطَهُورُهُ"[1]،واتا: هەر كەسێك لەئوممەتەكەم گەیشتە كاتی نوێژ، ئەو شوێنە بۆی دەبێتە مزگەوت و تەهارەت (دەستنوێژ).

ئەو دەقە روون و راشكاوانەیە كە هەركەسێك لەنێو لمدا بوو كاتی نوێژ هات، ئەو لمە بۆی دەبێتە دەستنوێژ.

لێیەوە بەدروست نەهاتووە كە بۆ هەموو نوێژێك تەیەمومی كردبێ یان فەرمانی لەو جۆرەی دابێ، بەڵكو حوكمی دەستنوێژی پێ داوە، بۆیە ئەو حوكمەی هەیە تەنیا ئەو كاتە نەبێ كە بەڵگەی پێچەوانەی هەبێ.

---

[1] - ئەحمەد ئیخراجی كردووە٣٦٠/ ٤٥١(٢٢١٣٧).

## دووەم: بەشی نوێژ

### ١- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەنوێژدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە هەڵدەستا بۆ نوێژ، دەیفەرموو(الله أكبرُ)[١]، لەپێش ئەوە هیچی نەدەفەرموو،بەزمان نییەتی نەدەهێنا. دەستی بەرز دەکردەوە و پەنجەکانیشی لەگەڵیدا درێژ دەکرد ڕووەو قیبلە بۆ لای گوێی. گێڕدراوەتەوە: بۆ لای شانی، پاشان دەستی ڕاستی ئەخستەسەر پشتی دەستی چەپی.

هەندێ جار نوێژەکەی دەستپێدەکرد بەم ویردە:«اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ»[٢]،واتا:خوایە گیان نێوان خۆم و تاوانەکانم لەیەك دووربخەرەوە هەروەك نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوات لەیەك جیاکردووەتەوە، هەڵە و تاوانەکانم بشۆرەوە بەئاو و بەفرەو تەرزە، خوایە گیان لەهەڵە و تاوانەکانم پاك بکەرەوە هەروەك چۆن بەرگی سپی لەپیسیی پاك دەکرێتەوە.

هەندێجاری تریش ئەیفەرموو:«وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعَهَا، إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الْأَخْلَاقِ لَا يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلَّا أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَ الْأَخْلَاقِ لَا يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلَّا أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ كُلُّهُ بِيَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ، أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ»[٣]،واتا:ڕوومکردە

---

[١] - بوخاری(٧٣٨) و موسلیم(٣٩٠) ئیخراجیان کردووە.

[٢] - بوخاری(٧٤٤) و موسلیم(٥٩٨) ئیخراجیان کردووە.

[٣] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٧١).

ئاراستەی ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەویی داهێناوە، یەکتاپەرست و موسڵمانم و هاوبەش پەیداکەر نیم، نوێژو خواپەرستی و ژیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، هیچ هاوبەشێکی نییە و هەر بەوەش فرمانم پێ کراوە و من یەکەمینی موسڵمانانم، خوایە گیان تۆ پادشا و بەدەسەلاتی، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە ئیللا تۆ نەبی، تۆ پەروەردگاری منی و منیش بەندەی تۆم، ستەمم لەخۆم کرد و دان بەتاوانی خۆمدا دەنێم، کەوابوو لەهەموو هەڵەکانم خۆش بە، هیچ کەسێ لەتاوانەکان خۆش نابێ تەنیا تۆ نەبی، رێنماییم بکە بۆ باشترین و جوانترین رەوشت، کەس رێنمایی ئەوە ناکات تەنیا تۆ نەبێ، رەوشتە ناشیرینەکانم لێ دووربخەرەوە، هیچ کەسێ لێمی دوورناخاتەوە تەنیا تۆ نەبی، لبیك(گەورەیی و شکۆداریی بۆ تۆ)، هەموو خێر و خۆشییەك لەدەست تۆیە، هەموو خراپەیەك لای تۆوە بڕیار دەدرێت،من پەنا بە تۆ دەگرم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە،پاك و مەزنیی بۆ تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و بەتەوبە و پەشیمانییەوە دەگەڕێمەوە لای تۆ.

بەلاَم ئەوە پارێزراوە، کە ئەم ویردەی لەشەونوێژدا خوێندووە.

جاری وەهاش هەبوو ئەیفەرموو:«اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرَائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ»[1]،واتا:خوایە گیان، ئەی پەروەردگاری جبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل، داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای نادیار و دیار، تۆ لەنێوان بەندەکانتدا بڕیار دەدەی لەسەر ئەوەی تیایدا جیاوازن، رێنیشاندەریيم بکە بۆ ئەو حەقەی ئەوان تیایدا جیاوازن و بەمۆڵەتی خۆت ئەو حەقەم پیشان بدە، ئەوە تۆی کێت بووێ، رێنیشاندەریی دەکەی بۆ رێگەی راست.

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٧٠).

جاری وەهاش هەبوو ئەیفەرموو:«اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ....» [1]،واتا:خوایە گیان هەموو سوپاسێك شایستەیە بە خۆت، تۆ رووناکیی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی کە تیایدان...

دوای ئەوە ئەیفەرموو:"أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ"، پاشان سورەتی فاتیحای دەخوێند و هەندێجار بەدەنگ"بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ"ی دەخوێند، زۆر جاریش بەبێ دەنگ.

خوێندنەوەکانی درێژ بوون، لەسەرەتای هەموو ئایەتێك دەوەستا و دەنگی درێژ دەکردەوە. کە لەسورەتی فاتیحا دەبوویەوە ئەیفەرموو:"آمِينَ"[2]، ئەگەر خوێندنەوە کە بەدەنگ بووایە،"آمِينَ"ەکەی بەرزتر دەخوێند و ئەوانەی دواتریشی بەدەنگ ئەیانوتەوە بەدوایدا.

دوو وەستانی کەمی(سەکتە)ی هەبوو، دانەیەکی لەنێوان تەکبیر و خوێندنەوەدا، ئەبو هورەیرە لەوەدا پرسیاری لێکردووە[3]،لەبارەی دووەمەوە جیاوازیی هەیە، گێڕدراوەتەوە کە لەدوای فاتیحا بووە، وتراوە: دوای خوێندووە و پێش رکوع بووە. وتراوە: لەدوای سەکتەی یەکەم، دووانی تریش هەبووە، واتا سێ وەستانی کەم بووە، بەڵام ئەوەی دیارە تەنیا دووان بووە، سێیەم زۆر لەسەر خۆ بووە و بۆ هەناسە وەرگرتن بووە، خوێندنەوە و رکوعی یەکسەر بەیەك نەگەیاندووە، پێچەوانەی کەمە وەستانی یەکەم کە بەئەندازەی ویردی ئیستیفتاح بووە. بۆ دووەمیش وتراوە: بۆ ئەوە بوو نوێژخوێنانی دوای خۆی، خوێندنەوەی خۆیان بکەن.

---

[1] - بوخاری(١١٢٠) و موسلیم(٧٦٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٧٨٢) و موسلیم(٤١٠) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(٧٤٤) و موسلیم(٥٩٨) ئیخراجیان کردووە.

که لەفاتیحا دەبوویەوە، دەستی دەکردە خوێندنەوەی سورەتێکی تر، هەندێجار خوێندنەوەکەی درێژ دەکردەوە و هەندێ جاریش کەمی دەکردەوە بەهۆی سەفەرێك یان کارێکەوە، هەندێجاریش مامناوەند بوو.

لەنوێژی بەیانییدا نزیکەی شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند، سورەتی(ق) و بەسورەتی(الروم) و ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ﴾و، ﴿ إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴾ و ، لەسەفەردا بووە مەعوزەتینی خوێندووە لەنوێژی بەیانییدا، بەسورەتی(المؤمنین) دەستیپێکردووە تاوەکو لەڕکاتی یەکەمدا گەیشتووەتە باسی موسا و هارون و تووشی کۆکە بووە بەهۆیەوە چووەتە رکوع.

نوێژی بەیانیی رۆژی جومعەی بەسورەتی سەجدە و سورەتی(الإنسان) خوێندووە، هەردووکی بەتەواوەتیی خوێندووە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەردوو سورەتی خوێندووە لەبەر ئەوەی بنەمای دروستبوونی گەردوون و قیامەت و دروستبوونی ئادەم و چوونە بەهەشت و دۆزەخی لەخۆیاندا هەلگرتووە، ئەوانەش لەڕۆژی جومعەدا بوونە و دەبن، لەبەیانیی ئەو رۆژەدا خوێندوونی کە یادکردنەوە و بەبیرهێنانەوەی ئوممەتە بۆ رووداوەکانی ئەو رۆژە، هەروەك لەگردبوونەوە گەورەکانی نمونەی جەژنەکان و رۆژی جومعەدا سورەتی(ق) و (اقتربت) و (سبح) و (الغاشیة)ی دەخوێند.

سەبارەت بەنوێژی نیوەڕۆ، هەندێجار درێژی دەکردەوە، هەتا ئەوەی ئەبو سەعید ئەڵێ: نوێژی نیوەڕۆ دەبەسترا، رێبوار دەیتوانی بچێتە بەقیع و پێویستیی خۆی جێبەجێ بکات و بگەڕێتەوە ماڵ و دەستنوێژی بشۆردایە و لەڕکاتی یەکەمدا بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بگەیشتبایە بەوەی، ئەوەندەی درێژ دەکردەوە[1].

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٥٤).

هەندێجار لەنیوەڕۆدا بەئەندازە سورەتی سەجدە و سورەتی(الأعلى) و سورەتی (الليل) و سورەتی البروج و سورەتی(الطارق)ی دەخوێند.

سەبارەت بەنوێژی عەسر، ئەوە لەنوێژی درێژیدا نیوەی نوێژی نیوەڕۆی دەخوێند، بەئەندازەی نیوەڕۆش لەکورتکردنەوەدا.

سەبارەت بەمەغریب، ئەوە ڕێنیشاندەریی و نوێژی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێچەوانەی کاری ئەمڕۆی خەڵك بووە، هەندێجار سورەتی(الأعراف)ی تیادا خوێندووە لەدوو ڕکاتدا و هەندێجاریش(الطور) و هەندێجاریش(المرسلات)، بۆیە ئەوەندەی بەبەردەوامیی سورەت و ئایەتە کورتەکان لەمەغریبدا بخوێندرێت، پێچەوانەی سووننەتە.

سەبارەت بەنوێژی عیشا، ئەوە تیایدا(التِّين والزيتون)ی خوێندووە، بۆ موعاز لەو نوێژەدا(الشمس) و (الأعلى) و (الليل)ی خوێندووە، ئینکاری کردووە بۆ موعاز سورەتی(البقرة)ی تێدا بخوێنێت کاتێ لەگەڵیدا بووە موعاز خوێندوویەتی،پاشان موعاز ڕۆیشت بۆلای بەنی عەمر و هەمان شتی بۆیان دووبارە کردەوە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"فَتَّانٌ أَنْتَ يَا معاذ"[1]،واتا: ئەی موعاز ئەرێ تۆ خەڵکیی بەفیتنەدا دەبەی؟

ئیتر خەڵکێك هەیە هەمیشە دەنووك لەم فەرمایشتە دەدەن و لاناکەنەوە بەملا و بەولایدا.

سەبارەت بەنوێژی جومعە، ئەوە تیایدا بەتەواوەتیی هەردوو سورەتی(الجمعة) و (المنافقين)ی دەخوێند، هەروەها هەردوو سورەتی(سبح) و (الغاشية).

سەبارەت بەخوێندنەوەی لەجەژنەکان، ئەوە هەندێجار هەردوو سورەتی(ق) و (اقتربت)ی بەتەواوەتیی دەخوێند، هەندێجاریش سورەتی(سبح) و (الغاشية)، ئەوە

[1]- بوخاری(٧٠٥) و موسلیم(٤٦٥) ئیخراجیان کردووە.

ڕێنیشاندەریی و ڕێنمایی پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) کە تاوەکو بەپەروەردگار گەیشتەوە، لەسەری بەردەوام بوو، بەهیچ شتێکی تر هەڵینەوەشاندەوە.

سەبارەت بەفەرمایشتی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم):«أَيُّكُمْ أَمَّ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ»[1]،واتا:هەریەکێ لەئێوە پێشنوێژیی بۆ خەڵك کرد، با کەمی بکاتەوە و درێژی نەکاتەوە. یان وتەی ئەنەس(خوای لێ ڕازیی بێ):"پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ماوەی نوێژەکەی کەمترین بوو بەشێوەی تەواویش ئەنجامی دەدا"، کەمکردنەوە و سووك وەرگرتن کارێکی ڕێژەییە، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)لەسەری بەردەوام بووە، بەردەوامبوونەکەشی لەبەر حەزی ئەوانە نەبوو لەپشتییەوە نوێژیان دەکرد، نە، ئەوە ڕێنیشاندەریی خۆی بوو بەردەوامیی لەسەر دەکرد، بڕیاردەر بوو لەهەموو ئەو شتانەی کەسانی تر تیایدا ناکۆك بوون.

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەنوێژەکاندا سورەتێکی تایبەت نەدەکرد هەر ئەوە بخوێنێتەوە جگە لەهەینی و دوو جەژنەکە.

لەڕینیشاندەری و هیدایەتی ئەودا ئەوە بوو سورەتێکی تەواوی دەخوێند، هەندێجار لەدوو ڕکاتدا سورەتێکی دەخوێند، هەندێجار سەرەتای سورەتەکەی خوێندووەتەوە، لێیەوە نەهاتووە کۆتایی یان ناوەڕاستی سورەتێکی خوێندبێتەوە، لەنوێژی سوونەتی نافیلەدا رووی داوە لەڕکاتێکدا دوو سورەتی خوێندووە، بەڵام نەهاتووە لەنوێژی فەرزدا ئەوەی کردبێ، بەدەگمەن رووی داوە لەدوو ڕکاتدا پێکەوە یەك سورەتی خوێندبێتەوە.

---

[1]– بوخاری(٩٠) و موسلیم(٤٦٦) ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەنوێژی بەیانییدا رکاتی یەکەمی درێژتربوو لەرکاتی دووەم، لەهەر نوێژێکی تریشدا، رەنگە رکاتی یەکەمی درێژکردبێتەوە هەتا ئەوەی گوێی لەدەنگی پێی کەسێك نەبووایە دێت بۆ نوێژ.

زیاتر لەنوێژەکانی تر، نوێژی بەیانی زیاتر درێژ دەکردەوە، چونکە نوێژی بەیانی هەمیشە بینراوە لەلایەن فریشتەکانی شەو و رۆژەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی رکاتەکانی کەمترە، ئەوە درێژکردنەوەی بووەتە قەرەبووی ئەو کەمکردنەوەیە، هەروەها دوای خەو ئەنجام دەدرێت و خەڵك ئەوکات پشوویان وەرگرتووە، هەروەها جارێ سەرقاڵی کار و کەسابەت و هۆکارەکانی دونیا نەبوونە، لەکاتێکدایە مرۆڤ دڵ و گوێ و زمانی ماندوو نەبووە، بۆیە دەتوانێ لەقورئان تێبگات و تێبفکرێ، هەروەها بناغە و سەرەتای کارە، بۆیە گرنگیدانێکی زیاتر و درێژکردنەوەیەکی پێ دراوە، ئەوەش کۆمەڵە نهێنییەکە تەنیا ئەوانە لێی تێدەگەن کە لاکردنەوەیان هەیە بەلای نهێنی و مەبەست و حیکمەتەکانی شەریعەت، خواش پشت و پەنایە.

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) کە لەخوێندنەوە دەبوویەوە، بۆ ماوەیەکی هەناسەدان بێدەنگ دەبوو، پاشان دەستی بەرزدەکردەوە وەك پێشوو، لەرکوعدا الله أکبری دەکرد و هەردوو دەستی ئەخستەسەر ئەژنۆی توند دەیگرتن، پشتی تەخت ئەکرد و سەری بەرز نەدەکردەوە و خواریشی نەدەکردەوە، وەك پشتی راست دەیگرت، ئەیفەرموو:"سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ"[1]هەندێجاریش لەگەڵ ئەوەدا یان بەتەنیا دەیفەرموو:"سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي"[2]بەنەریت رکوعەکانی ئەندازەی دە تەسبیحات دەبوون، سجودەکانیشی هەر بەو ئەندازەیە بوو.

هەرچی فەرموودەکەی بەرائی کوڕی عازبە(خوای لێ رازی بێ) کە ئەڵێ: ((لەپشت پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) نوێژم کرد، قیام و رکوع و وەستان و دانیشتنی

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٧٢).

[2] - بوخاری(٧٩٤) و موسلیم(٤٨٤) ئیخراجیان کردووە.

نێوان هەردوو تەحیات نزیك بەیەك بوو))[1]،خواش زانایە مەبەستی بەراء ئەوەیە، نوێژی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) مامناوەند بووە، كە قیامی درێژبكردبایەتەوە، ركوع و سجودیشی درێژ دەكردەوە، بەلأم هەندێجار تەنیا لەشەونوێژدا ئەوەی دەكرد، نزیك بەوە لەنوێژی خۆرگیرانیشدا ئەنجامی دەدا. بەزۆری نوێژی مامناوەند و گونجاو بوو.

هەروەها لەركوعدا ئەیفەرموو:"سُبُّوح قُدُّوسٌ رَبُّ الملائكةِ والرُّوح"[2]،هەندێجاریش ئەیفەرموو:"اللهمَّ لك ركعتُ، وبِكَ آمَنْتُ، ولكَ أسلمتُ، خَشَعَ لك سمعي وبَصَري ومُخِّي وعظمي وعَصَبي"[3]،ئەمانە تەنیا لەشەونوێژدا پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بینراوە.

پاشان سەری بەرز دەكردەوە و ئەیفەرموو:"سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه"دەستی بەرز دەكردەوە، لێیەوە گێڕدراوەتەوە كە لەسێ شوێندا بەنزیكەی سی هەناسە دەستی بەرزكردووەتەوە، لەسەر گێڕانەوەی یەكدەنگیی هەیە، بەهیچ شتێك پێچەوانەی ئەوە نەسەلماوە، بەڵكو ئەوە رێنمایی ئازیز بووە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) هەتاوەكو دونیای بەجێهیشتووە.

پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە لەنێوان هەردوو سجوددا پشتی بەرزدەكردەوە، رێك و راست پشتی رادەگرت، ئەیفەرموو:" لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ لَا يُقِيمُ فِيهَا الرَّجُلُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ"،واتا: نوێژی كەسێ قبوڵ نییە لەنێوان ركوع و سجوددا پشتی راست رانەگرێت. ئیبن خوزەیمە لەسەحیحەكەیدا باسی كردووە[4].

كە رادەوەستا ئەیفەرموو:"ربَّنا ولك الحمدُ"[5]، هەندێجار"ربَّنا لك الحمدُ"[1]، رەنگە

---

[1]- بوخاری(٧٩٢) و موسلیم(٤٧١) ئیخراجیان كردووە.

[2]- موسلیم ئیخراجی كردووە(٤٨٧).

[3]- موسلیم ئیخراجی كردووە(٧٧١).

[4]-صحیح ابن خزیمة١/٣٠٠(٥٩١)، هەروەها ئیخراج كراوەی لەلایەن ئەبو داوود(٨٥٥) و ترمیزی(٢٦٥) و نەسائی(١٠٢٧).

[5]- بوخاری(٦٨٩) و موسلیم(٤١١) ئیخراجیان كردووە.

هەندێجاریش فەرمووبێتی"اللهمَّ ربَّنا لك الحمدُ"[2]، هەموو ئەوانە دروست لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ەوە هاتوون.

یەکێك لەڕێنیشاندەرییەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)، درێژکردنەوەی ئەو روکنە بوو بەئەندازەی رکوع و سجود، دروست لێیەوە هاتووە ئەفەرمووێ:"سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ"[3].

دروست لەپەیامبەری ئازیزەوە هاتووە(صلى الله عليه وسلم):"لِربِّي الحمدُ، لِربِّي الحمدُ"[4] هەتا ئەندازەی رکوعێك.

دروست لێیەوە هاتووە کە هەرکاتێ لەڕکوع سەری بەرزدەکردەوە، ئەوەندە دەمایەوە هەتا ئەوەی هی وا هەبوو ئەیووت: لەبیری چووەوە، ئەوەش بەهۆی ئەوەی ئەوەندە ئەو روکنەی نوێژی درێژ دەکردەوە، موسلیم لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ) باسیکردووە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە دەیفەرموو"سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه"، هەڵدەستا هەتا ئەوەی ئەمانووت نوێژەکەی لەبیر چوویەوە، پاشان دەچووە سجود و لەنێوان هەردوو سوجدەدا دەمایەوە ئەمانوت:لەبیری چووەوە[5].

دروست لێیەوە هاتووە کە لەنوێژی خۆرگیراندا لەدوای رکوع، ئەو روکنەی نوێژی درێژکردووەتەوە و ماوەکەی نزیك بووە لەماوەی مانەوە لەڕکوع، رکوعیشی نزیك بووە لەهەڵسان(قیام)، ئەوە ئەو ڕێنیشاندەرییە روونەیە کە لەهیچ روویەکەوە پێچەوانەی نییە.

---

[1] - بوخاری(٧٢٢) و موسلیم(٤٠٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٧٩٦) و موسلیم(٤٠٩) ئیخراجیان کردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٧١).

[4] - ئەبو داوود(٨٧٤) و نەسائی(١٠٦٩) ئیخراجیان کردووە.

[5] - بوخاری(٨٢١) و موسلیم(٤٧٣) ئیخراجیان کردووە.

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)(الله أکبر)ی دەکرد و دەچووە سجود و دەستی بەرز نەدەکردەوە، لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە هەردوو دەستیشی بەرز کردووەتەوە، هەندێ لەحافیزانی فەرمووده نمونەی ئیبن حەزم(بەڕەحمەت بێ) تەسحیحی کردووە، بەڵام وەهمی کردووە و هیچ کات ئەوەی لێ بەدروست نەسەلماوە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەپێش ئەوەی دەستی بخاتە زەوی، ئەژنۆی ئەخستە زەوی، پاشان هەردوو دەستی دەخستە زەوی، پاشان تەوێڵی و لووتی، ئەوە ئەو گێڕانەوە راستەیە کە شەریك گێڕاویەتییەوە لەعاسیمی کوڕی کولەیبەوە ئەویش لەباوکییەوە لەوائیلی کوڕی حوجرەوە ئەڵێ: پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)م بینی کە سوجدەی دەبرد، لەپێش دەستی، ئەژنۆی دەخستە زەوی، کە هەڵدەستا، پێش ئەژنۆی دەستی بەرز دەکردەوە[1]. لەکرداریدا شتێك نەگێڕدراوەتەوە پێچەوانەی ئەوە بێ.

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسەر تەوێڵ و لووتی سوجدەی دەبرد لەخوار عەمامەکەی، لەفەرموودەی سەحیح و حەسەنیشدا نەسەلماوە لەسەر مێزەرەکەی سوجدەی بردبێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) زۆرجار لەسەر زەوی سوجدەی دەبرد، لەسەر ئاو و قوڕیش، لەسەر هەوێنی پەلکی دارخورما، لەسەر حەسیری لەدار خورما دروستکراو و لەسەر پێستی خۆشەکراویش سوجدەی بردووە.

کە سوجدەی دەبرد، تەوێڵ و لووتی لەزەوی دەدا، دەستەکانی بڵاو دەکردەوە هەتا ئەوەی سپیایی بن باڵی دەبینرا، ئەگەر کاوڕێکیش بیویستبایە دەیتوانی لەنێوان باڵەکانییەوە تێپەڕ ببێ.

---

[1] – ئەبو داوود(٨٣٨) و موسلیم(١٠٨٩) ئیخراجیان کردووە.

دەستی لەئاست گوێ و شان دادەنا، لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەبەرائەوە ئەڵێ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إذا سجدتَ فضعْ كفيك وارفعْ مِرفَقيك"[1]،واتا:ئەگەر سوجدەت برد، ناولەپت بخەرە زەوی و ئانیشکت بەرز بکەرەوە.

لەسوجدەدا رێك بوو، بەهەموو پەنجەکانی پێی رووی دەکردە قیبلە. ناولەپ و پەنجەکانی رادەخست، نە بۆشایی دەخستە نێوانیانەوە و نە هەمووی لەیەك توند دەکرد، لەسەحیحی ئیبن حیباندا[2] هاتووە: کە دەچووە رکوع، پەنجەکانی بلاّودەکردەوە، کە دەچووە سجود، پەنجەکانی ئەخستە پاڵ یەك.

ئەیفەرموو:"سبحان ربِّي الأعلَى"[3]، فرمانیشی کرد ئەوە بووترێت.

ئەیفەرموو:"سبحانك اللهمَّ ربَّنا وبحمدِك، اللهمَّ اغفر لي"[4]. ئەیفەرموو:"سُبُّوحٌ قُدُوسٌ ربُّ الملائكة والروحِ"[5]. هەروەها پەیامبەری ئازیز(صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو:"سبحانك وبحمدِكَ لا إله إلا أنت"[6].

ئەیفەرموو:"اللهمَّ إني أعوذُ برضاك من سخطك، وبمُعافاتك من عُقوبتِك، وأعوذُ بك منك، لا أُحصِي ثناءً عليك، أنتَ كما أثنيتَ على نفسِك"[7]،واتا: خوایە گیان بەڕازیبوونی خۆت پەنا دەگرم لەتوورەییت، بەلێبووردەیی و بەخشینت لەسزات، بەخۆت پەنا دەگرم لەخۆت، ستایش و پیاهەڵدانی تۆ لەژماردن نایەت، تۆ ئەوەی کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٩٤).

[2] - سەحیح ئیبن حیبان(١٩٢٠).

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٧٢).

[4] - بوخاری(٧٩٤) و موسلیم(٤٨٤) ئیخراجیان کردووە.

[5] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٨٧).

[6] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٨٥).

[7] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٨٦).

ئەیفەرموو: "اللهمَّ لك سجدتُ، وبك آمنتُ، ولك أسلمتُ، سَجَدَ وجهي للذي خلقَه وصوَّره وشقَّ سمعَه وبصَره، تبارك الله أحسنُ الخالقين"[1]،واتا: خوایە گیان من وا بۆ تۆ سوجدەم برد، باوەڕم بە تۆ هێنا و ملکەچی فرمانی تۆ بووم، ڕوومەتم سوجدەی برد بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە و وێنەی کێشاوە و بیستن و بینینی بۆ دروستکردووە، مەزنی و گەورەیی بۆ باشترین دروستکار و خالق.

ئەیفەرموو: "اللهمَّ اغفر لي ذنبي كُلَّه، دِقَّه وجِلَّه، وأوَّلَه وآخرَه، وعلانيتَه وسِرَّه"[2]،واتا: خوایە گیان لەتەواوی گوناهەکانم خۆش ببە، لەورد و درشت و سەرەتا و کۆتا و ئاشکرا و نهێنی، لەهەموو ئەو تاوانانەم خۆش ببە.

ئەیفەرموو: "اللَّهُمَّ اجْعَل فِي قلبِي نورا وَفِي سَمْعِي نورا وَفِي بَصرِي نورا وَفِي لساني نورا إِلَى قَوْله وَاجعَل لي نورا"[3]،واتا:خوایە گیان ڕووناکیی بخەرە دڵ و گوێ و بینین و ڕاست و چەپ و پێش و پاش و سەروو و خوارم، خوایە گیان ڕووناکییم پێ بدە.

فرمانی داوە لەسوجدەدا دوعای زۆر بکرێ و فەرمانی داوە: "إنه قَمِنٌ أن يُستجابَ لكم"[4]،واتا: کات و شوێنێکە لەپێشترە وەلامی پارانەوەکانتان بدرێتەوە.

قبوڵبوونی دوعا دوو جۆرە: قبوڵکردنی دوعای کەسەکە بەوەی داواکەی بێتەدی، هەروەها قبوڵکردنی دوعاکەی بەپاداشتدانەوەی لەسەر ئەو دوعایە، بەهەردوو جۆر ڕاڤەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە کراوە: ﴿أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ **البقرة: ١٨٦** ، واتا: گیرا دەکەم نزای نزاکاران هەرکاتێك هاوار و نزام لێ بکەن. دروست ئەوەیە، هەردوو جۆر لەخۆ دەگرێت.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٧١).

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٨٣).

[3] – بوخاری(٦٣١٦) و موسلیم(٧٦٣) ئیخراجیان کردووە.

[4] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٧٩).

خەڵکی جیاوازن لەبارەی قیام و سجودەوە ئاخۆ کامەیان باشترە؟ کۆمەڵێك لەبەر کۆمەڵە شتێك قیام بەباشتر دەزانن، کۆمەڵێکی تریش ئەڵێن: سجود باشترە. کۆمەڵێکی تریش ئەڵێن: لەشەودا درێژیی قیام باشترە، لەڕۆژیشدا زۆر رکوع و سجود بردن.

مامۆستاکەمان ئەڵێ: دروست ئەوەیە وەك یەکن، قیام بەقورئانخوێندنەکەیەوە باشترە، سجودیش بەهەیئە و دیمەنی سوجدە بردن، شێوەی باشترە لەشێوەی قیام، هەروەها زیکری قیام باشترە لەزیکری سجود، هەروەك لەنوێژی خۆرگیران و شەونوێژدا پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی داوە، کە قیامی کەم بکردایەتەوە، رکوع و سوجدیشی کەم دەکردەوە، لەفەرزەکانیشدا وەهای دەکرد[1].

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەوتنی(الله أكبر)ەوە سەری بەرز دەکردەوە بەبێ دەست بەرزکردنەوە، پێش دەست، سەری بەرز دەکردەوە، پاشان دادەنیشت و قاچی چەپی دەخستەژێر خۆی و لەسەری دادەنیشت و قاچی راستی رادەگرت، لەو شوێنەدا تەنیا ئەو جۆرەی لێ گێردراوەتەوە و سەلماوە.

دەستی دەخستەسەر رانی، ئانیشکی دەخستەسەر رانی و دەستی ئەخستەسەر ئەژنۆی، دوو پەنجەی توند دەکرد و ئەڵقەیەکی دروست دەکرد، پاشان پەنجەی بەرزدەکردەوە و دوعای پێ دەکرد و دەیجولاند، ئا بەو جۆرەی وتووە وائیلی کوڕی حوجر لەبارەی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ەوە[2].

پاشان ئەیفەرموو:"اللهمَّ اغفر لي وارحمني واجبُرني واهدِني وارزقنِي"[3]،واتا:خوایە گیان لێم خۆشببە و بەزەییت پێمدا بێتەوە و دڵم رابگرە و هیدایەتم بدە و رزقم بدە. ئیبن عەباس(خوای لێ رازیی بێ) ئاوەهای لێیەوە گێڕاوەتەوە(صلى الله عليه

---

[1]- مجموع الفتاوى لابن تيمية٢٣/٦٩-٨٣.

[2]- ئەبو داوود(٧٢٦) و نەسائی(٨٨٩) ئیخراجیان کردووە.

[3]- ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٨٤).

وسلم). حوزەیفە باس دەکات کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو: "ربِّ اغفر لي، ربِّ اغفر لي"[1]،واتا: خوایە گیان لێم خۆشبە. خوایە گیان لێم خۆشبە.

ڕێنیشاندەریی ئەو وەهابوو، بەئەندازەی ماوەی سوجدە، ئەو ڕوکنەی درێژ دەکردەوە، لەهەموو فەرموودەکاندا ئەوەی لێیەوە جێگیر بووە، لەسەحیحدا هاتووە لەئەنەسەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەنێوان هەردوو سوجدەدا دادەنیشت هەتا ئەوەی ئەمانووت: بیری چووەتەوە لەنوێژدایە[2].

لەدوای نەمانی هاوەڵان، ئەم سووننەتە زۆربەی خەڵك وازیان لێهێناوە، لەبەر ئەوەیە سابت وتوویەتی: ئەنەس شتانێکی دەکرد نابینم ئێوە ئەنجامی بدەن: لەنێوان دوو سوجدەکەدا ئەوەندە دەمایەوە ئەمانوت: بیری چووەتەوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەسەر پێشی قاچ و ئەژنۆی هەڵدەستایەوە بەخۆ دان بەسەر ڕاندا، هەروەك وائیل و ئەبو هورەیرە باسیان کردووە، لەسەر زەوی پشتی بەهەردوو دەستی نەدەبەست بۆ هەڵسانەوە، مالیکی کوڕی ئەلحوەیرس لێیەوە باس دەکات کە هەڵنەدەستایەوە تاوەکو لەدانیشتندا ڕێك نەبووایەتەوە، ئا ئەوەیە پێی دەوترێت دانیشتنی پشوودان(جلسة الاستراحة)، شەرعناسان لەوەدا جیاوازن: ئاخۆ ئەوە یەکێکە لەسووننەتەکانی نوێژ و سووننەتە هەموو کەسێ ئەنجامی بدات، یان بەشێك نییە لەسووننەتەکان، بەڵکو هەرکەسێ پێویستی بوو ئەنجامی بدات؟ ئەوەش بەپشت بەستن بەدوو بۆچوون کە دوو گێڕانەوەیە لەئەحمەدەوە(بەڕەحمەت بێ).

کە هەڵدەستایەوە دەستی دەکرد بەخوێندنەوە، وەستانێکی نەدەکرد وەك ئەوەی لەڕکاتی یەکەمی دەستپێکردنی نوێژدا ئەنجامی دەدا، شەرعناسان جیاوازن، ئاخۆ ئەوە لەشوێنی(أعوذُ

---

[1] – ئەبو داوود(٨٧٤) و نەسائی(١١٤٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٨٢١) و موسلیم(٤٧٣) ئیخراجیان کردووە.

باللە من الشیطانِ الرجیم)ە یان نە، ئەوە دوای ئەوەی یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە لەشوێنی(استفتاح)ی نوێژدا نییە، لەوەدا بوونەتە دوو بۆچوونەوە و دوو گێڕانەوەیە لەئەحمەدەوە، هەندێ لەقوتابییەکانی دەیکەنە ئەوەی ئایە خوێندنی نوێژ یەك خوێندنە کە یەك(أعوذُ باللە من الشیطانِ الرجیم)ی بەس بێ یان خوێندنەوەی هەر رکاتێك بەخۆی سەربەخۆیە؟ ئیکتیفاکردن بەیەك(أعوذُ باللە من الشیطانِ الرجیم) دیارترە بۆ ئەو فەرموودە سەحیحەی لەلایەن ئەبو هورەیرەوە هاتووە: کە پەیامبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) کاتێك لەرکاتی دووەم هەڵدەستایەوە، بەخوێندنەوەی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الفاتحة: ٢ دەستیپێدەکرد. بێدەنگ نەدەبوو. یەك(أعوذُ باللە من الشیطانِ الرجیم)ی دەخوێند، چونکە بێدەنگیی نەدەکەوتە نێوان هەردوو خوێندنەوەوە، بەڵکو زیکریان دەکەوتە نێوانەوە، بۆیە ئەگەر سوپاس و ستایشی خوای گەورە یان تەسبیحات یان لا إلە إلا اللە یان سەڵاواتدان لەسەر پەیامبەر(صلی اللە علیە وسلم)ی کەوتە نێوانەوە، ئەوە هەر وەك یەك خوێندنەوە دادەنرێت.

پەیامبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) رکاتی دووەمی وەك یەکەم ئەنجام دەدا تەنیا لەچوار شتدا نەبێ: بێدەنگی، دەستپێکردن، تەکبیرەی نوێژ دابەستن، درێژکردنەوە.

کە دادەنیشت بۆ شایەتومان، دەستی چەپی ئەخستەسەر رانی چەپی، دەستی راستیش لەسەر رانی راست، بەپەنجەی شایەتومانی ئاماژەی دەدا و دەیجوڵاند، هەندێ لاری دەکردەوە و دەیجوڵاند هەروەك لەفەرموودەکەی وائیلی کوڕی حوجرەوە هاتووە، پەنجە توتە و برای توتەی توند دەکرد و بەپەنجەی ناوەڕاست و سپێ کوژە ئەڵقەیەکی دروست دەکرد و پەنجەی شایەتومان(دۆشاومژە)ی بەرز دەکردەوە و چاوی دەخستەسەر، دەستی چەپی لەسەر رانی چەپی بڵاو دەکردەوە و خۆی دەخستەسەری.

سیفەتی دانیشتنیشی، وەك ئەوەی پێشتر باسمان کرد، دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەی وەك یەك وەهابوو، لەسەر قاچی چەپی دادەنیشت و قاچی راستی بەرز رادەگرت، لەجگە لەم سیفە و وەسفە، جۆری تر باس نەکراوە.

پاشان هەمیشە لەو دانیشتنەدا تەحیاتی دەخوێند و هاوەڵانی فێر دەکرد بڵێن:"التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ،السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِيْنَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ"[1].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەو تەحیاتەدا زۆر کەم دەمایەوە وەك ئەوەی لەسەر بەردی گەرم دانیشتبێ، لێیەوە هەرگیز نەگێڕدراوەتەوە گەیشتبێتە سەڵاوات و پەنای بەخوا گرتبێ لەسزای ناوگۆڕ و دۆزەخ و فیتنەی زیندووکردنەوە و مردن و فیتنەی مەسیحی دەجال، جا ئەگەر کەسێك ئەوە بەسوونەت بزانێ، ئەوە شتە گشتییەکان بەجۆرێکی تر تێگەیشتووە، بەڵکو تەواوی ئەوانە لەتەحیاتی کۆتاییدا دەوترێن.

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەوتنی(الله أکبر) و لەسەر پێشەوەی پەنجەکانی و ئەژنۆی و بەخۆخستنەسەر رانی هەڵدەستایەوە وەك پێشتر باسمان کرد. لەفەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی عومەردا هاتووە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەو شوێنەدا دەستی بەرزکردووەتەوە[2]، ئەم زیادەیەی نێو فەرمودەکەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر یەکدەنگیی لەسەر نییە، زۆربەی گێڕەوەکانی ئەمە ناگێڕنەوە.

پاشان تەنیا سورەتی فاتیحای دەخوێندەوە، لێیەوە نەسەلماوە لەدوو رکاتی کۆتاییدا لەدوای فاتیحا هیچ ئایەتێکی تری خوێندبێتەوە.

---

[1] – بوخاری(٨٣١) و موسلیم(٤٠٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٧٣٩).

لەڕەواتبەکاندا لەنوێژە چوار ڕکاتییەکاندا دوو ڕکاتی سەرەتای درێژدەکردەوە، ڕکاتی یەکەمی لەڕکاتی دووەم ماوە درێژتر بوو.
پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ڕێنیشاندەری و ڕەوشتی ئاوەهابوو لەهەموو نوێژەکانیدا: ڕکاتی یەکەم لەوی تر درێژتر بوو.
پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە لەتەحیاتی کۆتاییدا دادەنیشت، خۆی دەخستەسەر سمت و ڕانی، سمت و ڕانی ئەخستەسەر زەوی و قاچی لەیەك لاوە دەردەکرد، ئەمە یەکێکە لەو سێ شێوەیەی لەبارەی تەوەڕکەوە لێیەوە گێڕدراوەتەوە. ئەبو داوود لەفەرموودەیەکی ئەبو حومەیددا باسی کردووە.
ڕووی دووەم: بوخاری لەسەحیحەکەیدا باسیکردووە[1] هەر لەفەرموودەیەکی ئەبی حومەیدەوە ئەڵێ:"کە لەڕکاتی کۆتایی دادەنیشت، قاچی چەپی پێشدەخست و قاچی ڕاستی دادەنا و دادەنیشت"، ئەمە گونجاوە بەوەی یەکەم لەدانیشتن لەسەر سمت، ئەوە هەیە زیادەیەکی تێدایە لەوەسفی شێوەی هەردوو قاچ کە لەگێڕانەوەی یەکەمدا باس نەکراوە.
ڕووی سێیەم: ئەوەی موسلیم باسیکردووە لەسەحیحەکەیدا[2] لەفەرموودەیەکی عەبدوڵڵەی کوڕی زوبەیرەوە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)"قاچی چەپی ئەخستە نێوان ڕان و باڵی، قاچی ڕاستیشی ڕادەخست"، ئەمە پێچەوانەی هەردوو وەسفی سەرەتایە لەدەرکردنی قاچی چەپی لەلایەکەوە و دانانی قاچی ڕاستی.
ڕەنگە هەندێجار ئەمەی کردبێ و هەندێجار ئەوی تر، ئەمەش دیارترە، ئەکرێ ئەوە لەجیاوازیی گێڕەرەوانەوە بێ.
لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ەوە باس نەکراوە لەسەر سمتی دانیشتبێ تەنیا لەو تەحیاتەدا نەبێ کە تیایدا سەلام دەداتەوە.

---

[1] – بوخاری گێڕاویەتییەوە(٨٢٨).
[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٧٩).

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە لەتەحیادا دادەنیشت، دەستی راستی ئەخستەسەر رانی راستی و سێ پەنجەی ئەخستەسەر یەك و پەنجەی دۆشاومژەی درێژ دەکرد، قۆڵی لەسەر رانی رادەخست و دووری نەدەخستەوە، ئانیشکی لەکۆتایی رانی بوو، هەرچی قۆڵی چەپی بوو، ئەوە پەنجەکانی بەسەر رانی چەپیدا درێژ کردبوو.

لەدەست بەرزکردنەوەدا پەنجەکانی روو بەقیبلە دەکرد، هەروەها لەرکوع و سجود و شایەتومانیشدا روو بەقیبلە بوون، لەسجودیشدا پەنجەکانی پێی روو بەقیبلە بوون، لەهەردوو رکاتدا تەحیاتێکی دەخوێند.

لەحەوت شوێنی نوێژدا دەپاڕایەوە:

یەکەم: لەدوای تەکبیرەی نوێژ دابەستن(الله أكبر) و لەنێو دوعای ئیستیفتاحدا.

دووەم: لەپێش رکوع و لەدوای لێبوونەوە لەخوێندنەوەی ئایەتەکان لەنوێژی ویتردا.

سێیەم: لەدوای هەڵسانەوە لەرکوع.

چوارەم: لەرکوعدا.

پێنجەم:لەسجوددا،زۆربەی پاڕانەوەکانی لەو کاتەدا بوون.

شەشەم: لەنێوان هەردوو سوجدەدا.

حەوتەم: لەدوای شایەتومان و لەپێش سەلامدانەوە،بەوەش فەرمانی داوە لەفەرموودەکەی ئەبو هورەیرە و فەرموودەکەی فەزالەی کوڕی عوبەید، هەروەها فەرمانی کردووە بەپاڕانەوە لەسجوددا.

هەرچی پاڕانەوەی دوای سەلامدانەوەی نوێژە روو بەقیبلە یان پێشنوێژی بۆ کراون، ئەوە لەبناغەدا لەکاری پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) نەبووە و بەسەنەدی سەحیح یان حەسەن لێیەوە نەگێڕدراوەتەوە، تێکڕای ئەو فەرموودانەی پەیوەستن

بەنوێژەوە، ئەوەیە کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی داون و فەرمانی کردووە ئەنجام بدرێن، جگە لەوەی لێرەدا شتێك هەیە، ئەویش ئەوەیە نوێژخوێن ئەگەر لەنوێژەکەی بوویەوە و یادی خوای کرد و لا إله إلا اللهی وت و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد بەویردە رێگەپێدراوەکان، ئەوە سووننەتە لەدوای ئەوە سەڵاوات بنێرێ بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) و سووننەتە دوابەدوای ئەوە دوعا بکات، هەروەك لەفەرموودەکەی فەزالەی کوڕی عوبەیددا هاتووە:"إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِحَمْدِ اللَّهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ،ثم ليصلِّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ لْيَدْعُ بعد مَا شَاءَ"،واتا:ئەگەر یەکێ نوێژی کرد، با بەسوپاس و ستایشی خوا(الحمد لله) دەستپێبکات پاشان سەڵاوات بدات لەسەر پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)، پاشان چی ویست لەخوای داوا بکات. ترمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی سەحیحە[1].

پاشان پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بەلای راستدا سەلامی دەدایەوە و ئەیفەرموو: "السلامُ عليكم ورحمةُ الله"[2]، بەلای چەپیشدا هەمان شتی دەفەرموو. ئەوە کرداری بەردەوامی بوو کە پانزە هاوەڵ گێڕاویانەتەوە، لێیشەوە گێڕدراوەتەوە کە یەك سەلامی داوەتەوە[3]، بەڵام لەهیچ روویەکی دروستەوە ئەمە نەسەلماوە.

## ٢-رێبازی پەیامبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە پاڕانەوە لە نوێژدا

پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەنوێژەکانیدا دەپاڕایەوە و ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَفِتْنَةِ الْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَغْرَمِ وَالْمَأْثَمِ"[4]،واتا: خوایە گیان پەنات پێ دەگرم

---

[1]– سنن الترمذي(٣٤٧٧)، فەرموودەیەکی حەسەن سەحیحە.

[2]– موسلیم ئیخراجی کردووە(٤٣١).

[3]– ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٩١٨).

[4]– بوخاری(٨٣٢) و موسلیم(٥٨٩) ئیخراجیان کردووە.

لەسزای گۆڕ، پەنات پێ دەگرم لەفیتنەی دەجال، پەنات پێ دەگرم لەفیتنەی زیندووبوونەوە و مردن، خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لە قەرز و تاوان.

هەروەها لەنوێژدا ئەیفەرموو: "اللهمَّ اغفرْ لي ذنبي، ووسِّع لي في داري، وبارِكْ لي فيما رزقتَني"[1]،واتا: خوایە گیان لەتاوانم خۆشبە، ماڵم بۆ فراوان بکە و بەرەکەت بخەرە ئەو رزقەی پێمی دەبەخشی.

لەسجوددا ئەیفەرموو: "ربِّ أعطِ نفسي تَقواها، وزكِّها أنتَ خيرُ مَنْ زكَّاها، أنتَ وليُّها ومولاها"[2]،واتا: خوایە گیان ترسی خۆت بەدەروونم بدە، پاکی رابگرە ئەوە خۆتی پاکی رابگری، تۆ دۆست و گەورەی ئەوی.

پێشتریش باسی ئەوە رایبوورد کە چی فەرمووە لەوەی لەڕکوع و سجود و دانیشتن و هەڵسانەوە لەڕکوعدا فەرموویەتی.

هەموو ئەوانە بەبێژەی تاک(الإفراد) لەپاڕانەوەی نوێژی پەیامبەری ئازیزدا(صلی الله علیە وسلم) پارێزراوە.

### ٣- لەڕێبازی پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) لەڕەچاوکردنی حاڵی نوێژخوێنانی دوای خۆی لەگەڵ ئەوەی بەجوانیی دڵی کردبووە خوای گەورە و بیری خستبووەلای.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) کە هەڵدەستا بۆ نوێژ، سەری دائەنواند، پێشەوا ئەحمەد(خوای لێ رازیی بێ) باسیکردووە. پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) لەتەحیاتدا چاوی لەسەر پەنجەی شایەتومانی لا نەدەدا، ئارامی و خۆشی و ئاسوودیی خۆی خستبووە نوێژەکانییەوە، بەبیلالی ئەفەرموو: "يَا بِلاَلُ، أرِحْنَا بِالصَّلاَةِ"[3]،واتا: ئەی بیلال بەنوێژ ئارامییمان پێ بدە و ئاسوودەمان بکە. هەروەها

---

[1] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٥٠٠).

[2] –موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧٢٢).

[3] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٩٨٥).

ئەیفەرموو: " جُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ"[1]،واتا: گلێنە و ئارامییم لەنوێژدا بۆ دانراوە. لەگەڵ ئەوەشدا، رەچاوکردنی حاڵی نوێژخوێنانی دوای خۆی سەرقاڵی نەدەکرد لەجوان دڵدانە لای خوای گەورە و بیری لای پەروەردگاری بێ.

ئەچووە نوێژەوەو ئەیوست نوێژەکەی درێژ بکاتەوە، کە گوێی لەگریانی منداڵێك دەبوو، نوێژەکەی کورت دەکردەوە نەوەك لەسەری دایکی منداڵەکە ناڕەحەتیی دروست بووبێ، جارێکیان سوارێکی نارد هەواڵی بۆ بهێنێتەوە، هەڵسا بۆ نوێژ و لای دەکردەوە بەلای ئەو دۆڵەی سوارەکەی لێوە دەهات، رەچاوکردنی حاڵەتی ئەو سوارەش سەرقاڵی نەکرد لەدڵ خستنەلای نوێژەکەی.

جارێکیان نوێژی کرد و ئومامەی کچی ئەبی ئەلعاصی کوڕی ئەلرەبیع کچی زەینەبی کچی بوو لەسەر ملی بوو، کە هەڵدەستا هەڵیدەگرت، کە دەچووە رکوع و سجود دایدەنا.

نوێژی دەکرد و حەسەن یان حوسەین دەهات و دەچووە سەر پشتی و ئەویش سوجدەکەی درێژ ئەکردەوە نەوەك لەسەر پشتی بکەوێ.

نوێژی دەکرد و عائیشە بۆ پێویستییەکی دەهات دەیبینی دەرگا داخراوە، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دەچوو دەرگاکەی بۆ دەکردەوە و ئەگەڕایەوە بۆ نوێژەکەی.

لەنوێژدا دەبوو، بەئاماژە وەڵامی سەلامی ئەو کەسەی دەدایەوە سەلامی لێ بکردبایە.

جابر ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ پێویستییەك ناردمی، کە گەڕامەوە بینیم نوێژ دەکات، سەلامم لێ کرد بەئاماژە وەڵامی دامەوە[2].

---

[1] – نەسائی ئیخراجی کردووە(٣٩٣٩).

[2] – بوخاری(١٢١٧) و موسلیم(٥٤٠) ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نوێژی دەکرد و عائیشە روو بەقیبلەی راکشابوو، کە دەچووە سجود بەدەستی لێی دەدا و ئەویش قاچی کۆدەکردەوە، .کە هەڵدەستا، عائیشەش قاچی درێژ ئەکردەوە[1].

پەیامبەرێ خوا(صلی الله علیه وسلم) نوێژی دەکرد شەیتان هات تاوەکو نوێژەکەی لێ ببڕێت، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گرتی و چنگی خستە بیناقاقای هەتا ئەوەی لیکی شەیتان کەوتە سەر دەستی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)[2].

لەسەر مینبەر نوێژی دەکرد و دەچووە رکوع، کە کاتی سوجدە هات، بەکشانەوە دابەزی و لەسەر زەوییەکە چووە سوجدە پاشان چووەسەر مینبەرەکە.

روو بەدیوار نوێژی دەکرد ئاژەڵێك هات لەبەردەمیدا تێدەپەڕی، هەر رێگەی بۆ دەکردەوە و پاڵی پێوە دەنا تاوەکو سکی بەدیوارەکەوە نووساند و لەپشتەوەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) تێپەڕی[3].

نوێژی دەکرد و دوو خزمەتکاری نەوەی عەبدولموتەلیب هاتن و شەڕیان بوو، بەدەستی خۆی گرتنی و لەیەکی کردنەوە لەکاتێکدا لەنوێژدا بوو[4].

لەنوێژدا فووی دەکرد، لەنوێژدا دەگریا و دەنگی گریانی دەبیسترا، بەپێ خاوسی نوێژی دەکرد، جاری وا هەبوو بەنەعلەوە نوێژی دەکرد، هەندێجار لەیەك بەرگدا نوێژی دەکرد و هەندێجاریش لەدوو بەرگ نوێژی دەکرد کە زۆرجار لەدوو بەرگدا بووە.

لەنوێژی بەیانی لەدوای رکوع، بۆ ماوەی یەك مانگ قنوتی دەخوێند، پاشان وازی لەقنوت هێنا، تەنیا لەکاتی کۆست و بەلادا قنوتی دەخوێند، قنوتی بەنوێژی بەیانیی تایبەت نەکرد، بەڵکو لەنوێژی بەیانی و مەغریبیشدا قنوتی دەخوێند،

---

[1]– بوخاری(٣٨٤) و موسلیم(٥١٢) ئیخراجیان کردووە.

[2]– ئەحمەد١٨/٣٠٢(١١٧٨٠)، ٧/٤١(٣٩٢٦) و نەسائی لە الكبری١/٢٩٤(٥٥٥)، ١٠/٢٣٤(١١٣٧٥) ئیخراجیان کردووە.

[3]– ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٧٠٨).

[4]– ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٧١٧).

بوخاری باسیکردووە لەسەحیحەکەیدا لەئەنەسەوە[1]، موسلیمیش لەبەرائەوە گێڕاویەتییەوە[2].

لەرێبازی پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) ئەوە بوو، تەنیا لەکاتی کۆست و بەلادا قنوتی دەخوێند، کە کۆست و بەلا لەئارادا نەبووایە قنوتی نەدەخوێند و بەنوێژی بەیانییشەوە تایبەتی نەدەکرد، بەڵکو زۆربەی قنوتەکانی بۆ نوێژە درێژەکان و ئەوە بوو لەشەودا بوو، نزیکی دەکردەوە لەبەربەیان و کاتی قبوڵبوون و دابەزینی خوای گەورە، چونکە ئەو نوێژەیە کە خواو فریشتەکان ئامادە و شایەتیی لەسەر دەدەن، یان فریشتەکانی شەو و رۆژ شایەتیی لەسەر دەدەن و ئامادەی دەبن، هەروەك هەردووکی گێڕدراوەتەوە لەراڤەکردنی فەرمایشتی خوای گەورەدا: ﴿ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾ **الإسراء: ٧٨**، واتا: بەراستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت(لەلایەن فریشتەکانی شەو و رۆژەوە).

بەڵێ بەدروست لەئەبو هورەیرەوە هاتووە وتوویەتی: سوێند بەخوا نوێژی من زیاتر لەنوێژی ئێوە نزیکە بەنوێژی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئەبو هورەیرە لەرکاتی کۆتایی نوێژی بەیانییدا قنوتی دەخوێند لەدوای ئەوەی ئەیووت: "سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه"، بۆ باوەڕداران دەپاڕایەوە و نەفرەتی لەبێباوەڕان دەکرد[3].

گومان لەوەدا نییە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی کردووە پاشان وازی لێهێناوە، ئەبو هورەیرە حەزی کردووە فێریان بکات کە نمونەی ئەو قنوتە سوونەتە و پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی داوە، ئەوە

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە لەزیاتر لەپانزە شوێن، لەوانە: (١٠٠١، ٢٨٠١، ٤٠٨٨، ٤٠٩٠)، لەهەندێکیاندا باسی بەیانیی دەکات، لەهیچیاندا باسی مەغریبی نەکردووە.

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٦٧٨).

[3] – بوخاری(٧٩٧) و موسلیم(٦٧٦) ئیخراجیان کردووە.

وەلامدانەوەی خەڵکی کوفەیە کە بەڕەهایی قنوتی کاتی کۆست و بەلاَ و کاتەکانی تریان بەمەکروه ئەزانن و ئەڵێن: نەسخ بووەتەوە و کردنی بیدعەیە، بەلاّم فەرمووددەناسان لەنێوان ئەمان و ئەوانەدان کە لەکاتی بەلاَ و کاتەکانی تردا بەسووننەتی دەزانن، لەنێوان هەردوو کۆمەڵدا کار بەفەرموودە دەکەن، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کەی قنوتی کردبێ قنوت دەخوێنن و کەی وازی لێهێنابێ وازی لێ دەهێنن، لەئەنجامدان و ئەنجام نەداندا شوێن پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکەون و ئەڵێن: ئەنجامدانی سووننەتە و ئەنجامنەدانیشی بەهەمان شێوە سووننەتە، لەگەڵ ئەوەشدا مشتومڕ لەگەڵ ئەو کەسەدا ناکەن لەسەری بەردەوامە و کردنی بەمەکروه دانانێن و بەبیدعەی نابینن، کەسی ئەنجامدەر بەپێچەوانەی سووننەت دانانێن، هەروەك ئینکاری ئەو کەسەش ناکەن کە لەکاتی بەلاّو ناخۆشی و کاتی تریشدا ئەنجامی نادات و ڕەتی دەکاتەوە، بۆیە وازلێهێنانی بەبیدعە نابینن و وازلێهێنەریشی بەپێچەوانەی سووننەت نابینن، بەڵکو ئەوەی قنوت دەخوێنێ باشتری کردووە و ئەوەشی نایخوێنێ باشتر دەکات.

ئەگەر هەندێجار پێشنوێژی خوێن بەدەنگی بەرز بیخوێنێ تاوەکو نوێژخوێنانی دوای خۆی فێری بن، ئەوە کێشەی تێدا نییە، عومەر دوعای دەستپێکردنی نوێژی بەدەنگ خوێندووە تاوەکو نوێژخوێنان فێری بن، ئیبن عەباس لەنوێژی مردوودا بەدەنگی بەرز سورەتی فاتیحای خوێندووە تاوەکو بزانن ئەوە سووننەتە، هەروەها ئەوەی پێشنوێژیخوێن بەدەنگ ئامین بکات، ئەمە لەو جیاوازییە موباح و ڕێپێدراوەیە کە توند ناگیرێ بەرانبەر ئەوەی ئەنجامی دەدات و ئەوەی ئەنجامی نادات.

## ٤- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەسجودی سەهودا

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە فەرموویەتی:"إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي"[1]،واتا: منیش وەك ئێوە مرۆڤم و شتم بیردەچێتەوە وەك چۆن ئێوە بیرتان دەچێتەوە، ئەگەر شتێکم لەبیرچوویەوە بیرم بخەنەوە.

سەهو و لەبیرچووەوەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەنوێژدا یەکێکە لەتەواوکردنەکانی نیعمەتی خوای گەورە بەسەر ئوممەتەکەیەوە، بەشێکە لەکاملکردنی ئایینەکەیان تاوەکو چاوی لێبکەن و بزانن لەکاتی لەبیرچوونەوەدا چی بکەن.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) جارێك لەنوێژی چوار ڕکاتییدا لەڕکاتی دووەمدا دانەنیشت بۆ تەحیات، کە لەنوێژەکەی بوویەوە، پێش سەلامدانەوە دوو سوجدەی برد و پاشان سەلامی دایەوە، لەمەدا ڕێسایەك وەرگیرا: هەرکەسێك بەسەهو بەشێکی نوێژی ئەنجام نەدا کە یەکێك نەبوو لەپایەکانی نوێژ، لەپێش سەلامدانەوە سوجدە دەبات. لەهەندێ لایەنییەوە ئەوەش وەرگیرا: هەرکەسێ ئەوەی نەکرد و چووە نێو پایەیەکی تری نوێژەوە، ناگەڕێتەوە بۆ کردنی ئەوەی بیری چووەتەوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەنوێژێکی عیشادا دوو ڕکاتی کرد، پاشان قسەی کرد، پاشان تەواوی کرد، پاشان سەلامی دایەوە و پاشان لەدوای سەلام و قسەکردن دوو سوجدەی برد، لەچوونە سجود(الله أكبر)ی خوێند و لەسەربەرزکردنەوەشدا(الله أكبر)ی خوێند.

---

[1] - بوخاری(٤٠١) و موسلیم(٥٧٢) ئیخراجیان کردووە.



ئەبو داوود و ترمیزی باسیان کردووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نوێژی بۆیان کرد، دوو سوجدەی برد پاشان تەحیاتی خوێند پاشان سەلامی دایەوە. ترمیزی ئەڵێ(حسن غریب)ە[1].

ڕۆژێکیان نوێژی کرد و سەلامی دایەوە و ڕۆیشت، ڕکاتێ لەنوێژەکە مابوو، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوالله پێیگەیشت و وتی: ڕکاتێکی نوێژەکەت بیرچوو، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە هاتە مزگەوت و فرمانی بەبیلال کرد قامەت بکات، ڕکاتێکی بۆ خەڵکەکە ئەنجام دا. پێشەوا ئەحمەد(بەڕەحمەت بێ) باسیکردووە[2].

جارێکیان لەنوێژی نیوەڕۆدا پێنج ڕکاتی کرد، پێیوترا: ئایە ڕکاتەکانی نوێژ زیاد کراوە؟ فەرمووی: کام زیاتر؟ وتیان: پێنج ڕکاتت کرد، بۆیە دوو سوجدەی برد لەدوای ئەوەی سەلامی دابووەوە.

لەنوێژی عەسردا سێ ڕکاتی کرد، پاشان چووەماڵەوە و خەڵکیی ئەوەیان بیرخستەوە، بۆیە دەرچوو ڕکاتێکی تری پێیان کرد پاشان سەلامی دایەوە پاشان دوو سوجدەی برد و پاشان سەلامی دایەوە.

ئەوە کۆی ئەوە بوو کە لەسەهوکردن لەنوێژدا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) پارێزراوە و پێنج شوێنە، هەندێکی سجودە لەپێش سەلامدانەوە و هەندێکی لەدوای سەلامدانەوەیە.

ئەوانەی بۆی ڕوونکراونەتەوە و خراونەتە بەردەمی گومان نەبووە، بەڵکو دڵنیاییانە بووە و لەپێش سەلامدانەوە، سوجدەی بردووە.

---

[1] – ئەبو داوود(١٠٣٩) و ترمیزی(٣٩٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ئەحمەد٤٥/٢٢٧(٢٧٢٥٤) و ئەبو داوود(١٠٢٣) و نەسائی(٦٦٤) ئیخراجیان کردووە.

## ٥- ڕێبازی پەیامبەر( صلى الله علیه وسلم ) لەڕوانین لەکاتی نوێژدا

لەڕێبازی پەیامبەری خوادا نەبووە(صلى الله علیه وسلم) لەنوێژدا چاو دابخات، پێشتر باسکرا کە لەتەحیاتدا لەکاتی دوعادا چاوی لەسەر پەنجەی بووە و چاوی لەسەر پەنجەی لا نەداوە.

شەرعناسانان لەبارەی کەراهەتیەوە جیاوازن، پێشەوا ئەحمەد و کەسانی تر بەکەراهەتیان زانیووە چاو دابخرێت و وتوویانە: کرداری جولەکەیە[1]، بەڵام کۆمەڵێکی تر ئاساییان بینیووە و بەکەراهەتیان دانەناوە.

دروست ئەوەیە بووترێت: ئەگەر کردنەوەی چاو زیان لەخشوع نەدات، ئەوە باشترە، بەڵام ئەگەر کردنەوەی چاو زیان لەخشوع بدات بەهۆی بوونی جوانکاری و دیمەنی سرنجڕاکێش لەڕووی قیبلەی کەسەکەدا، ئەوە هیچ کەراهەتێك نییە کەسەکە چاو بنوقێنێت، ئەو قسەیەی لەم حاڵەتەدا بەڕێگەپێدراوی دەبینێ، نزیکترە لەبنەما و مەبەستەکانی شەرعەوە تاوەکو ئەوەی بەکەراهەتی دەبینێ، خواش زاناترە.

## ٦- ئەوەی پەیامبەر( صلى الله علیه وسلم ) لەلێبوونەوەی لەنوێژ دەیفەرموو کاتێ دادەنیشت و ئەو زیکر و ویردانەی لەدوای نوێژ بۆ ئوممەتەکەی داینا

پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) کە سەلامی دەدایەوە سێ جار(استغفر الله)ی دەخوێند و ئەیفەرموو:"اللهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ"[2].

بەئەندازەی وتنی ئەو ویردە ڕوو بەقیبلە دەمایەوە، بەڵکو خێرا ڕووی دەکردە نوێژخوێنان، ڕووی دەکردە لای ڕاست و لای چەپ، ڕووی نەدەکردە لایەك و ئەوی تر پشتگوێبخات.

---

[1] - المغني لابن قدامة٢/٣٩٦.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٩١).

که نوێژی بەیانیی دەکرد، لەشوێنی نوێژەکەی دەمایەوە تاوەکو خۆر هەڵدەهات.

لەدوای هەموو نوێژە فەرزێك دەیفەرموو:"لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ، لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ"[1].

هەروەها ئەیفەرموو:"لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، ولَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ، وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ،ولا نَعبدُ إلا إياه مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ"[2].

ئوممەتەکەی راهێناوە تاوەکو لەدوای هەموو نوێژێك ئەمە بڵێن: سی و سێ جار سبحان الله، سی و سێ جار الحمد لله، سی و سێ جار الله أكبر،بە(لا إلهَ إلا الله وحدَهُ لا شريكَ له، له الملكُ وله الحمدُ وهو على كُلِّ شيء قديرٌ) بیکەنە سەد[3].

لەسیفەتێکی تردا: سی و چوار وتنی(الله أكبر) و بەوە دەبێتە سەد[4].

لەسیفەتێکی تردا:"بیست و پێنج سبحان الله، بیست و پێنج الحمد لله، بیست و پێنج الله أكبر، بیست و پێنج جار وتنی(لا إلهَ إلا الله وحدَهُ لا شريكَ له، له الملكُ وله الحمدُ وهو على كُلِّ شيء قديرٌ)[5].

لەسیفەتێکی تردا:"دە سبحان الله، دە الحمد لله، دە الله أكبر"[6].

لەموسنەد و سوونەنەکاندا لەعوقبەی کوڕی عامرەوە ئەڵێ:"پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی پێکردم لەدوای هەمو نوێژەکاندا (المعوذات) بخوێنم"، ئەبو

---

[1] – بوخاری(٨٤٤) و موسلیم(٥٩٣) ئیخراجیان کردووە.
[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٩٤).
[3] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٩٧).
[4] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٩٦).
[5] – نەسائی ئیخراجی کردووە(١٣٥٠).
[6] – ئەبو داوود(٥٠٦٥) و ترمیزی(٣٤١٠) ئیخراجیان کردووە.

حاتەمیش گێڕاویەتییەوە لەسەحیحەکەیدا و حاکمیش لە المستدرك و ئەڵێ: سەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم، لەلەفزی ترمیزییدا هاتووە بە: "المعوذتین"[1].

ئامۆژگاریی موعازی کردووە کە لەدوای هەموو نوێژێك بڵێ: "اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ"[2]، واتا:خوایە گیان یارمەتییم بدە لەسەر ئەوەی یاد و سوپاست بکەم و جوان بتپەرستم.

دوای نوێژ ئەکرێ پێش سەلامدانەوە و دوای سەلامدانەوەش بێ، شێخ و مامۆستای ئێمە بارسەنگی ئەوەی کردووە پێش سەلامدانەوە بێ[3].

## ٧-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەسترە داناندا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە لەنوێژدا رووی دەکردە دیوار، لەنێوان خۆی و دیوارەکەدا ماوەی تێپەڕبوونی مەڕێکی دەهێشتەوە لێی دوورنەدەکەوتەوە، بەڵکو فرمانی دەدا بەنوێژکردن لەنزیك سترەدا، لەگەشت و دەشتدا حەربەی دادەنا بۆ سترە، بارەکەی دادەنا و دەیکرە سترە، فرمانی بەنوێژخوێن دەکرد سترە دابنێت ئەگەر بەتیرێك یان گالۆکێکیش دەبێت، ئەگەر ئەوەشی دەستنەکەوتبایە، ئەوە خەتێکی لەسەر زەوییەکە دەکێشا.

ئەگەر سترە نەبووایە، ئەوە دروست لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە نوێژی بڕیووە بەتێپەڕبوونی راستەوخۆی ئافرەت و گوێدرێژ و سەگی رەش بەبەردەمیدا، ئەوەی لەبارەوە سەلماوە لەگێڕانەوەیەکی ئەبو زەڕ و ئەبو هورەیرە و ئیبن عەباس و عەبدواللەی کوڕی موغەففەل.

---

[1] – ئەحمەد٢٨/٦٣٣(١٧٤١٧) و ئەبو داوود(١٥٢٣) و ترمیزی(٢٩٠٣) و ئیبن حیبان٥/٣٤٤(٢٠٠٤) و حاکم١/٣٨٣(٩٢٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ئەبو داوود(١٥٢٢) و نەسائی(١٣٠٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] – مجموع الفتاوى لابن تيمية٢٢/٤٩٩.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نوێژی کردووە و عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) لەڕووی قیبلەیدا خەوتبوو، ئەوە وەك ئەوە نییە بەبەردەمیدا تێپەڕبێ. حەرامە بۆ پیاو بەبەردەم نوێژخوێندا تێپەڕببێ، مەکروە نییە لەبەردەست نوێژخوێندا بمێنێتەوە، بۆ ئافرەتیش وەهایە، ئەگەر کەسێك بەبەردەمیدا تێپەڕبێ نوێژەکەی دەبڕێت.

## ٨- رێبازی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) لەسووننەتە رەواتبەکاندا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەردەوام پارێزگاری دەکرد لەدە رکاتەکە لەو کاتەی لەمەدینەدا بووایە، ئەو رکاتانەی کە ئیبن عومەر ئەڵێ: لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) دە رکاتم لەبەر کردووە: دوو رکات پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو رکات دوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات دوای مەغریب لەماڵی خۆیدا، دوو رکات دوای عیشا لەماڵی خۆیدا، دوو رکات پێش نوێژی بەیانی[1].

کە دوو رکاتەکەی دوای نوێژی نیوەڕۆی لەدەستچوو، لەدوای عەسر قەزای کردەوە و لەسەری بەردەوام بوو، چونکە کە کارێکی دەکرد، رێك و دامەزراوی دەکرد.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەندێجار لەپێش نوێژی نیوەڕۆ چوار رکاتی کردووە هەروەك لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)نەیدەهێشت چوار رکات پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو رکات پێش نوێژی بەیانیی لەدەست بچێ[2].

هەرچی ئەوەی ئەوترێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەماڵی خۆیدا چوار رکاتی کردووە، ئەگەر لەمزگەوتدا نوێژی بکردبایە دوو رکاتی دەکرد، بەڵێ ئەمە دیارترە، بەلأم کە بووترێت: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەمە و ئەوەی

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١١٨٠).

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١١٨٢).



دەکرد، بەڵێ هەریەک لەعائیشە و ئیبن عومەریش کە بینیوێتی ئەوەیان گێڕاوەتەوە، هەردوو فەرموودەکە دروستن و هیچ یەکێکیان تانەیان لەسەر نییە.

موسلیم لەسەحیحەکەیدا لەفەرموودەیەکی ئوم حەبیبەوە گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: گوێم لەپەیامبەری خوابوو(صلی الله علیه وسلم) ئەیفەرموو:"مَنْ صَلَّى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ،بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ"[1] ،واتا:هەرکەسێ لەشەو و ڕۆژێکدا دوانزە رکات نوێژ بکات، بەو دوانزە رکاتە لەبەهەشتدا ماڵێکی بۆ دروست دەکرێت.

ترمیزی و نەسائی زیاتریان تێدا کردووە:"چوار رکات لەپێش نوێژی نیوەڕ، دوو رکات دوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو رکات لەدوای مەغریب، دوو رکات لەدوای عیشا، دوو رکات لەپێش نوێژی بەیانی". نەسائی ئەڵێ: "دوو رکات لەپێش عەسر" لەجیاتی"دوو رکات لەدوای عیشا"، ترمیزییش تەسحیحی کردووە[2].

هەرچی چوار رکاتی پێش نوێژی عەسرە، ئەوە بەهیچ شتێ نەسەلماوە ئەنجامی دابێ جگە لەفەرموودەیەکی دووروودرێژی عاسمی کوڕی زەمرە ئەویش لەعەلییەوە، گوێم لێبوو شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە ئەو فەرموودەیەی ڕەتدەکردەوە و زۆر توند بوو ئەیووت: ئەمە هەڵبەستراوە، باس دەکرێ کە ئەبی ئیسحاق ئەلجوزەجانییش ڕەتیکردووەتەوە[3].

ئەحمەد و ئەبو داوود و ترمیزی لەفەرموودەیەکی ئیبن عومەرەوە گێڕاویانەتەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا"[4]، واتا: سۆز و بەزەیی خوا بۆ ئەو کەسەی لەپێش نوێژی عەسر، چوار رکات ئەنجام دەدات.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٢٨).

[2] – ترمیزی(٤١٥) و نەسائی(١٨٠١) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بڕوانە: الفتاوی الکبری لابن تیمیة٢/١٢٥، ٣٥٨.

[4] – ئەحمەد١٠/١٨٨(٥٩٨٠) و ئەبو داوود(١٢٧١) و ترمیزی(٤٣٠) ئیخراجیان کردووە.

لەبارەی ئەو فەرموودەیەوە جیاوازیی هەیە، ئیبن حیبان تەسحیحی کردووە و کەسی تریش عیلەتیان تێدا بینیووە.

هەرچی دو رکاتی پێش مەغریبە، ئەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)نەگوازراوەتەوە ئەنجامی دابێ، بەدروست هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە هاوەڵانی لەسەری ئیقرار کردووە، بینیوێتی ئەنجامی دەدەن، نە فرمانی پێکردوون و نە نەهی لێکردوون. لەسەحیحدا لەعەبدوالله ئەلموزنییەوە هاتووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"صلُّوا قبلَ المغربِ"،واتا: لەپێش نوێژی مەغریب نوێژ بکەن. لەسێیەمدا فەرموویەتی:"لِمَنْ شاءَ"، واتا: بۆ هەرکەسێ بیەوێ. کەراهەتێك وەك ئەوەی خەڵکیی بەسوونەتی بکەن[1]. ئەمەش دروستە لەبارەی ئەو دوو رکاتەوە، موستەحەبە(سوونەتە) نەك سوونەتی رەواتیب.

بەگشتی لەماڵی خۆیدا ئەو سوونەت و تەتەعوانەی ئەنجام داوە کە هۆکاریان نەبووە، بەتایبەت سوونەتی مەغریب، لێیەوە نەگوازراوەتەوە هەرگیز لەمزگەوتدا ئەنجامیانی دابێ.

لەمەغریبدا دوو سوونەت هەیە:

یەکێکیان: هیچ قسەیەك نەکەوێتە نێوان ئەو نوێژە سوونەتە و نوێژی مەغریبەوە.

سوونەتی دووەم: ئەوەیە لەماڵدا ئەنجام بدرێت.

بەردەوامبوون و پارێزگاریکردنی لەسوونەتی بەیانی توندتر بوو لەتەواوی سوونەتەکانی تری نەوافل، بۆیە نە لەمەدینە و نە لەسەفەردا دەستبەرداری ئەو نوێژە و نوێژی ویتر نەدەبوو، لێیەوە نەگوازراوەتەوە کە لەسەفەردا جگە لەو دوو سوونەتە، سوونەتی تری ئەنجام دابێ.

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(١١٨٣).

شەرعناسان ناکۆکن: کام لەو دوو نوێژە جەختکراوەیە؟ گوێم لەشێخ ئەلئیسلام ئیبن تەیمییە بوو ئەیووت: سوونئەتی بەیانی لەجێی سەرەتای کاردایە، ویتریش کۆتایی کارە، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سوونئەتی بەیانی و ویتری بەسورەتی ئیخلاس ئەنجام دەدا، سورەتێکە تەوحیدی زانست و کار و تەوحیدی مەعریفە و ئیرادە و تەوحیدی ئیعتیقاد و مەبەستی کۆکردووەتەوە. کۆتایی.

## ٩- رێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لە پاڵکەوتن دوای نوێژی بەیانی

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەدوای سوونئەتی بەیانی لەسەر لای راست پاڵی دەدایەوە، ئەوەشە لەسەحیحەیندا لێیەوە سەلماوە[١] لەفەرموودەیەکی عائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ).

لەو پاڵدانەوەیەدا دوو کۆمەڵ زیادەڕۆییان کردووە، کۆمەڵی سێیەم مامناوەندبووە، کۆمەڵێکی زاهیریی بەواجیبیان داناوە، بەنەکردنی ئەوە نوێژەکەیان بەتاڵ داناوە وەك ئیبن حەزم و ئەوانەی هاودەنگی بوونە، لەبەرانبەردا کۆمەڵێ شەرعناس بەکەراهەتیان زانیووەو بەبیدعەیان ناوبردووە، مالیك و کەسانێکی تریش مامناوەندیان گرتووە، بەکێشەیان نەزانیووە کەسێك ئەنجامی بدات وەك پشوودانێك، بەکەراهەتیشیان زانیووە کەسێك ئەنجامی بدات وەك سوونئەت، کۆمەڵێکی تریش رەهایانە بەسوونئەتیان داناوە و پێیان رێگەپێدراوە جا بۆ پشوودان بێ یان نە.

---

[١]- بوخاری(٦٢٦) و موسلیم(٧٣٦) ئیخراجیان کردووە.

## ١٠- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەشەونوێژدا

پێشین و دواییینیش جیاوازن لەبارەی ئەوەی: ئایە شەونوێژ فەرزە یان نە؟ هەردوو کۆمەڵ بەڵگەیان هێناوەتەوە بەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ ﴾ **الإسراء: ٧٩** ،واتا: (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) لە بەشێکی شەودا هەستە شەو نوێژ بکە بەقورئان خوێندن تێیدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە.

بۆ ئەم بابەتە، لەباسی تایبەتمەندییەکانی پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) پشت بەخوا ڕوونکردنەوەی زیاتر دەدەین[١].

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نە لەمەدینە و نە لەسەفەردا دەستبەرداری نوێژی شەونوێژ نەبوو، ئەگەر خەوی بەسەردا زاڵبووایە یان ئازاری هەبووایە، لەڕۆژدا دوانزە رکات نوێژی دەکرد، گوێم لەشێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە بوو ئەیووت: لەمەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی ویتر قەزا ناکرێتەوە ئەگەر کاتی لەدەستبچێ، وەك نوێژی (تحية المسجد)ە، چونکە مەبەست پێی ئەوەیە لەکۆتایی شەودا ئەنجام بدرێت و تاك بێ[٢].

شەونوێژی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) یانزە رکات یان دوانزە رکات بوو، هەروەك ئیبن عەباس و عائیشە وتوویانە، لەهەردووکیانەوە ئەو دوو ژمارەیە سەلماوە.

لەبارەی دوو رکاتی کۆتاییەوە جیاوازن: ئاخۆ دوو رکاتی نوێژی بەیانیین یان نە؟

---

[١] – ئیبن ئەلقەییم لەزیاتر لەشوێنێك باسی کردووە و بەتەواوەتیی لەباسی تایبەتمەندییەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) باسی دەکەین، بەڵام ئەوە هەیە لەم کتێبەدا ڕێم نەکەوتووەتە باسکردنی تایبەتمەندییەکانی، بەڵام ڕەنگە ئیبن ئەلقەییم خۆی نەینووسیبێ یان لەبیری چووبێ، خواش زاناترە.

[٢] – الفتاوى الكبرى لابن تيمية٢/٢٤٠ و تیایدا هاتووە: ((....قسەیەکی تری تێدایە: ویتر قەزا ناکرێتەوە...دروست ئەوەیە لەپێش نوێژی بەیانی قەزا دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژەکەت ئەنجام دا، ئەوە لەقەزا کردنەوەدا ئەو سوودە نامێنێ کە بەهۆیەوە خوای گەورە دایناوە)).

ئەگەر بخرێتە پاڵ ژمارەی رکاتە فەرزەکان یان رکاتەکانی ئەو سوونەتە رەواتبانەی کە پارێزگاریی لێیان ئەکرد، ئەوە کۆی رەواتبەکانی شەو و رۆژی بەچل رکات هاتووە و هەمیشە لەئەنجامدانیان بەردەوام بووە، ئەگەر زیاتر لەوەی کردبێ، ئەوە هاتووەتە پێش و رەواتب نەبووە، وەك ئەنجامدانی نوێژی فەتح کە هەشت رکات بووە، هەروەها نوێژی چێشتەنگاو کاتێ بگەڕابایەتەوە مەدینە، هەروەها نوێژی لەو کاتەی یەکێك سەردانی بکردبایە و نوێژی(تحیة المسجد) و ئەوانی تر.
پێویستە هەتاوەکو مردن بەندە لەسەری بەردەوام بێ، ئاخۆ چەندە وەڵام دەدرێتەوە و دەرگا دەکرێتەوە بۆ کەسێك لەشەو و رۆژێکدا چل جار لەدەرگا بدات. خواش پشت و پەنایە.

## ١١- شێواز و سیاقی نوێژ و ویتری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەشەو و باسی نوێژکردنی لەسەرەتای شەودا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە لەخەو هەڵدەستا بەسیواك کردن دەستیپێدەکرد، پاشان یادی خوای گەورەی دەکرد، پێشتر باسی ئەوەشمان کرد لەکاتی لەخەوهەڵساندا دەیفەرموو، پاشان دەستنوێژی دەشۆرد، پاشان دوو رکاتی ماوە کورتی دەکرد هەروەك لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەعائیشەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە لەشەواندا هەڵدەستا، نوێژکردنی بەدوو رکاتی ماوە کورت دەستپێدەکرد[١].

جاری وا هەبوو لەنیوەی شەودا هەڵدەستا، یان بەکەمێك پێش نیوەی شەو، یان بەکەمێك پێش ئەوە، یان رەنگە ئەوکاتەی کەڵەشێر دەیقوقاند کە لەنیوەی دووەمی شەودایە.

---

[١]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٦٧).

هەندێجار ویردەکەی دەبڕی و هەندێجار بەردەوامیی پێ دەدا کە ئەمە زۆرترین بووە هەروەك ئیبن عەباس وتوویەتی لەفەرموودەی شەومانەوەی لای پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم)، کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەڵسا و دەستنوێژی شۆرد و ئەیفەرموو:﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ **آل عمران: ١٩٠**،واتا: بەڕاستی لەدروست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لەجیاوازی و گۆڕانی شەوو ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن بیروهۆشەکان.

ئەو ئایەتانەی تاوەکو کۆتایی سورەتەکە خوێند، پاشان دوو رکات نوێژی خوێند و قیام و رکوع و سجودی درێژ کردەوە، پاشان رۆیشت، ئینجا خەوت هەتاوەکو هەناسەی لەلوتەوە دەهات، پاشان سێجار ئەوەی کرد، شەش رکات.

ئیبن عەباس باسی دوو رکات ماوە کورتی نەکردووە وەك ئەوەی عائیشە باسی کردووە، بۆیە هەندێجار ئەمەی کردووە و هەندێجار ئەوی تر، ئەوەی عائیشە ئەوەی لێ وەرگرتبێ و ئیبن عەباس وەری نەگرتبێ، ئەمە بۆچوونی دیارترە، چونکە عائیشە خێزانی بووە و هەمیشە لەگەڵیدا بووە و لەهەموو کەسێکی تر شارەزاتربووە بەشەونوێژی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، هەرچی ئیبن عەباسیشە، بۆیە پەیامبەری خوای بینیووە(صلى الله عليه وسلم)، یەك شەو لای پوورەکەی(خوشکی دایکی)ماوەتەوە، جا ئەگەر لەنێوان ئیبن عەباس و عائیشەدا جیاوازییەك هەبێ لەبارەی شتێکی تایبەت بەشەونوێژی پەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە قسە قسەی عائیشەیە و قسەی عائیشە وەردەگیردرێت.

شەو نوێژ و ویتری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) چەند جۆرێکە:

لەوانە: ئەوەی ئیبن عەباس باسیکردووە.

جۆری دووەم: ئەوەی عائیشە باسی کردووە.

جۆری سێیەم: هەروەها سیانزە رکات.

جۆری چوارەم: هەشت رکاتی دەکرد، لەهەردوو رکاتدا سەلامی دەدایەوە، پاشان وترێکی پێنج رکاتیی بەدوای یەکدا دەکرد و تەنیا لەڕکاتی کۆتاییدا دادەنیشت.

جۆری پێنجەم: نۆ رکات، هەشت رکاتی بەدوای یەکدا ئەنجام دەدا و تەنیا لەڕکاتی هەشتەمدا تەحیاتی دەخوێند، دادەنیشت یاد و سوپاسی خوای دەکرد و دەپاڕایەوە، پاشان هەڵدەستایەوە و سەلامی نەدەدایەوە، پاشان رکاتی نۆیەمی دەخوێند و دادەنیشت تەحیاتی دەخوێند و سەلامی دەدایەوە، پاش ئەو سەلامدانەوەیە دوو رکاتی بەدانیشتنەوە ئەنجام دەدا.

جۆری شەشەم: حەوت رکاتی دەکرد وەك ئەو نۆیەی پێشوو، پاشان بەدانیشتنەوە دوو رکاتی ئەنجام دەدا.

جۆری حەوتەم: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دوو دوو نوێژی دەکرد، پاشان بەسێ رکات ویتری دەکرد و لەیەکی جیانەدەکردنەوە.

جۆری هەشتەم: ئەوەی نەسائی لەحوزەیفەوە ئەگێڕێتەوە کە لەگەڵ پەیامبەری خوادا لەڕەمەزاندا نوێژی کردووە، پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) چووە رکوع و لەڕکوعدا فەرمووی:"سُبْحَانَ رَبِّي الْعَظِيم"، وەك ئەوەی لەڕاوەستاندا بوو، پاشان دادەنیشت و ئەیفەرموو:"ربِّ اغفر لي، ربِّ اغفر لي" وەك چۆن لەڕاوەستاندا بوو، پاشان چووە سجود و فەرمووی:"سبحان ربِّي الأعلى" وەك چۆن لەڕاوەستاندا، تەنیا چوار رکاتی کرد هەتا بیلال هات و بانگی کرد بۆ خواردنی بەیانی[1].

لەسەرەتای شەو و ناوەڕاست و کۆتاییدا ویتری دەکرد، شەوێك تەواو هەڵسا هەتاوەکو بەیانی یەك ئایەتی دووبارە دەکردەوە کە ئەمە بوو: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ

---

[1]- نەسائی ئیخراجی کردووە(١٦٦٥).

عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ المائدة: ١١٨ ،واتا: ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن وە ئەگەر لێشیان خۆش ببیت ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بەدەستەلآت و کاردروست.

شەونوێژی سێ جۆر بوو:

یەکەم: کە زۆرترینە، نوێژکردنی بوو بەڕاوەستانەوە.

دووەم: بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد و رکوعی دەبرد.

سێیەم: بەدانیشتنەوە قورئانی دەخوێند، کە خوێندنەوەیەکی کەمی بمابایەتەوە، هەڵدەستا و بەڕاوەستانەوە رکوعی دەبرد.

هەرسێ جۆرەکە دروستە لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ەوە هاتووە.

## بەش

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە: لەدوای ویتر بەدانیشتنەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، جارێکی تر بەدانیشتنەوە قورئانی تێدا دەخوێند، کە ویستی رکوع بەرێ، هەڵدەستا و رکوعی دەبرد، لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبی سەلەمەوە ئەڵێ: لەعائیشە(خوای لێ رازیی بێ) پرسیم لەبارەی پەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)، وتی: سیانزە رکات نوێژی دەکرد، هەشت رکات نوێژی دەکرد، پاشان ویتری دەخوێند، پاشان دوو رکات نوێژی دەکرد بەدانیشتنەوە، کە دەیویست رکوع ببات، هەڵدەستایەوە و رکوعی دەبرد، پاشان لەنوێژی بەیانی لەنێوان بانگ و قامەتدا دوو رکات نوێژی کرد[1].

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٣٨).

ئەمە لەجۆرێك كەس تێكەڵبووە، وەهایان داناوە كتوپڕ بووە، ئەمەش بەهۆی فەرمایشتی:"اجعلوا آخرَ صلاتكم بالليلِ وتراً"[1]، واتا: ویتر بكەنە كۆتا نوێژی شەوتان. دروست: ئەوەیە بووترێت: ئەم دوو ركاتە بەدرێژایی ساڵ ئەنجام دراون، تەواوكەری ویترن، چونكە ویتر خواپەرستییەكی سەربەخۆیە، بەتایبەت ئەگەر باسی واجیببوونی كرابێ، ئەو دوو ركاتەی لەدوای ئەوە ئەنجام دەدرێن، وەك سووننەتی مەغریبە لەدوای نوێژی مەغریب، نوێژەكەی دوای مەغریب ویتر و كۆتایی رۆژە و تەواوكەری مەغریبن، دوو ركاتەی دوای ویتری شەویش هەر بەو جۆرەیە.

## ١٢- رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەقنوتی ویتر و دوعای دوای ویتر

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) وەرنەگیراوە و نەگوازراوەتەوە لەویتردا قنوتی خوێندبێ تەنیا لەفەرموودەیەكدا نەبێ كە ئیبن ماجە گێڕاویەتییەوە[2]، لەئوبەی كوڕی كەعب كە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ویتری دەكرد و لەپێش ركوع قنوتی دەخوێند. ئەحمەد لەگێڕانەوەیەكی عەبدوڵلای كوڕیدا ئەڵێ: قنوت لەدوای ركوع هەڵدەبژێرم، هەموو شتێك لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلمابێ لەبارەی قنوتەوە، ئەوەیە لەنوێژی بەیانییدا بووە كاتێك لەڕكوعدا سەری بەرزكردووەتەوە، قنوتی ویتر لەدوای ركوع هەڵدەبژێرم، بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) نەهاتووە لەپێش ویتر و لەدوای ویتر، قنوتی خوێندبێ. ئەلخەلال ئەڵێ: موحەممەدی كوڕی یەحیای ئەلكوحال هەواڵی پێدام كە بەئەبو عەبدوڵلای وتووە لەبارەی قنوت لەویتردا، ئەویش وتوویەتی: هیچ شتێك لەو بارەیەوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) نەگێڕدراوەتەوە، بەڵام عومەر ساڵێ بۆ ساڵێ قنوتی خوێندووە.

---

[1] - بوخاری(٩٩٨) و موسلیم(٧٥١) ئیخراجیان كردووە.

[2] - سنن ابن ماجه(١١٨٢).

ئەحمەد و ئەهلی سووننەن گێڕاویانەتەوە لەفەرموودەیەکی ئەلحەسەنی کوڕی عەلی(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) وتوویەتی:"پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵێ وشەی فێرکردم لەقنوتی ویتردا بیخوێنم کە ئەمانەن:"اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَاكْفِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ""[1]. نەسائی و بەیهەقی ئەمەیان بۆ زیاتر کردووە:" وَلاَ يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ""[2]،واتا: خوایە گیان رێگەم پیشان بدە هەروەك چۆن رێگەت پیشانی پەیامبەران و چاکەکاران داوە، سەرفرازی و عافیێتم پێ ببەخشە هەروەك بەوانت بەخشیووە، خۆت کاروبارم هەڵسوڕێنە هەروەك کاروبارانی ئەوانی تر هەڵدەسوڕێنی و بەخۆمم مەسپێرە. لەوەی بە منت بەخشیووە فەڕ و بەرەکەتداری بکە. هەر خراپە و نەهامەتییەك لەقەدەرم نووسراوە لەسەرم لایبدە، ئەوە تۆی بڕیار دەدەی و کەس لەکاری تۆدا بڕیار بەدەست نییە. تۆ پشتی یەکێ بگری دۆڕانی بەسەردا نایەت. خوایە گیان تۆ مەزن و شکۆداری.

قنوت لەویتردا لەعومەر و ئوبەی و ئیبن مەسعودەوە پارێزراوە و بینراوە، گێڕانەوەی لایەنی ئەوان دروستترە لەقنوت لەنوێژی بەیانی، گێڕانەوەش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) دروستترە لەگێڕانەوەی ئەوەی لەقنونی ویتردا هاتووە.

ئەبو داوود و ترمیزی و نەسائی گێڕاویانەتەوە لەفەرموودەیەکی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەکۆتایی ویترەکەیدا ئەیفەرموو:"اللهمَّ إني أعوذُ برضاك من سخطك، وبمُعافاتك من عُقوبتِك،

---

[1] ـ ئەبو داوود(١٤٢٥) و ترمیزی(٤٦٤) و نەسائی(١٧٤٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] ـ ئەبو داوود ئیخراجی کردووە لەسەرچاوەی سەرەوە باسکرا، بەیهەقی٢/٢٩٦(٣١٣٨)، ٣/٥٦(٤٨٥٩)، ئەم لەفزەم لای نەسائی نەبینیووە.

وأعوذُ بك منك، لا أُحصِي ثناءً عليك، أنتَ كما أثنيتَ على نفسِك"،واتا: خوایە گیان بەڕازیبوونی خۆت پەنا دەگرم لەتووڕەییت، بەلێبووردەیی و بەخشینت لەسزات، بەخۆت پەنا دەگرم لەخۆت، ستایش و پیاهەڵدانی تۆ لەژماردن نایەت، تۆ ئەوەی کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە.

لەیەکێك لەگێڕانەوەکانی نەسائییدا هاتووە: ئەوەی دەفەرموو کاتێ لەنوێژ دەبویەوە و دەچووە نێو جێگەکەی. لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە لەسجوددا ئەوەی فەرمووە، ئەکرێ لەنوێژ و دوای نوێژیش ئەوەی فەرمووبێ.

حاکم لە(المستدرك)دا لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسدا(خوای لێ رازیی بێ) باسیکردووە لەبارەی نوێژ و ویتری پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)، کە لەنوێژەکەی دەبوویەوە گوێم لێ بوو ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي سَمْعِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَفَوْقِي نُورًا، وَتَحْتِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَخَلْفِي نُورًا،واجعَلْ لي يومَ لقائِك نورًا"،واتا:خوایە گیان رووناکیی بخەرە دڵمەوە، رووناکیی بخەرە بینایییمەوە، رووناکیی بخەرە بیستنمەوە، رووناکیی بخەرە لای راستمەوە، رووناکیی بخەرە لای چەپمەوە، سەرەوەم رووناك بکەرەوە و خوارەوەم بکەرە رووناکیی، پێشەوەم رووناك بکەرەوە و دواوەم رووناك بکەرەوە، لەو رۆژەی بەدیداری تۆ دەگەم رووناکییم پێ بدە.

کورەیب ئەڵێ: حەوت وشە لەدڵمدا بوو بیرمچووەوە، هەتا گەیشتمە پیاوێك لەکوڕانی عەباس و بۆی باسکردم و بیرمکەوتنەوە کە بریتیی بوون لە"عَصَبِي، وَلَحْمِي، وَدَمِي، وَشَعْرِي، وَبَشَرِي"،واتا: رووناکیی بخەرە ئێسك و گۆشت و خوێن و موو و پێستمەوە. دوو تایبەتمەندیی باس کرد. لەگێڕانەوەی نەسائی لەم فەرموودەیەدا هاتووە: لەسجوددا ئەیفەرموو.

ئەبو داوود و نەسائی لەفەرمووده‌یه‌کی ئوبەی کوڕی کەعب باسیانکردووه، ئەڵێ:پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەویتردا ئەمانەی ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ **الأعلى ١**، ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ **الكافرون ١**، ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ **الإخلاص ١** ، کە سەلامی دایەوە سێ جار فەرمووی:"سُبحانَ المَلِكِ القُدُّوس"، لەسێیەم جاردا دەنگی درێژتر و بەرزتر کردەوە. ئەمە لەفزی نەسائییە، دارەقوتنییش ئەمەی زیاتر کردووه بۆی:"رب الملائكة والروح"[1].

## ١٣- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەقورئانخوێندنەوەدا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) قورئانخوێندنەکەی دەبڕی و لەسەر هەموو ئایەتێك رادەوەستا. ئەلزوهری باس دەکات کە خوێندنەوەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئایەت ئایەت بووە. ئەوەش باشترە کە لەسەر هەموو ئایەتێك وەستان بکرێت ئەگەر ئەوەی دواییش پەیوەندیی پێوەی هەبێ. هەندێ لەقورئانخوێنان بەدوای مەبەست و نیازەکاندا رۆیشتوون، لەکوێ کۆتایی هاتبێ راوەستاون، لەپێشترە شوێن ڕێبازی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بکەوین.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سورەتی یەك لەیەك درێژتری خوێندووه، جاری وا هەبوو هەتا بەیانی یەك ئایەتی دووبارە دەکردەوە. خەڵکیی جیاوازییان هەیە لەبارەی تەرتیل لەگەڵ خوێندنەوەی کەم یان خێرایی لەگەڵ زۆر خوێندنەوە، ئاخۆ کامەیان باشترین؟ بۆ ئەوە بوونەتە دوو بەشەوە.

دروست لەم بابەتەدا ئەوەیە بووترێت: پاداشتی خوێندنەوەی تەرتیل و وردبوونەوە باشتر و بەنرخترە، لەهەمانکاتدا پاداشتی زۆر خوێندنەوە لەڕووی ژمارەوە زۆرترە. لەسەحیحی بوخاری لەقەتادەوە هاتووە وتوویەتی: لەئەنەسم پرسی لەبارەی

---

[1] – دارەقوتنی٢/٣٥٥(١٦٦٠)ئیخراجی کردووه، هەروەها ئەبو داوود(١٤٣٠) و نەسائی(١٦٩٩) ئیخراجیان کردووه.

قورئانخوێندنی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەویش وتی: درێژی دەکردەوە[1].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەندێجار قورئانخوێندنی لەشەونوێژدا بێدەنگانە بوو، هەندێجاریش بەدەنگی بەرز بوو، هەندێجار ماوە درێژ و هەندێجاریش ماوە کورت بوو.

## ١٤- رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەنوێژی تەتەوع(سوونەت) لەسەر ولاخەکەی

لەشەو و رۆژ لەسەر ولاخەکەی لەسەفەردا نوێژی سوونەتی کردووە ولاخەکەی رووی لەهەرکوێ کردبێت، بەئاماژە رکوع و سجودی بردووە، سجودی ماوە کەمتر بووە لەڕکوعی، ئەحمەد و ئەبو داوود گێڕاویانەتەوە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتوویەتی:پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەگەر بیویستبایە لەسەر ولاخەکەی نوێژی تەتەوع بکات، رووی دەکردە قیبلە و (الله أکبر)ی دەکرد، پاشان ئەیهێشت ولاخەکەی روو لەکوێ بکات، رووی لێ بکات و ئەویش نوێژی خۆی دەکرد[2].

## ١٥- رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەنوێژی چێشتەنگاودا

بوخاری لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتوویەتی: هەرچکاتێ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)م بینیبێ نوێژی چێشتەنگاوی کردبێ، منیش ئەو نوێژەم کردووە[3].

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٠٤٥).

[2] – ئەحمەد٢٠/٣٧٧(١٣١٠٩)، ئەبو داوود(١٢٢٥) ئیخراجیان کردووە، بنچینەکەی لەبوخاری(١١٠٠) و موسلیم(٧٠٢) دایە.

[3] – بوخاری(١١٢٨) و موسلیم(٧١٨) ئیخراجیان کردووە.

هەروەها گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەی موەڕیق ئەلعجلییەوە: بەئیبن عومەرم وت: ئایە نوێژی چێشتەنگاو ئەنجام دەدەی؟ وتی: نە. وتم: عومەریش نەیکردووە؟ وتی: نە. وتم: ئەبوبەکریش؟ وتی: نە. وتم: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)؟ وتی:گرنگیی پێ نەدا[1].

لەسەحیحی موسلیم لەعائیشەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا لەچێشتەنگاودا چوار رکاتی دەکرد، کە خوای گەورە بیویستبایە زیاتری ئەکرد[2].

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئوم هانیئەوە: کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی فەتحدا هەشت رکاتی کرد، لەچێشتەنگاویشدا بەو جۆرەی دەکرد[3].

خەڵکیی لەبارەی ئەو فەرموودانەوە بوونەتە چەند بەشێکەوە:

١- هەندێکیان ئەنجامدانیان بارسەنگ داناوە بەسەر نەکردنیدا، بەوەی جێگیر بووە و سەلماوە و زیادەیەکی تێدا هەیە بەلای رەتکەرەوەیەوە دیار نەبووە. وتوویانە: عائیشە و ئەنەس و جابر و ئوم هانیئ و عەلی کوڕی ئەبو تالیب هەواڵیان داوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی داوە و ئەو نوێژەی کردووە. وتوویانە: ئەوەی پاڵپشتیی ئەم فەرموودە سەحیحە دەکات، ئەوەیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خۆی ئامۆژگاریی داوە ئەنجام بدرێت و پارێزگاریی لێ بکرێت، پیاهەڵدانی ئەو کەسەی کردووە ئەنجامی دەدات، لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: موحەممەدی خۆشەویستم(صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاریی کردم بەڕۆژووی سێ ڕۆژی هەموو مانگێك و دوو رکاتەی نوێژی چێشتەنگاو و ئەوەی پێش خەوتن نوێژی ویتر ئەنجام بدەم[4].

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(١١٧٥).

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٧١٩).

[3] – بوخاری(٣٥٧) و موسلیم(٣٣٦) ئیخراجیان کردووە.

[4] – بوخاری(١١٧٨) و موسلیم(٧٢١) ئیخراجیان کردووە.

٢- کۆمەڵی دووەم: رۆیشتوون بەلای فەرموودەکانی تەرککردنی و لەڕووی سەنەدەوە بەبارسەنگی دەزانن و هاوەڵان کاریان پیێ کردووە، بوخاری لەئیبن عومەرەوە گێڕاویەتییەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی نەداوە و ئەبو بەکر و عومەریش ئەنجامیان نەداوە، وتم: پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)؟ وتی:گرنگیی پێ نەدا[١].

٣- کۆمەڵێ سێیەم: رۆیشتوون بۆ ئەوەی سوننەتە(موستەحەبە) ناوە ناوە ئەنجام بدرێت، هەندێ رۆژ ئەنجام بدرێت و هەندێجار ئەنجام نەدرێت، ئەمە یەکێکە لەدوو گێڕانەوەی لای ئەحمەد، تەبەری لەکۆمەڵێکەوە گێڕاویەتییەوە ئەڵێ: ئەوە دەکەنە بەڵگە کە لای ئەلجورەیری هاتووە لەعەبدوللەی کوڕی شەقیقەوە ئەڵێ: وتم بەعائیشە: ئایە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ وتی: نە، تەنیا ئەوە نەبێ کە لەسەفەر دەگەڕایەوە. پاشان ئەڵێ: ئەوانەی لەپێشین ئەوەیان ئەنجام دەدا ئەوەیان باس دەکرد[٢].

٤- کۆمەڵی چوارەم بۆ ئەوە رۆیشتوون: تەنیا لەبەر هۆکارێك ئەنجام دراوە، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) لەبەر هۆکارێك ئەنجامی داوە.

هەرکەسێ لەو فەرموودە مەرفوعانە و شوێنەواری هاوەڵان رابمێنێ، دەبینێ هەر لەسەر ئەو قسەیە بەڵگە دەدەن، هەرچی ئەو فەرموودانەیە کە برەو و رەغبەت بۆ ئەنجامدانی ئەو نوێژە دروست دەکەن و ئامۆژگاریی دەکەن بۆ ئەنجام دانی، دروست تیایدا وەك فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە و ئەبو زەڕ، ئەوە بەڵگە نادەن لەسەر ئەوەی سوونەتێکی رەواتیبە بۆ هەموو کەسێك، بەڵکو تەنیا ئامۆژگاریی ئەبو هورەیرەی کردووە بۆ ئەو ئەنجامدانی ئەو نوێژە، چونکە دەگێڕدرێتەوە کە ئەبو هورەیرە لەشەواندا وانەخوێندنی بەسەر قورئانخوێندنا پێشخستووە، بۆیە

---

[١] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١١٧٥).

[٢] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٧١٧).

فرمانی پێکردووه لەجیاتی شەونوێژەکەی، نوێژی چێشتەنگاو ئەنجام بدات، بۆیە فرمانی پێ کردووە هەتا ویتر نەخوێنێ نەخەوێت، بەوەش فرمان بەئەبو بەکر و عومەر و تەواوی هاوەڵان نەکراوە.

## ١٦-رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسوجدەی شوکر (سوپاسگوزاری)

یەکێك لەڕێبازی خۆی و هاوەڵانی، سوجدەی سوپاسگوزاریی بووە لەکاتی نوێبوونەوەی نیعەتێك کە مایەی دڵخۆشیی بێ یان لەکاتی لابردنی نەهامەتییەك سوجدەی سوپاسگوزارییان بردووە، هەروەك لە(المسند) لەئەبی بەکرەوە هاتووە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر هەواڵێکی دڵخۆشکەری پێ بگەیشتبایە، یەکسەر بۆ خوای گەورە دەچووە سوجدە.

کەعبی کوڕی مالیك کە هەواڵی پێگەیشت خوای گەورە لێیخۆش بووە، یەکسەر چووە سوجدە. بوخاری باسی کردووە[١].

## ١٧- رێبازی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسوجدەی نێو قورئاندا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە بەسوجدەیەکدا تێپەڕ بووایە،(الله أكبر)ی دەکرد و سوجدەی دەبرد، لەسوجدەیدا دەیفەرموو:"سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ،بحوله وقُوَّته"[٢]،واتا: ڕووم چووە سوجدە بۆ ئەو خوایەی کە ڕووی منی دروست کردووە و نەخشاندوویەتی و بەهێز و توانای خۆی، بیستن و بینین لێ دروستکردووە.

---

[١]- سەحیحی بوخاری(٤٤١٨).

[٢]- ئەبو داوود(١٤١٤) و ترمیزی(٥٨٠) ئیخراجیان کردووە.

فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ احْطُطْ عَنِّي بِهَا وِزْرًا، وَاكْتُبْ لِي بِهَا أَجْرًا، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْرًا، وتقبَّلها مني كما تقبلتَ من عبدِك داوود"[1]،واتا: خوایە گیان بەم سوجدەیە تاوانم لەسەر بسڕەوە، پاداشتم لەسەری بۆ بنووسە و لای خۆت بۆم گەنجینەی بکە، لێمی قبولّ بکە هەروەك لەبەندەی خۆت داوود قبولّت کردووە. خاوەن سووننەکان باسی ئەو دوو ویردەیان کردووە.

لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەگوازراوەتەوە لەهەڵسانەوە لەو سوجدەیەدا (الله أکبر)ی کردبێ، تەحیات و سەلامدانەوەشی لێ نەگوازراوەتەوە.

دروست گوازراوەتەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سوجدەی بردووە لە(ألم تنزیل) و لە(ص) و لە(النجم) و لە(إذا السماء أنشقت) و لە(اقرأ باسم ربك الذي خلق).

ئەبو داوود لەعەمری کوڕی عاصەوە باسیکردووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پانزە سوجدەی بۆ خوێندووەتەوە، لەوانە سیانی لە(المفصَّل) و دوو سوجدەش لە(الحجّ)[2].

## ١٨- ڕێبازی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەڕۆژی جومعە و باسکردنی تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕۆژە

لەسەحیحی موسلیمدا لەئەبو هورەیرەو حوزەیفەوە(خوایان لێ ڕازیی بێ) وتوویانە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"أَضَلَّ اللَّهُ عَنْ الْجُمُعَةِ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا، فَكَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ، وَكَانَ لِلنَّصَارَى يَوْمُ الْأَحَدِ، فَجَاءَ اللَّهُ بِنَا فَهَدَانَا اللَّهُ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَجَعَلَ الْجُمُعَةَ وَالسَّبْتَ وَالْأَحَدَ، وَكَذَلِكَ هُمْ تَبَعٌ لَنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، نَحْنُ

---

[1] – ترمیزی(٥٧٩) و ئیبن ماجە(١٠٥٣) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ئەبو داوود(١٤٠١) و ئیبن ماجە(١٠٥٧) ئیخراجیان کردووە.

الْآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، وَالْأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، المَقضي لهم قبلَ الخلائِق"[1]واتا: خوای گەورە ئەوانەی پێش ئێمەی لەگەورەیی ڕۆژی جومعە وێڵ کرد و لابرد، جولەکە ڕۆژانی شەممەیان هەبوو، گاورانیش ڕۆژانی یەکشەممە، ئینجا خوای گەورە ئێمەی هێنا و ڕۆژی جومعەی بۆ دیاریی کردین، کردیە جومعە و شەممە و یەکشەممە، بۆیە ئەوان لەڕۆژی قیامەتدا لەدوای ئێمەوە دێن،ئێمە لەدونیادا کۆتا خەڵکین، لەقیامەتیشدا لەپێشی پێشەوەین و پێش ئەوانی تر لێپرسینەوەمان یەکلا دەکرێتەوە.

لەجامیعی ترمیزییدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ"[2]،واتا: باشترین ڕۆژێك خۆری تێدا هەڵهاتبێ ڕۆژی جومعە بووە، ئادەم لەو ڕۆژەدا دروست کرا، لەو ڕۆژەدا خرایە بەهەشت و لەو ڕۆژەشدا تێیدا دەرکرا، قیامەتیش تەنیا لەڕۆژی جومعەدا هەڵدەستێ.

مالیك لە(الموطّأ)دا لەئەبو هورەیرەوە بەمەرفوعیی ئەگێڕێتەوە:"وَفِيهَا سَاعَةٌ لا يُصَادِفُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئًا إِلا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ"[3]،واتا:لەڕۆژانی جومعەدا کاتژمێرێك هەیە هەر موسڵمانێك لەو کاتەدا نوێژ بکات و داوای هەر شتێك بکات، خوای گەورە پێی ئەبەخشێ.

---

[1] – سەحیحی موسلیم(٨٥٦).

[2] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٤٨٨) هەروەها موسلیم(٨٥٤) و ئەبو داوود(١٠٤٦) و نەسائی(١٣٧٣).

[3] – مالیك١/١٠٨(١٥) و ئەبو داوود(١٠٤٦) ئیخراجیان کردووە.

## ١٩- سەرەتای جومعە

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: لەعەبدولڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە وتی: من چاوساغی باوکمم بووم کاتێ چاوەکانی لەدەست دا، کاتێ دەمبرد بۆ جومعە گوێی لەبانگ دەبوو، داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەبو ئومامە ئەسعەدی کوڕی زوراره دەکرد، کەمێك لەسەری بەردەوام بوو، بۆیە وتم: ئەمە بێتواناییەتی بۆیە راوەستاوە با لێی نەپرسم، بردم وەك چۆن خۆم دەردەچووم، کە گوێی لەبانگی جومعە بوو، بۆی پاڕایەوە، وتم: باوکە گیان ئەوە چییە ئەوەندە بۆ ئەسعەدی کوڕی زوراره ئەپاڕێیتەوە؟ وتی: کوڕی شیرینم، ئەسعەد یەکەمین کەسێك بوو پێش هاتنی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمەدینە کۆی دەکردینەوە لە(هَزمِ النبیت) لەشوێن و تاوێرێکی نەوەی بەیازە لەگۆماوێکدا پێیدەوترێ: نقیع الخضمات. وتم: ئەوکات چەند کەس دەبوون؟ وتی: چل پیاو بووین.

وتم: ئەوە سەرەتای جومعە بوو، پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هاتە مەدینە و لەقوبائدا لەنەوەی سالمی کوڕی عەوف مایەوە و مزگەوتەکەی بۆیان دروست کرد، پاشان لەڕۆژی جومعە دەرچوو، لەنەوەی سالمی کوڕی عەوف کاتی جومعە بوو، جومعەی لەو مزگەوتەدا ئەنجام دا کە لە(بطن الوادي) بوو، ئەوە یەکەمین جومعەیەك بوو لەمەدینەدا ئەنجامی دا، ئەوەش پێش دروستکردنی مزگەوتەکەی خۆی، مزگەوتی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم).

## ٢٠- تایبەتمەندییەکانی رۆژی جومعە

یەکێك لەڕێباز و رێنیشاندەرییەکانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، گەورە راگرتن و تایبەتکردنی ئەو رۆژەیە بەهەندێ پەرستش کە بۆ رۆژانی تر تایبەت نەبووە.

شەرعناسان ناکۆکن لەوەدا، رۆژی جومعە فەزڵی زۆرترە یان عەرەفە؟ بۆ ئەوە بوونەتە دوو بۆچوونەوە و هەردوو بۆچوون هی شەرعناسانی شافیعیین.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەنوێژی بەیانییدا ئەمەی خوێندەوە:﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ﴾ و ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ﴾.

زۆربەی ئەوانەی زانستیان نییە وەهای گومان دەکەن، کە مەبەست بەوە، تایبەتکردنی ئەو نوێژەیە بەسوجدەیەکی زیاتر کە ناوی دەبەن بەسوجدەی جومعە،بۆیە ئەگەر یەکێکیان ئەو سورەتەی نەخوێند، بەلایانەوە سوونەت و رێپێدراوە سورەتێکی تر بخوێنن سوجدەی تێدا هەبێ، بۆیە هەندێ لەپێشەوایان بەمەکروهیان داناوە لەبەیانیی رۆژی جومعەدا لەسەر خوێندنەوەی ئەو سورەتە بەردەوامیی بکرێت، ئەوەش لادانی گومانی ئەو نەزانانەیە.

گوێم لەشێخ ئەلئیسلام ئیبن تەیمییە بوو ئەیووت: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەو دوو سورەتەی لەبەیانیانی جومعەدا خوێندووەتەوە، چونکە لەخۆگری ئەوەن کە لەرۆژی جومعەدا شتانێك رووی داوە و روو دەدەن، چونکە لەو رۆژەدا ئادەم(سەلامی خوای لەسەربێ) دروستکراوە، باسی قیامەت و حەشری مەخلوقات هەیە[1]. ئەوە یەکێکە لەتایبەتمەندییەکانی رۆژی جومعە.

**تایبەتمەندی دووەم:** موستەحەب و سوونەتبوونی زۆر سەلاوات دان لەسەر پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەشەو و رۆژی جومعەدا، بەبەڵگەی فەرمایشتی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم):"أَكْثِرُوا مِنَ الصَّلَاةِ عَلَيَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلَيْلَةَ الجُمُعَةِ"[2]،واتا:لەرۆژ و شەوی جومعەدا سەلاواتی زۆرم لەسەر بدەن.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گەورەی مەخلوقاتە، رۆژی جومعەش گەورەی رۆژەکانە، بۆیە سەلاواتدان لەدیاری، تایبەتمەندییەکە بۆ هیچ کەسێکی تر نییە، ئەمەو لەگەڵ بوونی حیکمەتێکی تر، ئەویش ئەوەیە ئوممەتەکەی لەدونیا و ئاخیرەتدا خێر و خۆشییەکی دەستخستووە و لەسەر دەستی ئەو دەستیخستووە،

---

[1] – الفتاوی الکبری لابن تیمیة٢/٣٦٠.

[2] – ئەبو داوود(١٠٤٧) و نەسائی(١٣٧٤) و ئیبن ماجە(١٠٨٥) ئیخراجیان کردووە.

خوای گەورە بەبوونی ئەوەوە خێری دونیا و قیامەتی بۆ ئوممەتەکەی کۆکردووەتەوە، گەورەترین رێز و شکۆیەك بۆیان بەدیدێت و ئەو بەدیهاتنەش لەرۆژی جومعەدایە، لەرۆژی جومعەدا ئەیان نێرێ بۆ ماڵ و کۆشکەکانیان لەبەهەشت، ئەوە(یوم المزید)ە کاتێ دەچنە بەهەشتەوە،لەدونیادا رۆژی جەژنە بۆیان، ئەو رۆژەیە کە خوای گەورە پێویستی و داواکانیان بۆ بەجێدەهێنێ و تکای داواکاریان رەتناکاتەوە، هەموو ئەوانەش بەهۆی ئەوەوە دەزانن و بۆیان بەدیهاتووە، بۆیە بەشێکی کەمی سوپاسگوزاری و ستایشە دەرهەقی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) کە لەو شەو و رۆژەدا سەڵاواتی زۆری لەسەر بدەین.

تایبەتمەندی سێیەم: نوێژی جومعە کە یەکێکە لەفەرزە جەختکراوەکانی ئیسلام و گەورەترین کۆربیەندی موسڵمانانە، گەورەترین و فەرزترین گردبوونەوەیەکە موسڵمانان تیایدا کۆدەبنەوە، جگە لەگردبوونەوەی رۆژی عەرەفە.

تایبەتمەندی چوارەم: فرمانکردن بەخۆشۆردن لەو رۆژەدا، فرمانێکی زۆر جەخت لەسەرکراوەیە، واجیببوونی بەهێزترە لەواجیببوونی ویتر.

لەبارەی واجیببوونییەوە خەڵکیی سێ بۆچوونیان هەیە: رەتکردنەوە(نەفی)، سەلماندن، باسی تێروتەسەل لەنێوان ئەوەی بۆنێکی پێوە هەیە و پێویستی بەوەیە ئەو بۆنە لابدات و واجیبە بەسەریەوە، کەسێکیش پێویستی پێ نەبێ بۆی موستەحەبە، هەرسێ بۆچوون هی هاوەڵانی ئەحمەدە.

تایبەتمەندی پێنجەم: خۆبۆنخۆشکردن لەو رۆژەدا،باشترە لەخۆبۆنخۆشکردن لەهەر رۆژێکی تری هەفتە.

تایبەتمەندی شەشەم: سیواککردن لەو رۆژەدا تایبەتمەندی بەسەر سیواککردن لەرۆژانی تردا هەیە.

تایبەتمەندی حەوتەم: (الله أکبر) بۆ نوێژ.

تایبەتمەندی هەشتەم: سەرقاڵبوون بەنوێژ و ویرد و قورئانخوێندنەوە تاوەکو ئیمام دەردەچێت.

تایبەتمەندی نۆیەم: بێدەنگبوون بۆ گوێگرتن لەوتار لەکاتی بیستنی وتار و لەدروستترین بۆچووندا ئەو کارە واجیبە.

تایبەتمەندی دەیەم:لەکاتی لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسماندا نوێژکردن لەو ڕۆژەدا مەکروه نییە، لەفەرموودەی سەحیحدا هاتووە:"لا يَغْتَسِلُ رَجُل يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَيتَطَهَّرُ ما اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِه، أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِه، ثُمَّ يَخْرُجُ فلا يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كتِبَ لَهُ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ إِلَّا غُفِرَ لَهُ ما بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى"[1]،واتا:هەر پیاوێك ڕۆژی جومعە خۆی بشۆرێ بەوەی چەندەی توانی، پاشان ڕۆن لەقژی بدات یان بۆنی ماڵەوەی لەخۆی بدات و پاشان دەربچێ بۆ مزگەوت و ئاژاوە و دابڕان نەخاتە نێوان دوو کەسەوە، پاشان نوێژەکەی بکات و پاشان بێدەنگبێ بۆ وتاری ئیمام، ئەوە خوای گەورە لەتاوانی نێوان ئەو جومعەیەی بۆ جومعەیەکی تر لێی خۆش ئەبێ. هەتا کاتی دەرکەوتنی ئیمام دەتوانێ نوێژ بکات، کە ئیمام دەرکەوت، دابنیشێ و گوێ لەوتارەکەی بگرێت.

یانزەیەم: خوێندنەوەی سورەتی(الجُمعة) و (المنافقین) یان (سبح) و (الغاشیة) لەنوێژی جومعەدا،پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی جومعەدا ئەو سورەتانەی خوێندووە، موسلیم لەسەحیحەکەیدا باسیکردووە[2].

دوانزەیەم: ڕۆژی جەژنە و لەهەفتەدا دووبارە دەبێتەوە.

سیانزەیەم: سوونەتە بۆ پیاو جوانترین بەرگ لەبەر بکات لەو بەرگەی کە لای خۆشەویستە، لەسوونەنی ئەبو داوودا هاتووە لەعەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە کە گوێی لەپەیامبەری خوا بووە(صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی جومعە لەسەر مینبەر

---

[1] – سەحیحی بوخاری(٨٨٣).

[2] – سەحیحی موسلیم(٨٧٨، ٨٧٩).

فەرموویەتی:"مَا عَلَى أَحَدِكُمْ لَوِ اشْتَرَى ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ سِوَى ثَوْبَيْ مِهْنَتِهِ"[1]،واتا:چی ئەبێ ئەگەر یەکێ لەئێوە دوو بەرگ بکڕێ بۆ ڕۆژی جومعە جگە لەبەرگی کار و پیشەکەی.

چواردەیەم: ئەگەر کاتی جومعە هات، بۆ کەسێ جومعەی لەسەر واجیببوو جائیز نییە سەفەر بکات، هەرچی سەفەری پێش کاتی وتاری جومعە بوو، ئەوە زانایان سێ بۆچوونیان لەسەر هەیە، هەرسێکی گێڕانەوەن لەئەحمەدەوە، یەکەم: جائیز نییە. دووەم: جائیزە. سێیەم: جائیزە تەنیا لەدەرچوون بۆ جیهاد.

ئەمە ئەگەر کەسی موسافیر نەترسا لەوەی هاودەمیی هاوڕێکانی سەفەری لەدەست نادات، بەڵام ئەگەر ترسا خۆی دوابکەوێ هاوڕێکانی دەڕۆن، ئەوە ڕەهایانە بۆی جائیزە ئەو سەفەرە بکات، چونکە ئەوە عوزرێکە فەرزی جومعە و جەماعەتی لەسەر لادەبات.

پانزەیەم: ئەو کەسەی بەپێ دەچێت بۆ جومعە، بۆ هەر هەنگاوێك پاداشتیساڵێکی هەیە بەڕۆژوو و شەونوێژییەوە. عەبدولڕەزاق ئەڵێ: لەئەوسی کوڕی ئەوسەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَبَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ فَأَنْصَتَ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا صِيَامُ سَنَةٍ وَقِيَامُهَا وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ"[2] ،واتا: هەرکەسێ ڕۆژی جومعە خۆی بشۆرێ،(الله أكبر) بکات و زوو بچێ بۆ مزگەوت و لەڕیزی ئیمام نزیکبێتەوە و گوێ بگرێ لەئیمام، ئەوە بۆ هەر هەنگاوێك کە ئەینێ، پاداشتی ڕۆژوو و شەونوێژی ساڵێکی بۆ دەنووسرێ و ئەوە بۆ خوای گەورە ئاسانە. ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتییەوە لەموسنەدەکەیدا[3]، ئیمام ئەحمەد ئەڵێ: غَسَّلَ،واتا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جووت بوو، وەکیعیش ئاوەهای لێکداوەتەوە.

---

[1] - ئەبو داوود(١٠٧٨) و ئیبن ماجە(١٠٦٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - عەبدولڕەزاق ئیخراجی کردووە لە(مصنف)ەکەیدا٣/٢٥٩(٥٥٧٠).

[3] - ئەحمەد ئیخراجی کردووە٢٦/٩٢(١٦١٧٢).

شانزەیەم: رۆژی سڕینەوەی گوناهەکانە، لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە لەسەلمانەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"لا يَغْتَسِلُ رَجُل يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَيَتَطَهَّرُ ما اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ، أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيب بَيْتِه، ثُمَّ يَخْرُجُ فلا يُفَرِّقُ بَيْن اثْنَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كتبَ لَهُ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ إِلَّا غُفِرَ لَهُ ما بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرىَ"[1]،واتا:هەر پیاوێك رۆژی جومعە خۆی بشۆرێ بەوەی چەندەی توانی،خۆی پاك بكاتەوە، پاشان رۆن لەقژی بدات یان بۆنی ماڵەوەی لەخۆی بدات و پاشان دەربچێ بۆ مزگەوت و ئاژاوە و دابڕان نەخاتە نێوان دوو كەسەوە، پاشان نوێژەكەی بكات و پاشان بێدەنگبێ بۆ وتاری ئیمام، ئەوە خوای گەورە لەتاوانی نێوان ئەو جومعەیەی بۆ جومعەیەكی تر لێی خۆش ئەبێ.

حەڤدەیەم: لەڕۆژی جومعەدا كاتێك هەیە خوای گەورە تیایدا بەدەم داوای بەندەكانەوە دێت، مرۆڤی موسڵمان لەو كاتەدا داوای هەرچی بكات، خوای گەورە پێی دەدات، لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەكی ئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) كە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ"[2]،واتا:لەڕۆژی جومعەدا كاتژمێرێك هەیە، هەر موسڵمانێك لەو كاتژمێرەدا سەرقاڵی نوێژ و پاڕانەوە بێ، داوای هەرچی بكات، خوای گەورە پێی دەدات.

خەڵكیی لەبارەی ئەو كاتژمێرەوە بەسەر دوو بۆچووندا دابەشبوونە: ئاخۆ ماوەتەوە یان هەڵگیراوە؟ ئیبن عەبدولبیر[3] و كەسانی تر گێڕاویانەتەوە. ئەوانەی وتوویانە: ماوەتەوە و هەڵنەگیراوە لەبارەی كاتەكەیەوە جیاوازن: ئاخۆ كاتەكەی دیاریكراوە یان نە؟ بۆ ئەوە بوونەتە دوو بەشەوە. ئەوانەی دەستنیشانیان كردووە

---

[1] - سەحیحی بوخاری(٨٨٣).

[2] - بوخاری(٩٣٥) و موسلیم(٨٥٢) ئیخراجیان كردووە.

[3] - (التمهيد)ی ئیبن عەبدولبیر١٩/١٧-١٩.

بەسەر یانزە بۆچووندا جیاوازبوون. بارسەنگترینی نێو ئەو بۆچوونانە دوو بۆچوونە، هەردووکیان فەرموودەی جێگیر لەخۆی گرتوون و یەکێکیان لەوی تریان بارسەنگترە.

بۆچوونی یەکەم: کاتەکەی لەنێوان دانیشتنی ئیمامدایە تاوەکو تەواوبوونی نوێژ، بەڵگەی ئەم بۆچوونە، ئەوەیە کە موسلیم گێڕاویەتییەوە لەسەحیحەکەیدا لەفەرموودەیەکی ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسا، بەوەی عەبدوڵڵەی کوڕی عومەر پێیووتووە: ئاخۆ لەباوکت بیستووە و گوێت لێبووە لەبارەی کاتژمێری جومعەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) شتێکی گێڕابێتەوە؟ وتی: بەڵێ، گوێم لێبوو ئەیوت: گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) ئەیفەرموو:"هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلاَةُ"[1]،واتا: کاتەکەی لەنێوان دانیشتنی ئیمامە تاوەکو تەواوبوونی نوێژ.

بۆچوونی دووەم: لەدوای عەسرە، ئەمە بارسەنگترینی هەردوو بۆچوونە، بەڵگەی ئەم بۆچوونە، ئەوەیە کە ئەبو داوود و نەسائی گێڕاویانەتەوە لەجابرەوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:"يَوْمُ الْجُمُعَةِ اثْنَا عَشَرَ سَاعَةً، فِيهَا سَاعَةٌ لَا يُوجَدُ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ، فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ"[2]،واتا:ڕۆژی جومعە دوانزە کاتژمێرە، کاتژمێرێکی تێدایە هەر موسڵمانێك لەو کاتژمێرەدا داوای هەرشتێك لەخوای گەورە بکات، خوای گەورە پێی دەبەخشێت، ئەو کاتژمێرەش لەدوای عەسر دەستیبخەن.

هەژدەیەم: لەو ڕۆژەدا نوێژی جومعە هەیە کە خوای گەورە لەنێو هەموو نوێژە فەرزەکاندا بەکۆمەڵێ تایبەتمەندی، تایبەتی کردووە کە لەوانی تردا ئەو تایبەتمەندییانە بوونی نییە: لەگردبوونەوە و ژمارەی تایبەت و مەرجی ئەوەی

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٥٣).

[2] - ئەبو داوود(١٠٤٨) و نەسائی(١٣٨٩) ئیخراجیان کردووە.

دانیشتووی ئەو شوێنە بێت و خوێندنەوەی بەدەنگ. توندی و جەخت لەسەرکردنەوەیەکی لەسەر هاتووە تەنیا بۆ نوێژی عەسر هاتووە.

نۆزدەیەم: ئەو وتارەی تێدایە کە مەبەست پێی سوپاس و گەورە راگرتنی خوای گەورە و شایەتیدانی یەکتاپەرستی و پەیامداریێتیی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) و بیرهێنانەوەی رۆژگاری خوایە بۆ بەندەکانی و هەڕەشە و وریاکردنەوەیانی تێدایە لەتووڕەیی خوای گەورە و ئامۆژگاریکردنیانە بۆ نزیکبوون لەخوای گەورە و بەهەشتەکەی و رێگریکردنیانە لەهەر شتێ نزیکیان بخاتەوە لەتووڕەیی و دۆزەخی خوای گەورە، لەو وتارە و کۆبوونەوەی ئەو رۆژەدا هەر ئەوە مەبەستە.

بیستەم: ئەو رۆژەیە کە سووننەت و موستەحەبە بەندە تیایدا یەکلابێتەوە بۆ خواپەرستی، بەجۆرەها پەرستشی واجیب و سووننەت تایبەتمەندیی بەسەر رۆژەکانی تردا هەیە. خوای گەورە بۆ هەر میللەتێك رۆژێکی داناوە تیایدا یەکلاببنەوە بۆ خواپەرستی و دوورکەوتنەوە لەسەرقاڵییەکانی دونیا، بۆیە رۆژی جومعەش رۆژی خواپەرستییە، لەنێو رۆژەکانی تردا وەك مانگی رەمەزانە لەنێو تەواوی مانگەکانی تردا، کاتی قبوڵبوونی دوعا تیایدا، وەك شەوی قەدرە لەمانگی رەمەزاندا، بۆیە هەرکەسێ رۆژی جومعەی سەلامەت و رێك و راست بوو، ئەوە تەواوی هەفتەکەی سەلامەت دەبێ، هەرکەسێکیش رەمەزانی سەلامەت و دروست بوو، ئەوە تەواوی ساڵەکەی بۆ سەلامەت دەبێ، هەرکەسێ حەجەکەی سەلامەت بوو، ئەوە تەواوی تەمەنی سەلامەت دەبێ، بۆیە رۆژی جومعە تەرازووی هەفتەیە، رەمەزانیش تەرازووی ساڵە، حەجیش تەرازووی تەمەنە، سەرکەوتن و سەرفرازیش بەخوای گەورەیە.

بیست و یەك:لەبەر ئەوەی جومعە لەهەفتەدا وەك جەژنە لەساڵدا و جەژنیش نوێژ و قوربانیی لەخۆگرتووە و رۆژی جومعەش رۆژی نوێژە، ئەوە خوای گەورە خێراکردن

لەڕۆیشتن بۆ مزگەوتی لەجیاتی ئەو قوربانییە داناوە، بۆ ئەو کەسەی زوو دەچێت بۆ مزگەوت لەو ڕۆژەدا، نوێژ و قوربانیی بۆ کۆکردووەتەوە وەك لەسەحیحەیندا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"مَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْأُولَى فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ"[١]،واتا:هەرکەسێ لەکاتژمێری یەکەمدا بچێ بۆ مزگەوت، وەك ئەوەیە وشترێکی کردبێتە قوربانی، هەرکەسێکیش لەکاتژمێری دووەمدا بچێ، وەك ئەوەیە مانگایەکی کردبێتە قوربانی، هەرکەسێکیش لەکاتژمێری سێیەمدا بچێ، وەك ئەوەیە بەرانێکی شاخداری کردبێتە قوربانی.

شەرعناسان لەسەر ئەو کاتژمێرانە بوونەتە دوو بەشەوە:

یەکەم:سەرەتای ڕۆژە،ئەوە ناسراوە لەمەزهەبی شافیعی[٢] و ئەحمەد[٣] و ئەوانی تردا.

دووەم: بەشێکە لەکاتژمێر شەشی دوای لادانی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان، ئەمە بەناوبانگە لەمەزهەبی مالیك[٤] و هەندێ لەشافیعییەکانیش هەڵیانبژاردووە[٥].

منیش ئەڵێم: چەقی ڕەتکردنەوەی ئەوەی شەبەق(التبكير) لەسەرەتای ڕۆژدا نییە،لەسەر سێ شت وەستاوەتەوە: بێژەی(الرواح) کە تەنیا لەدوای خۆرئاوابوون، دووەم: بێژەی(التهجير) کە لە(الهاجرة) و لەکاتی گەرمای سەختدا ئەبێ، سێیەم: بەکاری ئەهلی مەدینە، ئەوان لەسەرەتای ڕۆژدا نەدەهاتن.

هەرچی بێژەی(الرواح)ە، گومان لەوەدا نییە بەماوەی دوای خواربوونەوەی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان دەوترێت، بەزۆری ئەگەر لەگەڵ بەرەبەیاندا بەراورد بکرێت، الرواحُ بەواتای ڕۆیشتن و چوون و ڕابوورد دێت.

---

[١] - بوخاری(٨٨١) و موسلیم(٨٥٠) ئیخراجیان کردووە.

[٢] - بروانە: بحر المذهب للروياني٢/٤١٢، المجموع للنووي٤/٥٤٠.

[٣] - المغني لابن قدامة٣/١٦٤.

[٤] - المنتقى للباجي١/١٨٣.

[٥] - بروانە: نهاية المطلب للجويني٢/٥٦٥، المجموع للنووي٤/٥٤٠.

هەرچی وشەی(التهجیر والهجیر و المهجر)ە، لە(الهجر والهاجرة)ەوە هاتوون، ئەلجەوهەری ئەڵێ: نیوەڕۆیە لەکاتی گەرمای سەختدا، ئەوتریێ: هجر النهار، واتا نیوەڕۆی گەرم[1]. ئەوانی تر ئەڵێن: قسەکردن لەبارەی بێژەی(التهجیر) وەك قسە کردنە لەبارەی بێژەی(الرواح) و مەبەست پێی شەبەقییە.

هەرچی ئەوەی خەڵکی مەدینە لەسەرەتای ڕۆژدا نەڕۆیشتوون بۆ جومعە، ئەمە کاری ئەوان بووە لەسەردەمی مالیکدا(خوای لێ ڕازیی بێ) و حوججە و بەڵگە نییە و لای ئەوەش کە ئەڵێ: کۆدەنگیی خەڵکی مەدینە بەڵگە و حوججەیە، لەو کارەدا تەنیا ئەوەیە واز لەڕۆیشتن بۆ جومعە هێنراوە لەسەرەتای ڕۆژدا، بەپێی پێویست و ناچاریی ئەوە جائیزە، ئەکرێ کەسێك سەرقاڵ بێ بەکار و بژێویی خۆی و ماڵ و منداڵییەوە تاوەکو کاروبارەکانی تری دین و دونیای و ئەوە باشترە بەجێیبهێنێ تاوەکو لەسەرەتای ڕۆژدا بچێت بۆ جومعە.

بیست و دوو: ڕۆژێکە کە خوای گەورە لەبەهەشتدا تیایدا خۆی پیشانی باوەڕداران دەدات، سەردانی دەکەن، ئەوەندە لێیەوە نزیك دەبن زیاتر لەنزیکبوونەوەی دونیایان لەئیمامی مزگەوت، ئەوانەی کە پێشدەکەون بۆ سەردانیکردنی، ئەوانەن کە لەدونیادا پێشدەکەون بۆ گەیشتنە جومعە.

بیست و سێ: ئەو ڕۆژەیە کە جگە لەشەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە، ئاسمانەکان و زەوی و چیا و دەریاکان و تەواوی مەخلوقات ترس و تۆقین دایانەگرێ، لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم):"لَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ وَلَا تَغْرُبُ عَلَى يَوْمٍ أَفْضَلَ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَمَا مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا وَهِيَ تَفْزَعُ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ إِلَّا هَذَيْنِ الثَّقَلَيْنِ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ"[2]،واتا:خۆر لەهیچ ڕۆژێکدا هەڵنایەت و ئاوا نابێ باشتربێ لەهەڵهاتن و ئاوابوونی لەڕۆژی جومعەدا، هیچ

[1] – الصحاح للجوهري٢/٨٥١.

[2] – ئەحمەد١٢/١١٦(٧٦٨٧) ئیخراجی کردووە، بنچینەکەی لەبوخاری(٨٨١) و موسلیم(٨٥٠)دایە.

گیاندارێك نییە لەڕۆژی جومعەدا نەترسێ و ترس داینەگرێ جگە لەجنۆکە و مرۆڤ. فەرموودەیەکی سەحیحە. ئەو ڕۆژەیە کە قیامەتی تێدا هەڵدەستێ و جیهان دەپێچرێتەوە و دونیا کاول و وێران دەبێت و خەڵکیی تیادا زیندوو دەکرێتەوە بۆماڵەکانیان لەبەهەشت و دۆزەخدا.

بیست و چوار: ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە بۆ ئەم ئوممەتە هێشتیەوە و ئەهلی کیتابی لێ وێڵ کرد، هەروەك لەسەحیحدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَلَا غَرَبَتْ عَلَى يَوْمٍ خَيْرٍ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، هَدَانَا اللَّهُ لَهُ، وَضَلَّ النَّاسُ عَنْهُ، فَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ، هُوَ لَنَا، وَلِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ وَلِلنَّصَارَى يَوْمُ الْأَحَدِ"[1]،واتا:خۆر لەڕۆژێکدا هەڵنەهاتووە و ئاوابێ باشتربێ لەڕۆژی جومعە، خوای گەورە ڕێنمایی ئێمەی کرد بۆ ئەو ڕۆژە و خەڵکیی تری لێ وێڵ کرد، لەوەدا خەڵکیی دوای ئێمە کەوتوون، ئەو ڕۆژە هی ئێمەیە، جولەکە ڕۆژانی شەممەی هەیە و گاورەکانیش ڕۆژانی یەکشەممە.

بیست و پێنج: لەنێو ڕۆژەکانی هەفتەدا جومعە هەڵبژاردەی خوای گەورەیە، هەروەك لەنێو مانگەکانی ساڵدا مانگی ڕەمەزانی هەڵبژاردووە، لەنێو شەواندا (ليلةُ القَدرِ)ی هەڵبژاردووە، لەزەوییدا مەککەی هەڵبژاردووە، لەنێو مرۆڤەکانیشدا موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)ی هەڵبژاردووە.

بیست و شەش: مەکروهی داناوە ڕۆژانی جومعە بەتەنیا ڕۆژووی تێدا بگیردرێ، لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"لاَ تَخْتَصُّوا لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيَالِى وَلاَ تَخُصُّوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِصِيَامٍ مِنْ بَيْنِ الأَيَّامِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِى صَوْمٍ يَصُومُهُ

[1] – ئەحمەد١٦/٤٢١(١٠٧٢٣) ئیخراجی کردووە، بنچینەکەی لەبوخاری(٨٨١) و موسلیم(٨٥٠)دایە.



أَحَدُكُمْ"[1]،واتا: لەنێو شەوانی هەفتەدا تەنیا شەوی جومعە تایبەت مەکەن بەشەونوێژەوە، لەنێو ڕۆژانی هەفتەدا تەنیا ڕۆژی جومعە تایبەت مەکەن بەڕۆژووگرتنەوە مەگەر فەرزبێ یەکێك لەئێوە ئەو ڕۆژە بەڕۆژووبی.

## ٢١- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەوتاردانـدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە وتاری دەدا، چاوەکانی سوور دەبوونەوە و دەنگی بەرزدەبوویەوە و توورەیی توونـد دەبوو وەك ئەوەی هۆشداریی بدات سوپایەك بەڕێوەیە بۆ سەر ئەو خەڵکە و ئەیفەرموو:" أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ"،واتا:پاشان،بزانن باشترین و چاکترین باس و گێڕانەوەیەك بریتییە لەقورئان، باشترین ڕێنمایی و ڕێنیشاندەرییەکیش بریتییە لەهیدایەتی موحەممەد، خراپترینی کاروبارەکان بریتییە لەشتە داهێنراوەکان، هەموو داهێنراوێکیش (بیدعەیەك)، گومڕاییە. پاشان ئەیفەرموو:"أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ"[2]،واتا: بۆ هەر باوەڕدارێك من لەپێشترم بۆی بەگیان و نەفسی خۆی، هەرکەسێ لەدوای خۆی ماڵێکی بەجێهێشت، ئەوە بۆ کەسوکاری ئەبێ، هەرکەسێکیش قەرزێکی لەدوای خۆی بەجێهێشت، ئەوە من قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە.

وتاری کورت دەکردەوە و نوێژی درێژ دەکردەوە، یادی خوای زۆر دەکرد و ئەیفەرموو:"إِنَّ طُولَ صَلاَةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ"[3]،واتا: درێژیی نوێژی کەسێك و کورتیی وتارەکەی، نیشانەی تێگەیشتنی ئەو کەسەیە.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١١٤٤).

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٦٧).

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٦٩).

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەوتارەکانیدا هاوەڵانی فێری ڕێسا و شەریعەتەکانی ئیسلام دەکرد، ئەگەر فرمان و نەهییەك هەبووایە بۆیانی ڕوون دەکردەوە، هەروەك کاتێ سەرقاڵی وتار بوو کەسێك هاتە ژوورەوە، فرمانی پێ کرد دوو ركات نوێژ بکات.

ڕێگری کرد لەکەسێك بەنێو ڕیزەکاندا دەهاتەپێش و فرمانی پێ کرد دابنیشێت.

بۆ حاڵەتێکی پێویست یان وەڵامی هاوەڵێکی، وتاری دەبڕی و دواتر دەگەڕایەوە سەر وتارەکەی و وتارەکەی تەواو دەکرد.

بۆ پێویستیی لەمینبەرەکەی دادەبەزی و پاشان دەگەڕایەوە سەر تەواوکردنی وتارەکەی، هەروەك دابەزی بۆ هەڵگرتنی حەسەن و حوسەین، هەڵیگرتن پاشان بردنیە سەر مینبەرەکە و وتارەکەی تەواو کرد.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەوتارەکانیدا بانگی خەڵکی دەکرد: فلانە کەس وەرە، فلان دابنیشە، فلان نوێژ بکە.

بەپێی پێویست لەوتاردا فرمانی بەهاوەڵانی دەکرد، ئەگەر هەژارێکی بدیبایە، فرمانی دەکرد و هاندانی دەکرد تاوەکو هاوکاریی ئەو کەسە بکرێت.

بەپەنجەی شایەتومانی لەوتاردا ئاماژەی دەکرد لەکاتی یادکردنی خوای گەورە و پاڕانەوەدا.

لەکاتی بێبارانییدا لەوتاردا لەخوای گەورە دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی باران ببارێت.

لەڕۆژی جومعەدا چاوەڕوانیی دەکرد تاوەکو خەڵکیی کۆببنەوە، کە کۆدەبوونەوە، بەتەنیا دەردەچووە لایان، کە دەهاتە مزگەوتەوە سەلامی لێیان دەکرد، کە دەچووە سەر مینبەر ڕوو بەخەڵکەکە ڕادەوەستا و سەلامی لێیان دەکرد، پاشان دادەنیشت و بیلالیش بانگی دەدا، کە لەبانگ دەبوویەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەڵدەستا وتاری دەدا بەوتارێك دابڕان لەنێوان بانگەکە و وتاردا نەبوو.

مینبەرەکەی سێ پایەی هەبوو، پێش دروستکردنی ئەو مینبەرە لای دارخورمایەکی بچووك وتاری دەدا و پشتی پێیەوە دەدا، لەناوەڕاستی مزگەوتدا مینبەری دروست کرد، بەڵکو لەڕووی ڕۆژئاوای مزگەوتەکە و نزیك بەدیوارەکە مینبەری دروست کرد، لەنێوان خۆی و دیوارەکەدا ئەندازەی تێپەڕبوونی مەڕێك بۆشایی مابوویەوە.

کە لەغەیری جومعەدا لەسەری دادەنیشت یان لەجومعەدا بەپێوە لەسەری رادەوەستا، هاوەڵان روویان تێ دەکرد، پەیامبەریش(صلى الله عليه وسلم) لەکاتی وتارەکەدا روو بەئەوان بوو.

بەڕاوەستانەوە وتاری دەدا، پاشان دانیشتنێکی کەمی دەکرد پاشان هەڵدەستا بۆ وتاری دووەم، کە لەوتاری دووەم دەبوویەوە، بیلال دەستی دەکردە قامەت کردن.

فرمانی بەخەڵك دەکرد لێیەوەی نزیك بنەوە و بێدەنگ بن و هەواڵی پێدەدان ئەگەر یەکێك بەئەوەی تەنیشتی بڵێ: بێدەنگ بە، ئەوە لەغوی کردووە[1].

کە بیلال لەبانگدان دەبوویەوە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەستی دەکردە وتار، هەرگیز هیچ کەسێ ئەوکاتە هەڵنەستاوەتەوە بۆ ئەنجامدانی دوو رکات نوێژ، تەنیا یەك بانگیش هەبوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی جومعەش وەك جەژن وەهایە و لەپێشیدا نوێژی سوونەت بوونی نییە، ئەمە دروستترین بۆچوونی زانایانە و سوونەتیش بەڵگەی لەسەر داوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە نوێژی جومعەی دەکرد، ئەچووە ماڵی خۆی و دوو رکات سوونەتی جومعەی دەکرد، فرمانی دەدا بەو کەسەی ئەو نوێژەی کردووە، دوای ئەوە چوار رکات بکات.

---

[1] - بوخاری(٩٣٤) و موسلیم(٨٥١) ئیخراجیان کردووە.

شێخ و مامۆستامان ئیبن تەیمییە بەڕەحمەت بێ ئەڵێ: ئەگەر کەسێ لەمزگەوت نوێژی کرد، چوار رکات بکات، ئەگەر لەماڵدا نوێژی کرد، دوو رکات بکات. منیش ئەڵێم: فەرموودەکان لەسەر ئەوە بەڵگە دەدەن.

## ٢٢- رێبازی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەدوو جەژنەکەدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لە(المُصلَّى) نوێژی دەکرد، کە دەکەوێتە دەرگای رۆژهەلاتی مەدینەوە، وەك حەج، لەمزگەوتەکەی خۆیدا نوێژی جەژنی ئەنجام نەدەدا، تەنیا یەکجار نەبێ کە باران بوو لەمزگەوتەکەیدا نوێژی جەژنی پێ کردن ئەگەر ئەو فەرموودەیە بسەلمێ، لەسووننەنی ئەبو داوود و ئیبن ماجەدایە[١]، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەمیشە لە(المُصلَّى) نوێژی دەکرد.

لەدەرچوون بۆ نوێژی جەژن جوانترین بەرگی دەپۆشی، کراسێکی هەبوو بۆ هەردوو جەژنەکە و نوێژی جومعە لەبەری دەکرد، جارێکیان دوو عەبا(بوردەی) سەوزی لەبەر کرد، جارێکی تریش عەبای سوور نەك سووری تەواو و تۆخ وەك ئەوەی هەندێ کەس گومانی دەکەن، ئەگەر وەها بوایە ئەوە عەبای بوردە نەدەبوو، بەڵکو هێڵی سووری تێدا هەبوو وەك عەبای یەمەنی، بۆیە ناونراوە سوور، چونکە ئەو رەنگە سوورەی تێدا هەبووە، بێگومان دروست لەپەیامبەری خواوە هاتووە(صلی الله علیه وسلم) کە نەهی کردووە لەسووری هەناری(معصفر) و سوور.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)پێش دەرچوونی بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد، تیق دەیخوارد نەك جووت، بەلام بۆ نوێژی جەژنی قوربان هیچی نەدەخوارد و دوای گەڕانەوەی لە(المُصلَّى) نانی دەخوارد و لەقوربانییەکەی دەخوارد.

---

[١]- ئەبو داوود(١١٦٠) و ئیبن ماجە(١٣١٣) ئیخراجیان کردووە.

ئەگەر فەرموودەکە دروست بێ، ئەوە بۆ نوێژی جەژن خۆی دەشۆرد، دوو فەرموودەی لاواز لەو بارەیەوە هاتوون، بەڵام لەئیبن عومەرەوە سەلماوە- سەرباری پابەندبوونی توندی بەسووننەتەوە- کە پێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژن، خۆی شۆردووە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەپیادە دەردەچوو، لەپێشیدا حەربەکەی هەڵدەگیرا، کە دەگەیشتە المُصلَّى، حەربەکەی دەکردە سترەی نوێژەکەی، چونکە ئەوکات المُصلَّى دەشتاییەك بوو دیوار و خانوویەکی تێدا نەبوو.

نوێژی جەژنی رەمەزانی دوادەخست و نوێژی جەژنی قوربانی پێشدەخست، ئیبن عومەر سەرباری پابەندبوونی توندی بەسووننەتەوە، ئەوە کاتێ دەردەچوو بۆ نوێژی جەژن کە خۆر هەڵدەهات و لەماڵەوە تاوەکو المُصلَّى (الله أكبر)ی دەوتەوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە دەگەیشتە المُصلَّى، دەستی دەکردە نوێژکردن، بەبێ بانگ و قامەت و وتنی(الصلاةُ جامعةٌ).

نە خۆی و نە هیچ هاوەڵێکی لەپێش و دوای نوێژ لەگەیشتن بە المُصلَّى هیچ نوێژێکیان نەدەکرد.

لەپێش وتاری جەژن، نوێژی جەژنی دەکرد، دوو رکاتی دەکرد، لەرکاتی یەکەمدا حەوت(الله أكبر)ی بەدوای یەکدا دەوتەوە بە(الله أكبر)ی دەستپێکردنی نوێژەکەوە، لەنێوان هەر(الله أكبر)ێ بۆ(الله أكبر)ێکی تر، وەستانێکی کەمی هەبوو، لێیەوە لەبەر نەکراوە لەنێوان(الله أكبر)ەکاندا ویردێکی دیاریکراوی خوێندبێ، ئیبن عومەر ئەگەرچی پابەندی سووننەت بوو، لەگەڵ هەر(الله أكبر)ێکدا دەستی بەرز دەکردەوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە (الله أكبر)ەکانی تەواو دەکرد، دەستی دەکردە قورئانخوێندن، سورەتی فاتیحای دەخوێند، پاشان لەرکاتێکدا:

﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ۝١﴾ ق: ١ ، لەرکاتەکەی تریشدا: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١﴾ **القمر: ١**. رەنگە لەو دوو رکاتەشدا ئەمانەی خوێندبێ: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ **الأعلى: ١** و ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ۝١﴾ **الغاشية: ١** بەدروست ئەمە و ئەوی تر لێیەوە هاتووە، جگە لەوە بەدروست لێیەوە نەگێردراوەتەوە.

کە لەخوێندنەوەی ئەو ئایەتانە دەبوویەوە، (الله أکبر)ی دەکرد و ئەچووە رکوع، پاشان کە ئەو رکاتەی تەواو دەکرد و لەسجود هەڵدەستا، پێنج جاری یەك بەدوای یەك(الله أکبر)ی دەکردەوە، کە لەو پێنج جارە دەبوویەوە، قورئانی دەخوێند.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە نوێژی تەواو دەکرد، دەچوو روو بەخەڵك رادەوەستا، خەڵکییش لەشوێنی خۆیاندا بەشیوەی ریز دانیشتبوون، ئامۆژگارییانی دەکرد و فرمان و نەهی پێیان ئەکرد، کە بیویستبایە نەهییەك بکات، یەکسەر نەهییەکەی دەکرد، یان ویستی فرمانێکی هەبووایە فرمانی دەدا. مینبەرێك نەبوو بچێتەسەری، بەڵکو بەپاوەستان لەسەر زەوییەکە وتاری بۆیان دەدا.

هەموو وتارەکانی بە(الحمدُ لله) دەستپێدەکرد، لەیەك فەرموودەشدا نەهاتووە لەهەردوو وتاری جەژندا بە(الله أکبر)دەستیپێکردبێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) روخسەت و مۆڵەتی بەوانە دا کە ئامادەی نوێژی جەژن بوون، بەوەی دابنیشن بۆ گوێبیستی وتار یان برۆن، روخسەتیشی پێدان ئەگەر نوێژی جەژن کەوتە رۆژی جومعەوە، تەنیا ئامادەی نوێژی جەژن بن.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەرۆژی جەژندا رێگەی دەگۆری، بەرێگەیەکدا دەهات و بەرێگەیەکی تردا ئەگەرایەوە، وتراوە: بۆیە وەهای دەکرد، تاوەکو سەلام لەخەڵکی هەردوو رێگە بکات. وتراوە: تاوەکو بەرەکەتی هەردوو خەڵکەکەی دەستبکەوێ. وتراوە: تاوەکو پێویستیی خەڵکانێك جێبەجێ بکات کە لەسەر ئەو دوو رێگەیە بوون. وتراوە: تاوەکو لەتەواوی رێگەو بانەکاندا دروشمەکانی ئیسلام

پیشانی ئەو خەڵکە بدات. وتراوە: تاوەکو دووڕووان خەفەتباربن بەبینینی شکۆداریی ئیسلام و موسڵمانان و جێگیربوونی دروشمەکانی ئەو ئایینە. وتراوە: تاوەکو شایەتییدانی شوێنەکان زیاتر بێتەوە، چونکە ئەو کەسەی دەچێت بۆ مزگەوت یان المُصلّی، بۆ هەر هەنگاوێکی پلەیەکی بۆ دەنووسرێ و بۆ هەنگاوێکی تریش تاوانێکی لەسەر دەسڕدرێتەوە تاوەکو دەگاتەوە ماڵ. وتراوە: دروستتر: بۆ هەموو ئەوانە و کۆمەڵێ حیکمەتی ترە کە لەئەنجامدانیدا هەیە.

لەبارەی پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) گێڕدراوەتەوە کە لەنوێژی بەیانی ڕۆژی عەرەفە تاوەکو کۆتا ڕۆژی(التشریق) تەکبیرەی کردووە و فەرموویەتی:"اللَّهُ أكبرُ اللَّهُ أكبرُ، لا إله إلا اللهُ، واللَّه أكبرُ اللَّهُ أكبرُ وللَّهِ الحمدُ"[1].

## ٢٣- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەنوێژی خۆر گیراندا

کە خۆرگیرا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەخێرایی و ترسەوە عەباکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا دەرچوو بۆ مزگەوت، خۆرگیرانەکە لەسەرەتای ڕۆژدا بوو کە بەئەندازەی دوو تیر(رمح) یان سێ تیر بوو لەکاتی هەڵهاتندا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هات و دوو رکات نوێژی کرد، لەڕکاتی یەکەمدا سورەتی فاتیحا و سورەتێکی درێژی خوێند، خوێندنەوەکەی بەدەنگ بوو، پاشان چووە رکوع و رکوعەکەی درێژکردەوە، پاشان لەڕکوعدا سەری بەرزکردەوە و نوێژی کردەوە و وەستانی درێژەی کێشا کەمتر لەوەستانی یەکەم، کە سەری بەرزکردەوە فەرمووی:"سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه، ربَّنا ولكَ الحمدُ" پاشان دەستی کردە خوێندنەوەی قورئان، پاشان چووە رکوع و رکوعی درێژکردەوە کەمتر لەڕکوعی یەکەم، پاشان سەری بەرزکردەوە پاشان چووە سجود و سجودەکەی درێژکردەوە، پاشان لەڕکاتەکەی تردا هەمان ئەو شتانەی کرد کە لەڕکاتی یەکەمدا کردی.

---

[1] - دارەقوتنی٢/٢٩٠(١٧٣٧) و بەیهەقی لە الدعوات الكبير٢/١٦٥(٥٤٠) ئیخراجیان کردووە.

لەهەر ركاتێكدا دوو ركوع و دوو سجود هەبوو، لەهەردوو ركاتەكەدا چوار ركوع و چوار سجودی برد، لەو نوێژەیدا بەهەشت و دۆزەخی بینی، ویستی لەبەهەشتدا هێشویەك تریێ بگرێ و پیشانیان بدات، دۆزەخییەكانیشی لەدۆزەخدا بینی، بۆیە وتارێكی رەوانبێژانەی بۆ باوەڕداران خوێندەوە كە ئەمانەی تێدا بوو:"إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَادْعُوا اللهَ وَصَلُّوا وتصدَّقوا"،واتا: خۆر و مانگ دوو نیشانەن لەنیشانەكانی خوای گەورە، بۆ مردن و ژیانی هیچ كەسێك تووشی گیران نابن، ئەگەر خۆر گیران و مانگ گیرانتان بینی، لەخوا بپاڕێنەوە و نوێژ بكەن و خێرات بكەن. پاشان فەرمووی:"يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ، مَا أَحَدٌ أغيرَ مِنَ اللَّهِ إن يَزْنِيَ عَبْدَهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتَهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا"[1]،واتا: ئەی ئوممەتی موحەممەد، سوێند بەخوا هیچ كەسێكتان لەخوا بەغیرەتتر نییە و تووڕەتر نابێ كاتێ بەندەكەی چی نێر بێ یان مێ كە داوێنپیسیی بكات، ئەی ئوممەتی موحەممەد، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی من دەمزانی ئێوە دەتانزانی، ئەوە كەم پێدەكەنین و زۆر دەگریان.

لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گێڕدراوەتەوە كە بەسیفەتی تر نوێژی كردووە: لەوانە: لەهەر ركاتێكدا سێ ركوعی بردووە، لەوانە: لەهەر ركاتێكدا چوار ركوعی بردووە، لەوانە: وەك ئەوەی نوێترین نوێژێك بێ ئەنجامی دابێت، لەهەر ركاتێكدا یەك ركوعی بردووە. بەڵام گەورە پێشەوایان ئەوە بەدروست ناخەنەوە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی داوە لەخۆرگیراندا یادی خوا بكرێتەوە، نوێژ بكرێت و پاڕانەوە و تەوبە و سەدەقە بكرێت و كۆیلە ئازاد بكرێت، خواش زاناترە.

---

[1] - بوخاری(١٠٤٤) و موسلیم(٩٠١) ئیخراجیان كردووە.

## ٢٤-رێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەنوێژە بارانەدا

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە کە بەچەند جۆرێك داوای باران بارینی کردووە:

یەکەم: لەڕۆژی جومعە و لەسەر مینبەر بوو لەکاتی وتاردا فەرمووی:"اللّٰهُمَّ أغِثْنَا، اللّٰهُمَّ أغِثْنَا، اللّٰهُمَّ أغِثْنَا، اللّٰهُمَّ اسْقِنَا، اللّٰهُمَّ اسْقِنَا، اللّٰهُمَّ اسْقِنَا"[1]،واتا: خوایە گیان فریامان بکەوە، خوایە گیان فریامان بکەوە، خوایە گیان فریامان بکەوە، خوایە گیان بارانمان بۆ دابارێنە، خوایە گیان بارانمان بۆ دابارێنە، خوایە گیان بارانمان بۆ دابارێنە.

رووی دووەم: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێکی بۆ خەڵك دیاریی دەکرد و تیایدا دەردەچوون بۆ المُصلّی، کە خۆر هەڵدەهات دەردەچوو، بەدەرچوونێکی سادەی کزۆڵ و ئەپاڕایەوە، کە گەیشتە المُصلّی چووە سەر مینبەر- ئەگەر دروستبێ، شتێك لەهەڵگەڕانەوە-القلب-هەیە- سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و (الله أکبر)ی کرد، لەو وتارەی پارێزرابێ ئەمە هاتووە:"الْحَمْدُ للّٰه رَبِّ الْعَالَمِينَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مَلِك يَوْمِ الدِّينِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ، اللّٰهُمَّ أنْتَ اللّٰهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أنْتَ أنْتَ الْغَنِيُّ وَنَحْنُ الْفُقَرَاءُ أنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ وَاجْعَلْ مَا أنْزَلْتَ عَلَيْنَا قُوَّةً وَبَلَاغًا إِلَى حِينٍ"[2]، واتا: سوپاس و ستایش تەنیا بۆ پەروەردگاری هەردوو جیهان کە خاوەن سیفەتی الرحمن و الرحیم و پادشا و خاوەنی ڕۆژی دواییە، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە الله، چی بووێ ئەوە دەکات، خوایە گیان تۆ(الله)ی، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە تۆ، چیت بووێ ئەوە دەکەی، تۆ الله و دەوڵەمەندی و ئێمەش هەژارین، باران و فریاکەوتنی خۆتمان بەسەردا دابارێنە، ئەوەشی بۆ ئێمەی دادەبارێنی هەتا ماوەیەك بۆ ئێمەی بگێڕە بە هێز و توانا.

---

[1] - بوخاری(١٠١٤) و موسلیم(٨٩٧).

[2] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١١٧٣).

پاشان دەستی بەرزکردەوە و دەستی کردە کڕوزانەوە و پاڕانەوە، ئەوەندە دەستی بەرزکردەوە تاوەکو سپیایی باڵی دەرکەوت، پاشان پشتی کردە خەڵك و روو بەقیبلە و روو بەقیبلە بوو کراسەکەی بەر و پشت کرد، لای راستی کردە چەپ و لای چەپی کردە راست و رووی ناوەوەی کردە دەرەوەو رووی دەرەوەی کردە ناوەوە، کراسەکەی خەمیصە رەش بوو، روو بەقیبلە دەستی کردە پاڕانەوە و خەڵکییش هەروەها.

پاشان دابەزی و دوو رکاتی پێیان کرد بەنمونەی نوێژی جەژن بەبێ بانگ و قامەت، لەهەردوو رکاتەکەدا بەدەنگ قورئانی خوێند، لەرکاتی یەکەمدا لەدوای فاتیحا(سبح اسم ربك الأعلى)ی خوێند، لەدووەمیشدا(هل أتاك حديث الغاشية).

**رووی سێیەم:** پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەر مینبەر پاڕایەوە بۆ باران دابارین و رۆژی جومعە نەبوو، لێیەوە نەگوازراوەتەوە لەو پاڕانەوەیەدا نوێژی کردبێ.

**رووی چوارەم:** پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەدانیشتنەوە لەمزگەوت بۆ باران بارین پاڕاوەتەوە، دەستی بەرزکردووەتەوە و لەخوای گەورە پاڕاوەتەوە، لەو پاڕانەوەیەی ئەوکات کردوویەتی ئەمە پارێزراوە:"اللهُمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مُغِيثًا مَرِيعًا طَبَقًا عَاجِلًا غَيْرَ رَائِثٍ نَافِعًا غَيْرَ ضَارٍّ"[1]،واتا:خوایە گیان بارانێك بۆمان دابارێنە فریامان بکەوێ و پەلە بێ نەك درەنگ، بەسوود بێ نەك زیان.

کە باران زۆر بوو، داوایان لەپەیامبەری خوا کرد(صلى الله عليه وسلم) کە بووەستێتەوە، ئەویش بۆیان پاڕایەوە فەرموی:"اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا، وَلاَ عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالجِبَالِ وَالآجَامِ وَالظِّرَابِ وَالأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ"[2]،واتا:خوایە گیان لەسەر

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١١٦٩).

[2] – بوخاری(٩٣٣) و موسلیم(٨٩٧) ئیخراجیان کردووە.

ئێمە راییگرە و بیخەرەسەر دەورووبەرمان، لەسەر چیا و دۆڵ و تەپۆڵکەکان و شوێنی رەواندنی درەختەکان.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە باران بارینی دەبینی ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ صَيِّبًا نَافِعًا"[1]،واتا: خوایە گیان بارینێکی بەسوود بێ.

بەرگەکەی ئەگوشی تائەوەی باران تەڕی دەکرد، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا فەرمووی:"لأنّهُ حديثُ عهدٍ بربِّه"[2]،واتا: بەتازەیی لەلایەن خوای گەورەوە دروستکراوە و دادەبەزێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە هەوری تاریك و رەشەبای دەبینی، ئەهات و دەچوو، بەڵام کە باران دەباری، دڵخۆش دەبوو، ئەترسا هەوری تاریك و رەشەبا سزای تێدا هەبێ.

## ٢٥- ڕێبازی لەسەفەرو پەرستشەکانی لەسەفەردا

پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەفەرەکانی لەچوارچێوەی چوار شتدا بوو: سەفەری هیجرەتی بۆ مەدینە، سەفەری بۆ جیهاد کە زۆرترین سەفەرەکانی بوو، سەفەری بۆ عومەرە، سەفەری بۆ حەج.

کە ویستی سەفەری هەبووایە، لەنێو خێزانەکانیدا تیروپشکی دەکرد، ناوی کامەیان دەربچووبایە ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بۆ سەفەرەکەی دەبرد، کە حەجی کرد، هەموویانی لەگەڵ خۆیدا برد.

کە سەفەری بکردبایە سەرەتای رۆژ بەڕێدەکەوت، حەزی دەکرد لەرۆژی پێنجشەمماندا دەربچێت، داوای لەخوای گەورە دەکرد بەرەکەت بخاتە کاتی

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١٠٣٢).

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٩٨).

بەیانیانی ئوممەتەکەیەوە، ئەگەر سوپا و سریەیەکیشی بناردبایە، سەرەتای رۆژ بەرێیدەخستن.

فرمانی بەگەشتیارەکان دەدا ئەگەر سێ کەس بن، یەکێکیان ببێتە ئەمیریان، نەهی دەکرد کەسێ بەتەنیا گەشت بکات، هەواڵی دەدا کە یەك سوار و رێبوار کاری شەیتانە، دوو سوار دوو شەیتانن، سێ کەس کاروان و کۆمەڵن.

کە وڵاخەکەی بۆ بهێنرایە تاوەکو سواربێ، ئەیفەرموو"بسم الله" کاتێ پێی ئەخستەسەر وڵاخەکە، کاتێ لەسەر پشتی سەقامگیر دەبوو ئەیفەرموو:"الْحَمْدُ للَّه الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ". پاشان ئەیفەرموو: "الحمدُ لله، الحمدُ لله، الحمدُ لله"، پاشان ئەیفەرموو:"الله أكبرُ، الله أكبرُ، الله أكبرُ"، پاشان ئەیفەرموو:"سُبْحَانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي إِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ"[1]. ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنْ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ" لەگەڕانەوەدا ئەم وشانەی بۆ زیاتر دەکرد"آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ"[2]،واتا: خوایە گیان لەم سەفەرەدا داوای چاکە و لەخواترسانت لێ دەکەم، داوات لێ دەکەم کارێکم بۆ هەڵسوڕێنی لەجێی رەزامەندیی تۆدا بێ، خوایە گیان ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بکەی و دوورییەکەیمان بۆ کەم بکەیتەوە، خوایە گیان بۆ ئەم سەفەرەمان هاودەم بە و کەسوکارمان بۆ بپارێزە.

خۆر و هاوەڵانیشی ئەگەر بەرەو لوتکە و بەرزاییەك بچونایە (الله أكبر)یان دەکرد، لەدابەزینە دۆڵیشدا(سبحان الله)یان دەکرد.

---

[1] - ئەبو داوود(٢٦٠٢) و ترمیزی(٣٤٤٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣٤٢).

ئەگەر بەرەو دێیەك بچووبایە و بیویستبایە بچێتە ناویەوە، ئەیفەرموو:" اللهم ربَّ السموات السبع وما أضللنَ ، وربَّ الأرضَين السبعِ وما أقللن ، وربَّ الشياطين وما أضللنَ ، وربَّ الرياحِ وما ذَرين ، أسألك خيرَ هذه القريةِ وخيرَ أهلها ، وأعوذُ بك من شرِّها، وشرِّ أهلِها وشرِّ ما فيها"[1].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەفەردا نوێژی چوار رکاتیی کورت دەکردەوە و ئەیکردە دوو رکات کاتێ بەسەفەر دەردەچوو تاوەکو ئەگەڕایەوە مەدینە، نەسەلماوە هەرگیز لەسەفەردا چوار رکاتیی کردبێ، عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: نوێژ دوو رکات دوو رکات فەرزکرا، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەشوێنی نیشتەجێبووندا رکاتەکانی نوێژ زیاتر کرا و نوێژی سەفەریش بەدوو رکات جێگیر کرا.

لەسەحیحی بوخاریدا لەئیبن عومەرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: هاوەڵێتی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)م کرد، لەسەفەردا زیاتر لەدوو رکاتی نەدەکرد، هەروەها ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانیش(خوایان لێ رازیی بێ)[2].

یەکێك لەڕێنمایی و رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەفەردا ئەوەبوو، نوێژە فەرزەکانی کورت دەکردەوە، لێیەوە نەگوازراوەتەوە لەپێش و دوای نوێژە فەرزەکاندا نوێژی سووننەتی ئەنجام دابێ، تەنیا ویتر و سووننەتی نوێژی بەیانی نەبێ کە لەسەفەر و شوێنی مانەوەیدا نەیهێشتووە لەدەستی بچن.

شافیعی بەڕەحمەت بێ ئەڵێ: لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە نوێژی کورت کردووەتەوە و شەونوێژی کردووە[3]،لەسەحیحەیندا لەعامری کوڕی رەبیعەوە کە پەیامبەری خوای بینیووە (صلی الله علیه وسلم) لەسەفەردا و لەسەر پشتی وڵاخەکەیەوە شەونوێژی کردووە"، ئەوە شەونوێژ بووە.

---

[1] – نەسائی لە السنن الكبرى٨/١١٧(٨٧٧٥) و ئیبن خوزەیمە لەسەحیحەکەیدا٤/١٥٠(٢٥٦٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(١١٠٢) و موسلیم(٦٨٩) ئیخراجیان کردووە.

[3] – (الأم)ی شافیعی٢/٣٦٥.

یەکێك لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بووە لەسەر ولآخەوە نوێژی سووننەتی تەتوعی کردووە، ولآخەکەی رووی لەکوێ کردبێ رووی لەوێ کردووە، بەسەری ئاماژەی رکوع و سجودی کردووە، سجودی ماوە کەمتر بووە لەرکوعی.

لەسەر ولآخ و گوێدرێژ-ئەگەر سەحیح بێ- نوێژی کردووە، موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێراویەتییەوە لەفەرموودەی ئیبن عومەرەوە[1].

لەبەر باران و قوڕوقوڕاو، لەسەر ولآخەکەیان نوێژی فەرزی پێیان کرد، ئەگەر ئەو فەرموودەیە دروست بێ.

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو کاتێ گەشتی بکردبایە پێش ئەوەی خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لابدات، نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست بۆلای عەسر، پاشان دادەبەزی و کۆی دەکردنەوە، بەلآم ئەگەر خۆرلایدابووایە پێش ئەوە گەشت بکات، نوێژی نیوەڕۆی دەکرد پاشان سەر ولآخ دەکەوت، ئەگەر پەلەشی بووایە، نوێژی نیوەڕۆی بۆلای عیشا دوادەخست و لەعیشادا پێکەوە کۆیدەکردنەوە.

لەڕێنمایی پەیامبەری خوادا نەبوو(صلی الله علیه وسلم) لەسەفەرەکانیدا لەسەر ولآخەوە نوێژەکانی کۆبکاتەوە، یان لەکاتی دابەزین و لادانداا، بەڵکو کە ویستی رۆیشتنی بووایە، نوێژەکانی کۆدەکردەوە، هەرچی کۆکردنەوەی نوێژ بووبێ لەکاتێکدا دابەزیبێ و لەسەروەخت سەفەر نەبووبێ، ئەوە ئەنجامی نەداوە تەنیا لەعەرەفەدا نەبێ.

بۆ ئوممەتەکەی ماوەیەکی سنورداری دیاری نەکردووە تاوەکو بەو ماوەیە نوێژ کورت بکرێتەوە و رۆژووی تێدا نەگیردرێت، بەڵکو رەهایانە هێشتوویەتییەوە.

---

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٠٠).

## ٢٦-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەخوێندنەوەی قورئان و گوێگرتن و خشوع و گریانی لەکاتی قورئانخوێندن وگوێگرتنی وجوان خوێندنەوەی

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) حیزبێکی هەبوو دەیخوێندنەوە و لەدەستی نەدەدا، خوێندنەوەکانی تەرتیل بوو، نە ئەمە و نە پەلەکردن، بەڵکو خوێندنەوەیەکی ڕاڤەوانانەی پیت پیت، خوێندنەوەکانی ئایەت ئایەت بوو، لەکاتی حەرفی مەددا حەرفەکەی درێژ دەکردەوە، مەد و درێژکردنەوەی دەدا بە(الرحمن) و (الرَّحيم).

لەسەرەتای خوێندنەوەدا پەنای بەخوا دەگرت لەشەیتانی نەفرەتی و ئەیفەرموو:"أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ" یان ڕەنگە فەرمووبێتی:"اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ، وَنَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ"[١].

حەزی دەکرد لەکەسی ترەوە گوێ لەقورئان ببێ، فەرمانی کرد بەعەبدوڵڵەی کوڕی مەسعود قورئانی بۆ بخوێنێ و خۆی گوێی لێ دەگرت، خشوع گرتی و فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە(صلى الله عليه وسلم)[٢].

بەڕاوەستان و دانیشتن و پاڵکەوتن و دەستنوێژ و بێ دەستنوێژەوە قورئانی دەخوێندەوە، تەنیا لەشگرانیی ڕێگر بوو قورئان بخوێنێتەوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) قورئانی بەئاوازەوە دەخوێندەوە، عەبدوڵڵەی کوڕی موغەففەل ئەگێڕێتەوە کە سێ جار تەرجیعی بە(آ آ آ) کردووە[٣].

ئاواز دەرکردن دوو جۆرە:

یەکەم: ئەوەی سرووشت پێویستی دەکات و ڕێگەی پێ داوە بەبێ زۆر لەخۆکردن و ڕاهێنان و خۆ فێرکردن، بەڵکو ئەگەر سرووشتی خۆی چۆن بوو بەکاریبهێنێ، ئەو

---

[١] – ئەبو داوود(٧٧٥) و موسلیم(٢٤٢) ئیخراجیان کردووە.

[٢] – بوخاری(٤٥٨٣) و موسلیم(٨٠٠) ئیخراجیان کردووە.

[٣] – بوخاری(٧٥٤٠) و موسلیم(٧٩٤) ئیخراجیان کردووە.

ئاوازە دەردەچێ، ئەوە جائیزە، بەتایبەت ئەگەر سرووشتی کەسەکە ئاواز و رازاندنەوە بەخوێندنەوەکە بدات وەك ئەوەی ئەبو موسا بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی وت:"ئەگەر دەمزانی گوێبیستی قورئانخوێندنەکەمی، ئەوە بەئاوازی کاریگەرەوە دەموتەوە"[1]. ئەمە ئەوەیە کە پێشین ئەنجامیان داوە و گوێیان لێ بووە، ئەوە ئەو ئاوازە رێپێدراوە ستایشکراوەیە کە خوێنەر و گوێگر پێی کاریگەر ئەبن. بەڵگەی تەواوی زانایانی ئەم بوارە لەسەر ئەم شێوەیە ئەوەیە، جائیز و رێپێدراوە.

**رووی دووەم:** ئەگەر دروستکراو بێ،بەشێك نەبێ لەسرووشتی کەسەکە، بەزۆر لەخۆکردن و راهێنان و دروستکردن ئەو دەنگە دروست بکات، وەك فێربوونی جۆرەها ئاوازی گورانی و بەپێی ئیقاعی تایبەت و ئاوازی دروستکراو کە تەنیا بەفێربوون و زۆر لەخۆکردن پەیدا دەبێ، ئەمە ئەوەیە کە پێشین بەمەکروهیان داناوە و عەیبدار و سەرزەنشتیان کردووە، قەدەغەیان کردووە بەو جۆرە قورئان بخوێنرێت، نکۆڵییان کردووە دژ بەو کەسەی بەوجۆرەی خوێندووەتەوە، بەم وردو درشتییە تێکەڵکردنی هەردوو روو نامێنێ و راست و ناڕاست لەیەك جیادەبێتەوە.

## ٢٧-رێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەسەردانیکردنی نەخۆشدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەردانی ئەو هاوەڵانەی دەکرد کە نەخۆش دەکەوتن، سەردانی خزمەتکارێکی خۆی کرد کە ئەهلی کیتاب بوو، سەردانی مامی خۆی کرد کە هاوبەش پەیداکەر بوو، موسڵمانبوونی بۆیان پێشنیار کرد، جولەکەکە موسڵمان بوو مامی موسڵمان نەبوو.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەنەخۆش نزیك دەکەوتەوە، لای سەری دادەنیشت و لەئەحواڵی دەپرسی و ئەیفەرموو:"کیف تجدُك؟"[2]،واتا: حاڵت چۆنە؟

---

[1] – عەبدولرەزاق لەموسنەفەکەی٢/٤٨٥(٤١٧٨) و نەسائی لە الکبری٧/٢٧٣(٨٠٠٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ترمیزی(٩٨٣) و ئیبن ماجە(٤٢٦١) ئیخراجیان کردووە.

دەستی راستی بەسەر نەخۆشەکەدا دەهێنا و ئەیفەرموو: " اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، أَذْهِبْ البَاسَ، اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ" شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا"[1] ،واتا:خوایە گیان ئەی خوای خەڵك، ئازاری لابدە، شیفای بدە هەر خۆت شیفادەری، هیچ شیفایەك نییە تەنیا شیفای تۆ نەبێ، شیفایەك هیچ دەرد و نەخۆشییەك نەهێڵێ.

ئەیفەرموو:"امْسَحِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ، بِيَدِكَ الشِّفَاءُ، لَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا أَنْتَ"[2] ،واتا: ئەی پەروەردگاری خەڵك ئازاری رابماڵە، شیفا هەر بەدەستی خۆتە، هیچ کەسێ ناتوانێ ئەم ئازارەی لەسەر لابدات تەنیا تۆ نەبێ. سێ جار بۆ نەخۆش دەپاڕایەوە هەروەك بۆ سەعد فەرمووی:"اللَّهُمَّ اشْفِ سعدا، اللَّهُمَّ اشْفِ سعدا، اللَّهُمَّ اشْفِ سعدا"[3] ،واتا: خوایە گیان شیفای سەعد بدە، خوایە گیان شیفای سەعد بدە، خوایە گیان شیفای سەعد بدە. کە دەچووە لای نەخۆش ئەیفەرموو:"لَا بَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ"[4] ،واتا: پشت بەخوای گەورە مایەی سڕینەوەی تاوانەکانتە.

دوعا و روقیەی دەکرد بۆ کەسێ سووتانەوەی هەبووایە یان برین یان هەر ئازارێك، پەنجەی شایەتومانی ئەخستە زەوی و پاشان بەرزی دەکردەوە و ئەیفەرموو:" بِسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا يُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا"[5] ، واتا: بەناوی خوا، بەخۆڵی خاکەکەمان و بەتفی هەندێکمان نەخۆشەکانمان بەویستی خوا چاك دەبنەوە.

لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەبووە رۆژێك یان کاتێك دیاریی بکات بۆ سەردانیکردنی نەخۆش.

---

[1] - بوخاری(٥٦٧٥) و موسلیم(٢١٩١) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٥٧٤٤) و موسلیم(٢١٩١) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(٥٦٥٩) و موسلیم(١٦٢٨) ئیخراجیان کردووە.

[4] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٣٦١٦).

[5] - بوخاری(٥٧٤٥) و موسلیم(٢١٩٤) ئیخراجیان کردووە.

## سێ یەم : بەشی تەرم (الجنائز)

**١- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی تەرم و نوێژ لەسەرکردن و دواکەوتن و دفنکردنی، لەنوێژی سەر مردوودا چۆن پاڕاوەتەوە بۆ مردووەکە و لەدوای ناشتن و شتانی تردا.**

ڕێباز و سەربووردەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کاملترین ڕێباز و پێچەوانەی تەواوی ئوممەتانی تر بووە، چاکەی مردووی تێدا بوو، بەجۆرێ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد سوودی هەبوو بۆ نێو گۆڕ و قیامەتی مردووەکە و چاکەی دەکرد بەرانبەر کەسوکاری و راپەڕاندنی خواپەرستییەکی زیندووانە کە سوودی بەمردووەکە ئەگەیاند و بەباشترین شێوازێك ئامادەی دەکرد بۆ گەڕانەوە لای خوای گەورە، لەگەڵ هاوەڵانیدا ریزی دەبەست سوپاسی خوایان دەکرد و داوای لێخۆشبوون و بەزەیی و چاوپۆشییان لەخوا دەکرد بۆ مردووەکە.

پاشان لەگەڵ تەرمەکەدا بەرێدەکەوتن بۆ ناشتنی، پاشان خۆی و هاوەڵانی لەسەر گۆڕەکەی رادەوەستان و داوای دامەزراوییان بۆ دەکرد کە زۆرترین پێویستییەك بوو لەو کاتەدا بۆ ئەو مردووە.

پاشان سەردانی گۆڕی دەکرد و سەلامی لێ دەکرد و بۆی دەپاڕایەوە هەروەك چۆن مرۆڤی زیندوو لەدونیادا سەردانی هاوڕێکەی دەکات.

یەکەمین شتێك: سەردانیکردنی بوو لەکاتی نەخۆشکەوتنیدا، یادی ئاخیرەتی بیردەهێنایەوە و فرمانی پێ دەکرد وەسێت بکات و تەوبە بکات، فرمانی دەدا بەوانەی لای بوون کە تەلقینی بدەن بە لا إله إلا الله تاوەکو ئەوە کۆتا قسەی بێت، پاشان نەهی دەکرد لەنەریتی ئوممەتان کە باوەڕیان بەزیندووبوونەوە نییە، لەنەریتی لەخۆدان و شیوەن و ئەوانی تر.

بەسووننەتی کرد کزۆڵانە بۆ مردوو بگرین، گریانێکی بێ دەنگ و دڵ خەمبارانە، خۆی ئەوەی دەکرد و ئەیفەرموو: "تَدْمَعُ الْعَيْنُ، وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَا يُرْضِي الرَّبَّ"[1]،واتا: چاو فرمێسك ئەڕێژێ و دڵ خەفەتبار ئەبێ، تەنیا ئەوە ئەڵێین کە خوا پێی رازییە.

سوپاسکردن و بەخۆداچوونەوەی بۆ ئوممەتەکەی کردە سووننەت، هەروەها رازیبوون بەوەی لای خوای گەورەوە هاتووە، ئەوەش دژ نییە بەفرمێسك رشتنی چاو و خەفەتباریی دڵ. خۆی لەهەموو مەخلوقاتی تر رازییتربوو بەقەزای خوای گەورە و لەهەمووان زیاتر سوپاسگوزارتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وەك بەزەیی و سۆزی باوکایەتی، لەرۆژی مردنی ئیبراهیمی کوڕیدا گریا، دڵیشی پڕ بوو بەڕازیبوون لەخوای گەورە و سوپاسکردنی و زمانیشی سەرقاڵبوو بەسوپاس و یادی خوای گەورە.

پەیامبەری خوای گەورە(صلى الله عليه وسلم) یەکێك لەسەربووردەکانی ئەوە بوو، خێرای دەکرد لەئامادەکردنی مردوو بۆ بەرێکردنی بۆلای خوای گەورە و شۆردن و بۆن پێوە کردن و کفنکردنی لەبەرگێکی سپییدا، پاشان دەهێنرایە لای و نوێژی لەسەر دەکرد، ئەمەو سەرباری ئەوەی لەکاتی سەرەمەرگدا دەچووەلای و بۆی دەپاڕایەوە و لای دەمایەوە هەتا گیانی دەردەچوو، پاشان ئامادەی بەرێکردنی دەبوو، پاشان نوێژی لەسەر دەکرد و هەتا سەر گۆڕ لەگەڵیدا دەچوو، پاشان هاوەڵان بینیان ئەوە بۆی سەختە، بۆیە دوای مردن بانگیان دەکرد و ئامادەی شۆردن و کفنکردنی مردوو دەبوو، پاشان بینییان ئەوەش بۆی گرانە، ئیتر مردووەکەیان ئامادە دەکرد و لەسەر دارەمەیتێك هەڵیان دەگرت بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و لەدەرەوەی مزگەوت نوێژی لەسەر دەکرد. لەڕێنمایی

[1]- بوخاری(١٣٠٣) و موسلیم(٢٣١٥) ئیخراجیان کردووە.



ئەو نەبوو (صلى الله علیه وسلم) لەمزگەوتدا وەك ڕەواتیب نوێژ لەسەر مردوو بكات، هەندێجار لەنێو مزگەوتدا نوێژی لەسەر مردوو كردووە، وەك نوێژكردنی لەسەر سوهەیلی كوڕی بەیزائو براكەی لەنێو مزگەوتدا.

یەكێك لەڕێباز و سەربووردەی ئازیز،داپۆشین و چاونوقاندنی مردوو بوو، هەندێجار مردووەكەی ماچ دەكرد وەك ئەوەی عوسمانی كوڕی مەزعونی ماچكرد و گریا، هەروەها ئەبو بەكری سدیق لەسەر تەرمی پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) گریا و ماچی دەكرد و خۆی دابوو بەسەریدا.

پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) فرمانی دەدا سێ جار یان پێنج جار یان زیاتر مردوو بشۆردرێ بەپێی ئەوەی مردوو شۆر بەپێویستی دەبینێ، فرمانی دەدا لەشۆردنی كۆتاییدا كافوری بۆ بەكاربهێنرێت، شەهیدی كوژراوی جەنگ نەدەشۆردرا.

ئەگەر یەكێ لەئیحرامدا بمردبایە، فرمانی دەدا بەئاو و سیدر بشۆردرێت و لەبەرگی خۆیدا كفن بكرێت كە بەرگی ئیحرامی بوون، نەهی دەكرد لەبۆن لێدان و داپۆشینی سەری.

فرمانی دەدا بەو كەسەی سەرپەرشتی مردووەكەی دەكرد، كفنەكەی جوان بكات و لەبەرگی سپییدا كفنی بكات و نەهی دەكرد لەزیادەڕۆییكردن لەكفنكردندا، ئەگەر كفنەكە كورت ببووایە و تەواوی جەستەكەی دانەپۆشیبایە، سەری دادەپۆشی و بەپووش و گیا قاچەكانی دادەپۆشی.

ئەگەر مردووی بهێنرابایەتەلا، نوێژی لەسەر دەكرد و ئەیفەرموو:"قەرزدارە یان نە؟"، ئەگەر قەرزدار نەبووایە نوێژی لەسەر دەكرد، بەڵام ئەگەر قەرزداربووایە نوێژی لەسەر نەدەكرد، ڕێگەی بەهاوەڵانی دەدا نوێژی لەسەر بكەن، چونكە نوێژی خۆی شەفاعەتە، شەفاعەتی ئەویش دێتەدی، بەڵام بەندەیەك كە قەرزی لەسەرە،

ناچێته بەهەشتەوە تاوەکو قەرزەکەی لەگەردن لانەبرێت، بەلاّم که خوای گەورە فەتحی بۆ کرد، نوێژی لەسەر مردوو دەکرد و قەرزەکەی دەبژارد و سەروەتی مردووەکەی بەمیراتبەرانی دەدا.

که نوێژی لەسەر مردووی دادەبەست، الله أكبر و الحمد لله و ستایشی خوای دەکرد.

ئیبن عەباس لەسەر تەرمێك نوێژی کرد، لەدوای (الله أكبر)ی یەکەم سورەتی فاتیحای بەدەنگەوە خوێند و وتی: با بزانن ئەمە سووننەتە.

لەئەبو هورەیرەوە کە پرسیاری لەعوبادەی کوڕی سامت کردووە لەبارەی نوێژی مردوو، ئەویش ئەڵێ:سوێند بەخوا بۆت باس دەکەم: بە(الله أكبر) دەستپێدەکات پاشان سەلاّوات لەسەر پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دەدەی و ئەڵێی:"اللهمَّ إن عبدَك فلانا كان لا يُشركُ بك وأنتَ أعلمُ به، إن كان مُحسنا فزِد في إحسانه، وإن كان مُسيئا فتجاوز عنه، اللهمَّ لا تَحرمْنا أجرَه و لا تَفتنَّا بعده"[1]،واتا: خوایە گیان فلاّنە بەندەت هاوبەشی بۆت بڕیار نەدەدا و خۆت باشتر پێی دەزانی، ئەگەر چاکەکار بوو ئەوە چاکەکانی بۆ زیاتر بکە، ئەگەر هەڵەکاریش بووە ئەوە لێی بووریّ و چاوپۆشیی لیّ بکە، خوایە گیان لەپاداشتی ئەو بێبەشمان مەکە و لەدوای ئەو تووشی فیتنەمان مەکە.

مەبەست بەو نوێژە: پاڕانەوەیە بۆ مردووەکە، لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) بۆ ئێمە پارێزراوە و گوازراوەتەوە کە سورەتی فاتیحا و سەلاّوات لەسەر دانی تێدا نییە.

لەپاڕانەوەکانیدا ئەوە پارێزراوە فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا

[1] – بەیهەقی ئیخراجی کردووە لە السنن الكبرى٤/٦٥(٦٩٦٣).

مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ"[1]،واتا: خوایە گیان لێی خۆش بە و بەزەییت پێدا بێتەوە و لێی ببورێ و سەلامەتی بکە، رێزی لێ بنێ و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکەرەوە، بیشۆرەوە بەئاو و بەفر و تەرزە و لەتاوانەکان پاکی بکەرەوە هەروەك بەرگی سپیت لەپیسیی پاك کردووەتەوە، خانوویەکی باشتر لەخانووی دونیای پێ بدە، کەسوکارێکی باشتر لەکەسوکاری دونیا و هاوسەرێکی باشتر لەهاوسەری دونیا، بیخەرە بەهەشتەوەو لەسزای گۆڕ و سزای دۆزەخ بیپارێزە.

پاڕانەوەیەکی تری لێ پارێزراوە کە فەرموویەتی:"اللهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا، اللهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِيمَانِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، اللهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تُضِلنَا بَعْدَهُ"[2]،واتا:خوایە گیان لێمان خۆشبە، لەزیندوو و مردوومان، لەبچووك و گەورەمان، لەنێر و مێمان، لەوەی ئێستا لێرەیە و لەوەی لێرە نییە، خوایە گیان هەرکەسێکت لەئێمە زیندوو کردەوە، لەسەر ئیمان زیندووی بکەیتەوە، هەرکەسێکیشت لێمان مراند، لەسەر ئیسلامەتیی بیمرێنە، خوایە گیان لەپاداشتی مردووەکەمان بێ بەشمان نەکەی و لەدوای ئەو گومڕامان نەکەی.

هەروەها لەپاڕانەوەکانی بۆ ئێمە پارێزراوە کە فەرموویەتی:"اللهُمَّ إِنَّ فُلاَنَ بْنَ فُلاَنٍ فِي ذِمَّتِكَ وَحَبْلِ جِوَارِكَ، فَقِهِ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ النَّارِ،فَأَنْتَ أَهْلُ الْوَفَاءِ وَالْحَقِّ، اللهُمَّ فَاغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ"[3]،واتا:خوایە گیان فلانی کوڕی فلان وا گەڕاوەتەوە لای خۆت، بیپارێزە لەفیتنەی گۆڕ و سزای دۆزەخ، بێگومان تۆ

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٩٦٣).

[2] – ئەبو داوود(٣٢٠١) و ترمیزی(١٠٢٤) و نەسائی(١٩٨٦) ئیخراجیان کردووە.

[3] – ئەبو داوود(٣٢٠٢) و ئیبن ماجە(١٤٩٩) ئیخراجیان کردووە.

ئەهلی وەفاداری و حەقی، لێیخۆش بە و بەزەییت پێدا بێتەوە، بێگومان هەر خۆت لێخۆشبووی بەبەزەییت.

فرمانی دەدا دڵسۆزانە دوعا بۆ مردووەکە بکرێت.

چوار جار(الله أكبر)ی دەکرد، بەدروست لێیەوە هاتووە پێنج جار(الله أكبر)ی کردووە، هاوەڵان لەدوای خۆی چوار جار و پێنج جار و شەش جار(الله أكبر)یان کردووە، زەیدی کوڕی ئەرقەم پێنج جار(الله أكبر)ی کردووە، باسی کردووە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئاوەهای کردووە، موسلیم باسیکردووە[1]، عەلی کوڕی ئەبو تالیب لەسەر تەرمی سوهەیلی کوڕی حەنیف شەش جار(الله أكبر)ی کردووە، لەسەر ئەهلی بەدر شەش جار(الله أكبر)ی کردووە، لەسەر هاوەڵانی تریش پێنج جار، لەسەر تەواوی خەڵکیش چوار جار، دارەقوتنی باسیکردووە[2].

سەعیدی کوڕی مەنسور باسیکردووە لەئەلحەکەمی کوڕی عوتەیبە وتی: لەسەر ئەهلی بەدر پێنج جار و شەش جار و حەوت جار(الله أكبر)یان کردووە. ئەوانە گێڕانەوەی دروستن و ڕێگری و قەدەغەیان تێدا نییە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی نەکردووە لەوەی زیاتر لەچوار جاری وتبێ، نەك هەر ئەوە، بەڵکو خۆی و هاوەڵانیش لەدوای خۆی ئەوەیان کردووە.

هەرچی ڕێبازی پەیامبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم) لەسەلامدانەوە لەسەر نوێژی مردوو، ئەوە لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە یەك سەلامی داوەتەوە، هەروەها گێڕدراوەتەوە کە دوو سەلامیشی داوەتەوە.

هەرچی دەست بەرزکردنەوەیە، ئەوە شافیعی بەڕەحمەت بێ وتوویەتی: بەپێی ئەسەر دەست بەرز دەکرێتەوە، قیاسە لەسەر سووننەت لەنوێژدا، پەیامبەری

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٩٥٧).

[2] – دارەقوتنی ئیخراجی کردووە٢/٤٣٥(١٨٢٣).

خوا(صلی الله علیه وسلم) لەهەموو تەکبیرەیەکی نوێژدا کە بەپێوە بووە، دەستی بەرزکردووەتەوە[1].

ئەڵێم: مەبەستی بەئەسەر، ئەوەیە گێڕاویەتییەوە لەئیبن عومەر و ئەنەسی کوڕی مالیك کە هەرکات لەسەر تەرم(الله أکبر)یان کردبێ، دەستیان بەرزکردووەتەوە.

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو کە فریا نەکەوتبایە نوێژ لەسەر مردو بکات، لەسەر گۆڕەکەی نوێژی دەکرد، جارێکیان لەسەر گۆڕێك نوێژی کرد دوای تێپەڕبوونی شەوێ، جارێکی تر لەدوای سێ شەو، جارێکی تر لەدوای مانگێك، کاتی بۆ ئەوە دەستنیشان نەکردووە.

یەکێکی تر لەڕێنمایی و ڕێبازی پەیامبەری ئازیز(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو ئەگەر مردووەکە پیاو بوایە، ئەوە لای سەری رادەوەستا، ئەگەر ئافرەت بوایە، ئەوە لەناوەڕاستی رادەوەستا.

لەڕێبازی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەنوێژکردن لەسەر منداڵ، بەدروست لێیەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی:"الطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ"[2]،واتا: منداڵ نوێژی لەسەر دەکرێت.

یەکێکی تر لەڕێباز و ڕێنماییەکانی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو نوێژی لەسەر کەسێك نەدەکرد خۆی بکوشتبایە، یان لەغەنیمەت دزی بکردبایە.

جیاوازیی هەیە لەبارەی نوێژکردن لەسەر ئەوەی لەجێبەجێکردنی حەددا بکوژرێ، وەك داوێنپیسی بەرد باران کراو، بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە کە نوێژی کردووە لەسەر ئەو ئافرەتە جوهەنییەی کە رەجمی کرد، عومەر پێیووت: ئەی پەیامبەری خوا نوێژی لەسەر دەکەی لەکاتێکدا داوێنپیسیی کردووە؟!

---

[1] - (الأم)ی شافیعی٢/٢٣٩.

[2] - ئەبو داوود(٣١٨٠) و ترمیزی(١٠٣١) و نەسائی(١٩٤٢) ئیخراجیان کردووە.

فەرمووی:"لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لوْ قُسِّمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ المَدِينَةِ لوَسِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدْتَ تَوْبَةً أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا للهِ"[1]،واتا: تەوبەیەکی کردووە ئەگەر بەسەر حەفتا کەسی خەڵکی مەدینەدا دابەشی بکەی بەشی هەموویان دەکات، ئاخۆ تەوبەیەکت بینیووە لەتەوبەی ئەم ژنە باشتر بێ کە گیانی خۆی بەخوا بەخشی.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە نوێژی لەسەر مردوویەك دەکرد، لەپێشییەوە بەپیادە بەڕێدەکەوت بۆ گەیاندنی بەگۆڕستان، کردیە سوونەت بۆ هەرکەسێ دوای تەرم دەکەوێ، ئەگەر سواریی بوو بکەوێتە دوای تەرمەکە، بەڵام ئەگەر پیادە بوو نزیك بێ لەتەرمەکەوە یان لەپێشییەوە یان لەدوایەوە یان لەلای ڕاستی یان لەلای چەپی بێ.

فرمانی دەکرد خێرا بکرێ بۆ بەخاکسپاردنی. کە دوای تەرم دەکەوت، دانەدەنیشت هەتاوەکو تەرمەکە ئەخرایە گۆڕەوە و فەرموویەتی:"إذا تبِعتُم الجنازةَ فلَا تَجْلِسُوا حَتَّى تُوضَعَ"[2]،واتا:ئەگەر دوای تەرم کەوتن، دامەنیشن تاوەکو ئەخرێتە گۆڕەوە.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە بەڕەحمەت بێ ئەڵێ: مەبەست بەخاکسپاردنێتی.[3]

لەڕێبازی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) نەبووە لەسەر هەموو مردوویەکی غائیب نوێژ بکات، زۆرێ موسڵمان مردن و غائیب بوون، نوێژی لەسەریان نەکرد، بەدروست هاتووە کە: لەسەر نەجاشیی نوێژی غائیبی کردووە[4].

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٦٩٦).

[2] - بوخاری(١٣١٠) و موسلیم(٩٥٩) ئیخراجیان کردووە.

[3] - اقتضاء الصراط المستقيم لابن تيمية١/٢٣٠.

[4] - بوخاری(١٣٢٧) و موسلیم(٩٥١) ئیخراجیان کردووە.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە ئەڵێ: دروست ئەوەیە ئەگەر کەسێك لەشوێن و وڵاتێکدا مرد و لەو شوێن و وڵاتەدا نوێژی لەسەر نەکرا، ئەوە نوێژی غائیبی لەسەر دەکرێت.

دروست لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ەوە هاتووە کە تەرمی بەلادا تێپەڕێنراوە بۆ تەرمەکە هەڵساوەتەسەر پێ، بەدروست لێیەوە هاتووە کە دانیشتووە، لەوەدا جیاوازیی هەیە، وتراوە: راوەستان نەسخ بووەتەوە، دانیشتن کۆتا شت بووە. وتراوە: هەردوو کار جائیزە، بەپێوە راوەستان و دانیشتن، بۆیە ئەنجامی داوە تاوەکو روونیبکاتەوە موستەحەبە، وازیشی لێهێناوە و نەیکردووە تاوەکو روونیبکاتەوە دانیشتن جائیزە، ئەمە لەپێشترە.

یەکێکی تر لەڕێباز و رێنماییەکانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو لەکاتی هەڵهاتنی خۆر و خۆرئاوابوون و کاتی نیوەڕۆ، مردوو بەخاك نەسپێردرێت.

یەکێکی تر لەڕێباز و رێنماییەکانی، لوحد و قوڵکردن و فراوانکردنی گۆڕ بوو لای سەر و قاچی مردوو، لێیەوە باس دەکرێت کە کاتێك مردووی خستووەتە گۆڕەوە فەرموویەتی: "بِسْمِ اللهِ وَبِاللهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ"[1]. لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە فەرموویەتی: "بسمِ الله، وفي سبيلِ الله، وعلى ملةِ رسول الله"[2].

هەروەها لەبارەیەوە دەگێڕدرێتەوە کە مردوو نێژراوە، سێ جار لای سەری مردووەکە خۆڵی کردووە بەسەریدا.

کە لەناشتنی مردوو دەبوویەوە، خۆی و هاوەڵانی لای گۆڕەکە دەمانەوە، داوای دامەزراویی بۆ دەکرد و فرمانی بەهاوەڵان دەکرد بۆی بپاڕێنەوە تاوەکو لەوەڵامدانەوەی فریشتەکاندا دامەزراو بێ.

لای گۆڕ دانەدەنیشت قورئان بخوێنێ یان تەلقینی مردوو بدات.

---

[1] – ئەبو داوود(٣٢١٣) و ترمیزی(١٠٤٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(١٥٥٠).

لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەبوو گۆڕ بەرزبکاتەوە و هەڵیبواسێ و دیوار و خشتی لەسەر دابنێت و قوڕکاریی بکات و گومەزی لەسەر دابنێت.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب(خوای لێ رازیی بێ) نارد بۆ یەمەن و فرمانی پێ کرد کە بەهەر پەیکەرێك گەیشت ورد و خاشی بکات، بەهەر گۆڕێکی بەرز کراو گەیشت تەختی زەویی بکات[1]. سوونەت و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) تەختکردنی تەواوی گۆڕە هەڵواسراوەکان بوو.

نەهی کرد لەهەڵواسینی گۆڕ و خانوو لەسەر دروستکردن و نووسین لەسەری، بەدانانی تاشەبەردێك ئەو گۆڕەی دەناسییەوە کە ویستی بوو بزانێ کامە گۆڕی فلانە کەسە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی کرد لەوەی گۆڕ بکرێتە مزگەوت و چرای تێدا دابگیرسێندرێت، ئەوەندە لەوەدا نەهییەکەی توند بوو تائەوەی نەفرەتی کردووە لەو کەسەی ئەو کارە دەکات، نەهی کردووە لەئوممەتەکەشی گۆڕی ئەو بکەنە جێی جەژن.

یەکێکی تر لەڕێبازی ئازیز(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بوو سوکایەتی بەگۆڕ نەکرێت، نەچنە سەری و لەسەری دانەنیشن.

## ٢- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەسەردانیکردنی گۆڕستاندا

کە سەردانی گۆڕی هاوەڵانی دەکرد، بۆ ئەوە سەردانی دەکردن دوعایان بۆ بکات و داوای بەزەیی و لێخۆشبوونی خوایان بۆ بکات، ئەمە ئەو سەردانییەیە کە بۆ ئوممەتەکەی کردە سوونەت، فرمانی بەئوممەتەکەی کرد لەکاتی سەردانیکردنی

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٩٦٩).

گۆڕستاندا بڵێن: "السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ، نَسْأَلُ اللَّهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ"[1]،واتا: سەلامی خواتان لێ بێ باوەڕداران و موسڵمانانی ئەم شوێنە، پشت بەخوا ئێمەش بەئێوە دەگەیەنەوە، لەخوای گەورە داوای سەرفرازی و براوەیی دەکەین بۆ ئێمە و ئێوە.

لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوەبوو، چی دەوت لەکاتی نوێژ و پاڕانەوەی بۆ مردوو، لەکاتی سەردانیکردنی گۆڕستانیشدا ئەوەی دەفەرموو، بەڵام هاوبەش پەیداکەران ئەوەیان رەتدەکردەوە، بەپێچەوانەوە ئەوان لەمردووەکان دەپاڕانەوە و دەیانکردنە هاوبەشی خوا!

## ٣- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) لەسەرخۆشیکردن لەکەسوکاری مردوو، خواردن بۆ دروستکردن و وازهێنان لەجاڕدان لەهەواڵی مردن

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بوو سەرخۆشیی لەکەسوکاری مردوو دەکرد، ئەوە نەبوو بۆ تەعزێباریی کۆبێتەوەو قورئان بخوێنێ لای گۆڕ و لەشوێنی تر.

رەوشت و ڕێنمایی ئەو لەو کاتەدا بێدەنگبوون و رازیبوون بوو بەقەزای خوای گەورە و سوپاسکردنی خوا و بەخۆداچوونەوە. خۆی بەری و بەدوور دەگرت لەو کەسەی لەکاتی کۆست و بەڵادا سنگی دادەڕی و دەنگ و هاواری بەرز دەکردەوە یان قژی خۆی دەبری.

لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوە بوو، کەسوکاری مردوو خواردنی خەڵکەکە لەئەستۆ نەگرن، بەڵکو فرمانی دەدا خەڵکی تر خواردنیان بۆ دروست بکەن و بۆیانی بنێرن، ئەوەش گەورەترین رەوشت جوانی و مەردایەتییە،

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٩٧٥).

سووککردنی بارگرانیی سەرشانی کەسوکاری مردووە، ئەوان سەرقاڵی کۆست و مەینەتیی خۆیانن و نایانپەرژێتەسەر خواردن پێدانی خەڵکی.

نەهی دەکرد لەوەی هەواڵی مردن بەهەموولایەك بگەینرێت و ئەیفەرموو: "هُوَ مِنْ عَمَلِ الْجَاهِلِيَّةِ"[1]، واتا: ئەوە لەکاری سەردەمی نەفامییە.

### ٤- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم )لەنوێژی ترسدا( صلاه الخوف )

خوای گەورە رێگەی داوە لەڕووی پایە و ژمارەی نوێژەوە کورت کردنەوە بکرێ ئەگەر ترس و سەفەر پێکەوە کۆبوونەوە، بەلاّم ئەگەر هۆکارەکە سەفەر بوو نەك ترس، ئەوە تەنیا ژمارەی رکاتەکان کورت بکرێنەوە، بەلاّم ئەگەر تەنیا ترس هەبوو نەك سەفەر، ئەوە لەپایەکانی نوێژ کەم بکرێتەوە، ئەوە یەکێك بوو لەکارەکانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و بەوە حیکمەت لەو ئایەتەدا دەردەکەوێ کە کورتکردنەوەی بەستووەتەوە بەگەڕان بەسەر زەوی و ترسدا.

یەکێکی تر لەڕێنمایی و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەنوێژی ترسدا، ئەوە بوو ئەگەر دوژمن رووەو قیبلەی بووایە، موسڵمانانی هەموو لەپشتەوەی خۆی ریز دەبەست، (الله أکبر)ی دەکرد و ئەوانیش هەموویان(الله أکبر)یان دەکرد، پاشان دەچووە رکوع و ئەوانیش دەچوونە رکوع، پاشان سەری بەرزدەکردەوە و ئەوانیش سەریان بەرزدەکردەوە، پاشان شۆڕدەبوویەوە بۆ سجود و ریزی پشتەوەشی لەگەڵیدا دەچوونە سجود، بەلاّم ریزی دواتر روو بەدوژمن رادەوەستان. کە لەڕکاتی یەکەم دەبوویەوە و بۆ رکاتی دووەم هەڵدەستا، لەدوای راوەستانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ریزی دواتر دوو سوجدەی دەبرد، پاشان هەڵدەستانەوە و ئەهاتنە شوێنی ریزی یەکەم و ریزی یەکەم دەچووە

---

[1] - ترمیزی ئیخراجی کردووە(٩٨٤).

شوێنی ئەوان تاوەکو گەورەیی ریزی یەکەم بەر هەردوولا بکەوێ و ریزی دووەم بگەن بەوەی لەرکاتی دووەم لەگەڵ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بچنە سوجدە هەروەك چۆن ریزی یەکەم لەرکاتی یەکەمدا بەوە گەیشتن لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) بچنە سوجدە. بەوە هەردوولا یەکسان دەبن و ئەوەش ئەوپەڕی دادپەروەرییە.

کە دەچووە رکوع، هەردوولا ئەوەیان دەکرد کە لەسەرەتادا کردیان، کە دادەنیشت بۆ تەحیات، ریزی دواتر دوو سوجدەی دەبرد و لەتەحیاتدا پێیدەگەیشتن، بەوە هەموویان پێکەوە لەنوێژەکەدا سەلامیان دەدایەوە.

ئەگەر دوژمن روو بەقیبلە نەبووایە، ئەوە هەندێجار دەیکردنە دوو کۆمەڵەوە: کۆمەڵێك روو بەدوژمن و کۆمەڵێکی تر لەگەڵیدا نوێژی دەکرد، یەکێك لەو دوو کۆمەڵە رکاتی یەکەمیان لەگەڵدا ئەنجام دەدا، پاشان نوێژەکەی دەگواستەوە لای شوێنی کۆمەڵەکەی تر، ئەوی تر ئەهاتە شوێنی ئەم و لەگەڵیدا رکاتی دووەمیان ئەنجام دەدا، پاشان سەلامی دەدایەوە، لەدوای سەلامدانەوەی ئیمام، هەر کۆمەڵە و رکاتەکەی تریان قەزا دەکردەوە.

جارێکیان یەك رکاتی بەیەکێك لەو دوو کۆمەڵە کرد، پاشان هەڵسا بۆ رکاتی دووەم، کۆمەڵی یەکەم رکاتێکی کرد و ئەو راوەستابوو، پێش رکوع سەلامی دایەوە، کۆمەڵەکەی تر هات و رکاتی دووەمی لەگەڵدا ئەنجام دا، کە دانیشت بۆ تەحیات، کۆمەڵەکەی تر هەڵسایەوە بۆ رکاتێکی تر و پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەتەحیاتدا چاوەڕێی کرد، کە ئەوانیش بۆ تەحیات دانیشتن، سەلامی بەوان دایەوە.

جاری وەهاش هەبوو بەیەکێك لەو دوو کۆمەڵەیە دوو رکاتی دەکرد، ئەو دوو کۆمەڵەیە لەپێش خۆی سەلامی دەدایەوە، کۆمەڵەکەی تر دەهات و دوو رکاتەکەی

تری بەوان تەواو دەکرد و سەلامی پێیان دەدایەوە و بەوە بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نوێژەکە دەبووە چوار رکاتی و بۆ ئەوان دوو رکات دوو رکات.

جارێکیشیان ئیمامەتیی بۆ کۆمەڵێکیان کرد و سەلامی پێ دانەوە، کۆمەڵەکەی تریش هات دوو رکات ئیمامەتیی بۆیان کرد و لەگەڵ ئەوانیشدا سەلامی دایەوە، بەو جۆرە نوێژی بەهەردوو کۆمەڵەکە کرد.

هەندێجار بەیەکێك لە دوو کۆمەڵەکە یەك رکات نوێژی دەکرد و پاشان دەڕۆیشت و هیچ رکاتێکی تری قەزا نەدەکردەوە، دەهات رکاتێکی تری بەکۆمەڵەکەی تر دەکرد و بەوە خۆی دوو رکاتی دەکرد و هەر کۆمەڵێکیش یەك رکات، جا هەموو ئەو شێوازانە تەواون و دەکرێ بەیەکێك لەو شێوازانە نوێژی ترس بکرێت.

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) گێڕدراوەتەوە لەبابەت نوێژی ترسدا کە بەسیفەت گەلێکی تر ئەنجامی داون، جا هەموو ئەو سیفەت و شێوازانە بۆ ئەو بنەمایانە دەگەڕێنەوە، رەنگە هەر جیاوازییەك هەبێ جیاوازیی لەفز و بێژە بێ. هەندێکیان دە سیفەتیان باس کردووە، ئەبو موحەممەدی کوڕی حەزم پانزە سیفەتی باسکردووە[1]، بەڵام راست و دروست ئەوەیە کە لەسەرەتا باسمان کرد، چونکە لەباسێکدا جیاوازیی گێڕەرەوانیان بینیووە، هەر جیاوازییەکیان کردووەتە وێنەی نوێژێکی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)، لەکاتێکدا جیاوازیی گێڕەرەوانە. خواش زاناترە.

---

[1] – المحلى لابن حزم٤/٢٧٢ و تیایدا باسی ئەوە دەکات کە لەکتێبی تردا لەو بارەیەوە بەتێروتەسەلی قسەی لەبارەی چواردە شێوازەوە کردووە.

# چوارەم: بەشی زەكات

## ١- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەسەدەقە و زەكاتدا

ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) كاملترین ڕێباز و ئامۆژگاریی بوو، لەكات و ئەندازە و پشكی زەكات و پێویستە كێ زەكات بدات و بەكێ بدرێت، لەهەموو ئەوانەدا رەچاوی بەرژەوەندیی خاوەن سەروەت و هەژارانی كردووە، خوای گەورە زەكاتی گێڕاوە بەپاكبوونەوەی ماڵ و سەروەت و خاوەنەكەی و پێزانینی نیعمەت بەسەر دەوڵەمەندانەوە، بەوە لەسەروەتی دەوڵەمەند كەم نابێتەوە، بەڵكو خوای گەورە بۆی دەپارێزێ و گەش و نمای پێ دەدات و بەڵاو ناخۆشیی لەسەر هەڵدەگرێت و بۆی دەكاتە شورا و پاسەوان.

پاشان زەكاتی لەچوار جۆر سەروەت و ساماندا داناوە كە زۆرترین سەروەتێكن لەنێو مرۆڤەكاندا و پێویستییان بەو چوار جۆرە هەیە:

یەكەم: كشتوكاڵیی و بەرووبوومی دار و درەخت.

دووەم: مەڕو ماڵات: وشتر و مانگا و مەڕ و بزن.

سێیەم: ئاڵتوون و زیوو.

چوارەم: سەروەتی بازرگانیی بەهەموو جۆرە جیاوازەكانییەوە.

پاشان خوای گەورە واجیبی كردووە هەموو ساڵێك ئەنجام بدرێت، بۆ كشتوكاڵ و بەرووبوومی دارو درەختیش لەكاتی وەرزی پێگەیشتندا پێویستە پشكی زەكاتی لێ دەربكرێت.

پاشان جیاوازیی كردووە لەئەندازەی واجیبدا، ئەوەش بەپێی هەوڵی خاوەن سەروەت و سامانەكە كە بۆ دەستخستنی هەوڵ دەدات و بەپێی ئاسان و سەختیی كارەكە، پێنج یەكی داناوە بۆ زەكاتی ئەو شتانەی لەزەوییدا دەدۆزرێنەوە لەجۆری كانزا و ماوەی ساڵ حساب ناكرێت، بەڵكو لەدەستخستنی ئەو كانزایە پێویستە زەكاتی لێ دەربكرێت.

بۆ ئەو بەرووبووم و کشتوکاڵییەی کە جوتیار زەوییەکە دەکێڵێ و تۆ و دەچێنێ و ئاودانی بەئاوی بارانە و کەسەکە ئاوی بۆ ناکرێ و بیری لێ نەداوە و بەسەتڵ(دۆڵەکە) و جەنجەڕ ئاوی نادات، یەك لەدەی بەرهەم و بەرووبوومەکە بەزەکات دەردەکات.

بەلاّم ئەگەر تەواوی ئەرك کەوتەسەر شانی جوتیارەکە و تێچووی تیادا بەخەرج دا لەزەوی کێلاّندن و خەرجکردنی پارە و توانا لەدابینکردنی ئاو بۆ کشتوکاڵییەکەی و سەرپەرشتیکردنی، ئەوە یەك لەبیستی بەرووبووم و بەرهەمەکە بەزەکات دەردەکرێت، چونکە ئەو تێچووەی ئەنجامی داوە زۆر زیاترە لەتێچووی کشتوکاڵییەك کە ئەو ئەرکەی تیادا نییە. لەبەر ئەوەی گەشەی کشتوکاڵی و بەرووبوومی دار و درەخت دیارتر و زۆرترە لەگەشەی بازرگانیی، ئەوە واجیببوونی دەرکردنی زەکات تیایدا زۆرترە لەدەرکردنی زەکاتی بازرگانیی، هەروەها دەرکەوتنی گەشەی ئەو کشتوکاڵییەی بەئاوی باران و رووبار ئاودێریی دەکرێت زیاترە لەوەی بەدۆڵەکە و ئاوبرژێن،دەرکەوتنیشی هەمووی پێکەوە وەك گەنجینە زۆرتر و دیارترە لەهەموو ئەوانی تر.

پاشان لەبەر ئەوەی هەر سەروەتێك با کەمیش بێ مەرج نییە دڵدانەوە و یارمەتیدان لەخۆبگرێ، ئەوە خوای گەورە ئەندازەی ئەو سەروەتەی کردووە کە دەرکردنی زەکاتی تێدا بەدڵدانەوە و هاوکاریی دادەنرێت و زیان نادات بەخاوەن سەروەت و سامانەکە و لای هەژارانیش شوێنی خۆی دەگرێت: بۆ پارە دوو سەد درهەمی داناوە، بۆ ئاڵتوونیش بیست مسقاڵ، بۆ گەنم و جۆر و بەرووبووم پێنج ئەوسەق(بار) و بۆ مەڕ و بزن چل سەر و بۆ مانگا سی سەر و بۆ وشتر پێنج سەری داناوە کە زەکاتیان تیادا واجیب ئەبێ، بەلاّم لەبەرئەوەی دەرکردنی زەکات لەخودی شتەکە دەبێتە زیان، ئەوە دانانی شەك مەڕێکی واجیب کردووە، بەلاّم کە

پێنج سەر وشترەکە بووە بیست و پێنج وشتر،ئەوە پشکی زەکات یەك وشترە و ئەوە واجیبە.

پاشان ئەندازەی ئەو واجیبەی کردووە لەڕووی زیاتربوون و کەمتربووندا، لەجۆرەکانی ئیبن مەخاز[١] و ئیبن لەبون و بنت لەبون[٢] و لەسەرووی ئەوەش حیق و حیقە[٣] و لەسەرووی ئەوەش لەجۆری جەزەع و جەزەعە[٤]. جا هەتاوەکو وشترەکان زیاتر بن، تەمەنی وشترەکانیش زیاتر ئەبن هەتاوەکو ئەوپەڕی. ئەوجار زیاتربوونی ژمارەی واجیبەکە بەرانبەر دەبێ بەزیاتربوونی ژمارەی سەروەت و سامانەکە.

خوای گەورە پشکی زەکاتی دابەشکردووە و کردوویەتییە هەشت بەشەوە، کۆیکردووەتەوە بۆ دوو جۆری خەڵك.

یەکەم: ئەوەی بۆ پێویستییەکانی وەریدەگرێت، هەریەکەو بەپێی سەختی و سووکیی پێویستییەکەی، کە هەژاران و بێ نەوایان و کۆیلە و ڕێبوارانن.

دووەم: ئەوەی بۆ سوود وەریدەگرن، ئەوانەی لەبواری کۆکردنەوەی زەکاتدا کار دەکەن، دڵڕاگیراوان و قەرزداران و موجاهیدانی ڕێگەی خوای گەورە.

جا هەرکەسێ پێویستی نەبێ و سوودی نەبێ بۆ موسڵمانان، ئەوە پشکی زەکاتی بۆ نابێ.

---

[١] -(ابن المخاض) و (بنت المخاض): ئەو وشترەیە کە ساڵێکی تەواو کردووە و چووەتە ساڵی دووەمەوە و دایکی ئاوس بووەتەوە.

[٢] -(ابن لبون) و (بنت لبون): ئەو وشترەیە کە ساڵی دووەمی تەواو کردووە و چووەتە ساڵی سێیەمەوە و دایکی بەدانانی سکی دووەمی بووەتە شیردەر.

[٣] -(الحِقُّ) و (الحِقَّة): ئەو وشترەیە کە ساڵی سێیەمی تەواو کردووە و چووەتە ساڵی چوارەمەوە.

[٤] -(الجَذَع) و (الجَذعَة): ئەو وشترەیە کە ساڵی چوارەمی تەواو کردووە و چووەتە ساڵی پێنجەمەوە.

## ٢- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەوانەی شایستەی بەوەرگرتنی زەکاتن

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە بیزانبیایە کەسێك شایستە بەوەیە زەکاتی پێ بدرێت، ئەوە زەکاتی پێ دەدا، ئەگەر کەسێك داوای زەکات بکردبایە و نەیزانیبایە حاڵی چۆنە، ئەوە دوای ئەوەی حاڵی خۆی باس دەکرد کە دەوڵەمەند نییە و خاوەن کار و کەسابەتێك نییە، زەکاتی پێ دەدا[1].

ئەگەر زەکاتی بەسەر خەڵکی ئەو شوێنەدا دابەش بکردبایە کە زەکاتەکەی تیادا کۆدەکرایەوە، چی بمابایەتەوە دەینارد بۆ دەشتو دەر و نەیدەنارد بۆ لادێکان.

کۆکەرەوانی زەکات و شارەزای دەنارد بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی کشتوکاڵی و بەرووبووم و دارخورما و مێوژ، ئەیانڕوانی چەند بار (وسق) ئەبن و بەپێی ئەوە ئەندازەی زەکاتیان دەردەکرد.

فرمانی دەدا بەکۆکەرەوانی زەکات دارخورما کە یەك لەسەر سێ یان چواری بەرووبوومەکە واز لێبهێنن و لێی نەکەنەوە، چۆنیان ویست لەگەڵ خاوەن زەکاتەکەدا لەبارەیەوە مامەڵە بکەن و ئەندازەی زەکاتەکە دەستەبەر بکەن.

زەکاتی دەرنەدەکرد لەئەسپ و کۆیلە و ئێستر و گوێدرێژ و سەوزە و کاڵەك و شووتی و ترۆزی و ئەو میوەیانەی کێشانە و پێوانە ناکرێن و گەنجینە ناکرێن.

---

[1] - ئەبو داوود(١٦٣٣) و نەسائی(٢٥٩٨) ئیخراجیان کردووە.

### ٣- دەرکردنی زەکات لەهەنگوین

لەبارەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەدەرکردنی زەکات لەهەنگوین جیاوازیی هەیە، بوخاری ئەڵێ: لەزەکاتی هەنگویندا شتێکی دروست نەهاتووە[١]، ترمیزیی ئەڵێ: لەم بوارەدا زۆربەی ئەو شتانەی لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ەوە هاتوون، دروست نیین و ناسەلمێنرێن[٢].

ئیبن ئەلمونزیر ئەڵێ: لەبابەت واجیببوونی دەرکردنی زەکات لەهەنگویندا فەرموودەیەك نەهاتووە بسەلمێ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوەی واجیب کردبێ، کۆدەنگییەکیش لەوەدا نەهاتووە، بۆیە زەکاتی تیادا دەرناکرێت[٣]، شافیعیی ئەڵێ: ئەو فەرموودەیە لاوازە کە دەرکردنی زەکاتی هەنگوینی یەك لەدە دیاریی کردووە، ئەوەشی کە ئەڵێ زەکاتی یەك لەدەی تیادا دەرناکرێت هەر لاوازە تەنیا لەعومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە هاتووە[٤]. ئەڵێن: هەموو ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتوون، عیلەدارن.

ئەحمەد[٥] و ئەبو حەنیفە[٦] و کۆمەڵێکی تر بۆ ئەوە رۆیشتوون، کە لەهەنگویندا زەکات دەردەکرێت، بۆ ئەوە رۆیشتوون هەموو ئەو ئەسەرانەی لەو بوارەدا هاتوون یەکتر بەهێز دەکەن، مەخرەج و شێوازەکانیان جیاوازە، بەڵام بەهۆی موسنەدیانەوە یەکتر بەهێز دەکەن.

بەڵام ئەوانەی وتوویانە واجیبە زەکات لەهەنگویندا دەربکرێ، جیاوازن لەوەی پشکی دەرکردنی هەیە یان نە؟ بۆ ئەوە دوو بۆچوونیان هەیە، یەکێکیان ئەڵێ: کەم

---

[١] - (العلل الکبیر)ی ترمیزی(ل١٠٢).

[٢] - سنن الترمذي٣/١٥.

[٣] - الإشراف لابن المنذر٣/٣٤.

[٤] - معرفة السنن والآثار للبیهقي٦/١٢٠، بڕوانە(الأم)ی شافیعی٢/٩٩.

[٥] - مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهویه روایة الکوسج(٦٤٤).

[٦] - الأصل للشیباني٢/١٢٨.

بێ یان زۆر زەکات دەردەکرێت، ئەمە بۆچوونی ئەبو حەنیفەیە[1]، دووەم: پشکێکی دیاریکراوی هەیە، بەڵام لەئەندازەیدا جیاوازن، ئەبو یوسف وتوویەتی: لەدە رەتڵدا زەکاتی هەنگوین دەردەکرێت[2]، موحەممەد وتوویەتی: پێنج ئەفراقە[3]، هەر فەرەقێکیش سی و شەش رەتڵی عێراقییە. ئەحمەد وتوویەتی: پشکی دەرکردنی زەکات لەهەنگویندا دە ئەفراقە[4].

**٤- پاڕانەوەی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم )بۆ ئەو کەسەی زەکاتەکەی بهێنایە و باشترینی نێو سەروەت و سامانەکەیانی وەرنەدەگرت**

ئەگەر کەسێك زەکاتەکەی بهێنایە بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)[5]، بۆی دەپاڕایەوە، جاری وا هەبوو ئەیفەرموو:"اللهُمَّ بَارِكْ فيهِ وَفِي إبلِه"[6]، واتا:خوایە گیان بەرەکەت بخەرە ژیانی خۆی و وشترەکانییەوە. هەندێجاریش ئەیفەرموو:"اللّهُمَّ صَلِّ عَلَيْه"[7]،واتا: خوایە گیان سەلاواتی لەسەر بدە.

لەکاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەبوو باشترینی نێو سەروەت و سامانی کەسێك بەزەکات وەربگرێت، بەڵکو مامناوەندی هەڵدەبژارد، لەبەر ئەوە بوو نەهی ئەو کارەی لەموعاز کرد.

---

[1] – هەمان سەرچاوە.
[2] - الخراج لأبي يوسف(ص٦٧).
[3] – الأصل للشيباني٢/١٢٨.
[4] – مسائل أحمد رواية أبي داوود(٥٥٦).
[5] – الأصل للشيباني٢/١٢٨.
[6] – نەسائی ئیخراجی کردووە(٢٤٥٨).
[7] – بوخاری(١٤٩٧) و موسلیم(١٠٧٨) ئیخراجیان کردووە.

## ٥- نەهیکردنی لەکڕینی زەکات لەلایەن خودی زەکاتدەردوە

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی دەکرد لەوەی کەسێك زەکاتی خۆی بکڕێتەوە، ڕێگەی دەدا کەسی دەوڵەمەند لەخێری کەسی هەژار بخوات. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەو گۆشتە خێرەی خوارد کە بەخێر بە بەریرە درابوو، فەرمووی:"وهو عليها صدقةٌ،ولنا منها هديةٌ"[١]،واتا: بۆ ئەو سەدەقەیە و تیایدا پشکی دیاریی بۆ ئێمە هەیە.

## ٦- دانەوەی قەرز لە پشکی زەکات

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەندێ جار بۆ بەرژەوەندیی موسڵمانان قەرزی دەکرد و لەزەکات دەیدایەوە، بەدەستی خۆی گوێی ئاژەڵی زەکاتی دیاریی دەکرد. ئەگەر کارێکی پێویست بهاتبایەتە پێش، ئەوە لەخاوەن زەکاتەکان داوای دەکرد پێش کاتی خۆی، زەکاتەکانیان بدەن.

## ٧- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەسەرفیترە

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) زەکاتی سەرفیترەی واجیب کرد بەسەر هەموو موسڵمانێکەوە، بەسەر هەر گەورە و بچووك و نێر و مێ و ئازاد و کۆیلەیەکەوە کە دەبێ سەرپەرشتیارەکەی بیدات، زەکاتی سەرفیترەی واجیب کرد کە دەبێ ساعێ خورما یان جۆ یان کەشك یان مێوژ بدرێ بۆ هەر یەك سەرێ. لێیەوە گێڕدراوەتەوە:"نصف صاع من برٍّ"[٢]،واتا: نیو ساع گەنمە. ئاشکرایە: عومەری کوڕی خەتاب نیو ساع گەنمی خستە شوێن ساعێکی ئەو شتانەوە،ئەبو

---

[١]- بوخاری(١٥٠٨) و موسلیم(٩٨٥) ئیخراجیان کردووە.
[٢]- ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١٦١٧).

داوود باسیکردووە[1]. لەسەحیحەیندا هاتووە کە موعاویە ئەوەی دامەزراندووە و بەهێزی کردووە[2]،لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) ئەسەر و هەواڵی مورسەل و کۆمەڵێ موسنەد هاتووە کە یەکتر بەهێز دەکەن.

## ٨- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم )لەکاتی دەرکردنی سەرفیترەدا

یەکێك لەڕێنمایی و ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەرفیترەدا، ئەوە بوو پێش نوێژی جەژن ئەو زەکاتەی دەردەکرد، لە(السنن)دا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:"مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ"[3]،واتا:هەرکەسێ لەپێش نوێژی جەژن دەریکرد، ئەوە زەکاتێکی قبوڵکراوە، بەڵام ئەگەر لەدوای جەژن دەریکرد، ئەوە سەدەقەیەکە وەك سەدەقەکانی تر.

## ٩- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) بەرانبەر بەوانەی شایستە بەسەرفیترەن

یەکێك لەڕێباز و ڕێنمایی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بریتی بوو لەتایبەتکردنی ئەو سەرفیترەیە بەهەژاران (المساكين) و بەهەشت جۆرەکەی تری نەدەدا.

---

[1]- ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١٦١٤).

[2]- بوخاری(١٥٠٨) و موسلیم(٩٨٥) ئیخراجی کردووە.

[3]- ئەبو داوود(١٦٠٩) و ئیبن ماجە(١٨٢٧) ئیخراجیان کردووە.

## ١٠-رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەدەقەی سووننەت (صدقة التطوع)

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەهەموو کەس خێرومەندتربوو بەوەی هەیبووایە لەوانی تر خێری زیاتر دەکرد. هەرشتێك خوای گەورە پێی ببەخشایە دەیبەخشی و کۆی نەدەکردەوە، هەرکەسێك داوای شتێکی لێ بکردبایە پێی دەبەخشی، جا ئەو شتە کەم بوایە یان زۆر. بەخشینەکەی بەجۆرێ بوو لەهەژاریی نەدەترسا. بەخشین و سەدەقە شیرینترین شتێك بوون بەلایەوە. لەو کەسە خۆشحاڵتر و شاگەشکەتر دەبوو کە خێر و بەخششەکەی پێ دەدا، بەخشندەترین کەس بوو وەك رەشەبا دەیبەخشی و دەستکراوە بوو.

ئەگەر خاوەن پێداویستییەك بهاتایە،خواردنەکەی خۆی پێ دەبەخشی، هەندێجار بەرگ و پۆشاکی خۆی پێ دەبەخشی.

بەخشش و سەدەقەکانی هەمەجۆر دەکرد، هەندێجار ئەیکردە دیاری، هەندێجار ئەیکردە سەدەقە، هەندێجار شتێکی دەکڕی و خودی شتەکە و نرخەکەشی ئەدایەوە بەو کەسەی لێی کڕیبوو هەروەك لەگەڵ جابردا وەهای کرد[1]، هەندێجار شتێکی بەقەرز دەهێنا، بەباشترین شێوە و زیاتر لەخۆی دەیگێڕایەوە، یان شتی دەکڕی و زیاتر لەنرخی شتەکەی دەدا، دیاریی قبوڵ دەکرد و بەباشتر پاداشتی خاوەن دیارییەکەی دەدایەوە.

سەدەقە و چاکەکانی بەپێی ئەوە بوو کە هەیبوو، هەروەها بەحاڵ و فەرمایشتی خۆی، چی هەبووایە ئەوەی دەدا، فرمانی دەدا بەسەدەقە کردن و هاندانی لەسەر دەکرد. کە چرووکێك بیبینایە حاڵی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)چۆنە، وەهای لێ دەکرد ببەخشێت، جا هەرکەسێك تێکەڵی و هاوەڵێتیی بکردبایە و رێبازی ئەوی ببینایە، لەلێبووردەیی و بەخششدا چرووکیی نەدەکرد.

---

[1] - بوخاری(٢٧١٨) و موسلیم(٧١٥) ئیخراجیان کردووە.

لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوەبوو، بانگەوازی دەکرد بۆ چاکەکاری و بەخشش و سەدەقە، بۆیە لەهەموو مەخلوقاتی تر زیاتر سنگفراوانتر و دەروون بەرزتر و دڵ نەرمتر و بەخشەرتر بوو، بێگومان خێر و سەدەقە و کردنی کاری چاك کاریگەریی سەیری هەیە لەسنگفراوانییدا، ئەمە و سەرباری ئەوەی کە خوای گەورە تایبەتمەندی کردبوو بەسنگفراوانیی لەپەیامبەرایەتی و پەیامدار بەکردار و هەستەوە سنگفراوانی کردبوو، پشکی شەیتانی لەدڵی دەرکردبوو.

## پێنجەم: بەشی رۆژوو

### ١- رێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەرۆژوودا

لەبەرئەوەی مەبەست بەرۆژوو خۆگرتنەوەیە لەشەهوەت و ئەوانەی رۆژانە مرۆڤ چێژیان لێ دەبینێ و چاککردنی هێزە شەهوانییەکەی جەستەیە تاوەکو ئامادەبێ بۆ داواکردن و گەڕان بەدوای ئەو شتانەی ئەوپەڕی بەختەوەری و خۆشییەکانی تێدایە و قبوڵکردنی ئەو شتانەیە کە دەروون پاك و پوخت دەکەنەوە بۆ ژیانی هەمیشەیی و، برسێتی و تینوێتییش توندی و ئەستوریی ئەشکێنێ و حاڵ و ئازاری جەرگ و دڵی برسیی هەژارن بیری مرۆڤ دەخاتەوە و لەرێڕەوی خواردن و خواردنەوەدا رێڕەوی شەیتان بەرتەسکتر دەکاتەوە و هێزی ئەندامانی جەستە بەند دەکات، کە شەیتان لەزیانی بژێوی و قیامەتی بەندەدا بەکاریدەهێنێ و کۆنترۆڵی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەکات، ئەوە رۆژوو جڵەوی لەخواترساوان و قەڵغانی جەنگاوەران و وەرزشی چاکەکاران و لەخواترساوانە، لەنێو هەموو کارە چاکەکانی تردا تاکە کارێکە بۆ پەروەردگاری جیهانیان ئەنجام دەدرێت. ئەوەی رۆژووەوان ئەیکات، وازهێنانە لەشەهوەت و خواردن و خواردنەوەی تەنیا لەپێناو خوای گەورەدا، وازهێنانە لەو شتانەی لای دەروون شیرینن تەنیا لەپێناو خۆشویستن و رازیکردنی خوای گەورەدا. رۆژوو نهێنی نێوان بەندە و خوای گەورەیە و تەنیا خوای گەورە پێی ئاگادارە. مرۆڤەکان تەنیا ئەوە دەبینن کە کەسەکە لەرواڵەت و ئاشکرادا نزیکی ئەو شتانە ناکەوێتەوە، بەڵام ئەوەی کەسەکە تەنیا لەپێناو خوای گەورە وازی لەو شتانە هێناوە، ئەوە شتێکە تەنیا خوای گەورە دەیزانێ، ئا ئەوە حەقیقەتی رۆژووە.

رۆژوو کاریگەرییەکی سەیری هەیە لەپاراستنی ئەندامە دیارەکانی جەستە و هێزی ناخی مرۆڤ و پارێزگاریکردنی لەتێکەڵ نەبوون بەو شتانەی لایەنی خراپی بۆ دەهێنن و بەتاڵی

دەکاتەوە لەو شتانەی ڕێگرن لەدروست و لەباربوونی کەسەکە و قبوڵبوونی ڕۆژووەکەدا.
گەورەترین هاوکاری و یارمەتیدەرێکی لەخواترسانە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ **البقرة: ١٨٣** ،واتا: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە و فەرزکراوە هەر وەك چۆن فەرزکراوە لەسەر ئەو ئومەتانەی لەپێش ئێوەدا بوون بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن لەخودا بترسن.
پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"الصَّوْمُ جُنَّةٌ"[١] ،واتا: ڕۆژوو قەڵغانە.
بۆ ئەو کەسەی ئارەزووی جووتبوونی زاڵە و ناتوانێ هاوسەرگیریی بکات، فرمانی کردووە بەڕۆژووبێ، چونکە لەزاڵبوونی ئەو ئارەزووە دەیپارێزێ.
ڕێباز و ڕێنمایی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تیایدا کامڵترین هیدایەن و گەورەترین بەدەستهاتێکی مەبەست و ئاسانترە بەسەر دەروونەوە.
لەبەر ئەوەی بڕینەوە و ڕێگریکردنی دەروون لەو شتانەی خووی پێوە گرتووە و ئالوودەی بووە لەکارە سەخت و دژوارەکانە، ئەوە فەرزبوونی ڕۆژوو دواکەوت و کەوتە دوای کۆچکردن بۆ مەدینە، هەتا ئەوکاتەی دەروونەکان لەسەر یەکتاپەرستی و نوێژ ڕاهاتن و ئاشنای فرمانەکانی قورئان بوون و بەقۆناغ تێکەڵی بوون.
فەرزبوونی ڕۆژوو کەوتە ساڵی دووی کۆچییەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد و نۆ ڕەمەزان بەڕۆژووبوو، سەرەتا بەشێوازی سەرپشکیی بۆی فەرزکرا، سەرپشککرا بەڕۆژوو بێ یان هەر ڕۆژێك خواردن بەبێ نەوایەك بدات، پاشان ئەم سەرپشکییە بووە فەرز، خواردن دان دانرا بۆ پیاوی بەتەمەن و ئافرەتێ کە توانای بەڕۆژووبوونیان نەبێ.

---
[١]– بوخاری(١٨٩٤) و موسلیم(١١٥١) ئیخراجیان کردووە.

روخسەت و مۆڵەت بەنەخۆش و رێبوار درا بەڕۆژوونەبن و دواتر بیگێڕنەوە، بۆ ئافرەتی سکپڕ و شیردەریش ئەگەر ترسی سەر ژیانی خۆیانیان هەبوو دەتوانن بەڕۆژوونەبن و دواتر بیگێڕنەوە، ئەگەر ترسی منداڵەکەیان هەبوو، لەگەڵ گێڕانەوەی رۆژووەکەدا بۆ هەر رۆژێك خواردنی بێ نەوایەك بدەن، بەڵام ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو، ساغ بوو، ترسی نەخۆشیی نەبوو، ئەوە ناچارە خواردنی بێ نەوا بدات وەك رۆژووشکاندنی دروست لەسەرەتای ئیسلامدا.

رۆژوو سێ پلەی هەیە،یەکێکیان: واجیببوونی بەوەسفی سەرپشکدارییی. دووەم: واجیببوونی بەنەبوونی سەرپشکیی، بەڵام ئەگەر کەسی رۆژووگر پێش ئەوەی خواردن و خواردنەوە بدات بخەوێ، ئەوە خواردن و خواردنەوەی لێ حەرامە هەتاوەکو شەوی داهاتوو، بەڵام ئەمە بەپلەی سێیەم هەڵوەشایەوە و نەسخ بوویەوە، کە شەرع لەسەری سەقامگیر بووە و هەتاوەکو رۆژی قیامەت بەو جۆرە دەمێنێتەوە.

## ٢- پەرستشی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەمانگی رەمەزاندا

یەکێك لەئاکار و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەمانگی رەمەزاندا، زۆر ئەنجامدانی جۆرەها خواپەرستیی بوو، جبریل(سەلامی خوای لەسەربێ) لەڕەمەزاندا قورئانی پێ دەور دەکردەوە. کە جبریل پێیدەگەیشت، لەڕەشەبا خێراتر بوو بۆ بەخشش و سەخاوەتی، ئەمە و سەرباری ئەوەی سەخاوەتترینی نێو خەڵك بوو، لەڕەمەزاناندا سەخیتر و زۆر بەخشەر و چاکەکار بوو، قورئانی زیاتر دەخوێندەوە و نوێژی زۆرتر ئەکرد و زۆرتر سەرقاڵی یادی خوابوو، ئیعتیکافی دەکرد.

رەمەزانی بەجۆرێ تایبەت دەکرد بۆ خواپەرستیی کە مانگەکانی تری بەو جۆرە تایبەت نەدەکرد، هەتائەوەی هەندێجار کاتژمێرەکانی شەو و رۆژی ئەدا بەدەم

یەکەوە بۆ خواپەرستی و ڕۆژووی نەدەشکاند، نەهیدەکرد هاوەڵانی شەو و ڕۆژ بدەن بەدەم یەکەوە بۆ خواپەرستی و ڕۆژوو نەشکێنن، پێیانووت: تۆ شەو و ڕۆژ دەدەی بەدەم بەیەکەوە، ئەویش ئەیفەرموو: "إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ- لەگێڕانەوەیەکدا- عِنْدَ رَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي"[1]،واتا: من وەك ئێوە نیم، من لای خوای گەورە خواردن و خواردنەوەم پێ دراوە.

خەڵکیی بوونەتە دوو بەشەوە لەبابەت ئەو خواردن و خواردنەوەیەی لەلایەن خوای گەورەوە بەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) دراوە:

یەکەم بۆچوون: خواردن و خواردنەوەیەکە هەستپێکراوەو لەڕێگەی دەمەوە بووە، وتوویانە: ئەمە حەقیقەتی بێژەی فەرموودەکەیەوە نابێ لێی لابدرێت.

دووەم: مەبەست پێی ئەو مەعریفەیە کە خوای گەورە پێی داوە، ئەو چێژ و خۆشییەیە کە لەموناجاتی خوادا خوای گەورە پێی داوە، لەنزیکیی خوای گەورەدا سوکنایی بۆ هاتووە و بەخۆشویستنی خوای گەورە نازپێدراو بووە، هەتاوەکو ئەو حاڵوبارانەی تر کە خۆراکی دڵ و چێژی ڕوح و سوکنایی و ئارامی و حەسانەوەن بۆ دەروون و ڕوح و دڵ، کە باشترین و بەسوودترین و نرخدارترین خۆراکێکن.

هەرکەسێ کەمترین ئەزموون و تامەزرۆیی هەبێ، دەزانێ جەستە بەبوونی خۆراکی دڵ و ڕوح پێویستیی بەزۆرێك خۆراك نابێ کە ژیانی پێوە دەوەستێتەوە، بەتایبەت بۆ ئەو خۆشحاڵەی کە داوا و ویستی بەدەستهێناوە و بەخۆشەویستەکەی ئارامیی بۆ هاتووە و ناز و خۆشیی بەدەستهێناوە، کە نزیکی بووەتەوە و ڕازیبوونی لێ وەدەستخستووە. جا ئەگەر ئەو خۆراکە خۆراکی هەستیی و ئەوە بێ کە لەدەمەوە تێکەڵ بەجەستە دەبێ، ئەی چۆن ڕۆژوو گر دەبوو، یان ئەبووە ئەو ڕۆژووگرەی کە ڕۆژوو و شەوی بەڕۆژووبوونەوە بەیەکەوە گرێ داوە.

---

[1]- بوخاری(١٩٦٤) و موسلیم(١١٠٥) ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە نەهیکردووە شەو و ڕۆژ درێژە بەڕۆژووبوون بدرێ، لەبەر بەزەیی بووە بەئوممەتەکەی، مۆڵەتی داوە هەتاوەکو کاتی پارشێو درێژەی پێ بدرێت، لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە لەئەبو سەعیدی خودرییەوە، بەوەی گوێی لەپەیامبەری خوا بووە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"لَا تُوَاصِلُوا فَأَيُّكُمْ أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ فَلْيُوَاصِلْ حَتَّى السَّحَرِ"[1]،واتا: ڕۆژووی ڕۆژ و شەوتان مەدەن بەدەم یەکەوە، هەرکەسێکتان ویستی درێژەی پێ بدات، با تاوەکو کاتی پارشێو درێژەی پێ بدات.

## ٣- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەلماندنی یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان و تەواوبوونی ئەو مانگە

یەکێك لەڕێنمایی و ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو بەبینێکی تەواو دڵنیایانەی مانگ یان شایەتیی یەك شایەت دەچووە نێو مانگی ڕەمەزانەوە، ئەگەر بینین و شایەت لەئارادا نەبووایە، ئەوە مانگی شەعبانی بەسی ڕۆژ دادەنا و ڕەمەزانی دەستپێدەکرد.

ئەگەر لەشەوی سییەمدا بەهۆی هەور و تەمەوە مانگ نەبینرایە، ئەوە شەعبانی بەسی ڕۆژ دەژمارد و دواتر ڕۆژووگرتنی دەستپێدەکرد، ئەوە کردار و فرمانی پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) و پێچەوانە نییە بەفەرمایشتی:"فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فاقْدِرُوا لَهُ"[2]،واتا: ئەگەر هەور و تەم نەیهێشت مانگ ببینن، ئەوە ئەندازەی بۆ بکەن. مەبەست پێی تەواوکردنی بوو بەسی ڕۆژ، هەروەك لەو فەرموودە

---

[1] سەحیحی بوخاری(١٩٦٣).

[2] بوخاری(١٩٠٠) و موسلیم(١٠٨٠) ئیخراجیان کردووە.

سەحیحەدا فەرموویەتی کە بوخاریی گێڕاویەتییەوە: "فأكملوا عدّة شعْبان"[1]،واتا: شەعبان بەسی ڕۆژ بژمێرن و تەواو بکەن.

یەکێك لەڕێنمایی و ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)،بەشایەتیی یەك پیاوی موسڵمان فرمانی بەخەڵك دەكرد بەڕۆژووبن و بەشایەتیی دوو کەس تەواوبوونی مانگی ڕەمەزانی ڕادەگەیاند.

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەگەر دوو کەس شایەتییان بدایە مانگیان بینیووە و شایەتییەکەیان دوای تێپەڕبوونی کاتی جەژن بووایە، فرمانی بەموسڵمانان دەكرد ڕۆژووەکەیان بشکێنن، لەبەیانی و لەکاتی نوێژدا نوێژی جەژنی دەكرد.

## ٤- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەخێراکردن لەڕۆژووشکاندن ( بەربانگ کردنەوە )

زوو بەربانگی ئێوارەی دەكردەوە و هاندانی بۆ ئەوەش دەكرد، پارشێوی دەكرد و هاندانی بۆ پارشێو کردن دەكرد، درەنگ پارشێوی دەكرد و هاندانی دەكرد پارشێو دوابخرێت.

هاندانی دەكرد بەخورما بەربانگ بکرێتەوە، ئەگەر خورمای دەستنەکەوتبایە بەئاو بەربانگی دەکردەوە، ئەوەش تەواوی بەزەیی و ئامۆژگاریی ئازیز بوو بۆ ئوممەتەکەی.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێش ئەوەی نوێژ بكات، بەربانگی دەكردەوە. لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە لەبەربانگ کردنەوەدا فەرموویەتی:"ذَهَبَ الظمأُ، وَابْتَلَتِ الْعُرُوقُ، وَثَبتَ الأجْرُ إِنْ شَاءَ اللهُ"،واتا: تینوێتیی ڕۆیشت و دەمارەکان بووژانەوە و پشت بەخوا پاداشتیش جێگیر بوو،ئەبو داوود باسیکردووە لەئیبن عومەرەوە[2].

---

[1] – سەحیحی بوخاری(١٩٠٩).

[2] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە (٢٣٥٧).

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) باسکراوە فەرموویەتی:"إِنَّ لِلصَّائِمِ عِنْدَ فِطْرِهِ دَعْوَةً ما تردُّ"،واتا:ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگکردنەوەدا هەر داوایەك بکات ڕەت ناکرێتەوە. ئیبن ماجە گێڕاویەتییەوە[1].

بەدروست لەپەیامبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ من هَا هُنَا، وَأَدبَرَ النَّهَارُ مِنْ هَا هُنَا، فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ"[2]،واتا: ئەگەر شەو لێرەوە دەرکەوت و ڕۆژیش لەوێوە ئاوا بوو، کەسی ڕۆژووەوان بەربانگ دەکاتەوە.

نەهی کردووە کەسی ڕۆژووەوان جنێو و هات و هاوار و قسەی ناخۆش بکات و وەڵامی جنێو بداتەوە، فرمانی داوە هەرکەسێ جنێوی بەڕۆژووەوان دا، ڕۆژووەوان پێی بڵێ:"إني صائِمٌ"[3]، واتا: من بەڕۆژووم.

## ٥- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەگەشت و سەفەر لەمانگی ڕەمەزاندا

پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەڕەمەزاندا گەشتی کردو بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژی وەهاش هەبوو بەڕۆژوو نەدەبوو، هاوەڵانیشی سەرپشك دەکرد بەڕۆژووبن یان بەڕۆژوو نەبن، کە نزیکی دوژمن دەبوونەوە، فرمانی پێیان دەکرد بەڕۆژوونەبن تاوەکو هێزی شەڕکردنی دوژمنیان هەبێت.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گەورەترین و گرنگترین شەڕی بەدر و فەتحی لەمانگی ڕەمەزاندا ئەنجام دا. عومەری کوڕی خەتاب وتوویەتی: لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) لەڕەمەزاندا دوو جەنگمان ئەنجامدا: ڕۆژی بەدر و فەتحی مەککە، لەهەردووکیاندا بەڕۆژوو نەبووین.

---

[1] - ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(١٧٥٣).

[2] - بوخاری(٩٥٤٨٩٤) و موسلیم(١١٠٠) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(١٨٩٤) و موسلیم(١١٥٠) ئیخراجیان کردووە.

لەڕێبازیدا نەبوو خەملاندن بۆ رووبەرێ بکات و بەو ئەندازەیە کەسێك بتوانێ لەسەفەرەکەیدا بەڕۆژوو نەبێ، هاوەڵان کۆڵوباری سەفەریان دەپێچایەوە و رۆژوویان نەدەگرت و تێپەڕاندنی ماڵەکانیان بەمەرج وەرنەدەگرت، هەواڵیشیان دەدا کە ئەوە سوونەت و رێبازی پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم).

### ٦- رێنیشاندەری و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەخۆشۆردن لەلەشگرانی و ماچکردنی هاوسەر لەرۆژی رەمەزاندا

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوە بوو، ئەگەر نزیکی بانگی بەیانیی بووایە و لەشگران بووایە بەیەکێك لەخێزانەکانی، ئەوە دوای بەیانیبوونەوە خۆی دەشۆرد و بەڕۆژوویش دەبوو.

بەڕۆژووبووە لەرۆژی مانگی رەمەزاندا ماچی هەندێ لەخێزانەکانی خۆی کردووە، ماچکردنی رۆژووەوانی بەئاو لەدەم رادان شوبهاندووە. بەدروست لێیەوە نەهاتووە لەوەدا جیاوازیی کردبێ لەنێوان پیاوی گەنج و بەتەمەن.

### ٧- مامەڵە و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەوەی بە لەبیرچوونەوە شتێکی خواردبێ و خواردبێتەوە

یەکێك لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوەبوو، ئەگەر بەهۆی لەبیرچوونەوە لەکاتی رۆژوودا شتێکی بخواردبایە و بخواردبایەتەوە، رۆژووەکەی نەدەشکاند و رۆژێکی تر قەزای بکاتەوە، بەڵکو ئەوە خوای گەورەیە ئەو خواردن و خواردنەوەیەی پێ داوە[1].

---

[1] - بوخاری(١٩٣٣) و موسلیم(١١٥٥) ئیخراجیان کردووە.

## ٨- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە

ئەوەی بەدروست لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ەوە هاتبێ، ئەوەی ڕۆژوو بشکێنێ و بەتاڵبکاتەوە بریتییە لەمانە: خواردن و خواردنەوە و کەڵەشاخ گرتن و خۆڕشاندنەوە، قورئان بەڵگەی داوە بەوەی جووتبوونیش ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە، بەڵام سەبارەت بەکلی چاوکردن هیچ شتێکی دروست نەهاتووە.

دروست لەئازیزەوە هاتووە(صلی الله علیه وسلم) کە بەڕۆژوو بووەو سیواکی کردووە.

پێشەوا ئەحمەد لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) باسیکردووە کە بەڕۆژوو بووە و ئاوی بەسەر سەری خۆیدا پرژاندووە.

ئاوی لەدەم و لووتی رادەدا و بەڕۆژووش بووە، ڕێگری کردووە لەڕۆژووەوان زیادەڕۆیی بکات لەئاو لەلووت کردن و هەڵمژین. بەدروست لێیەوە نەهاتووە کە کەڵەشاخی گرتبێ و بەڕۆژووش بووبێ.

## ٩- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەڕۆژووی سووننەتدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو هەتا دەوترا: هەموو ڕۆژێك بەڕۆژووە، ئەوەندەش بەڕۆژوو نەدەبوو هەتا دەوترا: بەڕۆژوو نابێ. جگە لەمانگی ڕەمەزان، هیچ مانگێکی تر نەبووە هەموو ڕۆژەکانی بەڕۆژوو بووبێ، لەمانگەکانی تریشدا بەقەد مانگی شەعبان بەڕۆژوو نەبووە. هیچ مانگێك نەبووە تیایدا بەڕۆژوو نەبووبێ. ڕۆژەکانی دووشەممە و پێنجشەممە بەڕۆژوو دەبوو.

ئیبن عەباس(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەیدەهێشت ڕۆژەکانی(أيام البيض)ی لەدەست دەربچێ و بەڕۆژوو نەبێ، جا لەمەدینەدا بووبێ یان لەسەفەردا.

سەبارەت بەڕۆژووی دوانزەی زیلحیجە، ئەوە لەبارەیەوە جیاوازیی هەیە(صلى الله عليه وسلم).

بەڵام سەبارەت بەشەشی شەوال، ئەوە بەدروست لێیەوە هاتووە فەرموویەتی:"صیامُها مع رمضان یعدلُ صیامَ الدهرِ"[1]، واتا:بەڕۆژووبوونی شەشەڵان(شەش ڕۆژەی شەوال) لەگەڵ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزاندا بەرانبەرە بەڕۆژووبوونی ساڵێ.

بۆ ڕۆژووی عاشورا، ئەوە بەڕۆژووبوونی بارسەنگ دەدا بەسەر ڕۆژەکانی تردا. کە هاتە مەدینە و بینی جولەکە لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبن و بەگەورەی رادەگرن، فەرمووی:"نحن أحقُّ بموسى منكُم"، واتا: ئێمە لەئێوە لەپێشترین بەموسا. بۆیە خۆی بەڕۆژوو بوو فرمانیشی کرد هاوەڵان بەڕۆژووبن، ئەوە لەپێش فەرزبوونی ڕەمەزاندا بوو، بەڵام کە ڕەمەزان فەرزکرا فەرمووی:" مَنْ شَاءَ صَامَهُ وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ"[2]،واتا: هەرکەسێ ویستی با ڕۆژی عاشورا بەڕۆژووبێ و هەرکەسێکیش ویستی با وازی لێبهێنێ.

موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەئیبن عەباسەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژی عاشورا بەڕۆژووبوو یان فرمانی دا تیایدا بەڕۆژووبن،وتیان: ئەی پەیامبەری خوا، ئەمە ڕۆژێکە جولەکە و گاورەکان گەورەی رادەگرن، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)یش فەرمووی:"إِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ إِنْ شَاءَ اللهُ صُمْنَا يَوْمَ التَّاسِعِ"،واتا: بۆ ساڵی داهاتوو إن شاء الله ڕۆژی نۆیەم بەڕۆژوو دەبین. بەڵام ساڵی داهاتوو نەهات و پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد[3].

---

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١١٦٤).

[2]- بوخاری(٢٠٠٢) و موسلیم(١١٢٥) ئیخراجیان کردووە.

[3]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١١٣٤).

## ١٠- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەڕۆژووی ڕۆژی عەرەفەدا

یەکێك لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە بوو، لەسەحیحەیندا لێیەوە سەلماوە[١]،هەروەها لێیەوە سەلماوە و بەدروست هاتووە کە ڕۆژووی عەرەفە تاوانی ساڵێ پێشووتر و دواتر دەسڕێتەوە، موسلیم باسیکردووە[٢].

بەهۆی بەڕۆژوونەبوونی لەعەرەفەدا چەند حیکمەتێك باسکراوە، لەوانە: بۆ ئەوەی هێز و توانای ئەوەی هەبێ بپاڕێتەوە، هەروەها: بەڕۆژوونەبوون لەسەفەردا باشترە لەوەی بەڕۆژووبی ئەمە لەڕۆژووی فەرزدا، ئەی چ جای ڕۆژووی سوونەت.

مامۆستامان(خوای لێ ڕازیی بێ) ڕێگەیەکی تری گرتووەتەبەر، ئەویش ئەوەیە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژنە بۆ ئەوانەی لەعەرەفەدان، چونکە تیایدا کۆبوونەوەتەوە، وەك کۆبوونەوەی خەڵکیی لەڕۆژی جەژندا، ئەم کۆبوونەوەیەش تایبەتە بەوانەی لەعەرەفەدان نەك خەڵکانی شوێنانی تر، ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئاماژەی داوەتە ئەو فەرموودەیەی کە ئەهلی سوونەن گێڕاویانەتەوە فەرموویەتی:"يَوْمُ عَرَفَةَ، وَيَوْمُ النَّحْرِ، وَأَيَّامُ مِنًى، عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ"[٣]، ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی قوربانیکردن و ڕۆژانی مینا، جەژنی ئێمەی ئەهلی ئیسلامن.

## ١١- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەڕۆژووی شەممە و یەکشەممەدا

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) گێڕدراوەتەوە کە زۆرجار ڕۆژانی شەممە و یەکشەممە بەڕۆژوو بووە، مەبەستی بەوەش پێچەوانەکردنی جولەکە و گاوران بووە، هەروەك لەموسنەد و سوونەنی نەسائیدا هاتووە لەکورەیبی خزمەتکاری ئیبن عەباسەوە وتوویەتی: ئیبن عەباس و خەڵکانێکی لەهاوەڵانی پەیامبەری

---

[١]- بوخاری(١٩٨٨) و موسلیم(١١٢٣) ئیخراجیان کردووە.

[٢]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١١٦٢).

[٣]- ئەبو داوود(٢٤١٩) و ترمیزی(٧٧٣) و نەسائی(٣٠٠٤) ئیخراجیان کردووە.

خوا(صلى الله عليه وسلم) منيان نارد بۆلای ئوم سەلەمە تاوەکو لێی بپرسم: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) زیاتر لەچی رۆژێکدا بەڕۆژوو دەبوو؟ فەرمووی: رۆژی شەممە و یەکشەممە و ئەیفەرموو:"إِنَّهُمَا عِيدٌ لِلْمُشْرِكِينَ فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أُخَالِفَهُمْ"[1]،واتا: ئەمە دوو جەژنی هاوبەش پەیداکەرانن، حەزەکەم پێچەوانەیان بکەم.

پێشەوا ئەحمەد و ئەبو داوود لەعەبدوڵلای کوڕی بیسر ئەلسولەمییەوە گێڕاویانەتەوە ئەویش لەئەلسەمائی خوشکیەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"لَا تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلَّا فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا عُودَ عِنَبٍ أَوْ لِحَاءَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضَغْهُ"[2]،واتا:رۆژی شەممان بەڕۆژوو مەبن تەنیا ئەوە نەبێ کە فەرز کراوە لەسەرتان، ئەگەر یەکێ لەئێوە هیچی دەستنەکەوت ئەو رۆژە بیخوات تەنیا چڵی ترێ یان توێکڵی دارێك، با بیجووێ.

خەڵکیی لەو دوو فەرموودەیەدا کەوتوونەتە جیاوازییەوە، مالیك وتوویەتی: ئەمە درۆیە[3]،مەبەستی فەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی بیسرە. ترمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی حەسەنە[4]. ئەبو داوود ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە نەسخ بووەتەوە(هەڵوەشاوەتەوە)[5]. نەسائی ئەڵێ: فەرموودەیەکی شێواوە(مضطرب)[6]، کۆمەڵێك لەئەهلی زانستیش وتوویانە: نەهیکردن لەبەڕۆژووبوون لەو رۆژە، ئەوەیە ئەگەر بەتەنیا لەو رۆژەدا بەڕۆژووی بی، رۆژی تری لەگەڵدا نەبێ.

---

[1] – ئەحمەد٤٤/٣٣٠(٢٦٧٥٠) و نەسائی لە الكبرى٣/٢١٤(٢٧٨٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ئەحمەد٤٥/ ٧(٢٧٠٧٥) و ئەبو داوود(٢٤٢١) ئیخراجیان کردووە.

[3] - سنن أبي داوود٢/٣٢١ دوای فەرموودەی(٢٤٢٤).

[4] – سنن الترمذي(٧٤٤).

[5] – نەسائی لە السنن الكبرى٣/٢١٢ دوابەدوای فەرموودەی(٢٧٨١) ئەڵێ: لەبەر هۆکاری جیاوازیی ئیخراجم کردووە.

[6] – نەسائی(٢٣٨١) و ئیبن ماجە(١٧٠٥) ئیخراجیان کردووە.

## ١٢- حوكمی بەڕۆژووبوونی تەواوی ساڵ

لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەبووە تەواوی ساڵ بەڕۆژووبی، فەرموویەتی:"مَنْ صَامَ الدَّهْرَ لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ، وَمَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ"[1]،واتا: هەركەسێ بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژووبێ، ئەوە نە ڕۆژووی گرتووە و نە بەربانگی كردووەتەوە.

بەڵكو ڕێبازی ئەو ئەوە بوو، ڕۆژووگرتنی ڕۆژێك و نەگرتنی ڕۆژێكی تر باشترە لەڕۆژووی تەواوی ساڵێك و بەلای خوای گەورەشەوە ئەوە شیرینترە[2].

## ١٣- ڕێبازی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەدامەزراندنی نیەتی ڕۆژووی سووننەت و بڕان و تەواوكردنی

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەچووەماڵەوە بۆلای خێزانەكانی و ئەیفەرموو:"هیچ خواردنێكتان لا هەیە؟ ئەگەر بیانوتبایە: هیچمان لا نییە. ئەیفەرموو: "إني إذن صائمٌ"[3]،واتا: كەوابوو من بەڕۆژووم. لەڕۆژدا نیەتی ڕۆژووی سووننەتی دادەمەزراند، هەندێجاریش نیەتی ڕۆژووی سووننەتی دەهێنا و دواتر دەیشكاند.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بەڕۆژووبووایە و دابەزیبایەتەلای قەومێك، ڕۆژووەكەی تەواو دەكرد و نەیدەشكاند، هەروەك چووە لای ئوم سەلیم، خورما و ڕۆنی بۆ هێنا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"أَعِيدُوا سَمْنَكُمْ فِي سِقَائِهِ وَتَمْرَكُمْ فِي وِعَائِهِ فَإِنِّي صَائِمٌ"[4]،واتا:ڕۆنەكەتان بخەنەوە هیزە و خورماكەتان بخەنەوە قاپتانەوە، چونكە من بەڕۆژووم.

---

[1] – نەسائی(٢٣٨١) و ئیبن ماجە(١٧٠٥) ئیخراجیان كردووە.

[2] – بوخاری(٣٤٢٠) و موسلیم(١٧١٦) ئیخراجیان كردووە.

[3] – موسلیم ئیخراجی كردووە(١١٥٤).

[4] – بوخاری ئیخراجی كردووە(١٩٨٢).

سەلماوە لەسەحیحدا هاتووە فەرموویەتی:"إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ وَهُوَ صَائِمٌ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ"[١]،واتا: ئەگەر دەعوەتی، یەکێکتان کرا بۆ خواردن و بەڕۆژوو بوو، با بڵێ: من بەڕۆژووم

## ١٤-کەراهەتی تایبەتکردنی رۆژی جومعە بەڕۆژووگرتن

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەکردار و گوفتار بەکەراهەتی دانا رۆژی جومعە تایبەت بکرێ بەڕۆژووگرتن، هۆکاری رێگریکردنیشی بەوە روونکردووەتەوە کە جومعە رۆژی جەژنە. ئیمام ئەحمەد لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يَوْمُ عِيدٍ، فَلَا تَجْعَلُوا يَوْمَ عِيدِكُمْ يَوْمَ صِيَامِكُمْ، إِلَّا أَنْ تَصُومُوا قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ"[٢]،واتا: رۆژی جومعە رۆژی جەژنە، رۆژی جەژنتان مەکەنە رۆژی رۆژووگرتنتان، تەنیا ئەوە نەبێ رۆژێ پێشتر یان دواتر لەگەڵیدا بەڕۆژووبن.

---

[١] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١١٥٠).

[٢] – ئەحمەد١٣/٣٩٥(٨٠٢٥) گێڕاویەتییەوە و بنەچەکەی لای بوخاریە(١٩٨٥) و موسلیم(١١٤٤).

## شەشەم: بەشی ئیعتیکاف(مانەوە لەمزگەوت)

### رێبازی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەئیعتیکاف کردندا

لەبەر ئەوەی چاکی و دامەزراویی دڵ لەسەر رێگە و رێبازی خوای گەورە هەمووی لەسەر خوا وەستاوەتەوە و دەبێ شپرزی و شێواوییەکان کۆبکرێنەوە و تێکڕایی روو بکرێتە خوای گەورە، خواردن و خواردنەوەی زیاتر و تێکەڵیکردنی زیاتری خەڵك و قسە و خەوی زیاتر شپرزی و شێواویی زیاتر دەکەن، ئەوە بەزەیی خوای گەورە بەبەندەکانی وەهای خواستووە لەڕۆژوودا شتێکیان بۆ دابنێت زیادەی خواردن و خواردنەوە بتوێنێتەوە و دڵ لەتێکەڵیکردنی ئەو شەهوەتانە پاك بکاتەوە کە رێگرن لەڕۆیشتن رووە و خوای گەورە، ئیعتیکافی بۆ داناون کە مەبەست بەوە، مانەوە و گۆشەگیریکردنی دڵە بۆ خوای گەورە و کۆکردنەوەی خودی مرۆڤە بۆ ژیان لەگەڵ خوای گەورە و خەڵوەتکردن و دابڕان لەسەرقاڵبوون بەمەخلوقات و تەنیا دواندنی خوای گەورەیە، بەخوا هۆگر دەبێ لەجیاتی هۆگربوون بەمەخلوق، بەوە هۆگری و دڵدەرەوە بۆ رۆژی تەنیایی نێو گۆڕ ئامادە دەکات لەو رۆژەی کە هیچ دڵدەرەوە و خەمڕەوێنێکی نییە جگە لە الله، جا ئەوە مەبەستی گەورەی ئیعتیکاف کردنە.

لەبەرئەوەی ئەو مەبەستە لەگەڵ رۆژووگرتندا دێتەدی، ئەوە ئیعتیکافکردن خراوەتە باشترین رۆژانی رەمەزانەوە کە دە رۆژی کۆتایی رەمەزانە. لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) نەگوازراوەتەوە کە قەت لەڕۆژانی بەڕۆژوو نەبووندا ئیعتیکافی کردبێ، عائیشە وتوویەتی:"تەنیا بەڕۆژووبوونەوە ئیعتیکاف دەکرێت"[1].

خوای گەورەش تەنیا لەگەڵ رۆژووگرتندا باسی ئیعتیکافی کردووە. بۆچوونی دروست لەو بەڵگەیەی کە کۆڕای سەلەف لەسەری رۆیشتوون ئەوەیە: بەڕۆژووبوون

[1] – ئەبو داوود(٢٤٧٣) ئیخراجی کردووە.

مەرجە بۆ ئیعتیکاف کردن، ئەوەیە کە شێخی ئیسلام ئەبو ئەلعەباس ئیبن تەیمییە بارسەنگی کردووە.

سەبارەت بەقسەی زیادە، ئەوە بۆ ئوممەتی داناوە کە زمانیان بەند بکەن و بپارێزن لەقسەیەك بۆ ئاخیرەتیان سوودی نەبێت.

سەبارەت بەخەوتنی زیادەش، ئەوە لەشەونوێژدا ئەوەی بۆ داناون کە باشترین شەونخونی و باشترین سەرەنجامی هەیە، شەو بەئاگایی مامناوەندە کە سوود بەدڵ و جەستە دەگەیەنێ و ڕێگریی ناخاتە بەرژەوەندیی بەندەوە.

چەقی خۆڕاهێنان و وەرزشی وەرزشوانان و ئەوانەی کار لەسەر روح دەکەن، وەستاوەتەوە سەر ئەو چوار پایەیە، بەختەوەرترینیان کە پێی بەختەوەر دەبێ، ئەوەیانە کە پەیڕەو لەو رەفتارەی موحەممەدی پەیامبەر دەکات(صلی الله علیه وسلم) و ڕێگەی چەوتی لادەران ناگرێتەبەر و ناچیتە ریزی کەمتەرخەمەکانە. باسی ڕێنمایی ڕێنمایی و ڕێبازی پەیامبەری خوامان کرد(صلی الله علیه وسلم) لەڕۆژوو و شەونوێژ و فەرمایشتیدا،با باسی ڕێبازیشی بکەن لەبابەت ئیعتیکافکردنیدا.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەدەی کۆتایی مانگی رەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد تاوەکو کۆچی دوایی کرد، جارێکیان نەیکرد و لەمانگی شەوالدا قەزای کردەوە.

جارێکیان لەدەی سەرەتا ئیعتیکافی کرد، جارێکیان لەدەی ناوەڕاست، پاشان دەی کۆتایی کە ئەکەوێتە شەوانی قەدرەوە، پاشان بۆی روونبوویەوە کە دەی کۆتاییە، لەسەر ئیعتیکافکردنی بەردەوام بوو تاوەکو گەیشتەوە بەخوای پەروەردگاری.

فرمانی دەکرد لەمزگەوتدا دەوارێ(رەشماڵێ)کی بۆ هەڵبدرێ و تیایدا خەڵوەت لەگەڵ پەروەردگاری بگێڕێ.

ئەگەر ویستی ئیعتیکاف هەبووایە، نوێژی بەیانیی دەکرد ئینجا دەچووە ئیعتیکافەوە.

لەهەموو ساڵێکدا دە ڕۆژ ئیعتیکافی دەکرد، کە ساڵی کۆچی دوایی هات، بیست ڕۆژ ئیعتیکافی کرد، جبریلیش هەموو ساڵێك یەك جار دەوری قورئانی پێ دەکردەوە، لەو ساڵەدا دوو جار دەوری قورئانی پێ کردەوە.

کە ئیعتیکافی دەکرد بەتەنیا دەچووە گومەزەکەیەوە، نەدەچووە ماڵەوە تەنیا لەبەر پێویستیی مرۆڤێك نەبێ، لەمزگەوتەوە سەری دەردەکرد و دەیخستە ماڵی عائیشەوە و عائیشەش سەری دەشۆرد لەکاتێکدا لەحەیزدا بوو. هەندێ لەهاوسەرەکانی سەردانیان دەکرد لەکاتێکدا ئیعتیکافی کردبوو، ئەگەر خێزانەکەی ویستی گەڕانەوە ماڵی هەبووایە و کاتەکەی شەو بووایە، لەگەڵیدا دەڕۆیشت. لەئیعتیکافدا لەگەڵ هیچ یەك لەهاوسەرەکانی جووت نەدەبوو ماچیشی نەدەکردن. کە ئیعتیکافی دەکرد، جێ خەوی بۆ دادەنرا.

ئەگەر بۆ پێویستییەك دەربچووبایە و بەلای نەخۆشێکدا تێپەڕیبوایە، لای نەدەکردەوە و پرسیاری لێ نەدەکرد. جارێکیان لەگومەزێکی چۆڵدا ئیعتیکافی کرد و حەسیرێکی بەسەر دەرگاکەیدا دابوو، هەموو بۆ ئەوەی مەبەستی ئیعتیکافەکەی بێتەدی و ئاسوودەبێ، پێچەوانەی ئەو نەفامانەی ئیعتیکاف دەکەن و شوێنی ئیعتیکافەکەیان جێگەی دە سەردانیکاری تێدا دەبێتەوە و سەردانیکار بۆ خۆی رادەکێشێ و لەگەڵیاندا دەکەوێتە گفتوگۆ و باس و خواسەوە، ئەمە جۆرێکە و ئیعتیکافی پەیامبەرانەی موحەممەدیش(صلی الله علیه وسلم) جۆرێکی ترە. سەرکەوتن بەخوای گەورەیە.

### حەوتەم: بەشی حەج و عومرە

### ١- ڕێنمایی و ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەحەج و عومرەکردنیدا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەدوای کۆچکردن بۆ مەدینە چوار عومرەی ئەنجام دا و هەمووی لەمانگی زیلقیعدەدا بوو.

یەکەم: عومرەی حودەیبییە، یەکەمین عومرەی بوو لەساڵی شەشدا ئەنجامی دا، هاوبەش پەیداکەران ڕێگرییان لێکرد، بۆیە لەحودەیبییەدا کە بەری پێگیرا قوربانیی کرد و خۆی و هاوەڵانی سەریان تاشی و ئیحرامیان داکەند و لەو ساڵەدا گەڕایەوە مەدینە.

دووەم: عومرەی قەزا کە لەساڵی دواتردا ئەنجامی دا، چووە مەککەوە و سێ ڕۆژ تیایدا مایەوە، پاشان تەواوبوونی عومرەکەی لەمەککە دەرچوو.

سێیەم: ئەو عومرەیەی کە لەگەڵ حەجدا ئەنجامی دا.

چوارەم: عومرەی لەجیعرانەوە کاتێك دەرچوو بۆ حونەین.

#### بەش

هیچ عومرەیەکی لەدەرچووندا نەبوو لەمەککە، بەڵکو تەواوی عومرەکانی بۆ چوونە نێو مەککە بوو، ئەو عومرەیەی کە ئەنجامی دا و دایڕشا، عومرەی چوون بوو بۆ مەککە نەك عومرەی ئەوەی لەمەککە دەربچێ بۆ ئیحرام بەستن و عومرە ئەنجامدان، لەژیانی خۆیدا هیچ کەسێ ئەوەی نەکرد تەنیا عائیشە ئەوەی کرد، چونکە نییەتی عومرەی هێنا،بەڵام کەوتە سووڕی مانگانەوە و بەوهۆیەوە حەجی بردە لای عومرە و بووە قارن، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەواڵی پێدا کە تەوافکردن و سوڕانەوەی بەدەور کەعبە و نێوان سەفا و مەروە لەجێی حەج و

عومرەکەیدایە، بەڵام شتێ نائارامیی لەدڵیدا بۆ دروستبوو، بۆیە فرمانی کردە عەبدولڕەحمانی برای تاوەکو لەتەنعیمەوە عومرەی پێ بکات تاوەکو دڵئارام بێتەوە.

## ٢- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەمانگەکانی عومرەکانیدا

هەموو عومرەکانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمانگەکانی حەجدا بوو، پێچەوانەی ڕێبازی هاوبەش پەیداکەران، چونکە ئەوان حەزیان بەعومرەی مانگەکانی حەج نەدەکرد و ئەیانووت: ئەوە خراپترینی نێو خراپییەکانە، بۆیە ئەوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی، عومرەکردن لەمانگەکانی حەج باشترە لەمانگی ڕەجەب و گومانیش لەوەدا نییە، بەڵام باشتردانانی عومرە لەو مانگانە لەگەڵ عومرەی مانگی ڕەمەزان، ئەوە شتێکە و جێی وردبوونەوەیە، بەدروست لێیەوە هاتووە کە فرمانی بەئوم معقل کردووە کە حەجی لەدەستچووبوو، فرمانی پێکرد لەمانگی ڕەمەزاندا عومرە ئەنجام بدات و هەواڵی پێدا، کە عومرە لەمانگی ڕەمەزاندا یەکسانە بەحەجێك[1].

## ٣- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەعومرەکردن لەیەك ساڵدا

لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ەوە نەهاتووە کە لەساڵێکدا تەنیا یەك عومرەی ئەنجام دابێ. ئەگەر بووترێ: بەچی شتێك بەموستەحەب و سوونەتی دەبینن لەساڵێکدا چەند عومرەیەك ئەنجام بدرێت ئەگەر لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەسەلمابێ ئەو چەند جارەی ئەنجام داوە؟ وتراوە: لەم بابەتەدا جیاوازیی دروست بووە، مالیك وتوویەتی: بەلامەوە کەراهەتی هەیە لەساڵێکدا زیاتر

---

[1] - بوخاری(١٧٨٢) و موسلیم(١٢٥٦) ئیخراجیان کردووە.

لەعومرەیەك ئەنجام بدرێت. ئیبن ئەلمواز وتوویەتی: ئومێد دەكەم لەوەدا كێشەیەك نەبێ[1]، عائیشە لەمانگێكدا دووجار عومرەی ئەنجام داوە و وەهای نابینم كەسێك رێگری بكات لەئەنجامدانی كارێك بەهۆیەوە لەخوا نزیكبێتەوە، بەدەق نەهاتووە رێگری لەئەنجامدانی چاكەی زۆر كرابێ، ئەمە قسەی كۆڕای زانایانە.

ئەوەندە بەسە كە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆ جاری دووەم لەتەنعیمەوە عومرەی بەعائیشە كردەوە و لەیەك ساڵیشدا بوو، ئەوەش ناوتری عائیشە ئەو عومرەیەی رەتكردبێتەوە كە قەزاكردنەوە بوو.

## ٤- رێبازی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەحەجكردندا

جیاوازی و ناكۆكیی لەوەدا نییە كە لەدوای كۆچكردنی بۆ مەدینە تەنیا یەك حەجی ئەنجام داوە، ئەوەش حەجی ماڵئاواییە، ناكۆكییش لەوەدا نییە كە لەساڵی دە بوو. كە حەج فەرزكرا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەستپێشخەریی كرد بۆ حەجكردن و دوای نەخست، فەرزبوونی حەج دواكەوت بۆ ساڵی نۆ یان دە، هەرچی فەرمایشتی خوای گەورەیە كە دەفەرمووێت: ﴿ وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴾ البقرە: ١٩٦ ، واتا: حەج و عومرەتان(كە دەست پێكرد) تەنعها بۆ خوا بە تەواوی بیكەن.

ئەگەرچی ئەو ئایەتە لەساڵی شەشدا دابەزی لەساڵی حودەیبییەدا، بەڵام فەرزبوونی حەجی تێدا نییە، بەڵكو فرمانە بەتەواوكردن و تەواوكردنی عومرە دوای ئەوەی دەچنە ناویەوە بۆ ئەنجامدان، بەرێكی و تەواویی ئەنجام بدرێن.

---

[1] - الدونة لسحنون١/٤٠٣، التبصرى للخمي٣/١٢٥٣، التوضيح في شرح مختصر ابن الحاجب لخليل بن إسحاق٢/٥٢٠.

**بەش**

کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ویستی حەج ئەنجام بدات، خەڵکی ئاگادار کردەوە کە حەج ئەنجام دەدات، بۆیە ئەوانیش ئامادەساز بوون تاوەکو لەگەڵیدا دەربچن، خەڵکانی دەورووبەری مەدینەش گوێبیستی ئەو هەواڵە بوون، هاتن و ئەیانویست لەگەڵ پەیامبەری خوادا بچن بۆ حەج، لەڕێگەدا خەڵکانێکی زۆر لەگەڵیدا بەڕێکەوتن کە لەژماردن نەدەهاتن، بەڕۆژ و لەدوای نیوەڕۆ لەمەدینە دەرچوو، شەش رۆژ لەمانگی زیلقیعدە مابوو، دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆی کرد بەچوار رکاتیی و پێش ئەوەش وتارێکی بۆ دان و تیایدا فێری کردن ئیحرام ببەستن و واجیب و سوونەتەکانی حەجی فێر کردن.

ئیبن حەزم ئەڵێ: دەرچوونی لەڕۆژی پێنجشەمەدا بوو[1].

پاشان قژداهێنان و عەبای لەبەر کرد، لەنێوان نیوەڕۆ و عەسر دەرچوو، دابەزیە زی ئەلحەلیفە و تیایدا نوێژی عەسری کرد بەدوو رکات، پاشان شەو لەوێدا مایەوە و لەوێدا نوێژی مەغریب و عیشا و بەیانی و نیوەڕۆی ئەنجام دا، لەو شوێنەدا پێنج نوێژی کرد، هەموو خێزانەکانی لەگەڵ بوو، ئەو شەوە هەموویانی بەسەرکردەوە، کە ویستی ئیحرام ببەستێ، دوو جار خۆی شۆرد جگە لەخۆشۆردنی یەکەمی لەشگرانی.

پاشان عائیشە بەدەستی خۆی بۆنی زەیرەی دا و میسکی دا لەجەستە و سەری، هەتا ئەوەی تەڕایی میسك لەنێوان قژ و ریشی دەبینرا، پاشان بەردەوامیی پێ دا و نەیشۆرد، پاشان پەشتەماڵ و عەباکەی لەبەرکرد، پاشان نوێژی نیوەڕۆی ئەنجام دا بەدوو رکات، پاشان لەشوێنی نوێژەکەیدا تەهلیلەی حەج و عومرەی کرد، لێیەوە نەگوازراوەتەوە کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) جگە لەفەرزی نیوەڕۆ، دوو رکاتی بۆ ئیحرام بەستنەکەی ئەنجام دابێ.

---

[1] حجة الوداع لابن حزم(ص٢٣٠).

لەبیست و شتێ فەرموودەی سەحیح و راشکاودا بەجۆری قارن ئیحرامی بەستووە،لەوانە:

لەوانە: ئەوەی لەسەحیحەینەوە ئیخراج کراوە هەروەها لەعوروەوە ئەویش لەعائیشەوە کە هەواڵی پێداوە لەبارەی پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) بەنمونەی ئەو فەرموودەیەی ئیبن عومەر[1].

هەروەها ئەوەی موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرمودەیەکی قوتەیبەوە ئەویش لەلەیسەوە ئەویش لەنافیعەوە ئەویش لەئیبن عومەرەوە بەوەی حەجی لەگەڵ عومرەدا ئەنجام داوەو بۆ هەردووکیان یەك تەوافی ئەنجام داوە، پاشان وتوویەتی: ئا بەم شێوەیەی ئەنجام دا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)[2].

## بەش

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەئاوی هێرۆ و هاوشێوەی، سەری تەڕ کرد تاوەکو قژی پێکەوە بنووسێ،لەشوێنی نوێژکردنیدا تەهلیلەی دەستپێکرد، پاشان سەرکەوتە سەر وشترەکەی و تەهلیلەی کرد، پاشان لەبیابانیشدا تەهلیلەی کرد. هەندێجار تەهلیلەی حەج و عومرەی دەکرد و هەندێجاریش تەهلیلەی حەجی دەکرد، چونکە عومرە بەشێکە لەحەج، پاشان ئەوترێ:قیرانی کرد ، وتراویشە: تەمەتوعی کردووە. وتراوە: ئیفرادی کردووە.

ئەوەی پارێزراوە ئەوەیە: لەدوای نوێژی نیوەڕۆ تەهلیلەی کردووە و پاشان تەلبیەی وتووەتەوە و فەرموویەتی:"لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ

---

[1] – بوخاری(١٦٩٢) و موسلیم(١٢٢٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢٣٠).

الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ"[1]، پاشان دەنگی بەرزکردەوە لەوتنەوەی ئەو تەلبییەدا تائەوەی هاوەڵانیشی گوێیان لێ بوو، فرمانی پێکردن بەفرمانی خوا کە دەنگیان بەوتنی ئەو تەلبییە بەرز بکەنەوە.

حەجکردنەکەی بەسواریی بوو، هەڵنەگیرابوو، لەنێو کەژاوەی وشتردا نەبوو. جیاوازی و ناکۆکیی هەیە لەسەر جائیزبوونی لەلایەن کەسێکەوە ئیحرامی بەستبێ و بۆ ئەوە دوو بۆچوون دروستبووە: هەردوو بۆچوون لەئەحمەدەوە هاتووە: یەکەم: جائیزە، ئەوەش مەزهەبی شافیعی و ئەبو حەنیفەیە. دووەم: قەدەغەیە، ئەوەش مەزهەبی مالیکە[2].

## بەش

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەکاتی ئیحرامدا لەنێوان حەج و عومرەدا سەرپشکی کردن، پاشان لەنزیکبوونەوەیان لەمەککە هانی دان بۆ فەسخکردنی حەج و قیران بۆ عومرە بۆ ئەو کەسەی کە قوربانیی پێ نییە، پاشان لای مەروە ئەوەی بەسەریاندا فەرز کرد.

ئەسمائی کچی عومەیس لای زیلحەلیفە، موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری سدیقی هێنایە دونیاوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی پێکرد خۆی بشۆرێ و بەبەرگێك بئاڵێنرێت و ئیحرام ببەستێت و تەهلیلە بکات. لەباسی ئەو حەجەدا سێ سووننەن هەبوو: یەکەم: ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووە خۆی بشۆرێ. دووەم: ئافرەتێ لەسووڕی مانگانەدابێ بۆ ئیحرامەکەی خۆی دەشۆرێ. سێیەم: ئیحرام بەستنی ئافرەتێ لەسووڕی مانگانەدا بێ دروستە.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢٣٠).

[2] - البيان للعمراني٤/٢٠٧، والمغني لابن قدامة٥/١٢٩.

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەڕێکەوت و تەلبیەی ئەوتەوە، خەڵکیش لەگەڵیدا ئەیانووتەوە، هەبوو تەلبیەکەی زیاتر ئەکرد و هەبوو کەمتر، هیچ یەك لەو دووانەی رەتنەکردەوە.

بەردەوامبوو لەتەلبیەکردن، کە گەیشتە رەوحاء، کەرەکێوییەکی نەرۆکی بینی، فەرمووی: "وازی لێبهێنن نزیکە خاوەنی بێت"، خاوەنەکەی هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئەم کەرە کێویە بۆ ئێوە. پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فرمانی بەئەبو بەکر کرد لەنێو هاوڕێیاندا بەشی کرد[1].

ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوەی، ئەو کەسەی لەئیحرامدایە، جائیزە لەڕاوی حەلاڵ بخوات ئەگەر بۆ ئەوە راوی نەکردبێ.

## بەش

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەدۆڵی عوسفاندا تێپەڕبوو، کە لەسەرفدا بوو عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) کەوتە سووڕی مانگانەوە، ئەو تەهلیلەی بۆ عومرە وتبووەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هاتەلای و عائیشە دەگریا. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "مَا يُبْكِيك، لَعَلَّك نَفسْت!"،واتا: بۆ دەگری؟ رەنگە کەوتبیتە سووڕی مانگانەوە! وتی: بەڵێ. فەرمووی: "فَإِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَافْعَلِي مَا يَفْعَلُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حتى تطهري"[2]، واتا: ئەمە فرمانێکە خوای گەورە پێویستی کردووە بەسەر کچانی ئادەمدا، حاجیان چییان کرد تۆش بیکە تەنیا تەواف بەدەوری کەعبەدا نەبێ، کەی پاکبوویتەوە تەواف بکە.

---

[1] – نەسائی ئیخراجی کردووە(٢٨١٨).

[2] – بوخاری(٢٩٤) و موسلیم(١٢١١) ئیخراجیان کردووە.

ئەم فەرموودەیەی عائیشە بنەمایەکی گەورەی بنەماکانی مەناسیکی حەجی لێ وەردەگیردرێت:

یەکەم: ئەوەی حەج و عومرە لەیەک کاتدا ئەنجام دەدات، یەک تەواف و یەک سەعیی نێوان سەفا و مەروەی بەسە.

دووەم: ئەو ئافرەتەی دێت و لەو وەختەدا لەسووڕی مانگانەدایە، تەوافکردنی لەسەر نییە، هەروەک لەفەرموودەی سەفیەی خێزانی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)دا هاتووە، ماڵئاواییکردن لەکەعبە لەجێی تەوافکردنە بۆ ئافرەتێ لەسووڕی مانگانەدابێ.

سێیەم: جائیزە بۆ ئافرەتێ لەسووڕی مانگانەدا بێ حەج بباتە لای عومرە، هەروەک بۆ ئافرەتێک لەسووڕی مانگانەدا نەبێ جائیز و لەپێشترە، چونکە ئەو ئافرەتە عوزری هەیە و پێویستی بەوەیە.

چوارەم: ئافرەتێ لەسووڕی مانگانەدا بێ تەواوی کارەکانی حەج ئەنجام دەدات.

پێنجەم: بەدەور کەعبەدا ناسوڕێتەوە(تەواف ناکات).

شەشەم: تەنعیم بەشێکە لەشوێنی ئیحرام بەستن.

حەوتەم: جائیزە لەیەک ساڵ و لەیەک مانگدا دوو عومرە ئەنجام بدرێت.

هەشتەم: رێگە دراوە کەسێک کە تەمەتوع دەکات، ئەگەر دڵنیانەبوو لەلەدەستچوون، ئەوە حەج بخاتەسەر عومرە، فەرموودەکەی عائیشە بۆ ئەوە بنەمایە.

نۆیەم: لەعومرەی مەککییدا ئەوە بنەمایە،ئەوانەی شوێنانی تر بەموستەحەب دادەنێن، هیچ بەڵگەیەکیان لەوەدا بەدەستەوە نییە.

که لەسەرف بوو بەهاوەڵانی فەرموو:"مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، فَأَحَبَّ أَنْ يَجْعَلَهَا عُمْرَةً فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلاَ"[1]،واتا:هەرکەسێ قوربانیی پێ نییە و حەزەکات بیکاتە عومرە، با بیکاتە عومرە، هەرکەسێکیش قوربانیی پێیە با وەها نەکات. ئەمە پلەیەکە لەسەرووی پلەی سەرپشکیی لای میقاتە.

بەڵام کاتێ لەمەککە بوو، فرمانی دا هەرکەسێك قوربانیی پێ نییە دەبێ بیکاتە عومرە و ئیحرامیش لەخۆی بکاتەوە، هەرکەسێکیش قوربانیی پێیە با ئیحرامەکەی لەخۆی نەکاتەوە، بەهیچ دەقێکی تر ئەوەی هەڵنەوەشاندەوە، بەڵکو سوراقەی کوڕی مالیك لێی پرسی لەبارەی ئەو عومرەیەی کە فەسخی کرد: ئایە بۆ ئەو ساڵەیان کاری پێ دەکرێت یان بۆ هەمیشەییە؟ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"بَلْ لِلْأَبَدِ، وَإِنَّ الْعُمْرَةَ قَدْ دَخَلَتْ فِي الْحَجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ"[2]،واتا:بەڵکو بۆ هەمیشەیە، وا کاتی عومرە تێکەڵ بەمانگەکانی حەج بوو هەتاوەکو ڕۆژی قیامەت.

چواردە هاوەڵ لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) گێڕیاویانەتەوە، کە فرمانی کردووە بەفەسخی حەج بۆ عومرە و تەواوی فەرموودەکانیشیان سەحیحە.

## بەش

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەڵسا تاوەکو دابەزیبە(ذي طُوى) کە لەئێستادا بە ئابار ئەلزاهیر دەناسرێت، شەوی یەکشەممە کە چوار ڕۆژ لەزیلحیجە تێپەڕیبوو لەوێدا مایەوە، لەوێ نوێژی بەیانیی ئەنجام دا، پاشان لەو ڕۆژەدا خۆی شۆرد و هەڵسا بۆ ڕۆیشتن بۆ مەککە، لەڕۆژدا لەبەرزاییەکانی(الثنية العليا) کە دەڕوانێتە سەر ئەلحەجون لەوێوە چووە مەککەوە، بەڵام لەعومرەدا لەخوارییەوە دەچووە مەککەوە. بۆ حەج لەبەرزاییەکانییەوە ڕۆیشتە مەککەوە و لەخوارییەوە

[1] – بوخاری(١٥٥٦) و موسلیم(١٢١١) ئیخراجیان کردووە.

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢١٦).

دەرچوو، پاشان بەڕێکەوت تاوەکو چووە مزگەوت و کاتەکەی کاتی چێشتەنگاو بوو.

کە ڕۆیشتە مزگەوتەوە ڕۆیشت ڕووەو کەعبە، نوێژی(تحية المسجد)ی نەکرد، نەڕۆیشت ڕووەو روکنی یەمانی، دەستی بەرزنەکردەوە و نەیفەرموو: بەتەوافکردنم نیەتم هێنا ئەم هەفتەیە ئەوە و ئەوە بکەم. بەتەکبیرە دەستی پێنەکرد، بەهەموو جەستەی رووی نەکردە بەردە رەشەکە، بەڵکو خستیە لای شانی، پاشان خستیەلای راستی و کەعبەی خستە لای چەپی، لای دەرگای کەعبە و لەژێر ئاوڕێژگە و دەرەوەی کەعبە و روکنەکانیدا نەپاڕایەوە، لەکاتی تەوافدا زیکرێکی دیاریکراوی نەخوێند نە بۆ خۆی و نە بۆ ئەوەی هاوەڵان فێر بکات، بەڵکو ئەوەی لێ پارێزراوە لەنێوان هەردوو روکندا فەرموویەتی: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١ ﴾ البقرە: ٢٠١ [١] ،واتا: هی واش هەیە دەڵێت خوایە هەم لەدونیا و هەم لە ڕۆژی دواییدا خێرو خۆشیمان پێ بدە وە بمان پارێزە لەسزای ئاگر.

لەو تەوافەیدا هەر سێ کاتی خێرا ئەنجام دا،هەنگاوەکانی خێرا ئەکردەوە، هەندێجاریش هەنگاوەکانی لەیەك نزیك دەکردەوە، عەباکەی ئەخستەسەر شانێکی، شانێکی تری بەنێو شانیەوە دەردەکەوت، کە ئەگەیشتە ئاست بەردە رەشەکە، ئاماژەی بۆ کرد و بەگاڵۆکەکەی کە پێیدەوترا(المحجَن) سڵاوی لێ کرد و (المحجَن)ی ماچ کرد. گاڵۆکێکی سەر چەماوە بوو.

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە سەلامی لەروکنی یەمانیی کردووە، بەڵام نەسەلماوە ماچی کردبێ. سەلماوە کە بەدەستی سڵاوی لێکردووە و دەستی خستووەتەسەری و پاشان ماچی کردووە. سەلماویشە کە بەو گاڵۆکەی سڵاوی لێکردووە، ئەوەش سێ سیفەت و جۆرە.

---

[١] ـ ئەبو داود ئیخراجی کردووە(١٨٩٢).

هەرکاتێ دەگەیشتە بەردە ڕەشەکە ئەیفەرموو((الله أكبر))[1]. لەڕوکنەکاندا تەنیا سڵاوی لەڕوکنی یەمانیی کردووە و دەستی پێدا هێناوە.

## بەش

کە لە تەوافەکەی بوویەوە هات بۆ پشتەوەی مەقام و ئەمەی خوێندەوە:﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ ﴾ **البقرة:** ١٢٥ ، واتا: شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم(عليه السلام) لە سەری ڕادەوەستا(کاتی دروست کردنی کەعبە)بکەنە جێگای نوێژ.

دوو رکات نوێژی کرد کە مەقام کەوتبووە نێوان خۆی و کەعبەوە، لەدوای سورەتی فاتیحا، هەردوو سورەتی ئیخلاسی خوێند[2].

کە لەو نوێژەی بوویەوە روویکردە بەردە ڕەشەکە و سڵاوی لێکرد، پاشان لەدەرگای بەرانبەریەوە دەرچوو بۆ سەفا،کە لێیەوە نزیك بوویەوە ئەمەی خوێندەوە:﴿ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ ﴾ **البقرة:** ١٥٨ ، أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ"[3]، واتا: بەڕاستی صەفاو مەروە لەدروشمەکانی(دینی)خوان. فەرمووی:لەوێوە دەستپێدەکەم کە خوا پێی دەستی پێکردووە.

بەو جۆرە دەستپێدەکەم کە خوای گەورە دایناوە بەو ریزبەندییە بێ.

پاشان بەرزبوویەوە تاوەکو کەعبەی بینی، رووی کردە قیبلە و تەوحیدی خوا و تەکبیرەی ئەفەرموو، ئەیفەرموو:" لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ

---

[1]- بوخاری(١٥٦٠) و موسلیم(١٢١١) ئیخراجیان کردووە.

[2]- واتا سورەتی: ﴿ قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ ١ ﴾و سورەتی: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ﴾

[3]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢١٨).

الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شيء قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ،أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ". پاشان پاڕایەوە و سێ جار ئەوەی فەرموو[١].

پاشان دابەزیە مەروە و ڕێی دەکرد، کاتێ قاچەکانی لەنێو دۆڵەکاندا خۆی گرت، تەکانی دەدا تاوەکو دۆڵەکەی تێپەڕان و بەڕێکردنەوە سەرکەوت، دروست ئەوەیە لێی گێڕدراوەتەوە، ئەوەش لەپێش دوو میلە سەوزەکەی سەرەتای مەسعا.

ئەوەی دیارە ڕێی کردووە، موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەئەبی ئەلزوبەیرەوە کە گوێی لەجابری کوڕی عەبدوالله بووە ئەیووت: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەحەجی ماڵئاوییدا لەسەر وڵاخەکەیەوە تەوافی کرد و نێوان سەفاو مەروەی ئەنجام دا، تاوەکو خەڵکیی ببینن و دەرکەوێ و پرسیاری لێ بکەن، چونکە خەڵکیی نەیاندەبینی"[٢]. بەلای منەوە کۆکردنەوەی هەردووکی ئەکرێ جوان بێ، سەرەتا بەپیادەیی سەعی کردووە، پاشان بەسوارییی، وەك ئاسایی دانانی ئەو کارە ئەوەی ئەنجام داوە[٣].

## بەش

سەبارەت بەتەوافکردنی بەدەوری کەعبەدا لەگەڵ هاتنی، ئەوە جیاوازیی لەو بارەیەوە هەیە: ئایە بەپێ تەوافی کردووە یان بەسوارییی؟

خوای گەورە خۆی دەزانێ و شارەزاترە لەتەوافی ئیفازەدا بووە، جابر لەسێی سەرەتادا لەبارەوە دەگێڕێتەوە کە تەنیا بەپیادەیی ئەبن. لەفەرموودەکاندا نەهاتووە لەتەوافی هاتندا بەسوارییی ئەوەی ئەنجام دابێ، خواش زاناترە.

---

[١] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢١٨).
[٢] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢٧٣).
[٣] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢٦٤).

## بەش

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کاتێ گەیشتە مەروە، بەرزبوویەوە بەسەریدا تاوەکو رووی کردە کەعبە(الله أكبر و لا إله إلا الله)ی دەوتەوە، ئەوەی کرد کە لەسەر سەفا کردی، کە لای مەروە سەعییەکەی تەواو کرد، فرمانی دا بەوانەی کە قوربانییان پێ نەبوو ئیحرامەکە لەخۆیان بکەنەوە و واجیبە ئەوە بکەن، قارن بن یان تەنیا(منفرد)، فرمانی دا بەهەموو ئەوانەی لەگەڵ خێزانیاندا جووت ببوون و بۆنیان لەخۆیان دابوو دەزوویان بەکارهێنابوو، ئیحرام لەخۆیان بکەنەوە و هەتاوەکو رۆژی تەرویە بەو جۆرە بمێننەوە، لەبەر قوربانییەکەی ئیحرامی نەبەست و لەوێدا فەرمووی:"لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا سُقْتُ الْهَدْيَ، وَلَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً"[1]،واتا: ئەگەر دەمزانی ئاوەها دەبێ، ئەوە قوربانییم نەدەهێنا و منیش ئەمکردە عومرە.

لێرەدا سێ جار داوای لێخۆشبوونی کرد بۆ ئەوانەی سەریان دەتاشن و جارێکیش بۆ ئەوانەی کورتی دەکەنەوە.

لەماوەی مانەوەی تاوەکو رۆژی تەرویە، نوێژکردنی وەك ئەو نوێژە بوو کە موسڵمانانی دابەزاندبووە دەرەوەی مەککە، لەدەرەوەی مەککە چوار رۆژ مایەوە و نوێژەکانی کورت دەکردەوە: رۆژی یەکشەممە و دووشەممە و سێشەممە و چوارشەممە.

کە چێشتەنگاوی رۆژی پێنجشەممە هات، بەو موسڵمانانەی لەگەڵیدا بوون روویکردە مینا، ئەوانەیان کە لای کۆڵوبارەکانیان ئیحرامیان بەستبوو، ئیحرامی حەجیان بەست، نەهاتنە مزگەوتەوە ئیحرام ببەستن، بەڵکو کاتێ ئیحرامیان بەست مەککە لەپشتەوەیانەوە بوو. کە گەیشتە مینا دابەزی و نوێژی نیوەڕۆ و عەسری

[1]- بوخاری ئیخراجی کردووە(١٦٥١).

کرد و شەو لەوێدا مایەوە، شەوی جومعە بوو، کە خۆر هەڵهات، بەڕێکەوت بۆ عەرەفە و ڕێگەی(ضبّ)ی گرتەبەر لەلای ڕاستی ڕێگەی ئەمڕۆی خەڵك، هەندێ لەهاوەڵان(لبيك اللهم لبيك)ەیان دەوتەوە، هەندێکی تریان(الله أكبر)یان دەوتەوە و ئەویش گوێبیستی هەردوولایان بوو، هیچ لایەکیانی ڕەتنەکردەوە، بینی بەفرمانی خۆی گومەزی بۆ دروستکراوە، تیایدا دابەزی تاوەکو خۆرئاوا بوو، فرمانی بەوشترەکەی کرد(القصواء) و بەڕێکەوت.

پاشان بەڕێکەوت تاوەکو گەیشتە نێو دۆڵێك لەخاکی عورنە، لەسەر وشترەکەیدا وتارێکی مەزنی بۆ خەڵکیی دا، تیایدا ڕێساکانی ئیسلامی جێگیرکرد و ڕێساکانی هاوبەش پەیداکردن و نەفامیی تێکشکاند، تیایدا ئەو حەرامکراوانەی جێگیر کرد کە تەواوی ئوممەتان لەسەر حەرامبوونی یەکدەنگن، ئەویش بریتییە لە: خوێنڕشتن و ماڵ و nامووس. کاروبارەکانی نەفامیی خستەژێر پێیەکانی، تەواوی سووخۆریی سەردەمی نەفامیی هەڵوەشاندەوە، فرمانی کرد باش بن لەگەڵ ئافرەتان، ماف و ئەرکی ئافرەتانی باس کرد، واجیبە خواردن و بەرگیان بەجوانیی بۆ دابین بکرێت، ئەندازەی نەکرد. ڕێگەی بەمێردەکانیان دا لێیان بدەن ئەگەر شتانێك بخەنە ماڵیانەوە مێردەکانیان حەزی پێ نەکەن. لەو وتارەدا وەسێتی بەئوممەت کرد دەستبگرن بەکتێبی خواوە. هەواڵی دا وێڵ و سەرگەردان نابن هەتاوەکو دەستیان پێیەوە گرتبێ، پاشان هەواڵی پێدان کە لەوەدا بەرپرسیارن. بەقسەی هێنان و فەرمووی: ئێوە چی دەڵێن و بەچی شایەتیی دەدەن؟ وتیان: شایەتیی دەدەین بەوەی تۆ گەیاندت و ئامۆژگاریی ئێمەت کرد. بۆیە پەنجەی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و سێ جار خوای کرد بەشایەت بەسەریانەوە و فرمانی پێکردن ئەوانەیان کە لەوێن و گوێبیستی ئەو وتارە بوون، بەوانی تری بگەیەنن کە لەوێ نین.

شوێنی وتارەکەی لەمەوقف(شوێنی وەستانی عەرەفە) نەبوو، بەڵکو لەعورنە بوو، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دابەزیە نەمرە، لەعورنە وتاری دا و لەعەرەفە وەستا و یەك وتاری دا، دوو وتار نەبوو لەنێوانیاندا دابنیشێت، کە وتارەکەی تەواو کرد، فرمانی بەبیلال کرد بانگ بدات، پاشان هەڵسا و نوێژی نیوەڕۆی کرد بەدوو رکاتی، بەدەنگەوە نەیخوێند، ڕۆژەکە ڕۆژی جومعە بوو، بەڵگەی دا کە ڕێبوار نوێژی جومعە ناکات، پاشان هەڵسا دوو رکات عەسری کرد، خەڵکی مەککەش لەگەڵیدا ئەنجامیان دا، بێگومان بەنوێژی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان لەیەك کاتدا کرد بەکورتکراوەیی، فرمانی نەکرد چوار رکاتیی بکەن یان کە کورتیان کردەوە کۆی نەکەنەوە.

کە لەنوێژەکەی بوویەوە، سەرکەوتەسەر وشترەکەی تاوەکو گەیشتە مەوقیف، لەخوارەوەی چیاکە لای تاشە بەردەکان(الصخرات) راوەستا و روویکردە قیبلە، گوریسی راکێشانەکە لەبەردەستیدا بوو لەسەر وشترەکە، دەستی کردە دوعاکردن و کڕوزانەوە و تکاکردن لەخوای گەورە تاوەکو خۆرئاوابوون، فرمانی بەخەڵك کرد لەناو دۆڵی عورنە بەرزببنەوە و فەرمووی:"وَقَفْتُ هَا هُنَا وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ"[1] ،واتا:من لێرەدا راوەستام، عەرەفە هەمووی شوێنی راوەستانە.

هەواڵی نارد بۆ خەڵك تاوەکو لەسەر دروشم و مەشاعیری خۆیان بمێننەوە و تیایدا بووەستن، چونکە ئەوە لەمیراتی ئیبراهیمی باوکیانە.

لەپاڕانەوەیدا دەستی بەرزکردەوە تاوەکو سنگی وەك چۆن هەژارێ دەست بەرز دەکاتەوە خواردنی پێ بدرێت، هەواڵیشی پێدان کە باشترین دوعایەك، دوعای ڕۆژی عەرەفەیە[2].

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢١٨).

[2] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٥٨٥).

لێرەدا ئەم ئایەتەی بەسەردا دابەزی: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾ **المائدة: ٣** ،واتا: ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو(کامڵ) کردوە بۆتان و چاکە و بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت.

لەوێدا پیاوێکی موسڵمان بەبەرگی ئیحرامەوە لەسەر وڵاخەکەی کەوت و مرد، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی کرد بەبەرگەکەیەوە کفن بکرێت و بۆنی لێ نەدرێت و بەئاو و سیدر بشۆردرێت و سەر و ڕوومەتی دانەپۆشرێت، هەواڵیشی دا کە خوای گەورە کاتێ لەڕۆژی قیامەتدا زیندووی دەکاتەوە، بەدەم (لبيك اللهم لبيك)ەوە زیندوو دەبێتەوە[1].

## بەش

کە خۆرئاوابوو، خۆرئاوابوونێکی تەواو کە زەردیی خۆر نەما، لەعەرەفە بەئارامی و ڕێزو ویقارەوە دەرچوو، ئوسامەی کوڕی زەیدی لەپشت خۆی سەرخست و جڵەوی وشترەکەی گرت، هەتا ئەوەی سەری لەچمکێکی جەواڵەکە گیر بوو، ئەیفەرموو:"أَيُّهَا النَّاسُ، عَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ، فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِالْإِيضَاعِ"[2]،واتا: ئەی خەڵکینە لەسەرخۆبن، ئارام و بەویقاربن، چاکە ئەوە نییە پەلە بکەن.

بەلەسەرخۆییەوە بەڕێگەی(المأزمين)دا ڕۆیشت، لەڕێگەی زەبەوە چووە عەرەفەوە، ئەوە نەریتی پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) لەجەژنەکاندا ڕێگەی دەگۆڕی.

---

[1] - بوخاری(١٢٦٧) و موسلیم(١٢٠٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١٦٧١).

پاشان ڕۆیشتنەکەی مامناوەند کرد، نە خێرا و نە هێواش، کە بۆشاییەکی دەبینی هەنگاوەکەی بەرزتر دەکردەوە، بۆ بەرزبوونەوە جڵەوی وشترەکەی شل دەکرد. بەردەوام بوو لەوتنەوەی(لبيك اللهم لبيك) و نەیدەبڕی، لەڕێگەدا بوو دابەزی سەرئاوی کرد و دەستنوێژێکی ماوە کەمی شۆرد،ئوسامە پێیووت: لەکوێ نوێژ بکەین ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرموی:"الْمُصَلَّى أَمَامَكَ"[1]،واتا: شوێنی نوێژ لەپێش خۆتدایە.

پاشان بەڕێکەوت تاوەکو گەیشتە موزدەلیفە، دەستنوێژی نوێژی هەڵگرت، پاشان فرمانی دا بانگ بدرێ، بانگبێژ بانگی دا، پاشان هەڵسا نوێژی مەغریبی کرد پێش ئەوەی کۆڵوبار بپێچرێتەوە و گوریسی وشتر و ولاخەکان بگیردرێت بۆ بەڕێکەوتن، کە کۆڵوباریان پێچایەوە، فرمانی دا بەنوێژ دابەستن و نوێژ کرا، پاشان نوێژی عیشای کرد بەقامەت بەبێ بانگدان و لەنێوان هەردوو نوێژدا هیچ نوێژێکی نەکرد[2].

پاشان خەوت هەتاوەکو بەیانی، ئەو شەوە شەونوێژی نەکرد، بەدروستیش لێیەوە نەهاتووە لەشەوی هەردوو جەژنەکەدا شەونوێژی کردبێ.

بەنەخۆش و بێ تواناکانی خێزانەکانی مۆڵەتی دا ئەو شەوە بەڕێبکەون و پێش بەیانیبوونەوە بگەنە مینا، ئەوەش لەکاتی نەمانی مانگ، فرمانیشی پێیان کرد ڕەجمی شەیتان نەکەن هەتاوەکو خۆر هەڵدێت.

## بەش .

کە بەیانیی بوویەوە، نوێژی بەیانیی کرد لەسەرەتای کاتی خۆیدا لەڕۆژی قوربانی و بەبانگ و قامەت، ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژن بوو، ڕۆژی حەجی گەورە، ڕۆژی جاڕدان بە بەریبوونی خواو پەیامبەرەکەی لەهەموو هاوبەش پەیداکەرێك.

---

[1] – بوخاری(١٨١) و موسلیم(١٢٨٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(١٦٧٢) و موسلیم(١٢٨٠) ئیخراجیان کردووە.

پاشان سەرکەوت هەتاوەکو گەیشتە شوێنی خۆی لەمەشعەری حەرام، رووی کردە قیبلە و دەستیکردە پاڕانەوە و تکا و تەکبیر و تەهلیلە و هەتاوەکو زۆر رووناکبوویەوە، ئەوەش لەپێش خۆرهەڵاتن بوو.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەشوێنی خۆی وەستا و خەڵکیی تێگەیاند کە تەواوی موزدەلیفە وەستانە(مەوقیفە)، پاشان لەموزدەلیفەوە بەرێکەوت و ئەلفەزڵی کوڕی عەباسی لەپشت خۆی سەرخستبوو لەرێگەدا(لبیك اللهم لبیك)ی دەوتەوە، ئوسامەی کوڕی زەیدیش لەپێشبڕکێی قورەیشدا بەپێ بۆی دەرچوو.

لەرێگەیدا فرمانی بەکوڕی عەباس کرد چەو(وردە بەرد)ی بۆ کۆبکاتەوە: حەوت دانەی بۆ کۆکردەوە و لەو شەوەدا لەو چیایە نەیشکاند و بەشەویش کۆی نەکردەوە. حەوت چەوی هاوێشتنی هەڵگرت، لەنێو لەپیدا دەیتەکاندن و ئەیفەرموو:"أَمْثَالُ هَؤُلاَءِ فَارْمُوا، وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ، فإنَّما أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمُ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ"[1]، واتا:نمونەی ئەم چەوانە بهاوێژن، ئامان وریابن لەزیادەڕۆییکردن لەئاییندا، ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی زیادەڕۆییکردن لەئایین تیاچوون.

لەرێگەدا ئافرەتێکی خەسعەم هاتە بەردەمی و پرسیاری لێکرد لەبارەی حەجکردن بۆ باوکی، باوکی پیاوێکی بەتەمەن بوو نەیدەتوانی لەسەر ولاخ خۆی رابگرێ، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی پێکرد بۆ باوکی حەج بکات.

کە گەیشتە نێو دۆڵی موحەسیر، ژەنییە وشترەکەیەوە و رۆیشتنی خێرا کردەوە، چونکە نەریتی بوو لەو شوێنانەی خوای گەورە سزای دوژمنانی خۆی دابێ، خێرا هەنگاو هەڵبگرێ، چونکە لەو شوێنەدا خوای گەورە سزای خاوەن فیلەکانی دابوو وەك بۆی گێڕاوینەتەوە، بۆیە ئەو دۆڵە ناونراوە بەدۆڵی موحەسیر(مُحسِّر)، چونکە کوێربوون و دابڕان لەرۆیشتن بۆ مەککە.

---

[1] – نەسائی(٣٠٥٧) و ئیبن ماجە(٣٠٢٩) ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەنێوان هەردوو ڕێگەدا ڕێگەی ناوەڕاستی گرتەبەر، ئەوەی بەسەر (الجمرة الكبرى) دەردەکەوێ هەتاوەکو هاتە مینا، ئینجا هاتە جەمرەتولعوقبا، لەخوار دۆڵەکەوە راوەستا و کەعبەی خستەلای چەپی و میناش لای راستی و ڕووی کردە جەمرە و بەسەر وشترەکەیەوە بوو لەدوای خۆرهەڵاتن بەردەکانی یەك یەك ئەهاوێشت و لەگەڵ هەر بەردێکدا (الله أكبر)ی دەکرد، ئەوکات (لبيك اللهم لبيك)ی راگرت.

لەو ڕۆیشتنەدا(لبيك اللهم لبيك)ی دەوتەوە تاوەکو دەستیکردە هاوێشتنی وردە بەرد و چەوەکان. کە بەردەکانی دەهاوێشت، بیلال و ئوسامەی لەگەڵدا بوون، یەکێکیان جڵەوی وشترەکەی بۆ گرتبوو، ئەوی تریشیان سێبەری بۆ کردبوو بەهۆی گەرماوە. لەمەدا: بەڵگە هەیە بۆ ئەوەی جائیزە سێبەر بکرێت بۆ ئەو کەسەی لەئیحرامدایە ئەگەر بێتو باسی ئەم سێبەرکردنە لەڕۆژی جەژندا بێ(ڕۆژی قوربانیکردن)، ئەگەر لەدوای ئەوەش بێ لەڕۆژانی مینا کە حەجی تێدا نییە و ئاساییە. لەفەرموودەکەدا ئەوە ڕوون نەکراوەتەوە لەچی کاتێکدا بووە، خواش زاناترە.

## بەش

پاشان گەڕایەوە مینا و وتارێکی بۆ خەڵك دا، وتارێکی کاریگەر بوو، تیایدا فێری پیرۆزیی ڕۆژی قوربانیکردن و فەزڵی ئەو ڕۆژەی کرد لای خوای گەورە، هەروەها پیرۆزیی مەککە بەسەر تەواوی شار و وڵاتان، فرمانی پێکردن بۆ گوێڕایەڵ بن بۆ ئەو کەسەی دەسەڵاتیان دەکات بەقورئان، فرمانی بەخەڵك کرد ڕێوشوێنەکانی حەج لەوەوە وەربگرن و فەرمووی:"لَعَلِّي لَا أَحُجُّ بَعْدَ عَامِي هَذَا"[1]، واتا: ڕەنگە لەدوای ئەم ساڵەم، ساڵێکی تر حەج نەکەم.

---

[1] - ترمیزی(٨٨٦) و نەسائی(٣٠٦٢) ئیخراجیان کردووە.

مەناسیك و ڕێوشوێنەكانی حەجی فێركردن، شوێن و پایەی كۆچەران و پشتیوانانی دیاریی كرد، فرمانی بەخەڵك كرد لەدوای دونیا بەجێهێشتنی خۆی، هەڵنەگەڕێنەوە و ببنە بێباوەڕ و لەگەردنی یەكتر بدەن، فرمانی كرد پەیامەكەی بگەیەنرێت، هەواڵیشی دا ڕەنگە كەسێك كە وتار و پەیامی ئەمی پێدەگات، باشتر لێی تێبگات لەوەی لەوێدا ئامادەیە و گوێبیستی فەرمایشتی ئەوە[1].

لەوتارەكەیدا فەرمووی: "لَا يَجْنِي جَانٍ إِلَّا عَلَى نَفْسِهِ"[2]،واتا: هەركەسێ ستەم بكات، لەخۆی ستەم دەكات.

كۆچەرانی لەلای ڕاستی قیبلە دابەزاند، پشتیوانانیش لەلای چەپ و خەڵكیی تریش بەدەوریاندا، خوای گەورە گوێی خەڵكیی بۆ كردەوە تاوەكو خەڵكی مینا لەماڵەكانی خۆیاندا گوێبیستی وتارەكەی بوون. ئەوكات ماڵئاوایی لەخەڵك كرد، بۆیە خەڵكییش وتیان: حەجی ماڵئاوایی.

عەبدوڵڵەی كوڕی عەمر ئەڵێ: ئەو ڕۆژە بینیم پرسیاری هەر شتێكی لێ بكرایە ئەیفەرموو: "افعلوا ولا حَرَجَ"،واتا: ئەنجامی بدەن تاوانبار نابن(كێشەی نییە). ئیبن عەباس ئەڵێ: لەبارەی سەربڕین و سەرتاشین و بەرد هاوێشتن و پێشخستن و دواخستنەوە(التقديم والتأخير)ەوە پرسیار لێكرا، فەرمووی: "لا حَرَجَ"،واتا: كێشەی تیا نییە.

پاشان ڕۆیشت بۆ شوێنی سەربڕین لەمینا، لەوێدا بەدەستی خۆی شەست و سێ وشتری سەربڕی، بەپێوە سەریبڕین و بەدەستی چەپی گرتبووی، ئەوەی ئەو سەریدەبڕی چەند ساڵێكیان تەمەن كردبوو، پاشان دەستی هەڵگرت و فرمانی كردە عەلی لەو سەد وشترەی مابوویەوە سەریان ببڕێ. پاشان فرمانی كردە عەلی(خوای لێ ڕازیی بێ) پێست و گۆشتەكەی بداتە خێر بەهەژاران و هیچ لەوانە نەداتە

---

[1] - بوخاری ئیخراجی كردووە(١٧٤١).

[2] - ترمیزی(٢١٥٩) و ئیبن ماجە(٣٠٥٥) ئیخراجیان كردووە.

قەسابەکە، فەرمووی لای خۆمان پێی دەدەین: "مَنْ شَاءَ اقْتَطَعَ"[1]، واتا: بۆ هەرکەسێ ویستی پشکێ ببات.

## بەش

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمینا قوربانیی کرد، فێری کردن هەموو مینا شوێنی قوربانیکردنە، شاخ و دەشی مەککە رێگە و شوێنی سەربڕینە[2].

لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پرسیار کرا لەمینادا سێبەرێکی بۆ دروستبکرێت، بۆیە فەرمووی:، واتا: "لا، مِنًى مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ إليهِ"[3]، واتا: نە، مینا شوێنی ئەو کەسەیە کە پێشتر پێیدەگات.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی موسڵمانان لەو شوێنەدا هاوبەشن، هەرکەسێ پێش ئەوی تر پێیگەیشتبێ، ئەوە لەپێشترە بەو شوێنە هەتا ئەوەی خۆی دەڕوات و کەس نابێتە خاوەن ئەو شوێنە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە سەربڕینەکەی تەواو کرد، بانگی سەرتاشی کرد و سەری خۆی تاشی، بەسەرتاشی فەرموو "خُذْ"، واتا: لێیبگرە. ئاماژەی کردە لای راستی، کە لێی بوویەوە، قژی کردە دوو بەشەوە و پاشان ئاماژەی کردە سەرتاشەکە و لەلای چەپی گرت، پاشان فەرمووی: "هَا هُنَا أَبُو طَلْحَةَ؟"، واتا: ئا ئەبو تەڵحە لێرەوەیە. ناردی بۆلای ئەبو تەڵحە[4].

سێ جار داوای لێخۆشبوونی کر د بۆ ئەوانەی سەریان تاشی و جارێکیش بۆ ئەوانەی کورتیان کردەوە.

---

[1] - بوخاری(١٧١٧) و موسلیم(١٣١٧) ئیخراجیان کردووە.
[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢١٨).
[3] - ئەبو داوود(٢٠١٩) و ئیبن ماجە(٣٠٠٦) ئیخراجیان کردووە.
[4] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣٠٥).



پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێش نوێژی نیوەڕۆ بەسواریی ڕۆیشت بۆ مەککە، تەوافی ئیفازەی کرد، تەنیا خۆی تەوافی کرد و بۆ کەسی تر نەگونجا لەگەڵیدا ئەنجامی بدات، ئا ئەمەش دروستە.

لەم تەوافە و لەتەوافی ماڵئاواییدا پەلەی نەکرد، بەڵکو لەتەوافی هاتندا ئەوەی کرد.

پاشان دوای ئەوەی تەوافکردنی تەواو کرد، هات بۆلای زەمزەم و موسڵمانان سەرقاڵی ئاوخواردنەوە و ئاو هەڵکێشان بوون لەنێو زەمزەمدا، فەرمووی:"لَوْلَا أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ لَنَزَلْتُ فَسَقَيْتُ مَعَكُمْ"،واتا:ئەگەر خەڵکیی نەدەکەوتن بەسەرتاندا، ئەوە منیش دادەبەزیم و لەگەڵتاندا ئاوم دەخواردەوە. سەتڵەکەیان لێ نزیککردەوە و بەڕاوەستانەوە لێی خواردەوە[1].

ئاخۆ ئەو تەوافکردنەی بەپیادەیی بوو یان بەسواریی؟ ئەوە موسلیم لەسەحیحەکەیدا ئەگێڕێتەوە لەجابرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەحەجی ماڵئاواییدا بەسەر وشترەکەیەوە تەوافی کرد، بەگاڵۆکەکەی سەلامی لەبەردە ڕەشەکە کرد، چونکە خەڵکیی دەیانبینی و پرسیاریان لێ دەکرد، خەڵك دەورەی لێ دابوو"[2].

پاشان گەڕایەوە مینا، جیاوازیی هەیە ئەو نیوەڕۆیە لەکوێ نوێژی کردووە؟ لەسەحیحەیندا هاتووە لەئیبن عومەرەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕۆژی قوربانیی ئیفازەی کرد، پاشان گەڕایەوە لەمینا نوێژی نیوەڕۆی کرد[3]، لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەجابرەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەمەککە نوێژی نیوەڕۆی کردووە. جیاوازیی هەیە لەبارسەنگکردنی یەکێك لەو دوو بۆچوونە بەسەر ئەوی تردا.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢١٨).

[2] - پێشتر باسکرا.

[3] - بوخاری(١٧٣٢) و موسلیم(١٣٠٨) ئیخراجیان کردووە.

عائیشە لەو ڕۆژەدا یەك تەوافی ئەنجام دا، هەروەها یەك سەعی، ئەوەش لەجیاتی حەج و عومرەکەی.

سەفیە لەو ڕۆژەدا تەوافی کرد، پاشان کەوتە سووڕی مانگانەوە، ئەو تەوافە جێگەی تەوافی ماڵئاوایی گرتەوە و خواحافیزیی نەکرد، سوونتەتی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) جێگیر بوو لەبارەی ئافرەتی پاکەوە بوو لەسووڕی مانگانە، ئەگەر لەپێش تەواف کەوتە سووڕی مانگانەوە پێش ئەوە قرن بکات، ئەوە یەك تەواف و یەك سەعی بەسە، ئەگەر دوای تەوافی ئیفازە کەوتە سووڕی مانگانەوە، ئەوە ئەو تەوافەی جێگەی تەوافی ماڵئاوایی دەگرێتەوە.

## بەش

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەو ڕۆژەیدا گەڕایەوە مینا، کە بەیانیی بوویەوە چاوەڕێی خۆرئاوابوونی کرد، کە خۆرئاوابوو لەنێو کاروانەکەدا بەڕێکەوت بۆ جەمەرات و سەر ولاخ نەکەوت، بەجەمرەی یەکەم دەستیپێکرد کە لەو دیوو مزگەوتی ئەلخیفەوەیە، بەحەوت چەو بەردبارانی کرد، یەك بەدوای یەك و لەگەڵ هاوێشتنی هەر چەوێکدا ئەیفەرموو:"الله أكبرُ"، پاشان لەپێش جەمرە چووە پێش و ڕوو بەقیبلە ڕاوەستا و پاشان دەستی بەرزکردەوە و پاڕایەوە بەپاڕانەوەیەکی درێژ بەئەندازەی خوێندنی سورەتی بەقەرە.

پاشان هات بۆ جەمرەی ناوەڕاست، بەو شێوەیە بەردبارانی کرد، پاشان ڕووەو لای چەپ لای دایەوە لەخوار دۆڵەکەوە، ڕووەو قیبلە ڕاوەستا و دەستی بەرزکردەوە بۆ پاڕانەوە و نزیك بەوەستانی یەکەم ڕاوەستا.

پاشان هاتە جەمرەی سێیەم کە جەمرەی ئەلعەقەبەیە،چووە دۆڵەکەوە، کەعبەی خستەلای چەپی و مینای خستەلای ڕاستی، ئەوێشی بەحەوت چەو بەردباران کرد.

نە لەسەرەوەی بەردی بۆ هاوێشت نە لەلای راستییەوە، بەڵکو روو بەقیبلە راوەستا و جەمرەی سێیەمی بەردباران کرد.

کە بەرد هاوێشتنەکانی تەواو کرد، یەکسەر گەڕایەوە و لای رانەوەستا. وتراوە: ئەوە بەهۆی بەرتەسکیی شوێنەکەوە بووە، وتراوە ئەوە دروستترە: پاڕانەوەی لەنێو پەرستش پێش لێبوونەوە باشترە لەدوای لێبوونەوە لەو پەرستشە، هەروەك چۆن سوونەتی ئەو وەهابوو لەپاڕانەوەی لەنوێژدا، کە دەپاڕایەوە، لەگرنگترین شوێنی نوێژدا ئەپاڕایەوە.

## بەش

هێشتا لەدڵمدا ماوە: ئاخۆ لەپێش نوێژی نیوەڕۆ چەو و بەردەکانی هاوێشتووە یان لەدوای نوێژی نیوەڕۆ؟ ئەوەی بەسەر گوماندا زاڵ بێ ئەوەیە، لەپێش نوێژی نیوەڕۆدا هاوێشتوویەتی، پاشان گەڕاوەتەوە نوێژی کردووە، چونکە جابر و کەسانی تر وتوویانە: کە خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لای داوە بەردەکانی هاوێشتووە. لاربوونی خۆر بۆ بەرد هاوێشتن لەڕۆژانی مینادا وەك خۆرهەڵاتنە بۆ بەردهاوێشتنی رۆژی قوربانی، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەڕۆژی قوربانییدا کە کاتی بەردهاوێشتن هات، هیچ پەرستشێکی پێش نەخست لەو رۆژەدا.

## بەش

حەجی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) شەش راوەستانی تێدا بوو بۆ پاڕانەوە: وەستانی یەکەم: لەسەر سەفا. دووەم: لەسەر مەروە. سێیەم: لەعەرەفە. چوارەم: لەموزدەلیفە. پێنجەم: لای جەمرەی یەکەم. شەشەم: لای جەمرەی دووەم.

**بەش**

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەمینادا دوو وتاری بۆ خەڵکیی پێشکەش کرد: وتاری رۆژی قوربانی کە پێشتر باسمان کرد، وتاری دووەمیش لەناوەڕاستی رۆژانی ئەلتەشریق، وتراوە: دووەم رۆژی قوربانییە کە ناوەڕاستی سێ رۆژەکەیە، واتا: باشترینیان.

**بەش**

عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب روخسەتی لێ خواست شەوانی مینا لەمەککە بمێنێتەوە بۆ ئاودان بەحاجییان، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)مۆڵەتی دا، شوانی وشترەکانیش(وشترلەوانەکانیش) داوای روخسەتیان لێ کرد شەوان لەدەرەوەی مینا بمێننەوە بۆ ئاودان بەوشترەکان، مۆڵەتی ئەوانیشی دا.
پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە مۆڵەتی ئاودەران بەحاجییان و وشترلەوانانی دا شەوان لەدەرەوەی مینا بن بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆیان، ئەوە کەسێك سەروەتێکی هەبێ ترسی هەبێ لەدەست دەربچێ یان نەخۆشێك پێویستی بەکەسێك هەبێ یان نەخۆشێك نەتوانێ شەوان لەدەرەوە بمێنێتەوە، ئەوە ئەوانیش مۆڵەتی گەڕانەوەیان هەیە بەو دەقەی بۆ عەباس و وشترلەوانان باسمان کرد، خواش ئاگادارە.

**بەش**

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پەلەی نەکرد لەدوو رۆژدا واجیبات و کارەکان تەواو بکات، بەڵکو مایەوە تاوەکو بەردهاوێشتنی هەرسێ رۆژی ئەلتەشریق تەواو بوو، رۆژی سێشەممە دوای نیوەڕۆ رۆیشت بۆ ئەلموحەصەب کە ئەبتەحە، خیفی نەوەی کینانە، بینی ئەبا رافیع لەوێدا گومەزی بۆ دروستکردووە، نوێژی نیوەڕۆ و

عەسر و مەغریب و عیشای کرد و سەرخەوێکی شکاند، پاشان هەڵسا بۆ مەککە، شەوێك هەتا بەربەیان تەوافیماڵئاوایی کرد و لەو تەوافەدا لەسەر خۆ بوو.

سەفیە هەواڵی پێدا کە کەوتووەتە سووڕی مانگانەوە، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"أحابِسَتُنا هِيَ؟"واتا: تەوافی ئیفازی دواخست تاوەکو پاك دەبێتەوە بمێنینەوە و تەواف بکات؟ پێیان وت: ئەو ئیفازەی کردووە. فەرمووی:،"فَلْتَنْفِرْ إذن"[1]،واتا: کەوابوو با ئامادەبێ و دەربچێ.

عائیشە ئەو شەوە ئارەزووی دەرخست بەتەنیا عومرەیەکی پێ بکات، ئەویش هەواڵی پێدا کە تەوافی کەعبە و سەفا و مەروە لەبری حەج و عومرەکەیەتی، بەڵام عائیشە رازیی نەبوو تەنیا بەوە نەبێ بەتەنیا عومرەیەك ئەنجام بدات، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کردە عەبدولڕەحمانی برای تاوەکو لەتەنعیمەوە عومرەیەکی پێ بکات، شەو لەعومرەکەی بوویەوە، پاشان لەگەڵ براکەیدا لەنیوە شەودا هاتنە ئەلموحەصەب، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"فَرَغتُما"،واتا: لێبوونەوە؟ عائیشە وتی: بەڵێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ هاوەڵانی جاڕی ڕۆیشتنی دا، خەڵکیی بەڕێکەوتن، پاشان پێش نوێژی بەیانی تەوافی کەعبەی کرد[2].

پاشان پێشین جیاوازن لەبارەی ئەلتەحصیب، ئایە سوونەتە یان جێ یەکدەنگییە؟ بۆ ئەوە بوونەتە دوو بەشەوە.

---

[1] - بوخاری(١٧٣٣) و موسلیم(١٢١١) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١٥٦٠).

## بەش

لێرەدا سێ بابەت هەیە:

بابەتی یەکەم: زۆرێك لەشەرعناسان و ئەوانی تر وەهایان داناوە کە لەو حەجەیدا چووەتە نێو بەیتەوە(کەعبە)،زۆرێك کەسیش وەهای دەبینن بەچاوکردن لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)، چوونە نێو کەعبە سوونەتە، بەڵام ئەوەی ڕێبازی پیرۆزی ئەو بەڵگەی لەسەر دەدات ئەوەیە، نە لەو حەجە و نە لەهیچ عومرەیەکدا نەچووەتە نێو کەعبەوە(بەیت)، بەڵکو لەساڵی فەتح چووەتە ناویەوە.

بابەتی دووەم: ڕاوەستانی لە(الملتزم)، ئەوەی لێیەوە گێڕدراوەتەوە ئەوەیە لەڕۆژی فەتحدا ئەوەی ئەنجام داوە.

بابەتی سێیەم: شوێنی نوێژکردنی لەبەیانیی زووی شەوی ماڵئاواییدا، لەسەحیحەیندا هاتووە لەئوم سەلەمەوە وتوویەتی: شەکوای ئازارم بردەلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی:"طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ"،واتا:بەسواریی لەپشت خەڵکەوە تەواف بکە. ئەڵێ: تەوافم کرد و ئەوکات پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەپاڵ بەیت(کەعبە) نوێژی دەکرد و ئەمەی ئەخوێندەوە:﴿ وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٍ مَّسۡطُورٖ ۝٢ ﴾ الطور: ١ – ٢[١] .

ئەمە ئەگەری ئەوە هەڵدەگرێ نوێژی بەیانیی بووبێ یان نوێژێکی تر، لەتەوافی ماڵئاواییدا بووبێ یان تەوافی تر. ڕوانیمانە ئەوە و بینیمان بوخاری لەسەحیحەکەیدا ئەم چیرۆکەی گێڕاوەتەوە، بەوەی کاتێك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ویستی دەربچێ، ئوم سەلەمە تەوافی کەعبەی نەکردبوو ویستی دەربچێ، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێیفەرموو:"إِذَا أُقِيمَتْ صَلاَةُ الصُّبْحِ فَطُوفِي عَلَى بَعِيرِكِ وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ"،واتا: کە نوێژی بەیانیی دابەسترا، لەسەر وشترەکەت تەواف بکە و

[١]– بوخاری(٤٦٤) و موسلیم(١٢٧٦) ئیخراجیان کردووە.

ئەوکات خەڵکیش خەریکی نوێژن. ئەویش ئەوەی کرد، نوێژی نەکرد هەتاوەکو دەرچوو[1]. ئەستەمە ئەوە رۆژی قوربانیکردن بێ، بێگومان رۆژی ماڵئاوایی بووە، دەردەکەوێ کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لای کەعبە نوێژی بەیانیی کردووە و ئوم سەلەمەش گوێی لێبووە(الطور)ی خوێندووە.

### بەش

پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەرێکەوت بۆ گەڕانەوە مەدینە، لەڕەوحاء بوو بەکۆمەڵێ سوار گەیشت،سەلامی لێکردن و فەرمووی:"مَن القومُ؟"، واتا: ئێوە کێن؟ وتیان: موسڵمانین. وتیان: ئێوە کێن؟ فەرمووی: پەیامبەری خوام. ئافرەتێك منداڵێکی نێو مەلۆتکە و قوماتی بەرزکردەوە و وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەمە حەج ئەبێ؟ فەرمووی: بەڵێ، بۆ تۆش پاداشت هەیە[2].

کە هاتە زی ئەلحەلیفە شەو لەوێ مایەوە، کە مەدینەی بینی سێ جار(الله أكبر)ی کرد و فەرمووی:"لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ"[3].

پاشان نیوەڕۆ لەڕێگەی(المعرس)ەوە هاتە ناویەوە و لەڕێگەی(الشجرة)ەوە دەرچوو، خواش زاناترە.

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١٦٢٦).

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣٣٦).

[3] - بوخاری(١٧٩٧) و موسلیم(١٣٤٤) ئیخراجیان کردووە.

## ٥- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەدیاری و قوربانی و گوێزەبانەدا

تایبەتە بەو هەشت جۆرە ئاژەڵەی لەسورەتی ئەنعامدا باسکراوە، نە لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و نە لەهاوەڵانەوە باسی قوربانی و گوێزەبانە نەهاتووە، لەکۆی چوار ئایەتی قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون: یەکەم: فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ **المائدة: ١** ، واتا: حەڵاڵ کراوە بۆتان(گۆشتی) ئاژەڵ و چوارپێ(مەڕ و بزن و وشتر و ڕەشە ووڵاغ).

دووەم: فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ﴾ **الحج: ٢٨** ،واتا: ناوی خوا ببەن(کاتێك قوربانی سەر دەبڕن)لە ڕۆژانێکی دیاریکراودا لەسەر ئەو ئاژەڵانەی خوا پێی داوون.

سێیەم: فەرمایشتی خوای گەورەیە کە فەرموویەتی: ﴿وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗاۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ١٤٢ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ نَبِّـُٔونِي بِعِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٤٣﴾ **الأنعام: ١٤٢ – ١٤٣** ،واتا: لەئاژەڵ و ماڵاتیش هەندێکی بارهەڵگرە و هەندێکی بۆ کوڵك و خوریە(کە ڕاخەر و فەرشی لێ دروست دەکرێت) لەوەی کە خوا پێی بەخشیوون بخۆن وە شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون چونکە بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە.(خوا) هەشت جۆر ئاژەڵ و ماڵاتی(دروستکردووە) لەمەڕ دووان(مەڕ و بەران) و لەبزن دووان(بزن و سابرێن)(ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئایا خوا ئەو دوو نێرەی حەرام

کردووە؟ یان ئەو دوو مێیە؟ یا ئەو بێچوانەی کە لەسکی ئەو دوو(جۆرە ئاژەڵە)مێینەدایە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن هەواڵم بدەنێ بەزانیارییەك(لەخواوە).

چوارەم: فەرمایشتی خوای گەورەیە:﴿ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ ﴾ **المائدة: ٩٥** ،واتا: بە شێوەی قوربانی بگاتە کەعبە(و لەوێ بیکات بەقوربانی).

ئەمە هەڵهێنجانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە(خوای لێ ڕازیی بێ).

ئەو سەربڕینانەی کە بۆ قوربانیی بۆ خوای گەورە ئەنجام دەدرێن سێ شتن: قوربانی(هدی) و سەربڕین(ضحایا) و گوێزەبانە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) مەڕ و وشتری کردووەتە قوربانی، بۆ خێزانەکانی مانگای کردووەتە قوربانی، لەمەقام و لەعومرە و حەجیدا قوربانیی کردووە، سوونەتی ئەوە بوو مەڕی دەستنیشان ئەکرد بێ ئەوەی بریندارى بکات.

ئەگەر لەشوێنی نیشتەجێبوونیدا قوربانیی بناردبایە، هیچ شتێکی لێ بۆ حەرام نەدەبوو.

کە وشتری بکردبایەتە قوربانی،وشترەکەی دیاریی دەکرد و کەمێ کۆپارەکەی بریندار دەکرد تاوەکو خوێنی لێ دەهات.

ئەگەر قوربانییەکەی بناردبایە، فرمانی بەکەسەکە دەکرد سەرییبڕێ و نەعلەکەی لەخوێنی قوربانییەکە بگرێت و بیخاتەسەر تەشت و قاپ، خۆی و کەسوکاری ماڵەکەی لێیان نەدەخوارد، پاشان گۆشتەکەی دابەش دەکرد.

لەنێو هاوەڵانیدا لەقوربانیکردندا هاوبەشیی دەکرد: وشترێ بۆ حەوت کەس، مانگایەکیش بۆ حەوت کەس.

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو بەڕاوەستانەوە وشتری سەردەبڕی، وشترەکە کۆتکراو بوو لەسەر لای چەپ بەزەویدا درابوو، لەکاتی سەربڕیندا(بسم الله) و (الله أکبر)ی دەکرد، بەدەستی خۆی

قوربانییەکەی ئەنجام دەدا، رەنگە لەهەندێکیدا وەکیلی دەستنیشان کردبێ، هەروەك فرمانی بەعەلیی کرد(خوای لێ رازیی بێ) بەسەربڕینی ئەو وشترانەی لەڕیزی سەد وشتری قوربانییدا مابوونەوە و سەرنەبڕدرابوون.

کە مەڕی سەربببڕدایە قاچی دەخستە سەر گازەرەی ملی، (بسم الله) و (الله أكبر)ی دەوت لەکاتی سەربڕینەکەدا. پێشتریش باسمان کرد کە لەمینا وشتری سەربڕی و فەرمووی: تەواوی شاخ و دەشتی مەککە جێی قوربانیکردنە[1].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ ئوممەتەکەی رێگەی دا لەقوربانیی یەکتر بخۆن و لێی هەڵبگرن. هەندێجار گوشتی قوربانیی دابەش کرد و جارێکیش فەرمووی:"مَنْ شَاءَ اقْتَطَعَ"[2]،واتا:بۆ هەرکەسێ ویستی پشکێ ببات. ئەمەی کردووە و ئەوەی کردووە. جا ئەمە کراوەتە بەڵگە کە جائیزە لەو پارە و شتانە هەڵبگیردرێتەوە کە بەسەر بوك و زاوا و هاوشێوەکانی تردا هەڵدەدرێت.

## ٦- رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەربڕینی ئاژەڵی قوربانییدا

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، سەربڕینی قوربانیی بوو لای مەروە و قوربانیی قیران لای مینا، لەدوای ئیحرامکردن قوربانیی کردووە و لەدوای هەڵهاتنی خۆر و لەدوای چەو هاوێشتن، چوار کاروباری ریزبەندکراوە: بەرد هاوێشتن، پاشان سەربڕین، پاشان سەرتاشین، پاشان تەوافکردن. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەو جۆرەی رێکخستووە و هەرگیز رێگەی نەداوە پێش خۆرهەڵاتن قوربانیی بکرێت. هەرکەسێ پێش خۆرهەڵاتن ئەنجامی بدات، ئەوە پێچەوانەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی کردووە، چونکە حوکمی

---

[1] – ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٣٠٤٨).

[2] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١٧٦٥)..



پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەقوربانیکردندا، ئەوەیە دوای خۆرهەلاتن ئەنجام بدرێت.

## ٧- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەقوربانیکردندا( زەحیە )

هەرچی رێبازی پەیامبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم) لەقوربانیکردندا، قوربانییەکەی دوانەدەخست، دوو بەرانی دەکردە قوربانی و لەدوای نوێژی جەژن سەری دەبرین، هەواڵیشی داوە هەرکەسێ پێش نوێژ سەرىببرێ، ئەوە بەشێك نییە لەقوربانیی جەژن، بەڵکو گۆشتێکە و پێشکەشی کەسوکاری کردووە[1].

فرمانیداوە شەك مەڕێ سەرببڕدرێت یان مەڕی پیر.

لەبابەت کاتی قوربانییەوە چوار بۆچوون هەیە:

یەکەم: هەموو رۆژانی ئەلتەشریق کاتی قوربانیکردنن.

دووەم: کاتی قوربانی، رۆژی جەژن و دوو رۆژەکەی دواترین، ئەمە مەزهەبی ئەحمەد[2] و مالیك[3] و ئەبو حەنیفەن[4]. ئەحمەد ئەڵێ: ئەوە قسەی زیاتر لەهاوەڵێکی پەیامبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم).

سێیەم: کاتی قوربانیکردن یەك رۆژە، ئەوە قسەی ئیبن سیرینە[5]، چونکە ئەو رۆژە تایبەت کراوە بەو ناوەوە(يوم النحر)، ئەو تایبەتکردنە بەڵگە دەدات تەنیا یەك رۆژە، ئەگەر لەو سێ رۆژەدا جائیز بووایە، ئەوە دەوترا: رۆژانی قوربانیکردن(أيام النحر)، هەروەك دەوترێ(رۆژانی رەجمکردن– أيام الرمي) و (رۆژانی مینا– أيام

---

[1] – بوخاری(٥٥٦٠) و موسلیم(١٩٦١) ئیخراجیان کردووە.

[2] – مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق ابن راهويه گێڕانەوەی الكوسج(٢٨٣٦– ٢٨٣٧).

[3] – المدونة لسحنون١/٥٥٠.

[4] – الأصل للشيباني٥/٤١٢.

[5] – المغني لابن قدامة١٣/٣٨٤.

منى) و (رۆژانی ئەلتەشریق- أيام التشريق)، هەروەك جەژن خستنەسەرە بۆ قوربانیکردن و یەك رۆژە، هەروەك دەوترێ جەژنی رەمەزان.

چوارەم: قسەی سەعیدی کوڕی جوبەیر و جابری کوڕی زەید[1]: لەشار و شوێنانی تردا یەك رۆژە و لەمینادا سێ رۆژە، چونکە ئەو سێ رۆژە لەمینادا خەڵك سەرقاڵی رەجم و تەواوف و سەرتاشینن، رۆژانی قوربانیکردنە پێچەوانەی خەڵکی شوێنانی تر.

### ٨- ئامۆژگاری و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆ کەسێك ویستی قوربانیکردنی هەیە

یەکێکی تر لەئامۆژگاری و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە، ئەگەر کەسێك ویستی قوربانیی بکات و چووە دە رۆژەی مانگەوە، ئەوە هیچ موویەك(تووکێك) لەخۆی نەکاتەوە، ئەوەش لەسەحیحی موسلیمدا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە[2].

### ٩- ئامۆژگاریی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسیفەتی ئاژەڵی بەقوربانیکراودا

یەکێکی تر لەئامۆژگاری و رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، دەستنیشانکردنی ئەو ئاژەڵەیە دەکرێتە قوربانی، دەبێ ئاژەڵێکی ساغ و دوور لەعەیب بێ، نەهی کردووە لەکردنی ئاژەڵێك بەقوربانی، کە گوێی کەل و کون و دڕاوبێ، ئەبو داوود باسی کردووە[3].

---

[1] - المغني لابن قدامة١٣/٣٨٤.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٩٧٧).

[3] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٨٠٥).

فرمانی داوە سەیری چاو و گوێی ئاژەڵەکە بکرێت بزانە ساغ و سەلامەتە، چونکە ئاژەڵێکی کوێر یان گوێ قرتاو و کونکراو و شەقکراو ناکرێت بەقوربانی. ئەبو داوود باسیکردووە[1].

هەروەها لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) باسکراوە فەرموویەتی:"أَرْبَعٌ لَا تُجْزِئُ فِي الْأَضَاحِيِّ: الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ضَلَعُهَا، وَالْعَجْفَاءُ الَّتِي لَا تُنْقِي"[2]،واتا: چوار جۆر ئاژەڵ ناکرێن بەقوربانی: کوێربێ و کوێرییەکەی بەڕوونیی ببینرێت، دیاربێ نەخۆشە، روون دیاربێ شەلە، ئاژەڵێکیش تەواو لاواز و سیسەڵ بێ.

## ١٠-ئامۆژگاری و ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەقوربانیکردنی لە(المُصَلَّى)دا

یەکێکی تر لەئامۆژگاری و ڕێنمایی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوە بوو لەموسەلاَّدا قوربانیی دەکرد، لەسەحیحدا هاتووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەربڕین و قوربانیکردنی لەموسەلاَّدا بووە[3].

## ١١-فرمانکردنی بەچاکەکردن لەسەربڕیندا

فرمانی بەخەڵك کردووە ئەگەر ئاژەڵیان سەربڕی، بەجوانترین شێوە سەریببڕن و فەرموویەتی:"إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ"[4]،واتا: خوای گەورە چاکەی لەسەر هەموو شتێك پێویست کردووە.

---

[1] – ئەبو داوود(٢٨٠٤) و ترمیزی(١٤٩٨) ئیخراجی کردووە.

[2] – ئەبو داوود(٢٨٠٢) و ترمیزی(١٤٩٧) و ئیبن ماجە(٣١٤٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٥٥٢).

[4] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٩٥٥).

## ١٢-بەقوربانیکردنی شەك مەڕێ لەبری پیاوێك و خێزانەکەی

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوەیە کەسێك دەتوانێ بۆ خۆی و خێزانەکەی شەك مەڕێك بکات بەقوربانیی ئەگەر ژمارەشیان زۆر بێت.

## ١٣-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەگوێزەبانەدا

لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەباوکیەوە ئەویش لەباپیریەوە وتی: پرسیار لەپەیامبەری خوا کرا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی گوێزەبانەوە(العقیقة)، فەرمووی:"لا أُحِبُّ العقوقَ"،واتا: حەزم بەسزا نییە،وەك ئەوەی حەزی بەو ناوە نەبێ. وتیان: ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، شتێکە یەکێ لەئێمە بۆ لەدایکبوونی کوڕەکەی ئەنجامی دەدات؟ فەرمووی:"مَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَنْسُكَ عَنْ وَلَدِهِ فَلْيَفْعَلْ، عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ"[1]، واتا: هەرکەسێ لەئێوە حەزی کرد بۆ مندالەکەی خێرێك بکات، با بۆ کوڕ دوو شەك مەڕ سەرببڕێت و بۆ کچیش شەك مەڕێك. بەدروست هاتووە لەفەرموودەیەکی عائیشەدا(خوای لێ رازیی بێ) فەرموویەتی:"عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ"[2]،واتا: بۆ کوڕ دوو شەك مەڕ و بۆ کچیش شەك مەڕێك.

فەرموویەتی:"كُلُّ غُلَامٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ، يُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَابِعِ، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ، وَيُسَمَّى"[3]،واتا:هەموو مندالێك کۆتی گوێزەبانەکەیەتی، لەڕۆژی حەوتەمدا بۆی دەکرێت و سەری دەتاشرێت و ناوی لێ دەنرێت.

ئیمام ئەحمەد ئەڵێ: واتا: کۆت و بەندە بەو تکایەی باوکی بۆی کردوویەتی. ڕواڵەتی فەرموودەکە ئەوەیە مندالەکە لەگرەودایە و کۆت و بەندە لەبەرانبەر خێر و

---

[1] - ئەبو داوود(٢٨٤٢) و نەسائی(٤٢١٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ترمیزی(١٥١٣) و ئیبن ماجە(٣١٦٢) ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئەبو داوود(٢٨٣٨) و ترمیزی(١٥٢٢) و نەسائی(٤٢٢٠) ئیخراجیان کردووە.

چاکەیەك باوکی بۆی ویستوویەتی، لەئاخیرەتدا لەسەر ئەوەی بۆی نەکراوە سزا نادرێت، هەروەك ئەگەر باوکی لەجووتبوون لەگەڵ دایکی(بسم الله)ی کردبێ و بەو جووتبوونە ئەم منداڵە هاتبێتە دونیاوە، شەیتان زیانی پێ نادات، ئەوە ئەگەر باوکی ئەو(بسم الله)یەی نەکردبێ، لەوە پارێزراو نابێ.

## ١٤- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەناولێنانی منداڵ و خەتەنەکردنی

پێشتر لەفەرموودەکەی قەتادە ئەویش لەئەلحەسەنەوە ئەویش لەسەمرەوە لەبارەی گوێزەبانە گێڕامانەوە:"تُذبَحُ يومَ سابعِه ويُسمَّى"[1]،واتا:لەڕۆژی حەوتمیدا ئاژەڵی بۆ سەرببڕدرێت و ناوی لێ بنرێت.

سەبارەت بەخەتەنەکردن، ئەوە ئیبن عەباس ئەڵێ: کوڕیان خەتەنە نەدەکرد هەتاوەکو ئیدراك و پەیپێبردنی نەبووبێ. ئەلمەیمونیی ئەڵێ: گوێم لەئەحمەد بوو ئەیووت: ئەلحەسەن بەمەکروهی دەبینی کوڕ لەڕۆژی حەوتەمیدا خەتەنە بکرێت. حەنبەل ئەڵێ: ئەبو عەبدوالله وتی: ئەگەر لەڕۆژی حەوتەمدا خەتەنە بکرێت کێشە نییە، بەڵام ئەلحەسەن بۆیە بەمەکروهی داناوە تاوەکو لێکچوو بەجولەکە نەکرێت، بەڵام لەوەدا شتێك نییە.

## ١٥- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەناولێنان و کونیە[2] دانان

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە فەرموویەتی:"إِنَّ أَخْنَعَ اسْمٍ عِنْدَ اللهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأَمْلَاكِ، لَا مَالِكَ إِلَّا اللهَ"[3]،واتا: نزم و سووکترین ناوێك بەلای خوای گەورەوە، ناوی پادشای پادشایانە، هیچ پادشایەك نییە جگە لە الله.

---

[1] – ئەبو داوود(٢٨٣٧) و ترمیزی(١٥٢٢) و ئیبن ماجە(٣١٦٥) و نەسائی(٤٢٢٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] – کونیە، واتا باوکی فلان و دایکی فلان– وەرگێڕ.

[3] – بوخاری(٦٢٠٥) و موسلیم(٢١٤٣) ئیخراجیان کردووە.

هەروەها لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە فەرموویەتی:"أَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللهِ عَبْدُ اللهِ وعَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَأَصْدَقُهَا حَارِثٌ وَهَمَّامٌ، وأقبحها:حَرْبُ ومرةُ"[1]،واتا:خۆشەویسترین و شیرینترین ناوێك بەلای خوای گەورەوە عەبدوالله و عەبدولڕەحمانە. راستترینیان(حَارِثٌ وَهَمَّامٌ)ە و ناشیرینترین ناوێکیش(حَرْبُ ومرةَ- شەڕ و تاڵ)یە.

هەروەها لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە فەرموویەتی:"لاَ تُسَمِّيَنَّ غُلاَمَكَ يَسَارًا وَلاَ رَبَاحًا وَلاَ نَجِيحًا وَلاَ أَفْلَحَ فَإِنَّكَ تَقُولُ أَثَمَّ هُوَ فَلاَ يَكُونُ فَتَقُولُ لاَ"[2]،واتا: منداڵەکەت ناو مەنێ یەسار و رەباح و نەجیح و ئەفلەح، چونکە ئەوترێ: ئەوە فلانە شتە؟ تۆش دەڵێی: نە.

لێیەوە سەلماوە کە ناوی(عاصیة)ی گۆڕیووە فەرموویەتی تۆ جەمیلەی(جَميلة)[3].

جوەیرە پێشتر ناوی(بَرَّة- چاکەکار)بووە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ناوەکەی گۆڕیی کردیە جوەیریە[4]. زەینەبی کچی ئوم سەلەمە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهی کرد ئەو ناوەی لێ بنرێت و فەرمووی:"لاَ تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمُ اللهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ"[5]،واتا:خۆتان پاك رامەگرن و وەهای پیشان مەدەن چاکەکارن، ئەوە خوای گەورەیە لەئێوە باشتر چاکەکار دەناسێت.

ناوی(حَزَن-خەفەت)ی گۆڕی کە باپیری سەعیدی کوڕی ئەلموسەیب بوو کردیە سەهل(ئاسان)، ئەو ناوەی رەتکردەوە و فەرمووی: سەهل جێ دەگرێ و دەچێت بەدڵەوە[6].

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٣٢).

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٣٧).

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٣٩).

[4] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٤٠).

[5] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٤١).

[6] - بوخاری(٦١٩٠) و ئەبو داوود(٤٩٥٦) ئیخراجیان کردووە.

## باسێك لەفیقهی ئەم بوارە

لەبەر ئەوەی ناو قاڵبی واتایە و بەڵگە لەسەر شتەکە دەدات، ئەوە حیکمەت و دانایی وەهای پێویست کردووە لەنێوان ناو و ناولێنراودا پەیوەندی و گونجان هەبێت، ئەگەرنا ناو و واتاکە بەیەك بێگانە دەبن، بۆیە حیکمەتی خوای گەورە ئەوە رەتدەکاتەوە رێك و گونجاو بەیەك نەبن. ئەگەر ناو و واتا پێکەوە گونجاو نەبن، واقیع پێچەوانەی دەسەلمێنێ. بێگومان ناو کاریگەریی گەورەی هەیە لەسەر ناولێنراو لەڕووی جوانی و ناشیرینی، ئێسك سووکی و قورسی و ناسك و زبر.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) حەزی بەناوی جوان کردووە، فرمانی داوە ئەگەر کەسێکیان ناردە لای هەواڵێکی پێ بدات، کەسەکە ناوێکی جوان و رواڵەتێکی جوانی هەبێ. لەخەو و بەئاگاییدا لەناوەکانەوە واتای وەردەگرت، هەروەك خۆی و هاوەڵانی لەماڵی عوقبەی کوڕی رافیعدا بینران، خورمایەکی جوانیان بۆ هێنرا لەخورماکانی ئیبن طاب، بۆیانی لێکدایەوە کە لەدونیادا سەربەرزییان بۆ هەیە و لەئاخیرەتیشدا براوە و سەرەنجام خێرن، ئەو ئایینەش کە خوای گەورە بۆ ئەوانی هەڵبژاردووە، تەڕ و تازە و خۆش و چاکە[1].

حەزی بەو شوێنانە نەبوو کە ناوی ناخۆش و ناشیرینیان لێ نرابوو، حەزی نەدەکرد بەو شوێنانەدا تێپەڕبێ، هەروەك لەغەزایەکدا بەنێوان دوو شاخدا تێپەڕبوو، لەبارەی ناوی ئەو دوو شاخەوە پرسی، وتیان ناویان(فاضح و مخز– ئابڕوبەر و ریسواکەر)ە، لەو رێگەیە لای داو بەنێوانیاندا تێپەڕ نەبوو.

لەبەر ئەوەی لەنێوان ناو و ناولێنراودا پەیوەندی و نزیکیی هەیە، هەروەها لەنێوان روح و جەستەدا و بەڵگە لەسەر یەکتر دەدەن، ئەوە زۆرجار کەس و شتەکان

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٧٠).

دەناسرێنەوە هەڵگری چی ناوێکن، بۆ نمونە ئیاسی کوڕی موعاویە و کەسانی تر کە یەکێکیان دەبینی ئەیانووت: پێویستە ئەم کەسە ناوی فلان بێ، هەڵەیان نەدەکرد. هەروەك عومەری کوڕی خەتاب لەکابرایەکی پرسی وتی: ناوت چییە؟ وتی: پشکۆ. وتی ئەی ناوی باوکت؟ وتی: بڵێسە. وتی: لەچی قەومێکی؟ وتی: (الحرقة-سووتان). وتی: خەڵکی کوێی؟ وتی: گەڕەکی ئاگر(النار). وتی: ماڵت ئەکەوێتە کوێوە؟ وتی: کڵپەگرتوو. وتی: برۆ ماڵەکەت گڕی گرتووە. کابرا ڕۆیشت بینی بەڵێ وا ماڵەکەی سووتاوە. عومەر وشەکانی لێکدایەوە و پەیوەستی کرد بەواتا و ناوەڕۆکیانەوە، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ناوی سوهەیلی لێکدایەوە بەوەی کاریان ئاسان دەبێ لەڕۆژی حودەیبییەدا، هەروەهاش دەرچوو. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی بەئوممەتەکەی دا ناویان جوان بکەن، هەواڵیشی پێدان کە لەڕۆژی قیامەتدا بەو ناوەوە بانگ دەکرێن.

تۆش رابمێنە چۆن لەوەسفی پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) دوو ناوی بۆ داڕێژراوە رێك و تەواون بەواتاکەی. ناوی ئەحمەد و موحەممەد، موحەممەدە لەبەر زۆریی سیفەتی ستایش تیایدا، ئەحمەدیشە لەبەر گەورەیی و فەزڵی بەسەر سیفەتەکانی تردا.

کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هاتە مەدینە و ئەو شارە پێیدەوترا (یثرب-سەرزەنشت و خراپ) و هەر ئەو ناوەی هەبوو، گۆڕی بۆ (طَيبة-چاك، پاك و بێگەرد).

رابمێنە لەناوی ئەو شەش کەسەی لەڕۆژی بەدردا چوونە مەیدان، چۆن ناوەکانیان گونجاو بەحاڵوباری ئەو رۆژەیان بوو، ئەوانەی بێباوەڕان ناویان شەیبە(پیر) و عوتبە و وەلید(تازە لەدایکبوو) بوون، سێ ناوی لاواز، وەلید سەرەتای لاوازی، شەیبەش کۆتایی لاوازیی کە پیر و پەکەوتەییە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٖ قُوَّةٗ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗ ﴾ **الروم: ٥٤** ،واتا: خوا زاتێکە ئێوەی دروستکردووە لە لاوازی(لاوازی نوتفە و بێچوو منداڵی شیرە خۆر)پاشان دوای لاوازی بەهێزی کردون(بوون بەلاو)لەدوای بەهێز کردنتان لاواز و پیرتان دەکات.

عوتبە واتا سەرزەنشت و شکست، بۆیە ناوەکانیان سەرزەنشتیی بەسەریاندا هێنا و لاوازییەکیش بوو سەرەنجامیانی لەنێوبرد.

ئەو سێ کەسەی موسڵمانانیش کە لەبەرانبەریاندا دەرچوونە مەیدان، عەلی و عوبەیدە و حارث بوون، سێ ناو گونجاو بەوەسفیان بوون کە بڵندی و بەندایەتی و هەوڵدانە، بەبەندایەتییان لەدونیا و هەوڵدانیان بۆ ئاخیرەت، بەسەر ئەو سێ بێباوەڕەدا سەرکەوتن.

لەبەر ئەوەی ناو کاریگەریی هەیە بۆ ناولێنراو، ئەوە خۆشەویسترین و شیرینترین ناوێك بەلای خوای گەورەوە عەبدوالله و عەبدولڕەحمانە، عەبدولڕەحمان بەلای خوای گەورەوە خۆشترە لەعەبدولقادر، خوای گەورە وەسفی ئەلڕەحمانی بەلاوە شیرینترە لەعەبدولقادر، عەبدوالله بەلایەوە شیرینترە لە عبد ربە، چونکە ئەو پەیوەستەییەی لەنێوان بەندە و خوادایە بریتییە لەبەندایەتی و عبودییەتی پەتی و تەواو، ئەو پەیوەندییەش کە لەنێوان خوا و بەندەدایە بەسۆز و بەزەییەکەی تەواو پەتی، ئەو ئامانجەی کە لەبەدیهێنانی مرۆڤدا هەیە، ئەوەیە مرۆڤ بەخۆشویستن و ترسەوە خوای گەورە بپەرستێ و مافی خوایەتیی بدات، مرۆڤ بەو کارە دەبێتە بەندەی الله، کە پێیدەوترێت عەبدوالله، واتا ئەستەمە جگە لەخوا بەندایەتیی بۆ هیچ مەخلوقێك بکات. لەبەرئەوەی بەزەیی خوا بەسەر تووڕەییدا زاڵبووە، ئەوە بەلایەوە بەزەیی خۆشەویسترە لەتووڕەیی، بۆیە عەبدولڕەحمانی بەلاوە خۆشەویسترە لەعەبدولقەهار.

**بەش**

لەبەر ئەوەی هەموو بەندەیەك بەپێی ئیرادە دەجولێتەوە، هیممەتیش بنەمای ئیرادەیە و کێلاندن و هەوڵی لەسەر ئیرادەی دەوەستێتەوە، ئەوە خۆشەویسترین ناوێك بەلای خوای گەورەوە بریتییە لەناوی(همَّام و حارث). لەبەر ئەوەی دەسەلات و موڵك و پادشایەتیی راستەقینە هی خوای گەورەیە، ئەوە سووکترین و نزمترین ناوێك بەلای خوای گەورەوە ناوی(شاهەنشا)یە، واتا: پادشای پادشایان و سوڵتانی سوڵتانەکان. هەندێ ئەهلی زانستیش نازناوی دادوەری دادوەران بەکاردەهێنن. ئەڵێ: هیچ کەسێ دادوەری دادوەران نییە تەنیا خوای گەورە نەبێ کە بڕیاری هەرشتێك بدات دێتەدی.

ئینجا ئەو ناوەی قێزەونی و سووکیی هەبێ و لەدوای ئەوانەی پێشتر باسکران، ناوی: گەورەی خەڵکی، گەورەی هەموانە، ئەوەش تەنیا تایبەتە بەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:"أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا فَخْرَ"[1]،واتا: من گەورەی کوڕانی ئادەمم لەڕۆژی قیامەتدا و شانازییش نییە.

**بەش**

لەبەر ئەوەی الحرب(جەنگ) و المُرة(تاڵ) لای مرۆڤ ناخۆش و ناشیرینە، ئەوە بوونەتە دوو وشەی ناشیرین، بۆ هاوشێوەکانیشیان هەروا، ئەو ناوانە کاریگەرییان بەسەر ناولێنراوەوە هەیە، هەروەك حزن(خەفەت) کاریگەریی هەبوو لەسەر سەعیدی کوڕی ئەلموسەیب و بنەماڵەکەی.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٧٨).



**بەش**

هەرچی نەهیکردن بێ لەناولێنانی منداڵ بە یسار و أفلح و نجیح و رباح، بۆ ئەوەیە کە فەرموودەکە ئاماژەی پێکردووە "فَإِنَّكَ تَقُولُ أَثَمَّ هُوَ فَلاَ يَكُونُ فَتَقُولُ لاَ"[1]،واتا:ئەوتریێ فلانە شتتان تێدایە و تۆش ئەڵێی نە. ئەوە رەشبینی دەخاتەوە.

ئەو ناوانە رەشبینیی ئەهێنن، هەروەك بەکابرایەك بڵێی ئەریێ ئاسانت لایە یان سەرکەوت؟ ئەویش بڵێ: نە. رەشبینیی ئەکەوێتە سەر دڵی خۆت، بەتایبەت ئەوانەی هەمیشە رەشبین و بێزارن، بۆیە حیکمەتی خوای گەورە وەهای پێویست کردووە، قەدغەی بەکارهێنانی کۆمەڵێ ناو بکات کە ناخۆشی و بێزاریی بخەنە بەر گوێی مرۆڤ، ئەمەو سەرباری ئەوەی کۆمەڵێ توانج ئەخاتە پاڵ ناوەکە، کەسەکە ناونراوە ئاسان کەچی سەخت و گیرترین مرۆڤە.

کارێکی تر: ئەویش ئەوەیە داوای شتێك لەکەسێك بکرێ پڕ پێست بەناوەکەی بێ، کەسەکە ئەوەی لا نەبێ و پێی نەکرێ و ئەوە ببێتە هۆکار بۆ سەرزەنشتکردن و جنێوپێدانی.

کارێکی تر: گومانی کەسەکە بەوەی هەڵگری واتای ئەو ناوەیە و رەنگە وەهای لێبکات خۆی بەباش بزانێ و بەسەر خەڵکی تردا خۆی بەرز رابگرێت، ئەمە واتای ئەوەیە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهیکرد ناوببردرێ بە(بَرَّة– چاکەکار) و فەرمووی:"لاَ تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمُ اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ"[2]،واتا:خۆتان پاك رامەگرن و وەهای پیشان مەدەن چاکەکارن، ئەوە خوای گەورەیە لەئێوە باشتر چاکەکار دەناسێت.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٣٧).

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٤٢).

## بەش

هەرچی کونیەیە، ئەوە ڕێزە بۆ خاوەن کونیە و ئاماژە بۆ کردنی، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کونیەی ئەبا تورابی لەعەلی نابوو(خوای لێ رازیی بێ)، برایەکی ئەنەسی کوڕی مالیکی بەکونیەی ئەبی عومەیر ناودەبرد کە هێشتا منداڵ بوو، پێنەگەیشتبوو.

لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوە بوو کونیەی لەهەموو کەس دەنا، منداڵی هەبووایە یان نەبووایە، تەنیا نەهی کرد کونیەی ئەبا ئەلقاسم بەکاربهێنرێت، بەدروست لێیەوە هاتووە فەرموویەتی:"تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكَنَّوا بِكُنْيَتِي"[1]،واتا: ناوم لەمنداڵ بنێن، بەڵام کونیەم بەکارمەهێنن. خەڵکیی لەوەدا جیاوازبوونە و چوار بۆچوونیان بۆ دروست بووە:

یەکەم: بەڕەهایی جائیز نییە کونیەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەکاربهێنرێت کە(ئەبا ئەلقاسم)ە، جا بەتەنیا بەکاریبهێنێ یان لەگەڵ ناوەکەیدا، کەسەکە زیندوو بێ یان مردوو، گشتگیری و ڕەهایی ئەم فەرموودە سەحیحەیان بۆ بووەتە بەڵگە.

دووەم: نەهیکردن لەکۆکردنەوەی ناو و کونیەکە پێکەوە، جا ئەگەر کەسێك ناوەکەی بەکارهێنا بەبێ کونیەکە یان کونیەی بەکارهێنا بەبێ ناوی موحەممەد، ئەوە کێشەی تیادا نییە، ئەبو داوود ئەوەی وتووە لە☹باب من رأى ألا يجمع بينهما- بەشی ئەوەی وەهای بینیووە پێکەوە کۆنەکرێنەوە) پاشان باسی فەرموودەکەی ئەبی ئەلزوبەیری کردووە لەجابرەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"مَنْ تَسَمَّى بِاسْمِي فَلاَ يَتَكَنَّ بِكُنْيَتِي، وَمَنْ تَكَنَّى بِكُنْيَتِي فَلاَ يَتَسَمَّ بِاسْمِي"[2]،واتا:هەرکەسێ ناوی منی لەمنداڵی نا با کونیەی منی لەگەڵدا

---

[1]- بوخاری(٦١٧٨) و موسلیم(٢١٣٤) ئیخراجیان کردووە.
[2]- ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٩٦٦).

بەکارنەهێنێ، هەرکەسێکیش کونیەی منی بەکارهێنا با ناوی من لەمنداڵی نەنێت.

ترمیزیی گێڕاویەتییەوە و ئەڵێ: فەرموودەیەکی(حسن غريب)ە[1]، هەر ترمیزیی گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی موحەممەدی کوڕی عجلانەوە ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: (حسن صحيح)ە[2].

سێیەم: جائیزە هەردووکی کۆبکرێتەوە،ئەوە گوازراوەتەوە لەمالیکەوە[3]، خاوەنانی ئەم بۆچوونە بەڵگەیان ئەوەیە کە ئەبو داوود و ترمیزی گێڕاویانەتەوە لەعەلییەوە وتوویەتی: وتم: ئەی پەیامبەری خوا، ئەگەر لەدوای تۆ کوڕێکم بوو، ئاساییە ناوی تۆی لێ بنێم و کونیەی تۆ هەڵبگرم؟ فەرمووی: بەڵێ. ترمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی(حسن صحيح)ە[4].

چوارەم: هەڵگرتنی کونیەی ئەبا ئەلقاسم لەژیانی پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) قەدەغە بوو، لەدوای کۆچی دواییکردنی جائیزە، هۆکاری نەهییەکە ئەوەیە تایبەت بووە بەژیانییەوە، چونکە لەسەحیحدا سەلماوە لەفەرموودەیەکی ئەنەسەوە وتوویەتی: پیاوێك لەبەقیعدا بانگیکرد و وتی: ئەی ئەبا ئەلقاسم. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لای کردەوە. پیاوەکە وتی: ئەی پەیامبەری خوا بانگی بەڕێزتم نەکرد، بەڵکو لەگەڵ فلانە کەسم بوو، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلَا تَكَنَّوا بِكُنْيَتِي"[5]،واتا: ناوی من هەڵبگرن بەڵام کونیەی من بەکارمەهێنن.

دروست: ناونان بەناوی موحەممەد جائیزە، هەڵگرتنی کونیەکەی قەدەغە کراوە، قەدەغەبوونەکە لەژیانی خۆیدا توندتر بووە، لەلایەن پەیامبەر(صلى الله عليه

---

[1] - ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٨٤٢).

[2] - ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٨٤١).

[3] - المنتقى للباجي٧/ ٢٩٦

[4] - ترمیزی(٢٨٤٣) و ئەبو داوود(٤٩٦٧) ئیخراجیان کردووە.

[5] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٢١٢١).

وسلم)ەوە کۆکردنەوەی هەردووکیان(ناو و کونیەکەی) قەدەغەیە، لەسەر دروستیی فەرموودەکەی عەلی(خوای لیّ رازیی بیّ) تێبینی هەیە، لەترمیزییدا لەبواری تەسحیحکردندا جۆریّ ئاسان وەرگرتن هەیە، بێگومان عەلی وتوویەتی: ئەوە مۆڵەتە بۆ ئەو، جا ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی بۆ غەیری عەلی قەدەغەیە، خواش زاناترە.

## بەش

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهی کردووە لەناونانی تریّ(العنب)بە(كَرْم)[1]، فەرموویەتی:"الكَرْمُ قَلْبُ المُؤمِنِ"[2]،واتا: بەخشندە و سەخاوەتی، دڵی مرۆڤی باوەڕدارە. لەبەر ئەوەی وشەی(كَرْم) بەڵگە دەدات لەسەر خێر و سوودی زۆر، ئەوە دڵی بەندەی باوەڕدار شایستەیە بەو ناوە نەك دار مێو.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"لَا تَغْلِبَنَّكُمُ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمْ، أَلَا إِنَّهَا الْعِشَاءُ وإنهم يُسَمُّونَهَا الْعَتَمَةَ"[3]،واتا:ئەعراب زاڵ نەبن بەسەرتاندا لەناوی نوێژەکەتان کە نوێژی عیشایە و ئەوان پێی ئەڵێن(الْعَتَمَةَ —تاریکایی). بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"لَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ، لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا"[4]،واتا: ئەگەر ئەیانزانی لەنوێژی عیشا(الْعَتَمَة) و بەیانییدا چی خێر و فەزڵێك هەیە، ئەوە بەگاگۆڵکیّ بۆی دەهاتن. وتراوە: ئەمە نەسخی قەدەغەیە، وتراوە بەپێچەوانەوەیە، دروست پێچەوانەی هەردوو بۆچوونە، چونکە مێژووی هیچ یەك لەو دوو فەرموودەیە نازانرێت و دژیەکییش لەنێوان هەردوو

---

[1] – بوخاری(٦١٨٢) ئیخراجی کردووە.

[2] – بوخاری(٦١٨٣) و موسلیم(٢٢٤٧) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بوخاری(٥٦٣) ئیخراجی کردووە لەفەرموودەیەکی عەبدوڵڵەی کوڕی موغەفیلی ئەلموزنی و موسلیم(٦٤٤) لەفەرموودەیەکی ئیبن عومەرەوە.

[4] – بوخاری(٦١٥) و موسلیم(٤٣٧) ئیخراجیان کردووە.

فەرموودەدا نییە، چونکە بەتێکڕایی نەهی نەکردووە لەبەکارهێنانی وشەی(الْعَتَمَةِ)، بەڵکو نەهی کردووە لەوەی دەستبەرداریی وشەی عیشا بکرێت کە وشەیەکە خوای گەورە لەقورئانەکەیدا باسی کردووە و ناکرێ دەستبەرداریی لێ بکرێت و وشەی(الْعَتَمَةِ) بەسەریدا زاڵ بێت، بۆیە ئەگەر بەو کاتە بووترێ عیشا و هەندێجاریش پێیبووترێت (الْعَتَمَةِ) کێشەی تێدا نییە، خواش زاناترە.

ئەمە پارێزگاریکردنە لەلایەن پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ەوە لەو ناوانەی کە خوای گەورە خواپەرستییەکانی پێ ناوبردووە، ناکرێ دەستبەردارییان لێ بکرێت و وشەی تریان بەسەردا زاڵ بکرێت، هەروەک ئەوانەی دواتر کردوویانە و بەهۆیەوە وازیان لەوشە و بێژەی دەقەکان هێناوەو زاراوەی تازەیان بەسەریاندا پێشخستووە، بەهۆی ئەوەشەوە نەفامی و نەزانییەك دروست بووە هەر خوا پێی زانایەو قەبارەی زیانەکەی دەزانێت.

## ١٦-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەپاراستنی مەنتیق و هەڵبژاردنی وشەکان

لەوتارەکانیدا بێژەی هەڵدەبژارد،بۆ ئوممەتەکەی جوانترین و ناسکترین و ڕێکترین وشەی هەڵدەبژارد، وشەیەکی هەڵدەبژارد دوور بووایە لەوشەی زبر و ناڕوون، قسەی پیس و ناخۆشی بەکارنەدەهێنا و هاوار و هەرای نەبوو، لەقسەدا زبر و توند نەبوو. حەزی نەدەکرد وشەیەکی گەورە دەرهەق بەکەسێ بەکاربهێنێ شیاوی نەبێ، یان حەزی نەدەکرد وشەیەکی زبر دەرهەق بەکەسێ بەکاربهێنێ شایستەی نەبێ.

لەنمونەی یەکەم: ڕێگریی دەکرد بەکەسی دووڕوو بووترێت"گەورەمان"، فەرموویەتی:"فَإِنَّهُ إِن يَكُ سَيِّدًا فَقَد أسخَطتُم رَبَّكُم عَزَّ وَجَلَّ"[1]،واتا:ئەگەر ئەمە

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٩٧٧).

گەورەتان بێ، ئەوە خوای پەروەردگارتان تووڕە کردووە. ڕێگریی کردووە بەئەبو جەهل بووترێ ئەبو ئەلحەکەم، هەروەها ناوی ئەبو ئەلحەکەمی هاوەڵی گۆڕیی بۆ ئەبو شورەیح و فەرمووی:"إِنَّ اللَّهَ هُوَ الحَكَمُ، وَإِلَيْهِ الحُكْمُ"[١]،واتا:خوای گەورە بڕیاردەرە و بڕیار بۆ ئەو دەگەڕێتەوە و لای ئەوە.

هەروەها نەهی کردووە کۆیلە بەگەورەکەی چی ژن بێ یان پیاو بڵێ(ربي وربَّتي)، یان خاوەن کۆیلە بەکۆیلەکەی بڵێ(عبدي– بەندەکەم)، بەڵکو خاوەن کۆیلە بڵێت: کوڕە لاوم و کچە لاوم. کۆیلەش بڵێ: گەورەم، خاتوونم[٢].

هەروەها فەرمایشتی بەو وتاربێژەی کە وتی: هەرکەسێ گوێڕیەڵی خوا و پەیامبەری خوا بێ ئەوە ڕێنیشاندەریی وەرگرتووە، هەرکەسێکیش سەرپێچییان بکات وێڵ و سەرگەردان بووە. فەرمووی:"بئسَ الخطيبُ أنت"[٣]،واتا: تۆ خراپترین وتاربێژێکی.

لەنمونەی فەرمایشتی:"لَا تَقُولُوا مَا شَاءَ اللهُ وَشَاءَ فُلَانٌ، وَلَكِنْ قُولُوا مَا شَاءَ اللهُ ثُمَّ شَاءَ فُلَانٌ"[٤]،واتا: مەڵێن ئەگەر خوا و فلاَن ویستیان لێ هەبێ، بەڵکو بڵێن ئەگەر خوا ویستی هەبێ پاشان فلاَنە کەس.

هەرچی بەشی دووەمە، وتنی وشەی سەرزەنشتکار بۆ کەسێ شایستە بەو قسەیە نەبێ، بۆ نمونە نەهیکردووە قسە بە کات بووترێت و فەرموویەتی:"فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْرُ"[٥]،واتا: کات بەدەست خوای گەورەیە هەڵیدەسووڕێنێ.

لەوەدا سێ خراپە هەیە:

یەکەم: جنێودان و قسە وتن بەشتێك شیاو بەجنێو پێدان نییە، چونکە کات لەلایەن خواوە دروستکراوە و ملکەچی فرمانی خوای گەورەیە.

---

[١]– ئەبو داوود(٤٩٥٥) و نەسائی(٥٣٨٧) ئیخراجی کردووە.

[٢]– ئەبو داوود(٤٩٧٥) ئیخراجی کردووە.

[٣]– موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٧٠).

[٤]– ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٩٨٠).

[٥]– بوخاری(٦١٨٢) و موسلیم(٢٢٤٦) ئیخراجیان کردووە.

دووەم: جنێودان بەکات هاوبەش پەیداکردن لەخۆدەگرێت، چونکە ئەو کەسەی جنێو بەکات دەدات، وەها گومان دەکات کات سوود و زیانی بەدەستە.

سێیەم: جنێودانیان بەهۆی رووداني کارێکەوە، ئەگەر لەو کارەدا حەق بەپێی ئارەزووی ئەوان هەڵبسووڕێیایە، ئەوە ئاسمانەکان و زەوی بەسەر یەکدا کاول دەبوو، بەڵام کە کات هیچی بەدەست نییە، ئەوە جنێودانیان بەکات جنێودانە بەخوای گەورە، بۆیە ناڕەزایی و ئازارە بۆ خوای گەورە.

لەمەدا پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: تَعِسَ الشَّيْطَانُ فَإِنَّهُ يَتَعَاظَمُ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الْبَيْتِ، فَيَقُولُ: بِقُوَّتِي صَرَعْتُهُ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ، فَإِنَّهُ يَتَصَاغَرُ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الذُّبَابِ"[1]،واتا: هیچ یەك لەئێوە نەڵێ چارەڕەش بێ شەیتان، بەو قسەیە گەورە دەبێ وەك خانوویەك زل دەبێ و ئەڵێ: بەهێزی خۆم دام بەزەویدا، بەڵكو با بڵێ: بسم الله، بەوە ئەوەندە بچووك دەبێتەوە تاوەکو ئەندازەی مێشێك.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕێنمایی هەرکەسێکی کردووە شەیتان بەشتێك مەس و دەستی لێ وەشاندووە کە یادی خوا بکات و بسم الله بکات و پەنا بەخوا بگرێ لەشەیتان، ئەوە سوود بەو کەسە دەگەیەنێ و شەیتانیش تووڕە ئەکات.

هەروەها نمونەیەکی تر، نەهیکردنی لەوەی کەسێك بڵێ: دەروونم پیس بووە"خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلْيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي"[2]،واتا: بەڵكو با بڵێ دەروونم ڕەق بووە. وشەی پیسی ڕەتکردووەتەوە، چونکە ناشیرینی و نابووتیی تێدایە.

لەوانە: نەهیکردووە کەسێ لەدوای لەدەستدەرچوونی کار بڵێ: ئەگەر وەها و وەهام دەکرد. بۆیە ڕێنمایی دەکات بۆ وتنی ئەوەی سوودی پێ دەگەیەنێ، با بڵێ:"قَدَّرَ

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٩٨٢).

[2] – بوخاری(٦١٧٩) و موسلیم(٢٢٥٠) ئیخراج کردووە.

اللهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ"[1]،واتا: قەدەری خوایە، چی بووێ ئەوە دەكات. چونكە لە ئەگەر(لو) ئەوە هەیە، ئەگەر ئەوەی لەدەروونی خۆیدایە ئەوە روویبدابایە، ئەوە شتێكی تر رووی دەدا جیاواز لەوەی خوای گەورە بڕیاری داوە و ویستی روودانی هەبووە. جا لەو قسەیەدا ئەگەر لەبەدرۆخستنەوەی قەدەر رزگاری بێ، ئەوە لەبەرهەڵستیكردن و ناڕەزاییبوونی بەرانبەر خوای گەورە رزگاری نابێ كە ئەڵێ: ئەگەر ئەوەم بكردبایە، ئەوە ئەوەم لادەبرد كە خوای گەورە بۆ منی ئەندازە و قەدەر كردبوو.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی كردووە(٢٦٦٤).

## هەشتەم: بەشی زیکر و یاد

### ١- ڕێنمایی و ڕێبازی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەیادکردنەوەی خوای گەورەدا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کاملترین خەڵکیی بوو لەزیکر و یادی خوای گەورەدا، نەك هەر ئەوە، بەڵکو تەواوی فەرمایشتەکانی، یادی خودا و ئەوە بوو خودا پێی خۆشبوو، فرمان و نەهی و تەشریعی بۆ ئوممەت یادێکی بوو بۆ خوای گەورە. هەواڵدانی لەبارەی ناو و سیفەت و حوکم و کردارەکانی خوای گەورە و موژدە و هەڕەشەکانی، یادێك بوون لەخۆیەوە بۆ خوای گەورە. ستایشی خۆی بۆ خوای گەورە بەباسکردنی خوایەتیی الله و شکۆدارکردن و سوپاس و تەسبیحاتکردنی، یادێکە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) بۆ خوای گەورە. تکا و داوای لەخوای گەورە بەویست و ترسەوە، یادێکی بوو بۆ خوای گەورە، بێدەنگ و کپبوونی یادێکی بوو بۆ خوای گەورە لەدڵەوە ئەنجامی دەدا. لەهەموو کات و حاڵوباریدا یادکەرەوەی خوای گەورە بوو. یادی خوا لەهەناسەی و ڕۆیشتن و سواربوون و دانیشتن و پاڵکەوتن و ڕاوەستانیدا ئامادەیی هەبوو.

کە لەخەو هەڵدەستا ئەیفەرموو:"الحَمْدُ للهِ الذي أحْيَانَا بَعْدَ مَا أمَاتَنَا وَإلَيْهِ النُّشُورُ"[١]، واتا: سوپاس بۆ خوا کە زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی مراندینی و گەڕانەوەشمان هەر بۆلای خۆیەتی.

عائیشە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە لەخەو رادەپەڕی دە جار(الله أكبر)ی دەکرد، دە جار(الحمد لله) و دە جار(سبحان الله وبحمده) و دە جار(سبحانَ الملكِ القدوس) و دە جار(استغفر الله) و دە جار (لا إله إلا الله) و پاشان دە جار ئەیفەرموو:"اللهُمَّ إني أعوذُ بك من ضيقِ الدنيا، وضيقِ يوم

---

[١]- بوخاری(٦٣٢٤) و موسلیم(٢٧١١) ئیخراجیان کردووە.

القيامة"،واتا: خوایه گیان پەنات پێ دەگرم لەسەختیی دونیا و لەسەختیی ڕۆژی قیامەت. پاشان نوێژی دەستپێدەکرد[1].

هەواڵیشی داوە ئەگەر هەرکەسێك لەشەودا لەخەو هەڵسا بڵێ:" لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" الحَمْدُ لله، وَسُبْحَانَ الله، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ" پاشان بڵێ: خوایه گیان لێم خۆش بە"اللهمَّ اغْفِرْ لِي" یان بپاڕێتەوە، ئەوە خوای گەورە داوای قبوڵ دەکات، ئەگەر دەستنوێژێ بشۆرێ و نوێژ بکات، نوێژەکەی قبوڵ دەکرێت" بوخاری باسیکردووە[2].

ئیبن عەباس(خوای لێ ڕازیی بێ) لەبارەی پەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) ئەگێڕێتەوە سەبارەت بەو شەوەی لای بووە و ئەڵێ: کە لەخەو هەڵسا سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و دە ئایەتی کۆتایی سورەتی ئالی عیمرانی خوێندەوە، پاشان فەرمووی:"اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ إلهي،و لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ العلي العظيم"[3].،واتا: خوایه گیان سوپاس و ستایش تەنیا بۆ تۆ، تۆ ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەشی کە تیایدان، سوپاس و ستایش تەنیا بۆ تۆ، تۆ ڕاگری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەشی کە تیایدان، سوپاس و ستایش تەنیا بۆ تۆ تۆ حەق و ڕاستییت، بەڵێنت حەقە، گەیشتنە

---

[1] – ئەبو داوود(٥٠٨٥) و نەسائی(١٦١٧) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری گێڕاویەتییەوە(١١٥٤).

[3] – بوخاری(١٨٣) و موسلیم(٧٦٣) ئیخراجیان کردووە.

دیدارت حەقە، فەرمایشتت حەقە، بەهەشت حەقە، دۆزەخ حەق و راستە، پەیامبەران حەق و راستین، موحەممەد حەقە، قیامەت حەقە، خوایە گیان من وا ملکەچی تۆ بووم، باوەڕم بە تۆ هێنا، تەنیا پشتم بە تۆ بەستووە، تەنیا بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە، ناکۆکییم بۆلای تۆ دەهێنم و تۆ دەکەمە بڕیاردەر، لەتاوانی پێشووم و دواتریش خۆش ببە، لەوەی نهێنی و ئاشکرایە، تۆ خوای منی، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە تۆ، هیچ هێز و گۆڕانکارییەك نییە بەبێ ویستی خوای گەورە.

عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە لەخەو هەڵدەستا ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وإسرافيل، فاطر السموات وَالْأَرضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ"[1]،واتا: خوایە گیان ئەی پەروەردگاری جبریل و میکائیل و ئیسرافیل، داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای نادیار و دیاری، تۆ بڕیار لەنێوان بەندەکانت دەدەی لەوەی تیایدا جیاواز و ناکۆکن، رێنماییم بکە بۆ ئەو شتەی حەقە و تیایدا جیاوازیی هەیە و بەمۆڵەتی خۆت رێنیشاندەرییم بکە، ئەوە تۆی کێت بووێ رێنیشاندەریی دەکەی بۆ حەق و راستی.

کە لەماڵ دەردەچوو ئەیفەرموو:" بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ، اللَّهُمَّ إني أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ، أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ"[2]،واتا: بەناوی خوا و تەنیا پشتم بەستە خوا، خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لەوەی ببمە مایەی گومڕایی خەڵك یان گومڕا بکرێم، خەڵك لەخشتە بەرم یان لەخشتەم بەرن،

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٧٧٠).

[2] - ئەبو داوود(٥٠٤٩) و ترمیزی(٣٤٢٧) و ئیبن ماجە(٣٨٨٤) ئیخراجیان کردووە.

ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکەن، خەڵك نەفام و نەزان بکەم یان نەفام و نەزان بکرێم.

ئەیفەرموو:"مَنْ قَالَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، يُقَالُ لَهُ:هُدِيتَ و ووُقِيتَ وكُفِيتَ، وَتَنَحَّى عَنْهُ الشَّيْطَانُ"،واتا: ئەگەر یەکێ لەماڵ دەرچوو وتی: بِسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ. ئەوە پێیدەوترێت: وا ڕێنیشاندەریی کرای و پارێزرایت و خوات بەسە. شەیتانیش لێی دوور دەگرێت. فەرموودەیەکی حەسەنە[1].

ئیبن عەباس لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) ئەگێڕێتەوە لەو شەوەی لای مابوویەوە ئەڵێ: دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی و ئەیفەرموو:"اللهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً، واجْعَلْ فِي لِسَانِي نُوراً، وَاجْعَلْ فِي سَمْعِي نُوراً، واجْعَلْ فِي بَصَرِي نُوراً، واجْعَلْ مِنْ خَلْفِي نُوراً، ومِنْ أَمَامِي نُوراً، واجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُوراً، وَاجْعَلْ مِنْ تَحْتِي نُوراً، اللهُمَّ أَعْظِمْ لِي نُوراً"[2]،واتا: خوایە گیان نور و ڕووناکیی بخەرە دڵمەوە،ڕووناکیی بخەرە سەر زمانم، ڕووناکیی بخەرە گوێ و بینین و پاش و پێشمەوە،ڕووناکیی بخەرە سەر و خوارمەوە، خوایە گیان ڕووناکییم بۆ گەورە بکە.

هەروەها پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێ لەئێوە چووە مزگەوت و وتی:"أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ"،واتا: پەنا دەگرم بەخوا و ڕووی پیرۆزی خوا و دەسەڵاتی لەپێشینەی خوا لەشەیتانی نەفرەت لێکراو. ئەگەر ئەوەی وت، ئەوە شەیتان ئەڵێ:"حُفِظَ مِنِّي سَائِرَ الْيَوْمِ"[3]،واتا: تەواوی ڕۆژەکەی خۆی لە من پاراست.

---

[1] – ئەبو داوود(٥٠٩٥) و ترمیزی(٣٤٢٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٦٣١٦) و موسلیم(٧٦٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٦٦).

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ – صلى الله عليه وسلم – وَلْيَقُلِ" اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ،وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلِ:اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ"[1]،واتا: ئەگەر یەکێ لەئێوە چووە مزگەوتەوە با سەلام بکات و سەلاوات بۆ من بنێرێ و بلێ(اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ)،واتا:خوایە گیان دەرگاکانی بەزەیی خۆتم بۆ بکەرەوە، کە دەرچوو بلێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)،واتا: خوایە گیان داوای فەزڵ و چاکەی خۆت دەکەم.

کە نوێژی بەیانیی دەکرد، لەشوێنی نوێژەکەی دادەنیشت تاوەکو خۆر هەڵدەهات و یاد و زیکری خوای گەورەی دەکرد. لەبەیانیبوونەوەدا ئەیفەرموو:"اللهمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ"،واتا:خوایە گیان بەناوی تۆوە بەیانیمان کردەوە و ئێوارەمان کردەوە،بە تۆوە دەژین و دەمرین و گەڕانەوەشمان هەر بۆلای تۆیە. فەرموودەیەکی سەحیحە[2].

ئەیفەرموو:"أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذَا الْيَوْمِ، وَخَيْرَ مَا بَعْدَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذَا الْيَوْمِ، وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَسُوءِ الْكِبَرِ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ، وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ"،واتا: بەیانییمان کردەوە و دەسەڵات هەر هی خوایە، سوپاس هەر بۆ خوایە، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە الله تاقانە و بێ هاوبەشە، دەسەڵات و ستایش هەر شایستە بەخۆیەتی، ئەندازەکاری هەموو شتێکە، خوایە گیان داوای خێر و خۆشیی ئەمڕۆت لێ دەکەم،هەروەها خێر و خۆشیی دواتری، پەنات پێ دەگرم لەشەڕو خراپەی ئەمڕۆ و شەڕو خراپەی دواتری، خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لەتەمبەڵی،لەخراپەی خۆبەزلزانی،خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لەسزای دۆزەخ و لەسزای ناو گۆڕ. کە

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٧١٣).

[2] – ئەبو داوود(٥٠٦٨) و ترمیزی(٣٣٩١) و ئیبن ماجە(٣٨٦٨) ئیخراجیان کردووە.

ئێوارەش دەهات ئەیفەرموو:"أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى المُلْكُ لِلَّهِ..."،واتا: ئێوارەمان کردەوە و موڵك و دەسەلاتیش هەر خوایە.........هەتا کۆتایی. موسلیم باسی کردووە[1].

ئەبو بەکر(خوای لێ رازیی بێ) بەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ی وت: کۆمەڵێ وشەم پێ بڵێ لەبەیانیان و ئێوارانداا بیڵێم، فەرمووی بڵێ:"اللهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوات والأَرْضِ، عَالِمَ الغَيْبِ والشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيءٍ وَمَلِيكَهُ وَمَالِكه، أَشْهَدُ أَنْ لا إلهَ إلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِك مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، وأَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفسِي سُوءاً أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ"،واتا: خوایە گیان ئەی داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای نادیار و دیار، پەروەردگار و خاوەن و پادشای هەموو شتێك، شایەتی دەدەم هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لەخۆت، پەنات پێ دەگرم لەخراپەی دەروونی خۆم، لەخراپە و هاوبەشیی شەیتان، پەنات پێ دەگرم لەوەی خراپەیەك بەسەر خۆمدا بهێنم یان پەلکێشی بکەم بۆ سەر موسڵمانێك. ئەوە بڵێ لەبەیانیان و ئێواران و ئەو کاتەی دەچیتە جێگەی خەو[2].

هەروەها پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ وَمَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ: بِسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ – ثَلاَثَ مَرَّاتٍ – إِلاَّ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ"،واتا: هەر کەسێك لەبەیانیان و ئێوارانی هەموو رۆژێکدا سێ جار بڵێ:"بِسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيءٌ فى الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ"،واتا: بەناوی الله کە هیچ شتێك لەگەڵ ناوی ئەودا ناتوانێ لەزەوی و ئاسماندا زیان بدات، الله کە بیسەر و زانایە. ئەوە لەو رۆژەدا هیچ شتێك زیانی لێ نادات. فەرموودەیەکی سەحیحە[3].

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧٢٣).

[2] – ئەبو داوود(٥٠٦٧) و ترمیزی(٣٣٩٢) ئیخراجیان کردووە.

[3] – ئەبو داوود(٥٠٨٨) و ترمیزی(٣٣٨٨) و ئیبن ماجە(٣٨٦٩) ئیخراجیان کردووە.

هەروەها فەرموویەتی: "رَضِيتُ بِاللهِ رَبَّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِينَاً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيَّاً، كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ أنْ يُرْضِيَهُ"، واتا: هەرکەسێ لەبەیانیان و ئێواراندا بڵێ: "رَضِيتُ بِاللهِ رَبَّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِينَاً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيَّاً"، واتا: رازیی بووم الله پەروەردگارم بێ و ئیسلام ئاییینم بێ و موحەممەدیش پەیامبەرم بێ. ئەوە مافە بەسەر خواوە ئەو کەسە رازیی بکات. ترمیزی و حاکم تەسحیحیان کردووە[1].

فەرموویەتی: هەرکەسێ بەیانیان و ئێواران بڵێ: "اللهُمَّ إنِّي أصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ، وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلائِكَتَكَ، وَجَمِيعَ خَلْقِكَ، أنَّكَ أنتَ اللهُ الَّذِي لاَ إلَهَ إلاَّ أنْتَ، وَأنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ"، واتا: خوایە گیان بەیانییم کردەوە و خۆت و فریشتەکانی هەڵگری عەرشی خۆت و هەموو فریشتەکان و بوونەوەران ئەکەمە شایەت کە هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لەخۆت و موحەممەدیش بەندە و پەیامبەری خۆتە. ئەگەر یەك جار ئەوە بڵێ، ئەوە یەك لەسەر چواری جەستەی لەدۆزەخ دەپارێزرێت، ئەگەر دوو جار بیڵێ نیوەی لەسووتانی دۆزەخ دەپارێزرێت، ئەگەر سێ جار بیڵێت، ئەوە خوای گەورە سێ لەسەر چواری جەستەی لەدۆزەخ بەدوور دەگرێت، ئەگەر چوار جار بیڵێت، ئەوە خوای گەورە لەدۆزەخ دەیپارێزێ. فەرموودەیەکی حەسەنە[2].

ئەفەرمووێ:هەرکەسێ بەیانیان وتی: "اللهُمَّ مَا أصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ أوْ بأحَدٍ مِنْ خَلْقِكَ، فَمِنْكَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ، لَكَ الحَمْدُ، وَلَكَ الشُّكْرُ"، واتا: خوایە گیان بەیانییم کردەوە و هەر نیعمەتێك لای من هەبێ یان لای بەندەکانت، ئەوە تەنیا لەلایەن خۆتەوەیە و هیچ هاوبەشێکت نییە، سوپاس و ستایش تەنیا شایستەیە بە تۆ. ئەوە سوپاسی رۆژەکەی کردووە، هەرکەسێکیش ئێواران بیڵێت، ئەوە سوپاسی شەوەکەی کردووە. فەرموودەیەکی حەسەنە[3].

---

[1] - ترمیزی(٣٣٨٩) و حاکم١/٦٩٩(١٩٠٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەبو داوود(٥٠٦٩) و ترمیزی(٣٥٠١) ئیخراجیان کردووە.

[3] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٠٧٣).

لەبەیانیان و ئێواراندا ئەم ویرد و دوعایانەی دەخوێند: "اللهُمَّ إنِّي أسْألُكَ العَافيَةَ في الدُّنْيَا والآخرَة، اللهُمَّ إنِّي أسْألُكَ العَفْوَ وَالعَافية في ديني وَدُنْيَايَ وَأهْلِي وَمَالِي، اللهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وآمنْ رَوْعَاتِي، اللهُمَّ احْفظْني منْ بَيْن يَدَيَّ، وَمنْ خَلْفِي، وَعَنْ يميني وَعَنْ شمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي"،واتا:خوایە گیان داوای سەرفرازیی و سەلامەتیت لێ دەکەم بۆ دونیا و ئاخیرەتم، داوای سەرفرازی و سەلامەتییت لێ دەکەم بۆ ئایین و دونیا و کەسوکار و سەروەت و سامانم، خوایە گیان عەیبەکانم داپۆشە و ترس و خەفەتم بڕەوێنەوە، خوایە گیان لەبەردەستی خۆم و لەپاش و لای ڕاست و چەپ و سەرەوە بمپارێزە، پەنا بەمەزنیی تۆ دەگرم لەهەر فێڵێك لێم بکرێت. حاکم تەسحیحی کردووە[1].

فەرموویەتی: هەرکەسێ لەئێوە بەیانیی کردەوە با بڵێ:"أصْبَحْنَا وَأصْبَحَ المُلْكُ للّه رَبِّ العَالَمِينَ، اللهُمَّ إنِّي أسْألُكَ خَيْرَ هذَا الْيَوْمِ: فَتْحَهُ وَنَصْرَهُ وَنُورَهُ وَبَركَتَه وَهِدَايَتَهُ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيهِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ"،واتا: بەیانییمان کردەوە و موڵك و دەسەڵاتیش هی (الله)یە کە پەروەردگاری هەردوو جیهانە، خوایە گیان داوای خێرو خۆشیی ئەمڕۆت لێ دەکەم، لەسەرکەوتن و ڕووناکی و بەرەکەت و ڕێنیشاندەریی ئەم ڕۆژە، هەروەها پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەمڕۆ و خراپەی دواتری. پاشان ئەگەر ئێوارەشی کردەوە با نمونەی ئەوە بڵێ. فەرموودەیەکی حەسەنە[2].

کە بەیانیی دەکردەوە ئەیفەرموو:"أصْبَحْنَا عَلَى فِطرَةِ الْإِسْلَامِ، وَكَلِمَةِ الْإِخْلَاصِ، وَدِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ، وَمِلَّةِ أبِينَا إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ"[3]،واتا: بەیانییمان کردەوە لەسەر سرووشتی ئیسلام و ئیخلاس و ئایینی موحەممەدی پەیامبەرمان و ئوممەتی ئیبراهیمی پەیامبەرمان کە یەکتاپەرست و ملکەچ بوو بۆ خوا و لەهاوبەش پەیداکەران نەبوو.

---

[1] – حاکم ئیخراجی کردووە١/٦٩٨(١٩٠٢).

[2] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٠٨٤).

[3] – ئەحمەد ئیخراجی کردووە٢٤/٧٧(١٥٣٦٠).

لێیەوە دەگێڕدرێتەوە کە بەفاتیمەی کچی فەرمووە:"مَا يَمْنَعُكِ أَنْ تَسْمَعِي مَا أُوصِيكِ بِهِ أَنْ تَقُولِي إِذَا أَصْبَحْتِ وَأَمْسَيْتِ: يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، وَلاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ"[1]، واتا: چی شتێك رێگریت ئەكات گوێبیستی ئەو ئامۆژگارییەم بی كە بە تۆی دەكەم تاوەكو لەبەیانیان و ئێواراندا بلێی" يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، وَلاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ"،واتا:ئەی خوای زیندوو، پەنا بۆ بەزەیی خۆت دەهێنم کە هەموو کاروباری ژیانم بۆ چاك بكەی و بۆ چاوتروكانێكیش بێ رادەستی دەروونی خۆمم نەكەی.

فەرموویەتی: گەورەی داوای لێخۆشبوون(سيد الاستغفار) ئەوەیە بەندە بڵێ:"اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ"هەرکەسێ بەیانیان بیخوێنێ و دڵنیابێ پێی، بمرێ لەو رۆژەیدا دەچێتە بەهەشت، هەرکەسێکیش ئێوارە بیخوێنێ دڵنیابێ پێی و شەوەکەی بمرێ دەچێتە بەهەشت[2] کە ئەڵێ: خوایە گیان تۆ پەروەردگاری منی، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لەخۆت، من بەندەی تۆم، بەوەی لەتوانامدا بێ لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆمم، پەنا بە تۆ دەگرم لەهەر خراپەیەك دامهێنابێ، دان بەنیعمەتی تۆدا دەنێم کە بە منت داوە، دان بەتاوانی خۆمدا دەنێم، خوایە گیان لێم خۆش بە، هیچ کەسێ لە تاوانەکان خۆش نابێ ئیللا تۆ نەبێ.

فەرموویەتی:"مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ مِئَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلاَّ مَنْ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ عَلَيْهِ"[3]،واتا: هەرکەسێ

---

[1] - بەزار(٦٣٦٨) و نەسائی لە الكبرى(١٠٣٣٠) و حاكم١/٧٣٠(٢٠٠٠) ئیخراجیان كردووە.

[2] - بوخاری ئیخراجی كردووە(٦٣٠٥).

[3] - بوخاری(٦٤٠٥) و موسلیم(٢٦٩٢) ئیخراجیان كردووە.

لەبەیانیان و ئێوارانداا ئەم ویرد و دوعایانەی دەخوێند:"اللهُمَّ إنِّي أسْألُكَ العَافيَةَ فِي الدُّنْيَا والآخِرَة، اللهُمَّ إنِّي أسْألُكَ العَفْوَ وَالعَافِيةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأهْلِي وَمَالِي، اللهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، اللهُمَّ احْفظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يمِينِي وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي"،واتا:خوایە گیان داوای سەرفرازیی و سەلامەتیت لێ دەکەم بۆ دونیا و ئاخیرەتم، داوای سەرفرازی و سەلامەتییت لێ دەکەم بۆ ئایین و دونیا و کەسوکار و سەروەت و سامانم، خوایە گیان عەیبەکانم داپۆشە و ترس و خەفەتم بڕەوێنەوە، خوایە گیان لەبەردەستی خۆم و لەپاش و لای راست و چەپ و سەرەوە بمپارێزە، پەنا بەمەزنیی تۆ دەگرم لەهەر فێڵێك لێم بکرێت. حاکم تەسحیحی کردووە[1].

فەرموویەتی: هەرکەسێ لەئێوە بەیانیی کردەوە با بڵێ:"أصْبَحْنَا وَأصْبَحَ المُلْكُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، اللهُمَّ إنِّي أسْألُكَ خَيْرَ هذَا الْيَوْمِ: فَتْحَهُ وَنَصْرَهُ وَنُورَهُ وَبَرَكَتَه وَهِدَايَتَهُ، وَأعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيهِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ"،واتا: بەیانییمان کردەوە و موڵك و دەسەڵاتیش هی (الله)یە کە پەروەردگاری هەردوو جیهانە، خوایە گیان داوای خێرو خۆشیی ئەمڕۆت لێ دەکەم، لەسەرکەوتن و رووناکی و بەرەکەت و رێنیشاندەریی ئەم رۆژە، هەروەها پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەمڕۆ و خراپەی دواتری. پاشان ئەگەر ئێوارەشی کردەوە با نمونەی ئەوە بڵێ. فەرموودەیەکی حەسەنە[2].

کە بەیانیی دەکردەوە ئەیفەرموو:"أصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الإسْلَامِ، وَكَلِمَةِ الإخْلَاصِ، وَدِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ، وَمِلَّةِ أبِينَا إبْرَاهِيمَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ"[3]،واتا: بەیانییمان کردەوە لەسەر سرووشتی ئیسلام و ئیخلاس و ئایینی موحەممەدی پەیامبەرمان و ئوممەتی ئیبراهیمی پەیامبەرمان کە یەکتاپەرست و ملکەچ بوو بۆ خوا و لەهاوبەش پەیداکەران نەبوو.

---

[1] – حاکم ئیخراجی کردووە١/٦٩٨(١٩٠٢).

[2] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٠٨٤).

[3] – ئەحمەد ئیخراجی کردووە٢٤/٧٧(١٥٣٦٠).

لێیەوە دەگێڕدرێتەوە فەرموویەتی: هەرکەسێ بەرگ و پۆشاکێ لەبەر بکات و بلێ:"الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ" ئەوە خوای گەورە لەتاوانی پێشووتری خۆشدەبێ[1].

بەدروست لێیەوە هاتووە دوو جار بەئوم خالیدی فەرمووە کاتێ بەرگێکی نوێی لەبەرکردووە، فەرموویەتی:"أَبْلِي وَأَخْلِقِي ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِقِي"[2]،واتا:بەتەمەن درێژییەوە لەبەری بکەی و بەرگی چاکتری بەدوادا لەبەر بکەی. بەتەمەن درێژییەوە لەبەری بکەی و بەرگی چاکتری بەدوادا لەبەر بکەی.

### ٣- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەکاتی چوونەوە ماڵ

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هیچ کات لەپڕێکدا خۆی نەکردووە بەماڵدا، بەڵکو کاتێ چووەتە ژوورەوە ئەوان بەگەڕانەوەی ئاگادار بوون، سەلامی لێیان دەکرد، کە دەهاتە ماڵەوە لەحاڵیانی دەپرسییەوە، ئەیفەرموو:خواردنتان هەیە"[3]، هەندێجاریش هیچ نەدەوت تاوەکو چی هەبووایە لەبەردەمی دادەنرا.

لەسووننەندا لێیەوە هاتووە فەرموویەتی:ئەگەر یەکێ چووە ماڵەوەی با بلێ:"اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمُولَجِ وَخَيْرَ الْمَخْرَجِ، بِسْمِ اللَّهِ وَلَجْنَا،وَعَلَى اللَّهِ رَبِّنَا توكلنا"پاشان سەلام لەماڵ و منداڵی بکات[4]،واتا:خوایە گیان داوای خێر و خۆشیی چوونە ژوورەوە و دەرچوونت لێ دەکەم، بەناوی خواوە وا چووینە ژوورەوە و پشتمان بەستە (الله)ی پەروەردگارمان.

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٠٢٣).

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٨٤٥).

[3] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١١٥٤).

[4] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٠٩٦).

لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ەوە هاتووە فەرموویەتی:"ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ رَجُلٌ خَرَجَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ وَغَنِيمَةٍ وَرَجُلٌ رَاحَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَرَجُلٌ دَخَلَ بَيْتَهُ بِسَلَامٍ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ"،واتا: سێ کەس لەلایەن خوای گەورەو کەفیلی و زامن کراون: کەسێك بۆ جیهاد لەپێناو خوای گەورە دەردەچێت، لەلایەن خواوە زامن کراوە هەتاوەکو خوا ئەیمرێنێ و ئەیخاتە بەهەشتەوە یان بەسەلامەتی و بەپاداشتی قیامەت و دەسکەوتەوە ئەگەڕێتەوە ماڵ، پیاوێکیش دەردەچێ بۆ مزگەوت لەزەمانەتی خوای گەورە دایە، پیاوێکیش بەسەلامەوە دێتەوە ماڵ ئەویش لەزەمانەت و سپاردەیی خوای گەورەدایە. فەرموودەیەکی سەحیحە[1].

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَذَكَرَ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ. وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ. وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ"،واتا:پیاوێك بێتەوە ماڵەوە و لەهاتنە ماڵ و خواردنیدا بسم الله بکات، شەیتان ئەڵێ: ئەمشە و مانەوە و خواردن بۆ ئێمە نییە، بەڵام ئەگەر لەهاتنەوە ماڵ بسم الله نەکات، شەیتان ئەڵێ: ئەمشەو دەتوانین لێرە بمێنینەوە، ئەگەر لەنان خواردندا خاوەن ماڵ بسم الله نەکات، شەیتان ئەڵێ: مانەوە و خواردنیشم بۆ هەیە. موسلیم باسیکردووە[2].

---

[1] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٤٩٤).

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠١٨).

## ٤- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەچوونە سەرئاو:

لەسەحیحەیندا سەلماوە کە لەکاتی چوونە سەرئاودا فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبُثِ وَالخَبَائِثِ"[١].

هەر لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) باس دەکرێت کە فەرموویەتی:"سِتْرُ مَا بَيْنَ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ إِذَا دَخَلَ الْكَنِيفَ أَنْ يَقُولَ بِسْمِ اللَّهِ"[٢]،واتا:ئەگەر کەسێ چووە سەر ئاو(ئاودەست) و (بسم الله)ی کرد، ئەوە جنۆکە عەورەتی ئەو کەسە نابینن.

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە کە لەکاتی میزکردندا پیاوێك سەلامی لێکردووە، وەلاّمی نەداوەتەوە.

لەسەرئاوکردندا نە ڕووی لەقیبلە کردووە نە پشتی لێ کردووە، نەهیکردووە لەڕووکردن و پشت کردن لەقیبلە، لەفەرموودەیەکی ئەبو ئەیوب و سەلمانی فارسی و ئەبو هورەیرە و مەعقیلی کوڕی ئەبو مەعقیل و عەبدوڵلاەی کوڕی ئەلحاریسی کوڕی جەزء ئەلزوبەیدی و جابری کوڕی عەبدوالله و عەبدوڵلاەی کوڕی عومەر، تەواوی ئەو فەرموودانە سەحیحن، هەر فەرموودەیەکی پێچەوانەی ئەوانە هەبن، یان لەسەنەدا کێشەیان هەیە یان واتا لاوازن.

کە لەئاودەست دەردەچوو ئەیفەرموو:"غُفْرَانَكَ"[٣].

---

[١]- بوخاری(١٤٢) و موسلیم(٣٧٥) ئیخراجیان کردووە.

[٢]- ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٢٩٧).

[٣]- ئەبو داوود(٣٠) و ترمیزی(٧) و ئیبن ماجە(٣٠٠).

## ٥- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) لەزیکری دەستنوێژدا

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە کە دەستی دەخستە ئەو قاپەی کە ئاوی تێدابوو، پاشان بەهاوەڵانی ئەفەرموو:"تَوَضَّؤُوا بِسْمِ اللهِ"[1]،واتا: بەناوی خواوە دەستنوێژ شۆردن دەستپێبکەن.

بەدروست لێیەوە هاتووە (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"مَن أَسْبَغَ الوُضُوءَ ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللَّه وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ"[2]،واتا: هەرکەسێ جوان دەستنوێژی شۆرد و پاشان وتی"أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللَّه وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ"ئەوە هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە و لەکام دەرگای بووێ دەچێتە ژوورەوە.

نەسائی بەئیسنادی سەحیح لەفەرموودەیەکی ئەبو موسای ئەشعەرییەوە باسی کردووە وتی:"ئاوی دەستنوێژم بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) هێنا و دەستنوێژی شۆرد، گوێم لێ بوو ئەپاڕایەو ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، وَوَسِّعْ لِي فِي دَارِي، وَبَارِكْ لِي فِي رِزْقِي"،واتا:خوایە گیان لێم خۆش بە وماڵەکەم بۆ فراوان بکە و بەرەکەت بخەرە ئەو رزقەی پێمی دەبەخشی. وتم: ئەی پەیامبەری خوا، گوێم لێت بوو دەپاڕایتەوە بۆ فلاَن شت و فلاَن شت. ئەویش فەرمووی: ئایە هیچ شتێکی ترم بەجێهێشتووە و نەم وتبێ[3].

---

[1]- نەسائی ئیخراجی کردووە(٧٨).

[2]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٣٤).

[3]- نەسائی لە السنن الکبری٩/٣٦(٩٨٢٨).



### ٦- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبانگدان و زیکرەکانیدا

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە، بانگدان ئەنجام دراوە بەدرێژکردنەوەی ئاوازی بانگەکە(ترجيع) و درێژنەکردنەوەی، ئیقامەی بەدووان و تاك(یەك جار وتن) داناوە، بەڵام ئەوەی لێیەوە بەدروست هاتووە، ئەوەیە دووجار بووترێت:"قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ"، بەدروست لێیەوە نەهاتووە هەرگیز بەیەك جار وترابێ، هەروەها بەدروست هاتووە لەسەرەتای بانگدا چوار جار وتراوە(الله أكبر) و بەدروست لێیەوە نەهاتووە کردبێتیە دوو جار.

رێباز و رێنمایی پەیامبەری ئازیز لەزیکری کاتی بانگدان و دوای بانگدا، ئەوە بۆ ئوممەتەکەی پێنج جۆری داناوە:

یەکەم: ئەوەی بیسەری بانگ هەمان وشەکانی بانگبێژ دووبارە بکاتەوە، تەنیا لە(حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَّاحِ) بەدروست لێیەوە هاتووە لەجیاتی ئەو دووانە فەرموویەتی(لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، ئەمە بەپێی حیکمەتی رێك و گونجاوە بەحاڵی بانگبێژ و ئەو کەسەی گوێی لەبانگە، هەردوو وتەی(حَيَّ) بانگکردنی بیسەرە تاوەکو بەدەم نوێژەوە بێت، بۆیە بووەتە سووننەت بۆ کەسی بیسەر کە لەڕۆیشتن و بەدەنگەوە چوونی ئەو بانگەوازە پشت بەخوای گەورە ببەستێ.

دووەم: بڵێ:"وأنا أشهدُ أن لا إله إلا الله، وأن محمداً رسول الله، رَضيتُ بالله ربًّا، وبالإسلام دينا، وبمحمد رسولا" هەواڵیشی داوە هەرکەسێ ئەوە بڵێ، ئەوە خوای گەورە لەتاوانەکانی خۆش دەبێ[1].

سێیەم: دوای لێبوونەوەی لەوەڵامدانەوەی بانگەکە،سەڵاوات لەسەر پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بدات و بگاتە سەڵاتی ئیبراهیمییە هەروەك ئوممەتەکەی فێرکردووە

---

[1] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٢٥).

بەو جۆرە سەلاواتی لەسەر بدەن. بێگومان هیچ سەلاواتێك نییە لەو سەلاواتە تەواوتربێ با بەخۆ بەزانا هەلكێشەرانیش شتی تر بلێن.

چوارەم: لەدوای سەلاواتدان لەسەر پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بلێ: "اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، إنك لا تُخلفُ الميعاد"[1].

پێنجەم: دوای ئەوە بۆ خۆی بپاڕێتەوە و داوا فەزڵی خوا بكات، ئەوە بۆی دێتەدی هەروەك لەسووننەندا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "قُلْ كَمَا يَقُولُونَ فَإِذَا انْتَهَيْتَ فَسَلْ تُعْطَهْ"[2]،واتا: ئەوە بلێنەوە كە بانگبێژ ئەیلێ، كە لێی بوویتەوە لەخوا داوا بكات پێت دەدرێت.

لەسووننەندا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "الدُّعَاءَ لا يُرَدُّ بَيْنَ الأذَانِ وَالإقَامَةِ"،واتا: پاڕانەوە لەنێوان بانگ و قامەتدا ڕەت ناكرێتەوە. وتیان: ئەی چی بلێین ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی: "سلوا الله العافيةَ في الدنيا والآخرةِ"،واتا: بۆ دونیا و ئاخیرەتتان داوای سەلامەتیی بكەن. فەرموودەیەكی سەحیحە[3].

٧- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەزیكركردن لەدەی زیلحیجەدا

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەدەی زیلحیجەدا زۆر دەپاڕایەوە و فرمانی دەكرد زۆر(لا إله إلا الله و الله أكبر و الحمد لله)بكرێت.

لێیەوە دەگێڕدرێتەوە كە لەنوێژی بەیانیی ڕۆژی عەرەفەوە تاوەكو عەسری كۆتا ڕۆژی تەشریق ئەیفەرموو: "اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ

---

[1]- بوخاری تەخریجی كردووە(٦١٤).

[2]- ئەبو داوود ئیخراجی كردووە(٥٢٤).

[3]- ئەبو داوود(٥٢١) و ترمیزی(٣٥٩٤) ئیخراجیان كردووە.



وَلِلَّهِ الْحَمْدُ"[1]، ئەمە و ئەگەرچی ئیسنادەکەی سەحیح نییە، بەلاّم کاری پێ دەکرێت.

شافیعی ئەڵێ: ئەگەر زیاتری کرد بڵێ☹الله أكبر كبيرا، والحمدُ لله كثيرا، وسبحانَ الله بكرةً وأصيلا، لا إله إلا الله، ولا نعبدُ إلا إياه مخلصين له الدينَ ولو كَرِهَ الكافرون، لا إلهَ إلا الله وحده، صدقَ وعدهَ، ونصرَ عبدَه، وهزمَ الأحزابَ وحدَه، لا إلهَ إلا الله واللهُ أكبر)ئەگەر ئەوەی بۆ زیاتر بکات باشترە[2].

**٨- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەزیکری کاتی بینینی مانگ**

باس دەکرێت لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ أهِلَّه علينا بالأمنِ وَالْإِيمَانِ، والسلامةِ وَالْإِسْلَامِ،رَبي وَرَبك الله"،واتا: خوایە گیان ئەم مانگەمان بەئارامی و ئیمان و سەلامەتی و ئیسلامەوە بۆ بهێنە، الله پەروەردگاری من و تۆیە. ترمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی حەسەنە[3].

لێیەوە دەگێڕدرێتەوە کە لەکاتی بینینی مانگدا فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ وَالإِيمَانِ،وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ،وَالتَّوْفِيقِ لِمَا نُحِبُّ وَتَرْضَى،رَبُّنَا وَرَبُّكَ اللَّهُ"،واتا: خوایە گیان بەسەرماندا هەڵیبێنی بەسەلامەتی و ئیمان و لەشساغی و ئیسلام و بۆ هەر شتێك ئێمە حەزمان پێی هەیە و جێی ڕازیبوونی تۆیە، ئەی مانگ پەروەردگاری تۆ و ئێمە هەر(الله)یە. دارمی باسیکردووە[4].

---

[1] – دارەقوتنی ٢/٣٩٠(١٧٣٧) و بەیهەقی لە الدعوات الكبير٢/١٦٥(٥٤٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] – الأم للشافعي٢/٥٢٠-٥٢١.

[3] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٤٥١).

[4] – دارمی ئیخراجی کردووە٢/١٠٥٠(١٧٢٩).

## ٩- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەپێش نانخواردن و دوای نانخواردن

کە دەستی ببردایە بۆ خواردن، دەیفەرموو(بسم الله)، بەو کەسەی نانی دەخوارد فرمانی دەکرد(بسم الله) بکات و ئەیفەرموو:"إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّه فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَقُولَ بِسْمِ اللَّه فِي أَوَّلِه فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللَّه فِي أَوَّلِه وَآخِرِه"،واتا: ئەگەر یەکێ لەئێوە نانی خوارد با (بسم الله) بکات، ئەگەر لەسەرەتادا(بسم الله)ی بیرچوو، با بڵێ:"بِسْمِ اللَّه فِي أَوَّلِه وَآخِرِه" فەرموودەیەکی سەحیحە[1].

دروست، واجیبە لەکاتی نانخواردندا(بسم الله) بکرێت.

کە خواردن لەبەردەستی هەڵدەگیرا، دەیفەرموو:"الْحَمْدُ لِلَّه حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيه، غَيْرَ مَكْفُورٍ وَلاَ مُوَدَّعٍ، وَلاَ مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا عَزَّ وَجَلَّ"، بوخاری باسیکردووە[2].

ئەیفەرموو:"الْحَمْدُ لِلَّه الَّذِي أَطْعَمَ وَسَقَى وَسَوَّغَهُ وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجًا"[3]،واتا:سوپاس و ستایش بۆ الله کە ئەو خواردن و خواردنەوەیەی پێ داوین و دەرچەشی بۆ کردووەتەوە. بوخاری لێیەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەیفەرموو:"الحمدُ لله الذي كفانا(وأروانا)"[4]،واتا: سوپاس و ستایش تەنیا بۆ الله کە هەموو شتێکی پێ داوین و تینوێتی شکاندووین.

ترمیزی لێیەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:: «مَنْ أَكَلَ طَعَامًا فَقَالَ الْحَمْدُ لِلَّه الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِه»واتا: هەرکەسێ نانێکی خوارد و وتی: « الْحَمْدُ لِلَّه الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ »واتا:سوپاس و ستایش تەنیا بۆ الله کە ئەم خواردنەی پێ دام بەبێ ئەوەی هیچ

---

[1] - ئەبو داوود(٣٧٦٧) و ترمیزی(١٨٥٨) ئیخراجی کردووە.

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٤٥٨).

[3] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٨٥١).

[4] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٤٥٩).

لەتواناى مندا هەبووبێ، ئەوە خواى گەورە لەتاوانى لەپێشترى خۆشدەبێ. فەرموودەیەکی حەسەنە[1].

باس دەکرێت کاتێك خواردنی لێ نزیکدەخرایەوە ئەیفەرموو(بسم الله)، کاتێکیش لێی دەبوویەوە و دەستی هەڵدەگرت ئەیفەرموو:"اللَّهُمَّ أَطْعَمْتَ وَسَقَيْتَ، وَأَغْنَيْتَ، وَأَقْنَيْتَ وَهَدَيْتَ، وَأَحْيَيْتَ، فَلَكَ الْحَمْدُ عَلَى مَا أَعْطَيْتَ" ئیسنادەکەی سەحیحە[2]، واتا: خوایە گیان وا خواردن و خواردنەوەت پێ داین و بێ پێویستییت کردین و ڕێنیشاندەریی ئێمەت کرد و ئێمەت زیندوو کردەوە، بۆ هەموو ئەوانە سوپاس و ستایشت دەکەین.

لەسوننەندا هاتووە فەرموویەتی:هەرکەسێ خواردنێکی خوارد با بڵێ:"اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ"،واتا: خوایە بەرەکەتی تێ بکەی بۆ ئێمە و باشترمان پێ بدەی. هەرکەسێکیش خوای گەورە شیری پێ دا با بڵێ: "اللهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَزِدْنَا مِنْهُ"،واتا: خوایە گیان بۆمان بەرەکەتی تێ بکەی و زیاتری بکەی. هیچ شتێك نییە بەقەد شیر مرۆڤ بێ پێویستیی نەکات بەخواردن و خواردنەوە،هیچ خواردنێکیش سوودی ئەویان نییە. فەرموودەکە حەسەنە[3].

لێیەوە باسدەکرێت کە کاتێ لەپەرداخدا شتی دەخواردەوە، سێ هەناسەی هەڵدەمژی.

---

[1] – ئەبو داوود(٤٠٢٣) و ترمیزی(٣٤٥٨) و ئیبن ماجە(٣٢٨٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ئەحمەد ئیخراجی کردووە٢٧/١٤٠(١٦٥٩٥).

[3] – ئەبو داوود(٣٧٣٠) و ترمیزی(٣٤٥٥) و ئیبن ماجە(٣٣٢٢) ئیخراجیان کردووە.

## ١٠-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی خواردنەوە

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە دەچووە لای خێزانەکانی ئەیپرسی:"هیچ خواردنێکتان لا هەیە؟"[١] هەرگیز عەیبی لەخواردنێك نەگرتووە، بەڵکو ئەگەر ئارەزووی خواردەنەکەی بکردبایە دەیخوارد و ئەگەر حەزی پێ نەکردبایە وازی لێ دەهێنا و قسەی نەدەکرد، جاری وەهاش هەبووە فەرموویەتی:"أَجِدُني أعافُه"[٢]،واتا: ئارەزووی ناکەم.

هەندێجار پیاهەڵدانی خواردنی کردووە، وەکو فەرموویەتی:"نِعْمَ الإِدَامُ الْخَلُّ"[٣]،واتا: خەڵ باشترین خواردنێکە. ئەمە باشتر دانان نییە، بەڵکو پیاهەڵدانێکێتی بۆ خەڵ لەو حاڵەتەی کە بەردەست بووە و بۆ ڕاگرتنی دڵی ئەو کەسە بووە کە هێناویێتی.

ئەگەر بەڕۆژوو بووایە و خواردنێکی بهێنرابایەتە بەردەست، دەیفەرموو:"إني صائمٌ"[٤]،واتا: من بەڕۆژووم. فرمانی کردووە بەو کەسەی لێی نزیککردووەتەوە کە بانگی ئەو کەسە بکات وا پێشکەشی کردووە، ئەگەر بەڕۆژوو نییە با لێی بخوات[٥].

ئەگەر دەعوەتی خواردنێك بکرابایە و کەسێك دوای بکەوتبایە، خاوەن ماڵی ئاگادار دەکردەوە و ئەیفەرموو:"إِنَّ هَذَا تَبِعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ وَإِنْ شِئْتَ رَجَعَ"[٦]،واتا:ئەم بەدواماندا هات، ئەگەر مۆڵەتی دەدەی با بێتە ژوورەوە و ئەگەر مۆڵەتی نادەی دەگەڕێتەوە.

---

[١] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١١٥٤).

[٢] - بوخاری(٥٤٠٠) و موسلیم(١٩٤٦) ئیخراجیان کردووە.

[٣] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٥٣).

[٤] - بوخاری ئیخراجی کردووە(١٩٨٢).

[٥] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٣١).

[٦] - بوخاری(٥٤٦١) ئیخراجی کردووە.

لەسەر خواردن قسەی دەکرد هەروەك لەبابەت خەڵەوە باسمان کرد، هەروەك بەزڕکوڕەکەی وت کە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە بوو فەرمووی: "سمِّ اللَّهَ، وكُلْ مما يَليك"[1]،واتا: بسم الله بکە و لەپێش خۆتەوە بخۆ.

هەندێجار چەند جارێك بەمیوانی دەفەرموو بەردەوام بیّ لەخواردن هەروەك خەڵکانی بەخشندە و سەخی ئەوە دەکەن، هەروەك لەفەرموودەی ئەبو هوریرە هاتووە لای بوخاری لەباسی خواردنەوەی شیردا و چەند جارێك فەرموویەتی: "اشرب– بخۆرەوە" و چەند جارێك فەرموویەتی، هەتاوەکو ئەویش وتوویەتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە، رێگە نەما تێیبکەم[2].

لای هەر قەوم و کەسیّ نانی خواردبیّ، دەرنەچووە هەتاوەکو دوعای بۆیان نەکردبیّ، لەماڵی عەبدوڵڵەی کوڕی بوسردا پاڕایەوە و فەرمووی: "اللهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِيمَا رَزَقْتَهُمْ، وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ"،واتا: خوایە گیان لەوەی رزقت داون بەرەکەتیان بۆ تێبکەی، لێیان خۆش بە و بەزەییت پێیاندا بێتەوە. موسلیم باسیکردووە[3].

لەماڵی سەعدی کوڕی عوبادە پاڕایەوە و فەرمووی: "أفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ"[4]،واتا: رۆژووەوانان لاتان بەربانگ بکەنەوە و چاکەکاران نانتان بخۆن و فریشتەکان بەسەرتان بکەنەوە.

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە شەو چووەتە ماڵەوە و گەڕاوە بەدوای خواردندا و خواردنی دەست نەکەوتووە، فەرموویەتی: "اللَّهُمَّ أَطْعِمْ مَنْ أَطْعَمَنِي واسْقِ مَنْ سقَانِي"[5]. پاڕاوەتەوە بۆ ئەوانەی خواردنیان بەهەژاران داوە

---

[1] – بوخاری(٥٣٧٦) و موسلیم(٢٠٢٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٤٥٢).

[3] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٥٥).

[4] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٨٤٥).

[5] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٥٥).

و پیاهەڵدانی کردوون، جارێکیان فەرمووی: "ألا رجلٌ يضيف هذا رحمه الله"[1]، واتا: کەسێك نییە میوانداریی ئەم پیاوە بکات خوا بەزەیی پێدا بێتەوە؟ بەپیاوە ئەنسارییەکە و خێزانەکەی فەرموو کە خواردنی خۆیان و منداڵەکەیان خستە بەردەم میوانەکە: "لقد عَجِبَ اللهُ مِنْ صنيعِكما بضيفِكما الليلة"[2]، واتا: خوای گەورە سەیری پێ هات بەو کارەی ئەمشەو هەردووکتان لەگەڵ میوانەکەتاندا کردتان.

لوتبەرزیی نەدەنواند لەخواردن دان بەهەرکەسێك، کەسەکە منداڵ بووایە یان گەورە، ئازاد بووایە یان کۆیلە، دەشتەکیی بووایە یان کۆچەر.

فرمانی کردووە بەدەستی راست خواردن بخورێت، نەهی دەکرد بەدەستی چەپ بخورێت و ئەیفەرموو: "إِن الشَّيْطَان يَأْكُل بِشمَالِه وَيشْرب بِشمَالِه"[3]، واتا: ئەو شەیتانە بەدەستی چەپی ئەخوات و ئەخواتەوە. مەبەست ئەوەیە خواردن بەدەستی چەپ حەرامە، ئەوەش دروستە، ئەو کەسەی بەدەستی چەپ نان بخوات یان شەیتانە یان بەشەیتان شوبهێنراوە.

فرمانی بەو کەسانە داوە کە هەرچی دەخۆن تێرناخۆن، بەوەی لەدەوری خواردنەکەیان کۆببنەوە و پێکەوە نان بخۆن و هەر یەکە و لەقاپێکدا نان نەخوات، (بسم الله)ش تاوەکو خوای گەورە بەرەکەت بخاتە خواردنیانەوە[4].

بەدروست لێیەوە هاتووە فەرموویەتی: "إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ يَأْكُلُ الْأَكْلَةَ يَحْمَدُهُ عَلَيْهَا ، وَيشْرَبُ الشَّرْبَةَ يَحْمَدُهُ عَلَيْهَا"[5]، واتا: خوای گەورە رازیی دەبێ لەو بەندەیەی کە خواردن دەخوات، (الحمدُ لله)لەسەر خواردنەکە دەکات، خواردن دەخواتەوە(الحمدُ لله)ی لەسەر دەکات.

---

[1] – بوخاری(٤٨٨٩) و موسلیم(٢٠٥٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٥٤).

[3] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٢٠).

[4] – ئەبو داوود(٣٧٦٤) و ئیبن ماجە(٣٢٨٦) ئیخراجیان کردووە.

[5] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧٣٤).

## ١١-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەلام کردن و مۆڵەت خواستن بۆ چوونە ژوورەوە و وەڵامدانەوەی کەسێك بپژمێت

لەسەحیحەیندا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە لەئەبو هورەیرەوە کە فەرموویەتی:"إِنَّ أَفْضَلَ الْإِسْلَامِ وَخَيْرَهُ إِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَأَنْ تَقْرَأَ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ"[1]،واتا:باشترین و چاکترین موسڵمانێتییەك، ئەوەیە نان بدەی و سەلام بکەی لەهەرکەسێ دەیناسی و نایناسی.

هەروەها لەسەحیحەیندا هاتووە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"أن آدَمَ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ والسَّلَامُ لمَّا خلقه اللَّهُ قَالَ لَهُ: اذْهَبْ إلى أولَئِكَ النَّفَرِ مِنَ المَلَائِكَةِ، فَسَلِّم عَلَيْهِمْ، وَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ بِهِ، فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَزَادُوهُ:وَرَحْمَةُ اللَّهِ"[2]،واتا: کاتێك خوای گەورە ئادەمی دروست کرد، بەئادەمی فەرموو: بچۆ بۆلای ئەو چەند فریشتەیە و سەلامیان لێ بکە و گوێیان لێ بگرە بزانە چۆن وەڵامت دەدەنەوە، وەڵامدانەوەی ئەوان دەبێتە سلاوی تۆ و وەچەکانت، ئادەم رۆیشت و وتی:السلام عليكم. ئەوانیش وتیان: السلامُ عليك ورحمةُ الله. (ورحمةُ الله)یان بۆی زیاتر کرد.

هەر لەسەحیحەیندا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی داوە بەسەلام کردن، هەواڵی پێداون کە سەلام لەنێو یەکتردا بڵاوبکەنەوە خۆشەویستی و رێزیان لەنێواندا بۆ دروست دەبێت، ناچنە بەهەشتەوە هەتا ئیمان نەهێنن، ئیمانیش ناهێنن هەتاوەکو یەکتریان خۆش نەوێت[3].

---

[1] - بوخاری(٦٢٣٦) و موسلیم(٣٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٣٣٢٦) و موسلیم(٢٨٤١) ئیخراجیان کردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٤).

## بەش

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)سەلماوە، کە بەلای منداڵاندا تێپەڕبووە و سەلامی لێکردوون. موسلیم باسیکردووە[1].

ترمیزی لە(جامع)ەکەیدا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) گێڕاویەتییەوە، کە ڕۆژێکیان بەلای کۆمەڵێ ئافرەتدا تێپەڕبووە و بەدەستی سەلامی لێکردوون[2].

لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە کە: هاوەڵان لەڕۆژی جومعەدا بڵاوەیان لێ دەکرد، لەڕێگەیاندا بەلای پیرەژنێکدا تێپەڕ دەبوون و سەلامیان لێ دەکرد و ئەویش وەڵامی سەلامەکەیانی دەدایەوە، خواردنێکی پێشکەش دەکردن لەگەڵای سلق و جۆ دروست کرابوو[3].

ئا ئەمە دروستە لەبابەت سەلامکردن لەژنان: تەنیا سەلام لەپیرەژن و ئافرەتانی مەحرەمدار دەکرێت.

## بەش

لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە لەسەحیحی بوخاری و ئەوانی تردا کە: تەمەن منداڵ، سەلام دەکات لەگەورەتر، کەسی ڕێبوار سەلام دەکات لەوەی دانیشتووە، سوار سەلام دەکات لەو کەسەی بەپیادە دەڕوات، ژمارە کەم سەلام دەکات لەژمارە زۆر[4].

لەسووننەنی ئەبو داوودا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم):"إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِاللَّهِ مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلَامِ"[5]،واتا: لەپێشترین کەسێك بەپاداشتی خوای گەورە، ئەوەیانە کە پێشتر سەلام دەکات.

---

[1] – بوخاری(٦٢٤٧) و موسلیم(٢١٦٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٦٩٧).

[3] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٢٤٨).

[4] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٢٣٤).

[5] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥١٩٧).

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوە بوو، کە بهاتبایە بۆلای کۆمەڵە کەسێك، لەسەرەتادا سەلامی لێیان دەکرد و لەڕۆیشتنیشدا سەلامی لێیان دەکرد.

ئەنەس ئەڵێ: هاوەڵانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێکەوە رێیان دەکرد، ئەگەر دار و درەختێك بهاتبایە رێیان بەملاو بەولایدا بلأوەیان دەکرد، کە لەو دیو درەختەکە بەیەکتر دەگەیشتنەوە سەلامیان لەیەکتر دەکرد.

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بوو کە دەچووە مزگەوت، بەدوو رکاتی(تحية المسجد) دەستیپێدەکرد[1]،پاشان دەهات و سەلامی لەو کەسانە دەکرد لەوێ بوون، بۆیە دوو رکاتی تحية المسجد لەپێش سەلامکردن لەخەڵکی نێو مزگەوت دەکرێ، لێرەدا مافی خوا لەپێشترە پێچەوانەی مافە داراییەکان کە رکەبەری و داوای دیار و ئاشکرای تێدا هەیە لای خەڵك.

لەمەدا: سوونەتە بۆ هەرکەسێ چووە مزگەوت و خەڵکی تێدا بوو، سێ شتی بەدوای یەکدا بکات: چووە مزگەوتەوە بڵێ: بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله، پاشان دوو رکات (تحية المسجد) بکات، پاشان سەلام لەخەڵکی ناو مزگەوتەکە بکات.

## بەش

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە شەو دەچووە ماڵەوە، سەلامێکی دەکرد کەسی خەوتوو بەئاگا نەهێنێ و ئەوەی بەئاگا بوو گوێی لێ بێ. موسلیم باسی کردووە[2].

---

[1] – بوخاری(١١٦٣) و موسلیم(٧١٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٥٥).

## بەش

ترمیزی گێڕاویەتییەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:"السلامُ قبلَ الكلامِ"[1]،واتا: سەلامکردن پێش قسە کردن. ئەمەو ئەگەرچی ئیسنادەکەی لاوازە، بەڵام کاری پێ دەکرێت.

بەهێزتر لەوە، ئەوەیە کە ترمیزی گێڕاویەتییەوە لە کەلەدەی کوڕی حەنبەلەوە:"سەفوانی کوڕی ئومەیە، بەشیر و فرۆ و گۆشتی وشترەوە ناردمی بۆلای پەیامبەری(صلی الله علیه وسلم)، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) لەسەر دۆڵەکە بوو، چوومەلای و سەلامم نەکرد و مۆڵەتی چوونە ژوورەوەشم لێ نەخواست، بۆیە فەرمووی:"أَرْجِعُ فَقُلِ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ؟"،واتا:بگەڕێوە و بڵێ: السلام علیکم، ئینجا بڵێ: بێمە ژوورەوە؟ ئەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی(حسن غریب)ە[2].

ئەگەر بهاتبایە بەر دەرگای هەرماڵێك، روو بەدەرگا و حەوشەی ماڵەکە رانەدەوستا، بەڵکو لەسووچی لای راست یان لای چەپی دەوەستا و ئەیفەرموو:"السلامُ علیکم، السلامُ علیکم"[3].

## بەش

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەخۆی سەلامی لەهەر کەسێك دەکرد کە رووبەڕووی بکەوتبایە، سەلامی لەگەڵ کەسانی تردا بۆ خەڵکی تر دەنارد و سەلامیشی دەگەیاند، هەروەك سەلامی خوای گەورەی بەخاتوو خەدیجەی کچی خوەیلد گەیاند(خوای لێ رازیی بێ) کاتێ جیبریل پێی فەرموو:ئەوە خەدیجەیە

---

[1]- ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٦٩٩).

[2]- ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٧١٠).

[3]- ئەبو داود ئیخراجی کردووە(٥١٨٦).

خواردنى بۆت هێنا، سەلامى خوا و منى پىٚ بگەيەنە و موژدەشى پىٚ بدە بەخانوويەك لەبەهەشت[١].

## بەش

رێباز و رەوشتى پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەلامكردندا، ئەوە بوو هەتاوەكو (وبركاتهِ)ى دەفەرموو، نەسائى لێيەوە گێڕاويەتييەوە كە: پياوێك هات وتى: السلامُ عليكم. پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) وەلاٚمى دايەوە فەرموو: دە. پاشان كابرا دانيشت و يەكێكى تر هات و وتى:السلامُ عليكم ورحمةُ الله، پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) وەلاٚمى دايەوە فەرمووى: بيست. پاشان كابرا دانيشت. پياوێكى تر هات و وتى: السلامُ عليكم ورحمةُ اللهِ وبركاتُه. پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) وەلاٚمى دايەوە و فەرمووى:سى. نەسائى و ترميزى گێڕاويانەتەوە لەفەرموودەيەكى عيمرانى كوڕى حصين و حەسەنى داناوە[٢].

## بەش

يەكێكى تر لەڕێبازى پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بوو سىٚ جار سەلامى دەكرد وەك لەسەحيحى بوخاريدا هاتووە لەئەنەسەوە(خواى لىٚ رازيى بىٚ) ئەڵىٚ: ئەگەر پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) شتێكى بفەرمووبايە، سىٚ جار دووبارەى دەكردەوە تاوەكو كەسەكە لێى تێبگات، ئەگەر بهاتبايە بۆلاى قەوم و كۆمەڵێك سىٚ جار سەلامى لێيان دەكرد[٣].

---

[١] - بوخارى(٣٨٢٠) و موسليم(٢٤٣٢) ئيخراجيان كردووە.

[٢] - ئەبو داوود(٥١٩٥) و ترميزى(٢٦٨٩) و نەسائى لە الكبرى٩/١٣٣(١٠٠٩٧) ئيخراجيان كردووە.

[٣] - بوخارى گێڕاويەتييەوە(٩٥).

ئەكرێ ئەو سەلامكردنەی لەكۆمەڵێكی زۆر بووبێ، هەركەسێكیش لەڕێباز و ئاكاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) رابمێنێ، دەبینێ هەندێجار رووداوی پێویست و كتوپڕ رووی داوە. خواش زاناترە.

## بەش

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەهەركەسێ بگەشتبایە پێشتر خۆی سەلامی دەكرد، هەركەسێكیش سەلامی لێ بكردبایە، وەك خۆی و باشتر وەڵامی دەدایەوە، یەكسەر و بەبێ دواخستن، تەنیا ئەگەر عوزرێ لەئارادا نەبووایە وەك نوێژكردن یان سەرئاوكردنەوە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەدەنگ وەڵامی ئەو كەسەی دەدایەوە كە سەلامی لێ كردبوو، بەدەست و سەرجوڵاندن و پەنجە جوڵاندن وەڵامی نەدەدایەوە، تەنیا لەنوێژدا نەبێ كە بەئاماژە وەڵامی سەلامی دەدایەوە، لەهەندێ فەرموودەدا ئەوەی لێ سەلماوە.

## بەش

ڕەتیدەكردەوە ئەو كەسەی سەرەتا سەلام دەكات بڵێ:علیك السلامُ. ئەبو جورەی ئەلهوجەینیی ئەڵێ: هاتم بۆلای پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و وتم: علیك السلامُ یا رسولَ الله. فەرمووی:"لاَ تَقُلْ عَلَيْكَ السَّلاَمُ، فَإِنَّ عَلَيْكَ السَّلاَمُ تَحِيَّةُ الْمَوْتَى"، واتا: مەڵێ علیك السلام، چونكە علیك السلام سەلامە لەمردوو. فەرموودەیەكی سەحیحە[1].

---

[1] – ئەبو داوود(٥٢٠٩) و ترمیزی(٢٧٢٢) ئیخراجیان كردووە.

ئەم فەرموودەیە لای کۆمەڵێك بەهەڵە وەرگیراوە، وەهایان داناوە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەیە کە لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ەوە سەلماوە بە(السلام علیکم)سەلامی لەمردووان کردووە، وشەی(السلام)ی پێشخستووە، بەڵکو واتای ئەمەیە:"فإن علیك السلام تحیة الموتی– سەلامت لێ بێ سەلامی مردوو" هەواڵە لەبارەی واقیعەوە نەوەك مەشروع و رەوایەتی، واتا: شاعیران و ئەوانی تر بەو شێوەیە سەلامیان لەمردوو کردووە.

بەم شێوەیە وەڵامی سەلامی مرۆڤی موسڵمانی دەدایەوە:"وعلیك السلامُ".

## ١٢-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەسەلامکردن لەئەهلی کیتاب

موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"لَا تَبْدَؤُوا الْيَهُودَ وَلَا النَّصَارَى بِالسَّلَامِ وَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُ إِلَى أَضْيَقِهِ"[1]،واتا:ئێوە سەرەتا سەلام لەجولەکە و گاور مەکەن، ئەگەر لەڕێگەو باندا بەیەکێکیان گەیشتن، ناچاری بکەن بەڕێگە بەرتەسکەکەدا بڕوات.

سەلەف و ئەوانەی دواتر لەوەدا جیاوازن، زۆرینەیان وتوویانە: نابێ موسڵمان سەرەتا سەلامیان لێ بکات. ئەوانی تر بۆ ئەوە رۆیشتوون کە جائیزە سەرەتا سەلامیان لێ بکرێت. کۆمەڵێك ئەڵێن: جائیزە سەرەتا سەلامیان لێ بکرێ بەهۆی بەرژەوەندییەکی ناچارییەوە، پێویستت بەو کەسە هەیە یان لەترسی ئازار و گێچەڵی یان بەهۆی خزمایەتییەوە.

جیاوازیشن لەبابەت واجیببوونی وەڵامدانەوەی سەلامیان، کۆڕایی لەسەر ئەوەیە واجیبە وەڵامی سەلامیان بدرێتەوە، ئەوەش بۆچوونی دروستە.

---

[1] - مەسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٦٧).

**بەش**

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە بەلای مەجلیسێکدا تێپەڕبووە موسڵمان و بتپەرست و جولەکەی تێدا بووە و سەلامی لێکردوون[1].

لێیەوە بەدروست هاتووە کە نامەی بۆ هیرقەل و ئەوانی تر ناردووە بەنووسینی:"السلامُ على مَنْ اتَّبَعَ الهُدى"[2]،واتا: سەلام بۆ ئەو کەسەی شوێن هیدایەت دەکەوێت.

**بەش**

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوە بوو کەسێك سەلامی کەسێکی تری پێ بگەیندبایە، وەلامی دەدایەوە بەوەلامدانەوەی سەلامی کەسی گەیەنەر و ئەو کەسەش کە سەلامەکەی گەیاندووە، هەروەك لەسووننەندا هاتووە کە پیاوێك بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی وتووە: باوکم سەلامت لێ دەکات. پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)یش فەرمووی:"عليكَ وعلى أبيكَ السلامُ"[3]،واتا: سەلام لەخۆت و باوکت.

یەکێکی تر لەڕێباز و ڕێنماییەکانی، ئەوە بوو وازی هێنا لەسەلاوکردنی سەرەتا لەلایەن خۆیەوە لەو کەسەی شتێکی ناخۆشی کردبێ هەتاوەکو ئەوکاتەی لێی خۆشدەبوو، لەوانە قسە نەکردنی لەگەڵ کەعبی کوڕی مالیك و دوو هاوەڵەکەی، کەعب سەلامی لێ دەکرد و نەدەزانرا بەجولاندنی لێوی وەلامی سەلامەکەی دەداتەوە یان نە[4].

---

[1] – بوخاری(٦٢٥٤) و موسلیم(١٧٩٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٢٦٠).

[3] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٢٣١).

[4] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٢٥٥) و موسلیم(٢٧٦٩).

## ١٣-ڕێبازی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) لەمۆڵەت وەرگرتندا

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی: "الاسْتِئْذَانُ ثَلاَثُ مَرَّاتٍ، فَإِنْ أُذِنَ لَكَ وَإِلاَّ فَارْجِعْ"[1]،واتا: مۆڵەت خواستن سێ جارە، ئەگەر مۆڵەتی چوونە ژوورەوە درای باشە، ئەگەرنا بگەڕێرەوە.

بەدروست لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)هاتووە کە ویستوویەتی چاوی ئەو کەسە کوێر بکات کە لەکون و کەلێنەوە تەماشای ژوورەوە بکات و فەرمووی:"إِنَّمَا جُعِلَ الاسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ"[2]،واتا:مۆڵەت خواستن و لەدەرگادان بۆ ئەوەیە چاو نەبڕیتە ژوورەوە.

بەدروست لێیەوە هاتووە بەکردار و فێرکردن لەپێش خواستنی مۆڵەتی چوونە ژوورەوە، سەلامی کردووە، سەلامی کردووە ئینجا مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی دراوە و فەرموویەتی:"أألجُ؟، واتا: بێمە ژوورەوە؟

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەپیاوێکی فەرموو:"بڕۆ بۆلای ئەمە و فێری مۆڵەت خواستنی بکە. کابرا پێیووت:بلێ:" السلامُ عليكم، بێمە ژوورەوە؟ کابرا لەدەرەوە گوێی لێبوو وتی: السلامُ عليكم، بێمە ژوورەوە؟ پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی دا و هاتەژوورەوە[3].

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بوو سێ جار لەدەرگای دەدا، ئەگەر وەڵام نەدرابایەتەوە دەڕۆیشت.

---

[1] – بوخاری(٦٢٥٤) و موسلیم(٢١٥٣) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٦٢٤١) و موسلیم(٢١٥٦) ئیخراجیان کردووە.

[3] – پێشتر باسکرا.

## بەش

یەکێکی تر لەڕێباز و ڕەوشتی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)،ئەوە بوو ئەگەر خاوەن ماڵ بیوتبایە: تۆ کێی؟ ئەیفەرموو: فلاّنی کوڕی فلاّنم، یان کونیە و نازناوی خۆی دەوت و نەیدەفەرموو: منم. هەروەك لەسەحیحەیندا هاتووە لەجابرەوە ئەڵێ: هاتم بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و لەدەرگام دا. فەرمووی: کێیە؟ وتم: منم. فەرمووی: "منم منم!" وەك ئەوەی حەز بەو وەلاّمدانەوەیە نەکات[1].

کە ئوم هانیئ لەدەرگای دا. فەرمووی:"کێیە؟" وتی: ئوم هانیئم[2]. ڕەتینەکردووە و پێی ناخۆش نەبوو کە کونیەی بەکارهێنا.

## بەش

هەرچی ئەو لەدەرگادانەی کە خوای گەورە فرمانی کردووە ئەو کۆیلانەی باڵغ نەبوون کاری پێ بکەن و لەسێ کاتدا بێ پرس نەچنە ژوورەوە: پێش بەیانیبوونەوە، کاتی نیوەڕۆ، کاتی خەوتن.

کۆمەڵێك وتوویانە: ئەو ئایەتە نەسخ بووەتەوە. کۆمەڵێکی تر ئەڵێن: مەندوب و ڕێنیشاندەرییە. کۆمەڵێکی تر ئەڵێن: ئەوە فرمانی تایبەتە بەئافرەتان. کۆمەڵێکی تر ئەڵێن پێچەوانەیە. کۆمەڵێك وتوویانە: فرمانکردن بەلەدەرگادان و مۆڵەت وەرگرتنی چوونە ژوورەوەیان لەو کاتەدا بۆ پێویستیی بووە، پاشان ئەو پێویستییە نەماوە. کۆمەڵێکی تر ئەڵێن: ئەو ئایەتە کاری پێ دەکرێت و گشتییە و حوکمی دژی بۆ نییە.

دروست، ئەگەر شتێك هەبێ جێی مۆڵەت وەرگرتن و لەدەرگادان بگرێتەوە لەنمونەی کردنەوەی دەرگا کە بەڵگەیە لەسەر چوونە ژوورەوە یان لابردنی پەردە

[1] – بوخاری(٦٢٥٠) و موسلیم(٢١٥٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری گێراویەتییەوە(٢٨٠).

یان هاتووچوون بۆ ناوە و دەرەوە و ئەوانە، ئەوە پێویستی بە لەدەرگادان نییە، ئەگەر ئەوانە نەبوو، ئەوە پێویستە داوای مۆڵەت بکرێ، چونکە حوکمەکە پەیوەستە بەهۆکارێکەوە کە ئایەتەکە ئاماژەی پێ کردووە، ئەگەر ئەو هۆکارە هەبێ ئەوە حوکمەکەش بوونی دەبێ، ئەگەر هۆکارەکە نەبوو حوکمەکەش نابێ، خواش زاناترە.

### ١٤-رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەزیکری پژمیندا

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ العُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ أحدكم وَحَمِدَ اللَّهَ،كان حَقًّا على كُل مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يقول له: يرحمُك الله. وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ، فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ،فإذا تثاءبَ أحدُكم، فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ،فإن أحدكم إذا تثاءب ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ"،واتا:خوای گەورە حەزی بەپژمینە و رقی لەباوێشکە، ئەگەر یەکێ لەئێوە پژمی و وتی(الحمدُ لله)، ئەوە حەقە بەسەر هەر موسڵمانێکەوە کە گوێی لەو(الحمدُ لله)یە بڵێ(یرحمُك الله). بەلام هەرچی باوێشکە، ئەوە لەشەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێ لەئێوە باوێشکی دا، با هەتا ئەوەی دەتوانێ بەری پێ بگرێت، چونکە کاتێ یەکێ لەئێوە باوێشك دەدات، شەیتان پێی پێ دەکەنێ. بوخاری باسی کردووە[1].

لەسەحیحەکەیدا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە فەرموویەتی: ئەگەر یەکێ لەئێوە پژمی، با بڵێ: "الحمدُ لله". براکەی یان هاوڕێکەی بڵێ: "یرحمُك الله". ئەگەر براکەی یان هاوڕێکەی وتی: "یرحمُك الله". با لەوەلامیدا بڵێ: "یَهدیکُم اللهُ ویُصلحُ بالَکم"[2]،واتا: خوای گەورە هیدایەتتان بدات و حاڵ و کارتان بۆ چاك بکات.

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٢٢٣).

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٢٢٤).

لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) سەلماوە لەسەحیحی موسلیمدا و فەرموویەتی:"إذا عطسَ أحدُكم فحمد الله فشمِّتوه، فإن لم يحمد الله فلا تشمِّتوه"[1]،واتا: ئەگەر یەکێ پژمی و وتی(الحمدُ لله)، ئێوەش وەڵامی بدەنەوە و داوای بەزەیی خوای بۆ بکەن، بەڵام ئەگەر(الحمدُ لله)ی نەکرد، ئێوەش ئەو دوعایەی بۆ مەکەن.

ئەبو داوود بەئیسنادی سەحیح لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) گێڕاویەتییەوە فەرموویەتی:"إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، وَلْيَقُلْ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ، وَيَقُولُ هُوَ: يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ"[2]،واتا:ئەگەر یەکێ لەئێوە پژمی با بڵێ:" الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ"، براکەی یان هاوڕێکەشی لەوەڵامیدا بڵێ"يَرْحَمُكَ اللهُ"، ئەویش بڵێ"يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ".

ڕواڵەتی فەرموودە ئەوەیە، ئەگەر کەسێك پژمی و (الحمدُ لله)ی وت، فەرزی عەینە و دەبێ کەسێ گوێی لێیە، لەوەڵامیدا بڵێ(يرحمك الله)، ئەگەر لەنێو کۆمەڵێکدا بوو، (يرحمك الله)ی یەك کەسیش لەبری ئەوانی تر نابێ، ئەمە یەکێکە لەدوو بۆچوونی زانایان، ئیبن ئەبی زەید و ئەبو بەکر ئەلعەرەبیی ئەمەیان هەڵبژاردووە[3] (هەردووکیان مالیکی مەزهەبن) و ڕەتناکرێتەوە.

لەبەرئەوەی ئەو کەسەی لەو پژمەیەیدا نیعمەت و سوودێکی دەستخستووە بەوەی ڕزگاری بووە لەو هەڵمەی لەمێشکیدا هەبووە ئەگەر بمابایەتەوە ڕەنگە تووشی کۆمەڵێ دەردی سەختی بکردبایە، ئەوە بۆی دانراوە لەسەر ئەو نیعمەتە سوپاسی

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٩٩٢).

[2] – ئەبو داوود(٥٠٣٣) ئیخراجی کردووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە، ترمیزییش(٢٧٤١) لەفەرموودەیەکی ئەبو ئەیوب و ترمیزی(٢٧٣٨) بەنزیك بەوە لەفەرموودەیەکی ئیبن عومەرەوە.

[3] – المسالك في شرح موطأ مالك لابن العربي٧/٥١٨.

خوا بكات كه دوای ئەو لەرزینە، ئەندامەكانی جەستەی وەك خۆی هێشتووەتەوە، ئەوە نمونەی لەرزینی جەستەیە وەك چۆن زەوی بلەرزێتەوە ئاوەهایە، كەسەكە بەو خەمەی لەكۆڵ بووەتەوە شاد دەبێت و شەیتانیش داخ دڵ ئەكات بەو سوپاسكردنەی بۆ خوای گەورە، بەوەی لەلایەن خوای گەورەوە بۆی هاتووەتەدی و موسڵمانانیش داوای بەزەیی خوای بۆ دەكەن و ئەویش دوعای هیدایەت و چاكبوونی وەزع و حاڵیان بۆ دەكات لەخوای گەورە، هەموو ئەوانە شەیتان تووڕە و خەفەتبار دەكەن، بۆیە هەموو ئەو دوعایەی بۆ دەكرێت پێیدەوترێت(تشمیت- خەمباركردن)دوژمنەكەی پێ خەمبار دەكات.

ئەمە واتایەكی نەرم و خۆشی هەیە ئەگەر ئەو كەسەی دەپژمێ و ئەوەی بۆی دەپارێتەوە لێی تێبگەن، سوودی لێ دەبینن و سوودی پژمین بۆ جەستە و دڵ تێدەگەن و بەگەورەی دەبینن، بەوەش نهێنی لەخۆشویستنی خوای گەورە بۆ ئەو كەسە ڕووندەبێتەوە، بۆیە سوپاسێك شایستە بەڕووی خوای گەورە بێ.

یەكێكی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوەیە كە ئەبو داوود و ترمیزی گێڕاویانەتەوە لەئەبو هورەیرەوە☹(پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەگەر بپژمیبایە دەستی یان بەرگەكەی ئەخستەسەر دەمی و دەنگی پێ كەم دەكردەوە))ترمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەكی سەحیحە[1].

بەدروست لێیەوە هاتووە كە پیاوێك لای پژمیووە، پێی فەرمووە(یرحمك الله)پاشان كابرا پژمەیەكی تری كردووە، فەرموویەتی:"الرجلُ مزكومٌ"،واتا: ئەم پیاوە هەڵامەتێتی. ئەمە لەفزی موسلیمە لەجاری دووەمدا وەهای فەرموو[2]،هەرچی ترمیزییە تیایدا هاتووە: پاشان بۆ جاری دووەم و سێیەم پژمی، بۆیە پەیامبەری

---

[1]- ئەبو داوود(٥٠٢٩) و ترمیزی(٢٧٤٥) ئیخراجیان كردووە.

[2]- موسلیم ئیخراجی كردووە(٢٩٩٣).

خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:"هذا رجلٌ مزكوم"،واتا: ئەم پیاوە هەڵامەتی هەیە. ترمیزی ئەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی(حسن صحیح)ە[1].

لەئەبو هورەیرەوە رەفعی کردووە:"إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيُشَمِّتْهُ جَلِيسُهُ، وَإِنْ زَادَ عَلَى ثَلَاثٍ فَهُوَ مَزْكُومٌ، وَلَا تَشْمِيتَ بَعْدَ ثَلَاثِ مَرَّاتٍ"،واتا: ئەگەر یەکێ لەئێوە پژمی، با ئەوەی لەگەڵی دانیشتووە(یرحمك الله)ی بۆ بکات، ئەگەر زیاتر لەسێ جار پژمی، ئەوە هەڵامەتێتی، زیاتر لەسێ جار(یرحمك الله)ی بۆ نەکات. فەرموودەیەکی حەسەنە[2].

ئەگەر بووترێ: کەسێك کە هەڵامەتی هەبێ لەپێشترە دوعای بۆ بکرێ زیاتر لەو کەسەی هیچ دەردێکی نییە. لەوەڵامدا پێیدەوترێ: دوعای بۆ دەکرێت هەروەك چۆن دوعا بۆ هەر نەخۆش و دەردەدارێکی تر دەکرێت، بەڵام سوننەتی پژمینێ کە خوای گەورە حەزی پێ دەکات، هەتا سێ دانەیە، ئەگەر زیاتری کرد، بۆ کەسەکە داوای شیفا و عافیە دەکرێت، کە فەرموویەتی: ئەو پیاوە هەڵامەتێتی، بۆ ئەوە بووە داوای شیفای بۆ بکرێت، ئەوە دەرد و نەخۆشییە تاوەکو کەسەکە فریای خۆی بکەوێ و پشتگوێی نەخات و کارەکەی بەسەردا سەخت و گران بێتەوە، بۆیە هەموو فەرمایشتێکی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) حیکمەت و بەزەیی و زانست و هیدایەتە.

---

[1] - ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٧٤٣).

[2] - ئەبو داوود(٥٠٣٥) و ابن السني لە(عمل الیوم واللیلة)(٢٥١) ئیخراجیان کردووە.

**بەش**

دروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)هاتووە،کەسانی جولەکە لای پژمیون، ئومێدیان کردووە پێیان بڵێ(یَرحَمْکُم اللهُ) بەڵام فەرموویەتی:"یَهدیکُم الله ویُصلحُ بالکم"[1].

**١٥-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەئەزکار و ویرد و ڕەوشتی سەفەر**

بەدروست لەپەیامبەری خواوە هاتووە فەرموویەتی: ئەگەر یەکێ لەئێوە یەکلابوویەوە بەکارێ هەڵبستێ، با دوو رکات بکات رکاتی فەرز نەبێ، پاشان بڵێ:"اللّهُمَّ إنِّي أسْتَخْيرُكَ بِعِلمِكَ، وَأسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأسْألُكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظِيمِ، فَإنَّكَ تَقْدِرُ ولاَ أَقدِرُ، وَتَعْلَمُ ولاَ أعْلَمُ، وَأنْتَ عَلاَّمُ الغُيوبِ، اللَّهُمَّ إنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أنَّ هَذَا الأمْرَ خَيْرٌ لي فِي دِيني وَمَعَاشِي، وَعَاجِلِ أمْرِي وَآجِلِهِ، فَاقْدُرْهُ لي، وَيَسِّرْهُ لي، وَبَارِكْ لي فيهِ، وإنْ كُنْتُ تَعْلَمُه شرَاً لي في دِيني ومَعَاشي، وَعَاجِلِ أمْرِي وَآجِلِهِ، فَاصْرِفْهُ عَنِّي، وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِّني بِهِ"،واتا:خوایە گیان بەزانستی خۆت داوای ڕاوێژت لێ دەکەم، داوای توانای خۆت دەکەم و پشت بەتوانای تۆ دەبەستم و بەفەزڵی گەورەی خۆت لێت داوا دەکەم، ئەوە تۆی تواناداری و منیش بێ توانا، تۆ زانستت بەهەموو شتێك هەیە و من زانستم نییە، تۆ زانای نهێنییەکانی، ئەگەر دەزانی ئەم کارە بۆ دین و ژینم چاك و خێردارە، بۆ ئێستا و داهاتووم،ئەوە بۆم ئاسانی بکە و بۆم ببێ و بەرەکەتی تێ بکە، ئەگەر دەشزانی بۆ دین و ژینم زیانی هەیە و بۆ ئێستا و داهاتووم، ئەوە لەمنی دوور بخەرەوە و منیش لەو شتە دووربخەرەوە، خێر لەچیدا بوو بۆمی دابنێ و پاشان بیکەرە جێی

---

[1] ـ ئەبو داوود(٥٠٣٨) و ترمیزی(٢٧٣٩) ئیخراجیان کردووە.

رازیبوونم. ئینجا ناوی ئەو پێویستییە بهێنێ کە نیازی هەیە بۆی بچێ و ئەنجامی بدات و بەدەستی بهێنێ[1].

ئەو دوعایە ئەمانە لەخۆدەگرێت: دانىنان بەبوونی خوای گەورە، دانىنان بەسیفاتی کەمالی، لەسیفەتی کەمالی زانست و توانا و ئیرادە و دانىنان بەپەروەردگارێتیی الله و سپاردنی کار بە الله و پشت پێ بەستن و دەرچوون لەخۆسپاردن بەخودی خۆت و بەریبوون لەهەموو هێزێك جگە لەخوا کە توانای گۆڕینی هەموو حاڵێکی هەیە، دانىنانی بەندەیە بەوەی بێ توانایە لەپەیبردن بەبەرژەوەندیی خۆی و بێ توانایی بوونی لەو بوارەدا، هەموو شتێك بەدەست خوای گەورەیە کە دروستکار و خاوەندی راستەقینەیەتی.

## بەش

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە سەر وڵاخەکەی دەکەوت سێ جار ئەیفەرموو(اللهُ أکبر) پاشان دەیفەرموو:"سُبْحانَ الّذي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ"پاشان ئەیفەرموو:"اللهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِي سَفَرِي هَذَا البِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ العَمَلِ مَا تَرضَى، اللهمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ، وَاطوِ عنَا بُعْدَه،اللهمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ، اللهمَّ اصْحَبْنَا فِي سَفَرِنَا، وَاخْلُفْنَا فِي أَهْلِنَا"[2].

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَمِنَ الْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ"[3]،واتا: خوایە گیان پەنات پێ دەگرم لەناڕەحەتی و ماندوویەتی سەفەر و

---

[1] - بوخاری گێڕاویەتییەوە(١١٦٢).
[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣٤٢).
[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣٤٢، ١٣٤٣).

خەمۆکییەك پەیدا ببێ و پەنات پێ دەگرم لەتێکچوونی شتێك کە کێشەی تێدا نەبووە، هەروەها پەنات پێ دەگرم لەدوعای ستەملێکراو و بەخراپ هەڵگەڕانەوەی وەزع و حاڵی کەسوکار و سەروەت و ماڵم.

**بەش**

کاتێك لەسەفەردا خواحافیزیی لەهاوەڵانی بکردبایە، بەهەر یەکێکیانی دەفەرموو: "أَسْتَوْدِعُ الله دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ"[1]، واتا: ئایین و ئەمانەت و سەرەنجامی کارەکانت بەخوا دەسپێرم.

پیاوێك پێیووت: ئەمەوێ سەفەر بکەم، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللهِ، والتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ"، واتا: ئامۆژگارییت دەکەم بەلەخواترسان و وتنی(الله أكبر) لەسەرکەوتن بەهەر بەرزاییەکدا. کە کابرا ڕۆیشت، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "اللهُمَّ ازْوِ لَهُ الأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْهِ السَّفَرَ"[2]، واتا: خوایە گیان زەوی بۆ ڕام بکە و بیخە ژێر ڕکێفییەوە و گەشتەکەی بۆ سووك و ئاسان بکە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی کە سەردەکەوتنە سەر هەر لوتکەیەك(الله أكبر)یان دەکرد، کە داشدەبەزین ئەیانفەرموو(سبحان الله)، نوێژیش بەو جۆرەی لێهات، کە سەربەرزدەکەیتەوە(الله أكبر) دەکەیت و لەنزمبوونەوەشدا تەسبیحات.

---

[1] — ئەبو داوود(٢٦٠٠) و ترمیزی(٣٤٤٣) ئیخراجیان کردووە.

[2] — ترمیزی(٣٤٤٥) و ئیبن ماجە(٢٧٧١) ئیخراجیان کردووە.

لەحەجدا سەری بەرزدەکردەوە بەڕێوە دەڕۆیشت، کە بۆشاییەکی ببینایە بۆی دەچوو، ئەیفەرموو:"لَا تَصْحَبُ الْمَلَائِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ وَلَا جَرَسٌ"[1]،واتا: فریشتەکان هاوڕێیەتی کاروان و سەفەرێك ناکەن سەگ و زەنگی تێدا هەبێت.

بەمەکروهی دەزانی کەسێك، ڕێبوارێك شەوان بەتەنیا سەفەر بکات و فەرموویەتی:"لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الْوَحْدَةِ مَا سَارَ أَحَدٌ وَحْدَهُ بِلَيْلٍ"[2]،واتا: ئەگەر خەڵکیی دەیانزانی شەوان بەتەنیا سەفەرکردن چی مەترسییەکی تێدایە، ئەوە کەس بەتەنیا شەوان بەڕێ نەدەوکەت. بەڵکو بەمەکروهی دادەنا ریبواریٓ بەتەنیا سەفەر بکات و هەواڵی داوە کە یەك کەس شەیتانە، دوو کەس دوو شەیتانن و سەفەری سیٓ کەس بەسەفەر دادەنرێت[3].

ئەیفەرموو:ئەگەر کەسیٓ دابەزیە هەر شوێنێك با بڵیٓ"أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ" هیچ شتێك زیانی لیٓ نادات هەتا ئەو شوێنە بەجێدەهێڵیٓ[4].

ئەیفەرموو:"إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ فَأَعْطُوا الْإِبِلَ حَظَّهَا مِنَ الْأَرْضِ، وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ فَبَادِرُوا بِهَا نِقْيَهَا"[5]، واتا: ئەگەر لەساڵی پڕ بەرەکەت و لەوەڕدا سەفەرتان کرد، بهێڵن وشترەکانتان هەندیٓ جار پشوو بدەن و لەگژ و گیای زەوی بلەوەڕێن، بەڵام ئەگەر کەوتنە وشکەساڵییەوە، هەنگاوی وشترەکان خێرا بکەن تاوەکو زوو بگەنە جێگەی مەبەست و لەو خۆراکەی بۆیان دانراوە بەشیان بکات و زیانیان پیٓ نەگات.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١١٣).

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٢٩٩٨).

[3] – ئەبو داوود(٢٦٠٧) و ترمیزی(١٦٧٤) ئیخراجیان کردووە.

[4] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧٠٨).

[5] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٩٢٦).

ئەگەر لەسەفەردا بەیانیی بکردبایەتەوە، لەبەیانی زوودا ئەیفەرموو:"سَمِعَ سَامِعٌ بِحَمْدِ اللَّهِ وَنِعْمَتِهِ وَحُسْنِ بَلَائِهِ عَلَيْنَا، رَبَّنَا صَاحِبْنَا، فَأَفْضِلْ عَلَيْنَا، سِتْرًا بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ"[1].

نەهی دەکرد رێبوار قورئان بباتە خاکی دوژمن نەوەك دەستی دوژمن بکەوێ و سووکایەتی پێ بکەن، نەهی دەکرد ئافرەت بەبێ مەحرەم سەفەر بکات ئەگەر ماوەی بورەیدێ(چوار فەرسەخ) رێگەش بووایە. فرمانی دەکرد ئەگەر رێبوار ئەرکی سەفەری بەجێهێنا، پەلە بکات بۆ گەڕانەوە لای ماڵ و منداڵی.

ئەگەر ئەرکی سەفەری تەواو بکردبایە و بگەڕابایەتەوە، لەبەرزبوونەوە سەر هەر تەپۆڵکەیەك سێ جار(الله أكبر)ی دەکرد، پاشان ئەیفەرموو:"لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ"[2].

ئەگەر کەسێك دوورکەوتنەوەی لەماڵەوە زۆری بخایندبایە و بگەڕابایەتەوە، نەهی دەکرد لەشەودا لەدەرگای کەسوکاری بدات.

ئەگەر لەسەفەر بگەڕابایەتەوە، باوەشی بەمناڵانی بنەماڵەکەیدا دەکرد، خۆیشی باوەشی بەو کەسەدا دەکرد کە لەسەفەر دەگەڕایەوە، ئەگەر رێبوارەکە کەسوکاری خۆی بووایە ماچی دەکرد. ئەگەر لەسەفەر بگەڕایایەتەوە، سەرەتا دەچووە مزگەوت و دوو رکات نوێژی دەکرد.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧١٨).

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(١٧٩٧).

**١٦-رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم ) لەزیکر و یادی هاوسەرگیرییدا**

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە کە هاوەڵانی فێری(خطبة الحاجة) کردووە: الحمد لله، نحمدُهُ ونَستَعينُه ونَستغفِرُهُ، ونعوذُ بالله من شرورِ أنْفُسنا وسيّئاتِ أعمالنا، من يهدِهِ الله، فلا مُضِلَّ له، ومَن يُضْلِل، فلا هاديَ له.

وأشهد أن لا إله إلاَّ الله وحدَه لا شريك لَه، وأشهدُ أنَّ محمّداً عبدُه ورسولُه: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ}.

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً}.

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً}.

شوعبە ئەڵێ: بەئەبو ئیسحاقم وت: ئەمە وتاری هاوسەرگیرییە یان شتی تر؟ وتی: وتاری هەر کارێکی پێویست[1].

فەرموویەتی:"إِذَا أَفَادَ أَحَدُكُمُ امْرَأَةً أَوْ خَادِمًا أَوْ دَابَّةً فَلْيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِهَا وَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا وَخَيْرِ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا جُبِلَتْ عَلَيهِ"[2]،واتا: ئەگەر یەکێ لەئێوە ژنی هێنا یان خزمەتکارێك یان گوێدرێکی کڕی، با تەوێڵی بگرێ و لەخوای گەورە داوای بەرەکەتی بۆ بکات و (بسم الله)بکات و بڵێ: خوایە گیان داوای خێری و ئەو خێرەیت لێ دەکەم کە بەفیترەت تیایدا دروست کراوە، پەنات پێ دەگرم لەخراپەی و ئەو خراپییەی بەفیترەت بۆی دروستکراوە.

---

[1] ئەبو داوود(٢١١٨) و ترمیزی(١١٠٥) و نەسائی(١٤٠٤) و ئیبن ماجە(١٨٩٢) ئیخراجیان کردووە. قسەی شوعبە لای تەیالیسی(٣٣٦).

[2] ئەبو داوود(٢١٦٠) و ئیبن ماجە(١٩١٨) ئیخراجیان کردووە.

بەکەسێ ژنی بهێنابایە ئەیفەرموو:"بَارَكَ اللَّهُ لَكَ وَبَارَكَ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ"[1]،واتا: خوای گەورە بۆتی بەرەکەتدار بکات و لەسەر خێر و خۆشیی کۆتان بکاتەوە.

فەرموویەتی:هەرکەسێ ویستی لەگەڵ خێزانیدا جووت ببێ و بڵێ:"اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا"واتا: خوایە گیان شەیتان لەخۆم و هاوسەرم و ئەو منداڵەی پێمان دەبەخشی دوور بخەرەوە. ئەگەر لەو جووتبوونە منداڵ دروست ببێ، هەرگیز شەیتان ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ[2].

## ١٧- ئەگەر دەردەدار و کەم ئەندامێکت بینی چی دەڵێی؟

دروست لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ەوە هاتووە فەرموویەتی: هەرکەسێك دەردەدارێکی بینی و وتی:"الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلًا"، ئەوە خوای گەورە تووشی ئەو دەرد و مەینەتییەی ناکات[3].

## ١٨- کەسێ خەوێکی ناخۆش ببینێ چی بکات؟

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ، وَالرُّؤْيَا السُّوءُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَمَنْ رَأَى رُؤْيَا فَكَرِهَ مِنْهَا شَيْئًا فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ ، وَلَا يُخْبِرْ بِهَا أَحَدًا، فَإِنْ رَأَى رُؤْيَا حَسَنَةً فَلْيَسْتَبْشِرْ، وَلَا يُخْبِرْ بِهَا إِلَّا مَنْ يُحِبُّ"[4]،واتا: خەوی

---

[1] ئەبو داوود(٢١٣٠) و ترمیزی(١٠٩١) و ئیبن ماجە(١٩٠٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] بوخاری(٥١٦٥) و موسلیم(١٤٣٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٤٣٢).

[4] بوخاری(٥٧٤٧) و موسلیم(٢٢٦١) ئیخراجیان کردووە.

راست لەخواوەیە، خەوی پووچیش لەشەیتانەوەیە، هەرکەسێ خەوی راستی بینی و بەدڵی نەبوو، با سێ تف بکاتە لای چەپی و پەنا بەخوا بگرێ لەشەیتان و بەوە زیانی پێ ناگات و بۆ کەسیشی باس نەکات، هەرکەسێکیش خەوی چاکی بینی با خۆشحاڵ بێ و بۆ کەسی باس نەکات تەنیا کەسێك کە خۆشیدەوێ.

فرمانی داوە بەو کەسەی خەوی ناخۆش دەبینێ، کە لەسەر ئەو لایە بجوڵێ وا لەسەری خەوتووە و نوێژیش بکات[1]. فرمانی کردووە ئەو کەسە پێنج شت بکات: تف بکاتە لای چەپ و پەنا بەخوا بگرێ لەشەیتان، بۆ کەسی نەگێڕێتەوە، ئەو لایەی بگۆڕێ کە لەسەری خەوتووە، هەڵبسێ نوێژ بکات، جا هەرکاتێ ئەو کەسە ئەو پێنج کارەی کرد، ئەوە ئەو خەوە ناخۆشە زیانی پێ ناگەیەنێ و بەوە زیانی لادەدات.

فەرموویەتی: "الرُّؤْيَا عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ تُعَبَّرْ، فَإِذَا عُبِّرَتْ وَقَعَتْ، وَلاَ تَقُصهَا إِلاَّ عَلَى وَادّ أو ذِي رَأْيٍ"[2]،واتا: خەو لەسەر قاچی باڵندەیەکدایە هەتا ئەو کاتەی لێکنەدراوەتەوە، کە لێکدرایەوە روودەدات، تەنیا بۆ کەسی خۆشەویست یان ژیر بیگێڕەوە.

## ١٩- کەسێ بەوەسوەسە تووشهاتبێ چی بکات و چی بڵێ و بۆ ئەوە پشت بەچی ببەستێ؟

عوسمانی کوڕی ئەبی ئەلعاس وتی: ئەی پەیامبەری خوا، شەیتان نوێژ و قورئانخوێندنم لێ تێکدەدات. فەرمووی:"ذَاكَ شَيْطَانٌ يُقَالُ لَهُ خَنْزَبٌ، فَإِذَا أَحْسَسْتَهُ فَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْهُ، وَاتْفِلْ عَلَى يَسَارِكَ ثَلَاثًا"[3]،واتا: ئەوە شەیتانێکە پێیدەوترێ خەنزەب، ئەگەر هەستت پێکرد پەنا بەخوا بگرە لێی و سی تف بکەرە لای چەپت.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٦٢).

[2] – ئەبو داوود(٥٠٢٠) و ترمیزی(٢٢٧٩) ئیخراجیان کردووە.

[3] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٠٣).



هاوەڵان شکایەتیان لا کرد کە یەکێکیان لەدەروونیدا شتێك بەدیدەکات- شتێکی بۆ ئەخاتەڕوو، پێم خۆشە تۆپەڵە ئاگرێك بێ و ئازاری بدات بەس ئەو شتە نەڵێ، فەرمووی:"اللّهُ أكْبَرُ، اللّهُ أكبَرُ، اللّهُ أكْبَرُ، الْحَمْدُ للّهِ الّذي رَدَّ كَيْدَهُ إلَى الْوَسْوَسَة"[1]، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە فێڵەکەی رەتکردەوە بۆ وەسوەسە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"لا يَزالُ الناس يَتساءلون حتى يقولَ قائلُهم: هذ الله خَلَقَ الخلقَ، فمن خلقَ الله؟ فمن وجدَ من ذلك شيئا، فليستَعذ بالله ولينتَه"[2]،واتا: خەڵکیی لەپرسیارکردندا بەردەوام دەبن هەتاوەکو یەکێکیان ئەڵێ: ئەم مەخلوقاتانە خوای گەورە دروستی کردوون، ئەی کێ خوای گەورەی دروستکردووە؟ هەرکەسێ پرسیارێکی وەهای لەدەروونی خۆیدا بینی با پەنا بەخوا بگرێ و کۆتایی پێ بهێنێت.

## ٢٠ – کەسێك کە تووڕەیی توند بیگرێ چی بڵێ و چی بکات؟

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی کردووە، هەرکەسێ تووڕەیی گرتی، ئاگری تووڕەییەکەی بەدەستنوێژ بکوژێنێتەوە، ئەگەر بەپێوە بوو دابنیشێ، ئەگەر دانیشتبێ پاڵ بکەوێ و پەنا بەخوا بگرێت لەشەیتانی نەفرەت لێکراو[3].

لەبەر ئەوەی تووڕەیی و شەهوەت دوو پشکۆی ئاگرینن لەدڵی مرۆڤدا، ئەوە فرمانی کردووە ئەو دوو پشکۆیە بکوژێنرێتەوە بەدەستنوێژ و نوێژ و پەناگرتن بەخوا لەشەیتانی نەفرەت لێکراو.

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥١١٢).

[2] – بوخاری(٣٢٨٦) و موسلیم(١٣٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٧٨٤).

## ٢١- ئەگەر شتێکی بینایە و بەلایەوە خۆشەویست و شیرین بووایە چی ئەفەرموو؟

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەگەر شتێکی ببینایە بەلایەوە خۆشەویست و شیرین بووایە ئەیفەرموو:"الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ"،ئەگەر شێکی ببینیایە حەزی پێ نەبووایە ئەیفەرموو:"الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ"[1].

## ٢٢- چی دەفەرموو بەو کەسەی شتێکی بۆ نزیکبخستبایەتەوە یان چاکەیەکی بۆ بکردبایە؟

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەپاڕایەوە بۆ ئەو کەسەی شتێکی لێیەوە نزیکبخستبایەتەوە پێی خۆش بووایە و گونجاو بووایە. ئیبن عەباس ئاوی دەستنوێژەکەی لێ نزیکخستەوە فەرمووی:"اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ"[2]،واتا: خوایە گیان لەئایین تێبیگەیەنە و فێری لێکدانەوەی قورئانی بکە.

فەرموویەتی:"مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللَّهُ خَيْرًا. فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ"[3]،واتا: هەرکەسێ چاکەیەکی بۆ کراو بەئەنجامدەری چاکەکە وتی: خوای گەورە بەچاکە پاداشتت بداتەوە، ئەوە ئەوپەڕی سوپاس و ستایشی کردووە.

قەرزێکی کرد لەعەبدوڵڵای کوڕی رەبیعە، پاشان بۆی بردەوە و فەرمووی:"بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْحَمْدُ وَالْأَدَاءُ"[4]،واتا:خوای گەورە بەرەکەت بخاتە خێزان و سەروەت و سامانتەوە، سوپاس و گەیاندن پاداشتی گەڕاندنەوەی قەرزە.

---

[1] – ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٣٨٠٣).

[2] – بوخاری(١٤٣) و موسلیم(٢٤٧٧) ئیخراجیان کردووە.

[3] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٠٣٥).

[4] – ئیبن ماجە(٢٤٢٤) و نەسائی(٤٦٨٣) ئیخراجیان کردووە.

کاتێ جەریر زی ئەلخولسەی، بتی دەوسی لەکۆڵ کردەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێنج جار دوعای بەرەکەتی کرد بۆ پیاوان و ئەسپەکانی ئەحمەس[1].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە دیارییەکی بۆ بهێنرابایە قبوڵی دەکرد، بەزیاتر لەو دیارییە پاداشتی خاوەن دیاریی دەدایەوە، ئەگەر رەتیشی بکردبایەتەوە عوزری بۆ خاوەن دیاریی دەهێنایەوە، وەك ئەوەی بەسەعبی کوڕی جەسامەی فەرموو کاتێ گۆشتی راوی بۆ هێنا و فەرمووی:"إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلَّا أَنَّا حُرُمٌ"[2]،واتا: بۆیە رەتیدەکەمەوە و لێتی قبوڵ ناکەم، ئیحرامم بەستووە.

## ٢٣- یەکێ گوێی لەزەڕینی گوێدرێژ و دەنگی کەڵەشێر بێ چی بڵێ؟

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی بەئوممەتەکەی داوە ئەگەر گوێبیستی زەڕینی گوێدرێژبوون، بڵێن(أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)، ئەگەر گوێبیستی دەنگی کەڵەشێریش بوون بڵێن(اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)[3] و داوای فەزڵی خوا بکەن.

## ٢٤-کەراهەتی نەبوونی زیکر و یادی خوا لەمەجلیسدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رقی بووە لەوەی مەجلیس یاد و زیکری خوای تێدا نەبێ، فەرموویەتی:"مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ فِيهِ إِلَّا قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ الْحِمَارِ"[4]،واتا: هەر قەوم و کۆمەڵێك لەمەجلیس دابنیشن و دواتر بڵاوەی لێ بکەن و ئەو مەجلیسە یادی خوای تێدا نەکرابێ، وەك ئەوەیە لەسەر لاکی گوێدرێژ هەڵسابن.

---

[1] - بوخاری(٤٣٥٦) و موسلیم(٢٤٧٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٢٥٨٥) و موسلیم(٢٥٣٦) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(٣٣٠٣) و موسلیم(٢٧٢٩) ئیخراجیان کردووە.

[4] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٨٥٥).

هەروەها فەرموویەتی: "مَنْ قَعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْهِ تِرَةً، وَمَنِ اضْطَجَعَ مَضْجَعًا لا يَذْكُر اللهَ فِيهِ كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةً"[1]، واتا: هەرکەسێ لەشوێنێ دابنیشێ و تیایدا یادی خوای گەورە نەکات، ئەوە لەلایەن خوای گەورەوە حەسرەتێکی پێ دەدرێ، هەرکەسێك پالْ بداتەوە و رابکشێ و تیایدا یادی خوا نەکات، لەلایەن خوای گەورەوە حەسرەتێکی پێ دەدرێ.

فەرموویەتی: هەرکەسێ لەمەجلیسێکدا دانیشت قسەی تێکەڵ و پێکەڵی زۆر تیادا کرا، پێش ئەوەی لەمەجلیسەکەی هەڵبستێ بڵێ: "سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ" لەهەڵەی نێو مەجلیسەکەی لێخۆشبوونی بۆ دەکرێت"[2].

## ٢٥-ئەوەی لەکاتی ترسدا دەوترێ

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هاوەڵانی فێر دەکرد لەکاتی ترس و راچەڵەکیندا بڵێن: "أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِيْنِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ"[3]، واتا: پەنا دەگرم بەفەرمایشتە تەواوەکانی خوای گەورە لەتووڕەیی و سزای خۆی و خراپەی بەندەکانی و چپەی شەیتان و ئامادەیی شەیتان و جنۆکەکان.

## ٢٦-حەز نەکردنی بەوتنی هەندێ وشە

لەوانە: دەروونم پیس بووە. تێکەڵهات، بەڵکو بووترێت: رەق بووە[4].

---

[1] – ئەبو داوود(٤٨٥٦) و ترمیزی(٣٣٨٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٤٣٣).

[3] – ئەبو داوود(٣٨٩٣) و ترمیزی(٣٥٢٨) ئیخراجیان کردووە.

[4] – بوخاری(٦١٧٩) و موسلیم(٢٢٥٠) ئیخراجیان کردووە.

لەوانە: حەزی نەکردووە بەتریێ بووتریێ(كَرْم) و نەهی کردووە ئەو ناوەی پێ بووترێت، فەرموویەتی:"لاَ تَقُولُوا: الْكَرْمُ، وَلَكِنْ قُولُوا: الْعِنَبُ، وَالْحَبَلَةُ"، مەڵێن(الْكَرْمُ)، بەڵکو بڵێن(الْعِنَبُ، وَالْحَبَلَةُ)[1].

رەتیکردووەتەوە بووترێت: خەڵکیی تیاچوون و فەرموویەتی:"مَنْ قَالَ: هَلَكَ النَّاسُ، فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ"[2]،واتا: هەرکەسێ وتی: خەڵکیی تیاچوون، ئەوە خودی خۆی خەڵکی بەتیاچووندا بردووە.

نزیك بەواتای ئەوە: خەڵکیی خراپ بوونە، زەمانە خراپ بووە و هاوشێوەی ئەوە.

نەهیکردووە بووترێت: ئەگەر خوا و فلانە کەس بیانەوێ، بەڵکو بووترێت: ئەگەر خوا بیەوێ پاشان فلانە کەس.

پیاوێك پێیووت: ئەگەر خوا و تۆ ویستتان لێی هەبێ. پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"جَعَلْتَنِي لِلَّهِ نِدًّا؟ قُلْ: مَا شَاءَ اللَّهُ وَحْدَهُ"[3]،واتا: منت کردە هاوبەشی خوا؟ بەڵکو بڵێ: ئەگەر تەنیا خوای گەورە ویستی لێ هەبێ. لەواتای ئەمەدا وتەی تر هەیە: ئەگەر خوا و فلان نەبووایە ئەوە نەدەبوو، ئەمەش ناشیرینتر و خراپترە.

لەوانە: بارانمان بۆ داباری بەئاماژەی فلان و فلان، بەڵکو بڵێ بارانمان بۆ داباری بەفەزڵ و بەزەیی خوا[4].

لەوانە: سوێندخواردن بەغەیری خوا، بەدروست لەپەیامبەری خوای گەورەوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ أَشْرَكَ"[5]،واتا: هەرکەسێ سوێند بەغەیری خوا بکات، هاوبەشیی بڕیار داوە.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٤٨).

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٦٢٣).

[3] - ئیبن ماجە(٢١١٧) و ئەحمەد٤/٣٤١(٢٥٦١) ئیخراجیان کردووە.

[4] – بوخاری(٨٤٦) و موسلیم(٧١) ئیخراجیان کردووە.

[5] – ئەبو داوود(٣٢٥١) و ترمیزی(١٥٣٥) ئیخراجیان کردووە.

لەوانە: ئەوەی لەسوێندخواردنیدا بڵێ: جولەکە بێ یان گاور یان بێباوەڕ بێ ئەگەر فلانە شت بکات[1].

لەوانە: بەموسڵمانێ بڵێ: ئەی بێباوەڕ[2].

لەوانە: بەسوڵتان بڵێ: پادشای پادشایان[3]. قیاس لەسەر ئەوە، وشەی دادوەری دادوەران.

لەوانە: گەورە، بەکۆیلە ژن و پیاوەکەی بڵێ: بەندەکەم، کۆیلە و خزمەتکاریش بەگەورەکەی بڵێ: پەروەردگارم. بەڵکو گەورە، بەکۆیلە ژن و پیاوەکانی بڵێ: کچەکەم، کوڕەکەم. خزمەتکار و کۆیلەش بڵێ: گەورەکەم[4].

لەوانە: جنێودان بەڕەشەبا لەکاتی هەڵکردنیدا، بەڵکو دەبێ لەخوای گەورە داوای خێری ئەو رەشەبایە بکرێت و خێری ئەوەی پێی نێردراوەو پەنا بەخوا بگیردرێ لەشەڕی رەشەبا و ئەو شەڕەی بەڕەشەبا نێردراوە[5].

لەوانە: جنێودان بەتا، نەهیکراوە جنێو بە تا بدرێت و فەرموویەتی:"إِنَّهَا تُذْهِبُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ كَمَا يُذْهِبُ الكِيْرُ خَبَثَ الحَدِيْدِ"[6]،واتا: تا، تاوانەکانی مرۆڤ دەسڕێتەوە هەروەك چۆن کورەی ئاگر ژەنگ و پیسیی سەر ئاسن لادەبات.

لەوانە: نەهیکردن لەجنێودان بەکەڵەشێر، بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"لَا تَسُبُّوا الدِّيكَ فَإِنَّهُ يُوقِظُ لِلصَّلَاةِ"[7]،واتا: جنێو بەکەڵەشێر مەدەن، ئەو بۆ نوێژ هەڵدەستێت.

---

[1] – ئەبو داوود(٣٢٥٨) و نەسائی(٣٧٧٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٦١٠٤) و موسلیم(٦٠) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بوخاری(٦٢٠٦) و موسلیم(٢١٤٣) ئیخراجیان کردووە.

[4] – بوخاری(٢٥٥٢) و موسلیم(٢٢٤٩) ئیخراجیان کردووە.

[5] – ئەبو داوود(٥٠٩٧) و ترمیزی(٢٢٥٢) ئیخراجیان کردووە.

[6] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٥٧٥).

[7] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥١٠١).

لەوانە: بانگەشەکردنی سەردەمی نەفامی[١] و پرسەگێڕان بەجۆری سەردەمی نەفامان[٢]، وەك بانگەواز و بانگەشەی دەمارگیری و هۆزایەتی و رەچەڵەك و دەمارگیریی بۆ مەزهەب و تەریقەت و مەشایەخ.

لەوانە: ناوبردنی عیشا بە(العتَمة) و زاڵکردنی بەسەریدا تاوەکو وشەی عیشا واز لێبهێنرێت[٣].

لەوانە: نەهیکردن لەجنێودان بەموسڵمان[٤] ،نەهیکردن لەوەی ئەگەر سێ کەس پێکەوە بوون دووانیان چپە چپ بکەن[٥]، نەهیکردن لەوەی ئافرەتێ باس لەجوانیی ئافرەتێکی تر بۆ مێردەکەی بکات[٦].

لەوانە: لەپاڕانەوەیدا بڵێ:"اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ،وارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ"[٧]،واتا: خوایە گیان ئەگەر ویستت لێم خۆش بە، ئەگەر ویستت بەزەییت پێمدا بێتەوە.

لەوانە: نەهیکردن لەزۆر سوێندخواردن[٨].

لەوانە: نەهیکردن لەوەی پیاوێك باس لەجووتبوونی لەگەڵ خێزانەکەی و نهێنی ژن و مێردایەتیی خۆیان بۆ خەڵك بکات[٩]، هەروەك سووك و نەفامان ئەوە دەکەن.

---

[١] - بوخاری(١٢٩٤) و موسلیم(١٠٣) ئیخراجیان کردووە.

[٢] - ئەحمەد ئیخراجی کردووە٣٥/ ١٥٧(٢١٢٣٣).

[٣] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٦٤٤).

[٤] - بوخاری(٦٠٤٤) و موسلیم(٦٤) ئیخراجیان کردووە.

[٥] - بوخاری(٦٢٨٨) و موسلیم(٢١٨٤) ئیخراجیان کردووە.

[٦] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٢٤٠).

[٧] - بوخاری(٦٣٣٩) و موسلیم(٢٦٧٩) ئیخراجیان کردووە.

[٨] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٦٠٧).

[٩] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٣٧).

**بەش**

پێویستە هەموو کەسێك تەواو وریایی بکات لەزیادەڕۆیی و سەرکەشیی وشەی(من)و (بۆ من) و (لای من) بکات(أنا، لي، عندي)، ئەو سێ وشەیە بوو ئیبلیس و فیرعەون و قارونیان پێ تاقیکرایەوە، ئیبلیس وتی:﴿ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ ﴾ **الأعراف: ١٢** ،واتا: من لەو باشترم. فیرعەون وتی:﴿ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ ﴾ **الزخرف: ٥١**،واتا: میسر هی منە و من خاوەن و پادشای میسرم. قارون وتی:﴿ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ ﴾ **القصص: ٧٨** ، واتا: بەزانستی خۆم ئەمەم بەدەستهێناوە.

باشترین شتێك کە بەندەی وشەی(من، خۆم) بەکاربهێنێ، ئەوەیە بڵێ: منی بەندەی تاوانباری هەڵەکار داوای لێخۆشبوون دەکەم و دان بەهەڵەی خۆمدا دەنێم. بڵێ: من تاوانم هەیە، من هەڵەم هەیە، من پێویستییم هەیە، من هەژار و سەرکزییم هەیە، وەك فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ اغْفِر لي جدي وهزلي وخطئي وعمدي، وكل ذَلِكَ عِنْدِي"[1]،واتا: خوایە گیان لەکردەوەکانم خۆش بە، لەکرداری ڕاست و گاڵتە و هەڵەو ئەنقەست و هەر شتێك لەمنەوە سەرچاوە دەگرێت.

[1]– بوخاری(٦٣٩٩) و موسلیم(٢٧١٩) ئیخراجیان کردووە.

## نۆیەم: بەشی جیهاد

لەبەر ئەوەی جیهادکردن، لوتکە و گومەزی ئیسلامە و شوێنانی جیهادکاران لەبەرزترین شوێنی بەهەشتدایە و لەدونیاشدا پایەبەرزییان بۆ هەیە و لەدونیا و ئاخیرەتدا پایەدارن، ئەوە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەلوتکەی ئەو پایە و مەقامەدایە، بەسەر هەموو جۆرەکانی جیهاددا بەرزبووەتەوە، مافی جیهاد و تێکۆشانی داوە لەپێناو خوای گەورەدا. بەدڵ و جەستە و بانگەواز و روونکردنەوە و شمشێرەوە جیهادی کردووە. کاتەکانی وەستانی لەگۆرەپانی جیهاددا بەدڵ و زمان و دەست بووە، بۆیە لەهەموو مرۆڤەکانی تر یادی زۆرتر و بەرزترەو لای خوا لەهەمووان بەرێزترە.

لەبەر ئەوەی جیهادکردنی دوژمنانی خوا لقێکی جیهادکردنی بەندەیە بەرانبەر بەدەروونی خۆی لەبەر خوا، هەروەك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي طَاعَةِ اللهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ ما نهى اللهُ عنه"[1]،واتا:موجاهید ئەو کەسەیە جیهاد و بەربەرەکانێی دەروونی خۆی دەکات لەپێناو خوا و گوێڕایەڵیی خوادا، کۆچەریش ئەو کەسەیە دەستبەرداری شتێك دەبێ خوای گەورە نەهی لێکردووە. ئەوە جیهادکردنی نەفس کەوتووەتە پێش جیهادکردنی دوژمنی دەرەوە.

ئەو دوو دوژمنە، خوای گەورە بەندەی بەجیهادکردنیان تاقیکردووەتەوە، لەنێوانیاندا دوژمنێکی سێیەم هەیە کە بەجیهادکردنی ئەو، جیهادی ئەو دووانەی تر دەکرێت، ئەویش شەیتانە، لەنێوانیاندا وەستاوەو بەندە سارد و تەمبەڵ دەکاتەوە لەجیهاد کردنیاندا، پەروەردگار ئەفەرمووێت:﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾ **فاطر: ٦** ، واتا: بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە دەی کەواتە ئێوەش بەدوژمنی خۆتانی دابنێن.

---

[1] – ئەبو داوود(١٤٤٩) و نەسائی(٢٥٢٦) بەنزیك بەوە ئیخراجیان کردووە.

ئەوەی خوای گەورە فرمانی داوە بەدوژمن وەربگیردرێت، ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەوەی لەدوژمنایەتیکردن و جەنگکردنیدا ئەوپەڕی توانا بدرێت.

سەبارەت بەو سێ دوژمنە، فرمان بەمرۆڤ کراوە جەنگ و جیهادیان بکات، لەم دونیایەشدا مرۆڤ بەجەنگکردنیانەوە تاقیکراوەتەوە و دەکرێتەوە، خوای گەورە یارمەتیدەر و چەکی ئەم جیهادکردنەی پێ داوە، بەدوژمنەکەشی داوێتی و بەیەکتر تاقیدەکرێنەوە، بەوە دەبێتە دۆستی ئەو کەسەی دۆستایەتی خوا دەکات و دەستبەرداری ئەوەش دەبێ کە دەچێتە ریزی شەیتان و دار و دەستەیەوە.

فرمانی بەمرۆڤەکان کردووە بەجیهادێك جیهادی بکەن مافی جیهادکردن و تێکۆشانەکە بدەن، هەروەك فرمانی کردووە بەجۆرێ خوا بپەرستن مافی تەواوی بدەن، هەروەها بەندە بەجۆرێ جیهادی دەروونی خۆی بکات تاوەکو دڵ و زمان و تەواوی ئەندامانی جەستەی بۆ خوا بن، جیهادی شەیتانیش بکات بەدرۆخستنەوەی بەڵێن و بەگوێ نەکردنی، بەو دوو جیهادەوە مرۆڤ دەتوانێ زاڵ بێ بۆ جیهادکردنی دوژمنانی خوا، جیهادێك بەدڵ و زمان و دەست و سەروەت و سامانی، تاوەکو تەنیا پەیام و وتەی خوا بەرز و بڵندبێ.

### ١- پلەکانی جیهاد

جیهاد چوار پلەی هەیە: جیهادکردنی دەروون، جیهادکردنی شەیتان، جیهادکردنی بێباوەڕان، جیهادکردنی دووڕووان.

**جیهادکردنی دەروون چوار پلەی هەیە:**

یەکەم: جیهادی دەروونی بکات بۆ فێربوونی ئیسلام.

دووەم: جیهادی دەروونی بکات بۆ کردارکردن بەو زانستەی فێری بووە.

سێیەم: جیهادکردنی دەروون لەبانگەوازکردن بۆ ئایینی خوا و فێرکردنی ئەوانەی کە نایزانن.

چوارەم: جیهادکردنی دەروون لەسەر ئارامگرتن لەناڕەحەتییەکانی بانگەوازکردن بۆ ئایینی خوا.

ئەگەر ئەو چوار پلەیەی کامڵ کرد، ئەبێتە یەکێك لەخواویستان(الربّانيين)، سەلەف یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هیچ زانایەك شایستە بەڕێزی خواویستان نییە تاوەکو حەق نەناسێ و کاری پێ نەکات و خەڵکیی پێ فێر نەکات.

هەرچی جیهادکردنی شەیتانە، ئەوە دوو پلەی هەیە:

یەکەم: جیهادکردنی لادان و ڕەتکردنەوەی ئەو گومان و چپە خراپانەی کە بەرانبەر بەئایین ئەیخاتە بەردەم مرۆڤ.

دووەم: جیهادکردنی لادانی ئەو ئیرادە خراپ و شەهوەتانەی دەیخاتەبەردەم مرۆڤ.

جیهادی یەکەم بەکەرەستە و چەکی یەقین و دڵنیایی دەکرێت، جیهادی دووەمیش بەچەکی ئارامگری، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ **السجدة: ٢٤** ،واتا: لەناو ئەواندا پێشەوایانێکمان دانا ڕێنمونی(خەڵك)یان دەکرد بە فەرمانی ئێمە کاتێك خۆیان گرت و بەئایەتەکانی ئێمە دڵنیابوون(باوەڕی بتەویان هێنا).

هەرچی جیهادکردنی بێباوەڕان و دووڕووانە، ئەوە چوار پلەی هەیە: بەدڵ، زمان، سەروەت و سامان، دەروون. جیهادی بێباوەڕان بەدەست، جیهادی دووڕووانیش بەزمان.

هەرچی جیهادکردنی ستەمکاران و خراپەکاران و بیدعەچییانە، ئەوە سێ پلەی هەیە: یەکەم: بەدەست ئەگەر توانا هەبوو، ئەگەر توانای دەست نەبوو ئەوە بەزمان، ئەگەر توانای ئەوەش نەبوو ئەوە لەدڵدا ڕقت لێبێتەوە و جیهادی بکە.

ئەوە سیانزە پلەی جیهاد بوو،"مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ بالغزو مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ النِّفَاقِ"[1]،واتا:هەرکەسێ بمرێ و جیهادی نەکردبێ و لەدەروونی خۆیدا تاووتوێی جیهادکردنی نەکردبێ، بمرێ لەسەر لقێکی دووڕوویی مردووە.

## ٢- مەرجی جیهادکردن

بەبێ هیجرەت جیهادکردن نییە، هیجرەت و جیهادکردنیش بەئیمان دەکرێن، ئەوانەی کە ئومێدیان بەخوای گەورە هەبووە، ئەو سێ کارەیان راپەڕاندووە، پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ﴾ **البقرة: ٢١٨**، واتا: بە ڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێنا و ئەوانەی کۆچیان کرد و تێکۆشان لەڕێی خوادا ئا ئەوانە چاوەڕوانی میهرەبانی خودان وە خوا لێ خۆش بوو میهرەبانە.

هەروەك چۆن ئیمان فەرزە بەسەر هەموو کەسێکەوە، ئەوە لەیەك کاتیشدا دوو هیجرەت بەسەر ئەو کەسەوە فەرزە:

- هیجرەت و کۆچکردن بۆلای خوای گەورە بەدڵسۆزی و یەکتاپەرستی و تەوبە و پشتبەستن بەخوا و ئومێد و خۆشویستنەوە.
- هیجرەت و کۆچکردن بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەوەی پەیڕەوی فرمانەکانی بکەین و هەواڵ و پەیامەکەی بەڕاست بخەینەوە و فرمان و هەواڵی ئەو پێشبخەین بەسەر فرمان و هەواڵی کەسی تر.

"فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ"[2]،واتا: هەرکەسێ کۆچکردنی

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٩١٠).

[2] - بوخاری(٥٤) و موسلیم(١٩٠٧) ئیخراجیان کردووە.

بۆلای خوای گەورەو پەیامبەرەکەی بێ، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ خوا و پەیامبەرەکەیەتی، بەڵام ئەو کەسەی هۆکاری کۆچەکەی بۆ دەستخستنی شتێکی دونیایە یان بۆ ئەوەی ئافرەتێك مارە بکات، ئەوە کۆچکردنەکەی بەپێی نیەتەکەیەتی کە بۆی کۆچی کردووە.

بەسەر مرۆڤەوە جیهادکردنی دەروونی خۆی و شەیتان فەرز کراوە، فەرزی عەینە و کەس ناتوانێ لەجێگەی یەکێکی تر ئەنجامی بدات، ئەوە جیهادی بێباوەڕان و دووڕووانە دەکرێ هەندێ لەموسڵمانان لەجیاتی تەواوی ئوممەت پێی هەڵبستن ئەگەر مەبەستی پێ هاتەدی.

### ٣- جیهادی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لە پێناو خوای گەورە

کامڵترین مەخلوقێك بەلای خوای گەورەوە، ئەوەیە کە هەموو پلەکانی جیهاد کامڵ و ڕێك دەخات، بۆیە لەوەدا کامڵترین و بەڕێزترینی نێو مەخلوقات بریتییە لەکۆتا پەیامبەر، چونکە لەپێناو خوای گەورەدا مافی تەواوی جیهادی دا لەو کاتەوەی بەپەیامبەرێتی نێردرا تاوەکو ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد، کە ئەم ئایەتەی بەسەردا دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ۝٤ ﴾ **المدثر: ١-٤،** واتا: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە. هەستە(خەڵکی) بێدار بکەرەوە. وە پەروەردگارت وە گەورە بگرە. وە پۆشاکت وە پاك ڕابگرە.

کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی، قۆڵی بانگەوازی هەڵماڵی و لەپێناو خوای گەورەدا تەواوترین هەوڵێکی دا و شەو و ڕۆژ و بەنهێنی و ئاشکرا بانگەوازی دەکرد، کە ئایەتی: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ﴾ **الحجر: ٩٤،** واتا:جا هەر فرمانێکت پێ دەدرێت بە ئاشکرا ڕایگەیەنە. بەجۆرێ فرمانی خوای ئاشکرا کرد، لەسەرزەنشتی هیچ سەرزەنشتکاری سڵی نەکردەوە و گوێی بەتانە و توانجی بێباوەڕان نەدا.

## ٤- ئازاردانی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) لەلایەن قورەیشەوە

کە فرمانی خوای گەورەی ئاشکرا کرد و راشکاوانە بانگەوازی قەومەکەی کرد، بەدەرخستنی عەیب و عاری خواوەندەکانیان و ئایینەکەیان دەستییێکرد،قورەیش سەخت ئازاری خۆی و هاوەلانی دا، جۆرەها ئازار و ئەشکەنجەیان بەسەریاندا هێنا، ئەوەش سوونەتی خوایە لەنێو مەخلوقاتدا، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ﴾ **فصلت: ٤٣** ،واتا: هیچ شتێك بە تۆ ناوترێت مەگەر ئەوەی بەپێغەمبەرانی بەر لە تۆ ووتراوە.

خوای گەورە بەو ئایەتە دڵی پەیامبەرەکەی دایەوە، پێی راگەیاند کە پەیامبەرانی پێش خۆی لەو ئازار و مەینەتییەدا پێشەنگ و نمونەن بۆی، هەروەها دڵی شوێنکەوتووانیشی دایەوە کە فەرمووی: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ ﴾ **البقرة: ٢١٤** ،واتا: ئایا واتان زانیووە کە دەچنە بەهەشت کەچی هێشتا نەهاتۆتە رێتان ئەوەی لەناڕەحەتی تووشی ئەوانە بوون کە لە پێش ئێوەدا تێپەڕین(کە لە رێی خوادا)دووچاری سەختی و زەرەر و زیان بوون وە زۆر بە توندی تەکان دران و نۆریان بۆ هات بەرەنگێك کە پێغەمبەرەکە و ئەوانەی کە بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا دەیان ووت سەرکەوتنی خوا کەی دێت ئاگاداربن و دڵنیابن بەڕاستی سەرکەوتنی خوا نزیکە.

مرۆڤ با لەسیاقی ئەو ئایەتانە رابمێنێ، هەرکەسێ وتی: وا باوەڕم هێنا و بوومە باوەڕدار، ئەوە خوای گەورە تاقییدەکاتەوە، جا هەرکەسێك نەیووت: وا بوومە

باوەڕدار، وەها نەزانێ خوای گەورە بێ توانایە و هیچی بەدەست نییە، بەڵکو تەواوی قۆناغەکان لەدەستی خۆیدایە و دەیپێچێتەوە.

مرۆڤی باوەڕدار سەرەتا لەدونیادا وەك تاقیکردنەوە، ئازار و ناڕەحەتیی دێتەڕێ، پاشان سەرەنجامی دونیا و قیامەتی بۆ دەبێ، بەڵام ئەوەی پشت دەکاتە باوەڕ، سەرەتا چێژ دەکات، بەڵام لەپاشەڕۆژدا ئازاری هەمیشەیی بۆ دەبێ.

پرسیار لەشافیعی کرا(بەڕەحمەت بێ)، کام لەم دووانە بۆ کەسێ باشە: بەهێز بکرێ یان تاقیبکرێتەوە؟ وتی: بەهێز و سەقامگیر نابێ هەتا تاقیی نەکرێتەوە.

بۆیە هیچ کەسێ وەها گومان نەکات لەئازار و ناخۆشیی رزگاری دەبێ، تەنیا ئەوە هەیە ئازارچەشتووان لەعەقلدا جیاوازی و کەم و زۆرییان هەیە، عاقڵترینیان ئەوەیانە کە ئازارێکی بەردەوامی گەورە ئەگۆڕێتەوە بەئازارێکی دوابڕاوی سووك، گەمژەترینیشیان ئەوەیانە کە ئازارێکی کەم و دابڕاو بەگۆڕێتەوە بەئازارێکی گەورەی بەردەوام.

لەبەر ئەوەی ئازار شتێکە مرۆڤ ناتوانێ لێی رزگاری ببێ، ئەوە خوای گەورە دڵدانەوەی ئەو کەسە دەکات کە ئازاری سووك و دابڕاوی هەڵبژاردووە بەسەر ئازاری گەورەی بەردەوامدا و ئەفەرمووێ: ﴿ مَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَـَٔاتٍۢ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٥﴾ ﴾ **العنكبوت: ٥** ،واتا: هەرکەس ئومێدی وایە بگات بەدیداری خوا(با بەندایەتی خوا بکات) چونکە بەڕاستی کاتی دیاریکراوی خوا هەردێت وە تەنها خوایە بیسەر و زانا و ئاگادار.

ماوەی ئەو ئازارەی داناوە بە(أجلاً) کە رۆژی دیداری خۆیەتی، ئا لەبەر ئەوەیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) داوای لەپەروەردگاری کردووە، تامەزرۆیی دیداری خۆی پێ بدات[1].

---

[1] – نەسائی ئیخراجی کردووە(١٣٠٥).

پاشان خوای گەورە بەدڵدانەوەیەکی تر دڵدانەوەی کردوون، ئەویش ئەوەیە، جیهادکردنیان لەپێنان خوای گەورە جیهادکردنیانە لەپێناو خۆیان، ئەگینا خوای گەورە پێویستی بەکەس نییە، پاشان هەواڵی پێداون کە بەجیهاد و ئیمانیان ئەیانخاتە ریزی کۆمەڵی چاکەکارانەوە.

پاشان هەواڵی داوە لەحاڵی کەسێك بەبێ بەرچاوڕوونیی چووەتە نێو ئیمانەوە، کاتێك ئەو کەسە لەلایەن خەڵکەوە تووشی فیتنەو نەهامەتی و ئەو ئازارە دەبێ کە پێویستە پەیامبەران و شوێنکەوتووانیان بیچێژن، ئەو ئازار و ناخۆشییە بەو سزایەی خوا دەبینێ کە باوەڕداران بەئیمانیانەوە لێی هەڵهاتوون.

مەبەست: حیکمەتی خوای گەورە وەهای پێویست کردووە کە دەبێ دەروونەکان تاقیبکاتەوە، بەو تاقیکردنەوەیە دەروون پاك و چەپەڵ لەیەك جیاببنەوە. دەروونەکان لەبناغەدا نەفام و ستەمکارن، ئەوەندە پیس بوون پێویست بەوە بکات پاك و پوخت بکرێنەوە، ئەگەر لەم دونیایەدا پاك نەبوونەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخ پاکیان دەکاتەوە، مرۆڤ کە پوخت و پاك کرایەوە، ئەوجا رێگە دەدرێت بچێتە بەهەشتەوە.

## ٥- سەبارەت بەوانەی پێشکەوتن لەبەدەمەوەچوونی بانگەوازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)

کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بانگەوازی دەستپێکرد، لەهەموو هۆزێك خەڵکانێك بەدەم بانگەوازەکەیەوە هاتن،ئەوەی پێشکەوت و براوە بوو لەپێشبڕکێی بەدەمەوەچوون، راستگۆی ئوممەت ئەبو بەکری سدیق بوو(خوای لێ رازیی بێ)، لەگەیاندنی ئایینی خوادا پشتی گرت و بەرچاوڕوونانە لەگەڵیدا بانگەوازی بۆلای خوا



کرد،ئەوانەی بەدەم بانگەوازی ئەبو بەکری سدیقەوە هاتن، ئەمانە بوون: عوسمانی کوڕی عەفان و تەڵحەی کوڕی عوبەیدوالله و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس.

ڕاستگۆی نێو ژنان، خەدیجەی کچی خوەیلد بەدەم بانگەوازەکەیەوە هات.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب(خوای لێ ڕازیی بێ) هەشت ساڵان بوو بەدەم بانگەوازەکەیەوە هات کە لەئەستۆی پەیامبەری خوادا بوو(صلى الله عليه وسلم) و لەئەبو تالیبی مامی وەریگرت.

زەیدی کوڕی حاریسەی خۆشەویستی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەدەم بانگەوازەکەیەوە هات کە خزمەتکاری خەدیجە بوو، خەدیجە کردبوویە دیاریی بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم).

خەڵکیی یەك بەدوای یەك دەهاتنە نێو ئیسلامەوە، قورەیش ئەوەی ڕەت نەدەکردەوە تاوەکو کەوتە عەیبدارکردنی ئایینەکەیان و باسکردنی خواوەندەکانیان، بەوەی نە سوودیان هەیە و نە زیان، ئەوکات دوژمنکارانە بەڕووی خۆی و هاوەڵانیدا هەڵسانەوە، خوای گەورە بەئەبو تالیبی مامی، پەیامبەری خۆی پاراست، چونکە پیاوێکی گەورە و بەڕێز بوو لای قورەیش و خەڵکی مەککە گوێڕایەڵی بوون و بوێرییان نەدەکرد ئازار و ئەشکەنجەی بەڕوودا دەربخەن، هەرچی هاوەڵانی بوو، ئەوەی عەشیرەتی هەبوو عەشیرەتەکەی دەیپاراست، ئەگینا ئەوانی تر ڕووبەڕووی ئازار و ئەشکەنجە دەبوونەوە، لەوانە: عەماری کوڕی یاسر و سومەیەی دایکی و بنەماڵەکەی کە هەموویان لەبەر خوا ئەشکەنجە دران، هەروەها بیلالی کوڕی ڕەباح کە سەختترین سزای لەپێناو خوای گەورەدا چەشت.

### ٦- کۆچکردن بۆ حەبەشە

کە سزا و ئەشکەنجەی هاوبەش پەیداکەران بۆ سەر باوەڕداران سەخت بوویەوە و ئەوەندە ئازار دەدران تاوەکو لێیان هەبوو هاوار بکاتە لات تاوەکو وازی لێبهێنن، مۆڵەتی دان کۆچی یەکەم بکەن بۆ خاکی حەبەشە، یەکەمین کەسێك بۆ ئەویٚ کۆچی کرد، عوسمانی کوڕی عەفان و روقیەی خێزانی بوو کە کچی پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم)، خەڵکانی نێو ئەو یەکەمین کۆچە، دوانزە پیاو و چوار ئافرەت بوون، دەرچوونیان لەمانگی رەجەبی ساڵی پێنجەمی پەیامبەرایەتیی بوو.
قورەیش بەدوایاندا دەرچوون تاوەکو گەیشتنە دەریا و دەستیان بەکەسیان نەگەیشت، پاشان هەواڵیان پێگەیشت کە قورەیش دەستیان هەڵگرتووە لەئازاردانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بۆیە گەڕانەوە، پاشان کە کاتژمێرێکی رۆژ مابوو نزیکی مەککە بوونەوە، پێیان گەیشت کە قورەیش لەجاران سەختتربوونە لەدوژمنایەتیکردنی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ناچار خۆیان دایە پاڵ کەسوکار.
پاشان بەلاٚو نەهامەتیی قورەیش سەختتربوویەوە بۆ سەر ئەوانەی لەحەبەشە گەڕابوونەوە و بۆ سەر کەسانی تریش، عەشیرەتەکانیان بەرانبەریان توندبوونەوە و ئازاری زۆریان بەسەریاندا هێنا؛ بۆیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی دان بۆ جاری دووەم دەربچن بۆ خاکی حەبەشە، دەرچوونی دووەم بەسەریانەوە سەختتر بوو.

ژمارەی ئەوانەی لەجاری دووەمدا دەرچوون، سی و سیٚ پیاو و نۆزدە ئافرەت بوون.

کە دەی مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی حەوتی، کۆچی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە هات، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نووسراوی نووسی بۆ نەجاشی و بانگەوازی کرد بۆ موسڵمان بوون، لەگەڵ عەمری کوڕی ئومەییەی

ئەلزەمری ناردی، کە نووسراوەکەی بۆ خوێندەوە موسڵمان بوو وتی: ئەگەر توانای ئەوەم هەبووایە بچم بۆلای، دەچووم بۆلای.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆی نووسی کە لەو هاوەڵانەی لای ئەون، بۆی رەوانەیان بکاتەوە، ئەویش لەدوو کەشتییدا لەگەڵ عەمری کوڕی ئومەییەی ئەلزەمریی ناردیانیەوە، هاتن بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە لەخەیبەر بوو لەوێدا پێیگەیشتن بینیان خەیبەری فەتحکردووە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داوای لەموسڵمانان کرد لەپشکی خەیبەر بەشدار بکرێن، ئەوانیش ئەوەیان کرد و ئەوانیان پشکدار کرد.

### ٧- شاندی قورەیش بۆلای نەجاشی

کۆچەران لەپادشانشینەکەی ئەسحەمەی نەجاشیی بەئارام گیرسانەوە، کە قورەیش بەو هەواڵەیان زانی، شاندێکی بەدوایاندا بەدیارییەوە ناردە لای نەجاشی تاوەکو رادەستیان بکاتەوە، شاندەکە پێکهات لەعەبدوڵڵەی کوڕی ئەبی رەبیعە و عەمری کوڕی عاس، بەدیاری و توحفەی نیمچە دوورگەی عەرەبەوە رۆیشتن، بەڵام نەجاشیی داواکەیانی رەتکردەوە، بۆیە پەنایان بردە بەر تکای گەورەکانی وڵاتەکەی، بەدەم تکا و داوای ئەوانیشەوە نەڕۆیشت.

### ٨- بڵاوبوونەوەی ئیسلام و پچڕاندنی پەیوەندیی قورەیش لەگەڵ بەنی هاشم و بەنی عەبدولموتەلیب

پاشان حەمزە و کۆمەڵێکی زۆر بوونە موسڵمان، ئیسلام بڵاوبوویەوە، کە قورەیش بینی بانگەوازی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) زیاتر و زۆرتر دەبێ، کۆبوونەوە بۆ رێککەوتن دژ بەبەنی هاشم و عەبدولموتەلیب، رێککەوتن کڕین و فرۆشتن و ژن و

ژنخوازییان لەگەڵدا نەکەن، قسەیان لەگەڵدا نەکەن و لەمەجلیسیان دانەنیشن تاوەکو پەیامبەری خوایان رادەست نەکەن(صلی الله علیه وسلم)، بۆ ئەوە پەیماننامەیەکیان نووسی و بەسەقفی کەعبەدا هەڵیانوواسی.

لەشەوی دەرکەوتنی مانگی موحەڕەمی ساڵی حەوتی پەیامبەرایەتی، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لەدۆڵی ئەبو تاڵیب گەمارۆ دران.

بۆ ماوەی سێ ساڵ بەگلدراوی و گەمارۆدراویی مانەوە، هەتا ئەوەی تاقەتیان لەبەر بڕا و دەنگی گریانی منداڵەکانیان لەو دیوو دۆڵەکەوە دەبیسترا.

قورەیش ئەوکات بوونە دوو بەشەوە، بەشێکیان بەوە رازیی بوون و بەشێکی تریان بەدەنگ هاتن و ناڕەزاییان دەربڕی، ئەوانەی ناڕازیی بوون هەوڵیان دا پەیماننامەکە هەڵبوەشێننەوە، ئەوەی بەو کارە هەڵسا، هیشامی کوڕی عەمری کوڕی ئەلحاریس بوو، رۆیشت بۆلای موتعیمی کوڕی عەدی و کۆمەڵێکی قورەیش، ئەوانیش بەدەم داواکەیەوە رۆیشتن.

پاشان خوای گەورە سەبارەت بەپەیماننامەکە هەواڵی پێدا کە مۆرانە لێی داوە، هەموو ئەو بەشەی خواردووە کە باس لەستەمکردن دەکات جگە لەوە نەبێ کە یادی خوایە، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)یش ئەوەی بەمامی گەیاند، ئەویش دەرچوو بۆلای قورەیش و هەواڵی پێدان کە برازاکەی ئەوە و ئەوەی وتووە، ئەگەر قسەی ئەو بوو مۆرانە خواردبووی، ئەوە دەستمان لەسەر هەڵبگرن و پچڕاندنی پەیوەندیی وازلێبهێنن، ئەگەر راستی نەکرد و مۆرانە لێی نەدابوو، ئەوە ئێمە وازی لێدەهێنن و چیتان دەوێ بیکەن. وتیان: قسەیەکی تەواوە. رۆیشتن سەیری پەیماننامەکە بکەن، بینیان دەرکەوت بەو جۆرەیە کە پەیامبەر(صلی الله علیه

وسلم) هەواڵی داوە، کەچی بێباوەڕتربوون، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و ئەوانەی لەگەڵی بوون لەدۆڵەکە دەرچوون.

ئیبن عەبدولبیر ئەڵێ: دوای دە ساڵی پەیامبەرایەتی بوو، دوای شەش مانگ لەوە ئەبو تاڵیب مرد، دوای ئەویش بەسێ ڕۆژ خەدیجە کۆچی دوایی کرد. وتراوە: کاتی تر بووە.

## ٩- مردنی خەدیجە و ئەبو تاڵیب و دەرچوونی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بۆ تائیف

کە پەیماننامەکە هەڵوەشایەوە و هاوکاتی کۆچی دوایی خەدیجە و مردنی ئەبو تاڵیب بوو کە ماوەیەکی کەمیان لەنێواندا بوو، لەلایەن نەفام و سووکەکانی قەومەکەیەوە ئازار و ناڕەحەتیی زۆرتر بەسەر پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)دا هات، بوێرییان بەرانبەر کرد و ئازاریان بەرانبەر دەرخست، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەرچوو بۆ تائیف بەئومێدی دەخستنی پشتیوان و سەرخەر، پشتیوانی بۆ پەیدا ببێ بەرانبەر بەقەومەکەی و بیپارێزن، بانگەوازی کردن بۆ ئایینی خوا، بەڵام کەسی نەبینی داڵدەی بدات، لەگەڵ ئەوەشدا ئازاری زۆریان دا و بەجۆرێ ناڕەحەتیان کرد قەومەکەشی ئاوەهای لەگەڵ نەکردبوو.

لەگەڕانەوەیدا پاڕانەوەی بەناوبانگی کرد-پاڕانەوەی تائیف- کە فەرمووی:"اللَّهُمَّ إِلَيْك أَشْكُو ضَعْفَ قُوّتِي، وَقِلّةَ حِيلَتِي، وَهَوَانِي عَلَى النّاسِ يَا أَرْحَمَ الرّاحِمِينَ أَنْتَ رَبّ الْمُسْتَضْعَفِينَ وَأَنْتَ رَبّي، إلَى مَنْ تَكِلُنِي؟ إلَى بَعِيدٍ يَتَجَهّمُنِي؟ أَمْ إلَى عَدُوّ مَلّكْتَهُ أَمْرِي؟ إنْ لَمْ يَكُنْ بِك عَلَيّ غَضَبٌ فَلَا أُبَالِي، غَيْرَ أَنّ عَافِيَتَك أَوْسَعُ لِي، أَعُوذُ بِنُورِ وَجْهِك الّذِي أَشْرَقَتْ لَهُ الظّلُمَاتُ، وَصَلُحَ عَلَيْهِ أَمْرُ الدّنْيَا وَالْآخِرَةِ، أَنْ يَحِلّ عَلَيّ غَضَبُك

أَوْ أَنْ يَنْزِلَ بِي سَخَطُكَ، لَكَ الْعُتْبَى حَتَّى تَرْضَى، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِكَ"[1]،واتا: خوایە گیان شەکوای لاوازیی و نەبوونی رێگە چارەم دەهێنمە لای تۆ، ئەوەی خەڵکم بەسەردا زاڵە و ئازارم دەدەن و چارەم نییە، ئەی بەبەزەیی بەبەزەییان، تۆ پەروەردگاری لاوازان و پەروەردگاری منی، بۆلای کێ رادەستم دەکەی و بەکێم دەسپێری؟ بۆ کەسێکی دوور کە پەلامارم دەدات و ئازارم دەدات یان دوژمنێك بوارم نادات، ئەگەر تۆ لە من تووڕە نەبی، ئەوە من خەمم نییە بەوەی چیم بەسەردێ، بەڵام عافیێت و سەلامەتیی خۆتم بۆ فراوان بکە، پەنا دەگرم بەنور و رووناکیی خۆت کە تاریکاییەکانت بۆ رووناك کردووەتەوە و کاری دونیا و ئاخیرەتت لەسەری چاك و لەبار کردووە، تکات لێ دەکەم ئەگەر تووڕەییەکت لەسەرم هەیە لایبدەی، لەدەرگای تۆ دەدەم هەتا رازیی دەبی و بەتۆوە هێزی گۆڕانکاریی بوونی هەیە.

خوای گەورە فریشتەی چیاکانی ناردەلای تاوەکو فرمانی لێ وەربگرێت هەردوو چیای ئەخشەبەین بەسەر خەڵکی مەککەدا بدات لەیەك، چونکە خەڵکی مەککە لەنێوان هەردوو چیادا بوون کە پێیان دەوترا ئەخشەبەین، فەرمووی:"لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُخْرِجَ مِنْ أَصْلَابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا"[2]،واتا:نە ئەوەم ناوێ، بەڵکو خوای گەورە لەپشت و وەچەی ئەوان خەڵکانێك بهێنێتە دونیاوە بەتاك و تەنیایی خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن.

کە لەگەڕانەوەدا لەنەخلە لای دا، شەو هەڵسا بۆ نوێژکردن، خوای گەورە وەهای قەدەر کرد کۆمەڵێ جنۆکە بچن گوێ لەقورئانخوێندنەکەی بگرن، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەستی پێیان نەکرد هەتاوەکو ئەم ئایەتە دابەزی:﴿ وَإِذْ

---

[1] – ئیبن هیشام لە السیرة١/٤٢٠ و تەبەری لە(تاریخ)ەکەیدا٢/٣٤٥ ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٣٢٣١) و موسلیم(١٧٩٥) ئیخراجی کردووە.

صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ ﴾

**الأحقاف: ٢٩ – ٣٢** ،واتا: بیریان بخەرەوە کاتێك چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆ لات تا گوێ لەقورئان بگرن جا کاتێك ئامادەی گوێ گرتن لە قورئان بوون ووتیان(بەیەکتری)بێ دەنگ بن(و گوێ بگرن) جا کە(قورئان خوێندنەکە)تەواو بوو هەموویان گەڕانەوە بۆلای قەوم و هۆزەکەیان بەترسێنەر. ووتیان ئەی هۆز و قەومەکەمان بەڕاستی ئێمە گوێ بیستی کتێبێك بووین کە لەپاش موسا نێردراوەتە خوارەوە پەڕاوەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێت(خەڵك) ڕێنموونی دەکات بۆ هەق و ڕێبازی ڕاستی. ئەی قەومەکەمان وەلامی بانگخوازی خوا(موحەممەد صلی الله علیه وسلم) بدەنەوە و باوەڕی پێ بهێنن(خوا)لە تاوانەکانتان خۆش دەبێت و دەیسڕێتەوە وە لەسزای سەخت دەتان پارێزێت. هەرکەسیش وەلامی بانگخوازی خوا(کە موحەممەدە صلی الله علیه وسلم) نەداتەوە، ئەوە بەهیچ جۆرێك ناتوانێ لە زەویدا لەدەست خوا دەرچێ و خۆی قوتار کات وە جگە لەخوا یارمەتیدەر و پشتیوانێکی نیە، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

### ١٠- شەوڕەوی

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەجەستە-بەدروست- لەمزگەوتی حەرامەوە بۆ بەیتولمەقدیس شەوڕەویی پێ کرا بەسەر بوراقەوە، ئەوەی لەگەڵیدا

بوو جبریل بوو(سەلامی خوای لەسەربێ)، لەوێ دابەزی و ئیمامەتیی نوێژی بۆ پەیامبەران کرد و بوراقی بەئەڵقەی دەرگای مزگەوتی ئەقساوە بەستەوە، پاشان ئەو شەوە بەبوراق لەبەیتولمەقدیسەوە بەرزبوویەوە بۆ ئاسمان، پاشان لەوێوە بۆلای خوای پەروەردگار پێی بەرزبوویەوە و ئەوەندە لەخوا نزیك بویەوە بەئەندازەی دوو کەوان یان کەمتر بوو، خوای گەورە وەحی بۆ بەندەکەی خۆی کرد و دواندی، پەنجا نوێژی لەسەر فەرزکرد، کە گەڕایەوە بەلای موسادا تێپەڕبوو، موسا پێی فەرموو: بەچی فرمانت پێ کرا؟ فەرمووی: بەپەنجا نوێژ. وتی: ئوممەتەکەت توانای پەنجا نوێژیان نییە، بگەڕێرەوە بۆلای خوای گەورە و داوای کەمکردنەوەی بکە بۆ ئوممەتەکەت. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لای کردەوە بەلای جبریلدا وەك ئەوەی راوێژی پێ بکات و تۆ چی ئەڵێی، ئەویش ئاماژەی پێ دا بەڵێ ئەگەر بتەوێ. ئاوەها لەنێوان خوا و موسادا مایەوە دەهات و دەچوو هەتاوەکو کردیە پێنج جار، دیسان موسا فرمانی پێ کرد بگەڕێتەوە داوای کەمکردنەوە بکات، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئیتر شەرم لەپەروەردگارم دەکەم، رازیی دەبم بەو پێنج نوێژە و ملکەچ دەبم. کە ئەوە یەکلابوویەوە، جاڕدەرێ جاڕی دا و فەرمووی: ئەوە من فەرزی خۆمم بڕیار دا و لەسەر بەندەکەم کەمم کردەوە[1].

کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەنێو قەومەکەیدا بەیانیی کردەوە، ئەو هەواڵەی پێیدان، سەخت بەدرۆیان زانی و رەتیان کردەوە شتی وەها رووی دابێ، داوایان لێکرد وەسفی بەیتولمەقدیسیان بۆ بکات، خوای گەورە بەیتولمەقدیسی بۆ بەرزکردەوە و خستیە پێش چاوی، بەجۆرێ وەسفی کردن نەیانتوانی شتێکی لەدژ رەتبکەنەوە. هەواڵی گەڕانەوەی کاروانی وشترەکەیانی پێ دان لەکوێ دەڵەوەڕێن و

---

[1] – بوخاری(٣٢٠٧) و موسلیم(١٦٤) ئیخراجیان کردووە.

کەی دەگەنەوە و چی وشترێکیش لەپێشیانە، چی فەرموو، ئەوە دەرچوو، کەچی سەختتر پێیان هەڵگرت لەدژایەتیکردنی. روونە ئەو کارە لەسەرووی ئەوەوەیە کەسێکی خەوتوو بیبینێ؛ شەوڕەوییش یەك جار بوو.

## ١١-بنەمای کۆچکردن کە خوای گەورە تیایدا دۆست و دوژمنی خۆی جیاکردەوە و کردیە بنەمای شکۆدارکردنی ئایینەکەی و سەرخستنی بەندە و پەیامبەری خۆی

واقیدیی ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەرەتای پەیامبەرایەتییدا سێ ساڵ لەمەککەدا بەشاراوەیی پەیامبەرایەتییەکەی هێشتەوە، پاشان لەساڵی چوارەمدا ئاشکرای کرد، دە ساڵ خەڵکی بانگەوازکرد بۆ ئیسلام، لەوەرزی حەجدا دەچووە لای حاجیان لەشوێنەکانی دابەزین و لادانیان، هەروەها لەوەرزی عوکاز و مجنە و زی ئەلمەجاز، داوای لێ دەکردن پشتگیریی بکەن تاوەکو پەیامی خوا بگەیەنێ و بەهەشتیش بۆ ئەوان بێ و بچنە بەهەشتەوە، کەچی کەسێکی نەبینییەوە پشتیوانیی بکات[١].

خوای گەورە ئەوەی بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) هێنایە پێش هەڕەشەی جولەکەی خستە بەر گوێی ئەوس و خەزرەج، هەڕەشەیان دەدا بەوەی پەیامبەرێك لەپەیامبەران لەو سەردەمەدا رەوانە دەکرێت، کە دەرکەوت، دوای دەکەون و شەڕی عاد و ئیرەمی ئەوانی پێ دەکەن، پشتیوانانیش وەك هۆزەکانی تری عەرەب حەجیان دەکرد، بەڵام جولەکە حەجی نەدەکرد، کە پشتیوانان پەیامبەری خوایان بینی(صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی خەڵك دەکات بۆ ئایینی خوا، لێی رامان و بەیەکتریان وت: ئەی قەوم و کەس دەزانن، سوێند بەخوا ئەمە ئەو پەیامبەرەیە کە جولەکە هەڕەشی ئێمەی پێ دەکەن، با نەهێڵین پێشمان بکەون.

---

[١] - الطبقات الكبرى لابن سعد١/١٦٨.

## ١٢- بەیعەتی یەکەم و دووەمی عەقەبە

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەرچوو لای عەقەبە بەشەش کەسی پشتیوانان گەیشت کە هەموویان لەهۆزی خەزرەج بوون، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام و ئەوانیش بوونە موسڵمان، پاشان گەڕانەوە مەدینە و بانگەوازیان بۆ ئیسلام کرد، ئیسلام لەمەدینەدا بڵاوبوویەوە تاوەکو هیچ ماڵێك نەمایەوە ئیسلامی تێ نەچێ، کە ساڵی داهاتوو هات دوانزە پیاویان هاتن، ئەبو ئەلزوبەیر ئەڵێ: لەجابرەوە: وتمان: ئەی پەیامبەری خوا لەسەر چی شتێك بەیعەتت پێ بکەین؟ فەرمووی: بەیعەتم پێ بکەن لەسەر گوێڕایەڵی لەکاتی چالاکی و تەمبەڵی و خۆشی و ناخۆشی، لەسەر فرمانکردن بەچاکە و ڕێگریکردن لەخراپە، بمپارێزن چۆن خۆتان و ژن و منداڵتان دەپارێزن، ئەگەر هاتم بۆلاتان سەرمبخەن، ئەوکات بەهەشت بۆ ئێوە دەبێ، ئێمەش پیاو لەدوای پیاو هەڵساین بۆلای و مەرجی لەسەرمان کرد و بەوەش بەهەشتمان پێ دەدات.

پاشان گەڕانەوە مەدینە، لەگەڵیاندا عەمری کوڕی ئوم مەکتوم و موسعەبی کوڕی عومەیری نارد تاوەکو ئەوانەیان کە موسڵمان بوون، فێری قورئان بکەن و بانگەواز بکەن بۆ ئایینی خوا، هەردووکیان دابەزینە لای ئەبی ئومامە ئەسعەدی کوڕی زوراره، موسعەبی کوڕی عومەیر ئیمامەتیی بۆیان دەکرد، کە ژمارەیان گەیشتە چل کەس، جەماعەتی پێیان دەکرد، خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستیان بوونە موسڵمان، لەوانە: ئوسەیدی کوڕی ئەلحوزەیر و سەعدی کوڕی موعاز بوون، بەموسڵمانبوونی ئەو دووانەش تەواوی نەوەی عەبدئەلئەشهەل بەژن و پیاوەوە بوونە موسڵمان تەنیا ئەلوسەیرم عەمری کوڕی سابتی کوڕی وەقش نەبێ کە موسڵمانبوونی کەوتە ڕۆژی ئوحودەوە، لەو ڕۆژەدا شەڕی کرد و کوژرا پێش ئەوەی سوجدەیەك بۆ خوا بەرێ،

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەیەوە هەواڵی داوە:"عَمِلَ قَلِيلاً وأُجِرَ كَثِيراً"[1] ،واتا:کاری کەمی کرد و پاداشتی زۆری وەرگرت.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) مۆڵەتی بەموسڵمانان دا کۆچ بکەن بۆ مەدینە، خەڵکییش دەستوبردیان کرد بۆ ئەوە، لەمەککەدا تەنیا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و ئەبو بەکر و عەلی مانەوە، بەفرمانی خۆی هەردووکیان لەوێ مانەوە، جگە لەوانەی هاوبەش پەیداکەران بەزۆر گلیانیان دابووەوە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئامادەسازیی خۆی کردبوو بۆ ئەو کاتەی فرمانی دەرچوونی پێ دەدرێت، ئەبو بەکریش ئامادەسازیی بۆ ئەوە کردبوو.

### ١٣- پیلانی دار ئەلنەدوە

کە هاوبەش پەیداکەران بینیان هاوەڵانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئامادەسازییان کردووە و ڕۆیشتوون، ماڵ و منداڵیان خستووەتە لای ئەوس و خەزرەج، زانیان کە مەدینە سەختە و خەڵکەکەی هێزیان هەیە، ترسان لەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بگاتە لایان و بەوە حاڵەتەکەی بەسەریانەوە سەختتر دەبێ، بۆیە لەدار ئەلنەدوە کۆبوونەوە، پیاو ماقوڵ و خاوەن بۆچوونەکانیان هەموو ئامادە بوون و کەس دوانەکەوت تاوەکو لەبارەی پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) ڕاوێژ بکەن، هەریەکەو بۆچوونی خۆی دەربڕی، هەتا ئەوەی ئەبو جەهل وتی: لەبارەیەوە بۆچوونێکم بۆ دروست بووە وەها دەزانم ئێوەش هاودەنگم دەبن. وتیان: چییە؟ وتی: لەهەر هۆزێکی قورەیش گەنجێکی بەهێز هەڵدەبژێرین و هەریەکەو شمشێرێکی تیژی پێ دەدەین، پێکەوە لەیەك کاتدا لێی بدەن و بەوەش لەنێو هۆزەکاندا خوێنی ون دەبێ، ئیتر نەوەی عەبد مەناف

---

[1] بوخاری(٢٨٠٨) و موسلیم(١٩٠٠) ئیخراجیان کردووە.

نازانن چی بکەن و ناشتوانن دوژمنایەتی هەموو هۆزەکان بکەن، ئێمەش خوێنباییان پێ دەدەین. لەسەر ئەوە بلاوەیان لێ کرد،لەسەر ئەو بۆچوونە یەکدەنگ بوون، جبریل لەلایەن پەروەردگاریەوە وەحی بۆ هێنا و پیلانەکەی قورەیشی پێ گەیاند، فرمانی پێ کرد ئەو شەوە لەجێ خەوەکەیدا نەخەوێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەنیوەڕۆدا کە لەوکاتەدا کەس نەدەهاتە لای، بەدەم هەلێپێچراوییەوە هات بۆلای ئەبو بەکر و فەرمووی:"ئەوانەی لای تۆن بیانکە دەرەوە؟ ئەبو بەکر وتی: ئەوانە کەسی خۆتن ئەی پەیامبەری خوا. پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"خوای گەورە مۆڵەتی دەرچوونی پێ کردووم. ئەبو بەکر وتی: لەگەڵتدا هاوەڵی ڕێگە بم ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)؟ فەرمووی: بەڵێ. ئەبو بەکریش وتی: باوك و دایکم بەفیدات بێ ئەمە دوو وشترە یەکێکیان هەڵبژێرە. پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"بەپارە هەڵیدەگرم"[1].

فرمانی بەعەلی کرد ئەو شەوە لەجێگەکەی بخەوێت، ئەوانەی قورەیش کۆبوونەوە و لەکونی دەرگاکەوە تەماشایان دەکرد و چاودێرییان دەکرد و چاوەڕێی خەوتنی شەویان دەکرد، گرەویان دەکرد کامیان بەزەبرەوە لێی بدات، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەرچوو بۆلایان و چنگێ خۆڵی هەلگرت و پرژاندی بەسەریاندا و ئەوان نەیانبینی، لەو کاتەشدا ئەم ئایەتەی دەخوێند:﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ یس: ٩، واتا: بەربەستمان لەبەردەم و پشتیانەوە داناوە پەردەشمان داوە بەسەر چاویاندا بۆیە ئەوان(ڕاستی)نابینن.

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٢١٣٨).

پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) و ئەبو بەكر رۆيشتن، لەكلاوڕۆژنەيەكى ماڵى ئەبو بەكرەوە بەشەو دەرچوون، پياوێك هات و بينى ئەو كەسانە لەبەر دەرگان، وتى: چاوەڕێى چى دەكەن؟ وتيان: موحەممەد. وتى: زيانتان كرد، سوێند بەخوا فێڵى لىٚ كردن و خۆڵى پرژاندن بەسەرتاندا. وتيان: ئێمە نەمانبينى. هەڵسان خۆڵى سەر سەرى خۆيانيان تەكان، پاشان پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) و ئەبو بەكر رۆيشتن بۆ ئەشكەوتى سەور و چوونە نێو ئەشكەوتەكەوە.

عەبدوڵڵەى كوڕى ئورەيقيتى لەيسييان بەكرىٚ گرتبوو، رێناس و رێبەرێكى شارەزاى ئەو رێگەيە بوو، ئەگەرچى لەسەر ئايينى قورەيشى قەومى خۆى بوو، متمانەيان پىٚ هەبوو، دوو وشترەكەيان پىٚ سپاردبوو، كاتى يەكتربينيان ئەشكەوتى سەور بوو لەدواى سىٚ رۆژ كە وشترەكانيان پىٚ سپاردبوو، قورەيش بەدواياندا تەقەلاى دەدا، گەيشتنە بەر دەرگاى ئەشكەوتەكە و لەسەرى وەستان، لەسەحيحى بوخاريدا هاتووە كە ئەبو بەكر وتوويەتى: ئەى پەيامبەرى خوا، ئەگەر سەير بەرپێى خۆيان بكەن دەمانبينن، پەيامبەرى خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووى:"يا أَبَا بَكْرٍ مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا، لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا"[1]،واتا:ئەى ئەبو بەكر گومانت چۆنە بەدوو كەس كە خوا سێيەميان بىٚ، خەفەت مەخۆ خوامان لەگەڵدايە.

پەيامبەرى خوا(صلى الله عليه وسلم) و ئەبو بەكر گوێبيستى قسەكانيان بوون لەسەر سەريانەوە قسەيان دەكرد، بەڵام خواى گەورە ئەوانى كوێر كرد بەرانبەريان، عامرى كوڕى فوهەيرەش مەڕەكانى ئەبو بەكرى دەلەوەڕاند، گوێى دەگرت بزانە لەمەككە چى دەوترێت و قسە و هەواڵى بۆيان دەهێنا،لەبەيانيانى زووشدا لەگەڵ شوانەكاندا مەڕو وماڵاتى دەلەوەڕاند.

---

[1] - بوخارى(٣٦١٥، ٣٦٥٣) و موسليم(٢٣٨١) ئيخراجيان كردووە.

لەو ئەشکەوتەدا سێ شەو مانەوە هەتاوەکو گەڕانی سەخت بەدوایاندا کەم بوویەوە، ئینجا عەبدوالڵەی کوڕی ئەریقیت دوو وشترەکەی هێنا، ئەبو بەکر، عامری کوڕی فوهەیرەی دوای خۆی خست و ڕێبەری ڕێگە پێشیان کەوت، چاوی خوا هەردووکیانی دەپاراست و پشتیوانییانی دەکرد.

کە هاوبەش پەیداکەران بێ ئومێدبوون دەستیان پێیان بگات، دیارییان دانا بۆ هەرکەسێ بیاندۆزێتەوە، ئیتر خەڵکی ڕاپەڕین بەدوایاندا، بەڵام ئەوە خوای گەورە چی بووێ ئەوە دەکات.

## ١٤-هاتنی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بۆ مەدینە

هەواڵی دەرچوونی موحەممەدی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەمەککەوە بۆ گەیشتن بەمەدینە بەپشتیوانان گەیشت،هەموو بەیانیانێ دەردەچوون و چاوەڕوانییان دەکرد، کە خۆر گەرمی دەکرد، وەك نەریت دەگەڕانەوە ماڵەکانیان.

کە ڕۆژی جومعە هات، بەفەرمانی خوا سەرکەوت، ڕۆژی جومعە گەیشتە نەوەی سالمی کوڕی عەوف، لەو مزگەوتەی لەنێو دۆڵەکەدا بوو نوێژی پێکردن، پاشان جڵەوی وشترەکەیان گرت و بەچەك و ژمارەوە لەدەوری بوون، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"خَلُّوا سَبِيلَهَا فَإِنَّهَا مَأْمُورَةٌ"،واتا:بەری بەردەن، چونکە فرمان پێکراوە لەکوێدا بووەستێ. وشترەکەی بەردەوام بوو لەڕۆیشتن و ئازیزیش(صلی الله علیه وسلم) بەسەریەوە بوو، بەهەر ماڵێکدا پشتیواناندا تێپەڕ دەبوو داوایان لێ دەکرد لابداتە لایان، ئەویش دەیفەرموو:"دَعُوهَا فَإِنَّهَا مَأْمُورَةٌ"،واتا:وازی لێ بهێنن فرمانی پێکراوە لەکوێ لابدات. بەڕێکەوت تاوەکو گەیشتە ئەو شوێنەی لەمڕۆدا مزگەوتەکەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی لێیە و چۆکی دادا، لەوێ مایەوە هەتاوەکو هەڵسا

و کەمێك بەڕێکەوت، پاشان لای کردەوە و گەڕایەوە لەشوێنی یەکەمجاری چۆکی دادایەوە، ئا لەوێدا پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دابەزی، ئەوەش لەنێو بەنی نەجاڕی خاڵوانی خۆیدا بوو(صلی الله علیه وسلم).

ئەوە بەخشش و سەرخستنێکی خوایی بوو بۆی، چونکە حەزی دەکرد لای خاڵوانی دابەزێ و بۆ ئەوانیش ببێتە ڕێزێك، خەڵکیی لەگەڵ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) قسەیان دەکرد تاوەکو دابەزێتە لای ئەوان، بەڵام ئەبو ئەیوبی ئەنساریی دەستپێشخەریی کرد و کۆڵوباری پەیامبەری خوای بردەماڵی خۆی، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"المرْءُ مَعَ رَحْلِه"، واتا: مرۆڤ لەو شوێنەدایە کە کۆڵوبارەکەی لەوێیە. ئەسعەدی کوڕی زورارە هات و جڵەوی وشترەکەی گرت، بەڵام جڵەوەکە لەدەست ئەبو ئەیوبدا بوو.

لەماڵی ئەبو ئەیوبدا مایەوە تاوەکو ماڵ و مزگەوتەکەی دروست کرد. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەماڵی ئەبو ئەیوبدا بوو زەیدی کوڕی حاریسە و ئەبا رافیعی بەدوو وشتر و پێنجسەد درهەمەوە نارد بۆ مەککە و فاتیمە و ئوم کەلسومی کچیان هێنا، هەروەها سەودەی خێزانی کە کچی زەمعە بوو، هەروەها ئوسامەی کوڕی زەید و ئوم ئەیمەنی دایکی، هەرچی زەینەبی کچی پەیامبەری خوابوو(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە مێردەکەی کە ئەبو ئەلعاس کوڕی ئەلڕەبیع بوو نەیهێشت دەربچێ، عەبدوڵلەی کوڕی ئەبو بەکریش بەخێزانی ئەبو بەکرەوە دەرچوو کە عائیشەشیان لەگەڵدا بوو، دابەزینە ماڵی حاریسەی کوڕی نوعمان.

قیبلەی مزگەوتەکەی ڕووکردە بەیتولمەقدیس، سێ دەرگاشی بۆ کردەوە، دەرگایەك لەدواوەی مزگەوتەوە، دەرگایەکی تریش پێیدەوترا: دەرگای(الرَّحْمة)، ئەو دەرگایەش کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لێیەوە دەهاتە ژوورەوە، دار خورمای بۆ کردە کۆڵەکە و چڵی خورمای خستەسەر، لەپاڵیدا کۆمەڵێ خانووی

لەگڵ دروستکراوی دروست کرد و سەقفی ئەو خانووانەی بەدار خورما داپۆشی، کە لەو دروستکردنە بوویەوە، عائیشەی گواستەوە بۆ ئەو خانووەی لەڕووی رۆژهەڵاتی مزگەوتەکەوە بۆی دروستیکردبوو، کە شوێنی ژوورەکەی ئێستای پەیامبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم)، بۆ سەودەی کچی زەمعەش خانوویەکی تری دروستکرد.

## ١٥-لەدروستکردنی برایەتی لەنێوان کۆچەران و پشتیوانان

پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەماڵی ئەنەسی کوڕی مالیك، برایەتیی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانان، نەوەد پیاو بوون، نیوەی لەکۆچەران و نیوەکەی تریشی لەپشتیوانان بوون، لەسەر بنەمای دڵنەوایی، برایەتیی خستەنێوانیان، هەروەها میرات لەیەك بردن لەدوای مردن و ئەوە هەتاوەکو جەنگی بەدر رووی دا، بەڵام کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ ﴾ الأحزاب: ٦ ،واتا: ئەوانەی(بە نەسەب)خزمی یەکترن(ئەگەر موسڵمان بن)لەقورئانی خوا بۆ یەکتری لە پێشترن. ئیتر میراتبردن گەڕایەوە سەر رەچەڵەك(خزمایەتی).

## ١٦-بەڵێن و رێکەوتنی نێوان پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) و پاشان جەنگکردنی جولەکە

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەڵێنی لەجولەکەی مەدینە وەرگرت، لەنێوانیاندا نووسراو کرا، زانا و گەورەیان کە عەبدوڵڵەی کوڕی سەلام بوو دەستپێشخەریی کرد و هاتە نێو ئیسلامەوە، بەڵام زۆرینەیان بێباوەڕییان هەڵبژارد.

جولەکەی مەدینە سێ هۆز بوون: بەنو قینوقاع، بەنو نەزیر، بەنو قورەیزە، هەرسێکیان شەڕی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)یان کرد. منەتی خستەسەر بەنو قینوقاع و بەنو نەزیری دەرکرد، شەڕی بەنو قورەیزەی کرد و منداڵەکانیانی کردە کۆیلە، سورەتی(الحشر) لەبارەی بەنو نەزیرەوە دابەزی و سورەتی(الأحزاب)یش لەبارەی بەنو قورەیزەوە.

## ١٧-گۆڕینی قیبلە

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێشتر ڕوو بەبەیتولمەقدیس نوێژی دەکرد، حەزی دەکرد ڕووبکاتە کەعبە،بۆیە بەجبریلی فەرموو:"وَدِدْتُ أَنْ يَصْرِفَ اللَّهُ وَجْهِي عَنْ قِبْلَةِ الْيَهُودِ"،واتا:حەزدەکەم ڕوو لەقیبلەی جولەکە وەرگێڕم. جبریل وتی: من تەنیا بەندەیەکم، بۆ ئەوە داوا لەپەروەردگارت بکە. ئیتر پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەئاسماندا ڕوو وەردەگێڕا و تکای ئەوەی دەکرد هەتاوەکو ئەم ئایەتە دابەزی:،
﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ ﴾ البقرە: ١٤٤،واتا: بەڕاستی ئێمە گەڕانی ڕووخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین دەی سوێند بەخوا ڕووت دەکەینە ڕووگەیەك کە پەسەندت بێ و ڕازی بیت پێی ئیتر ڕووت وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە(مسجد الحرام).

ئەوەش دوای شانزە مانگ بوو لەهاتنی بۆ مەدینە و بەدوومانگ پێش شەڕی بەدر بوو.

لەوەی بەیتولمەقدیسی کردە قیبلە و پاشان ڕووی وەرگێڕا بۆ کەعبە حیکمەتێکی گەورە هەبوو، کۆست بوو بۆ موسڵمانان و هاوبەش پەیداکەران و جولەکە و دووڕووان.

سەبارەت بەموسڵمانان، ئەوە وتیان: گوێڕایەڵی فرمانی خواین: ﴿ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ ﴾ **آل عمران: ٧** ، واتا:ئەڵێن ئێمە بڕوامان هێناوە بە(موتەشابیهەکان) هەمووی لە پەروەردگارمانەوەن.

هەرچی هاوبەش پەیداکەران بوو وتیان: وا گەڕایەوە بۆ قیبلەی ئێمە، نزیکە بگەڕێتەوە سەر ئایینەکەمان، بەڵام نەگەڕایەوە سەر ئایینی ئەوان، بەڵکو ئەوەی کردی حەق بوو.

هەرچی جولەکە بوو وتیان: پێچەوانەی قیبلەی پەیامبەرانی پێش خۆی کرد، ئەگەر پەیامبەر بوایە، ئەوە روو بەقیبلەی پەیامبەران نوێژی دەکرد.

هەرچی دووڕووانە، ئەوان ئەیانووت: موحەممەد نازانێ رووەکاتە کوێ، ئەگەر ئەوەی سەرەتا راست بووبێ، ئەوە ئێستا دەستبەرداری بوو، ئەگەر ئێستای راست بێ، ئەوە پێشتر لەسەر باتڵ بووە، بۆیە قسەی گەمژەکانی نێو خەڵك زۆر بوونەوە، بەو جۆرە بوو کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِن كَانَتۡ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ ﴾ **البقرة: ١٤٣** ،واتا: بەڕاستی(ئەم گۆڕینە) کارێکی زۆر گەورە و گران بوو مەگەر لای ئەوانەی کە خوا ڕێنموونیی کردوون.

کۆست و بەڵایەك بوو خوای گەورە مرۆڤەکانی پێ تاقیکردەوە تاوەکو ببینێ کێ شوێن پەیامبەرەکەی دەکەوێ و کێیش هەڵدەگەڕێتەوە.

## بەش

لەگەڵ قیبلەدا نیعمەتی خۆی بەسەردا کاملکرد، بەوەی لەشەو و رۆژێکدا پێنج جار بانگی بۆ موسڵمانان دانا، لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسر و عیشادا دوو رکاتی زیاتر کرد دوای ئەوەی پێشتر دو رکاتیی بوون کردیە چوار رکاتی، هەموو ئەوانە لەدوای هاتنی بۆ مەدینە هاتنەبوون.

## ١٨-مۆڵەتدان بۆ جەنگکردن

کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمەدینە سەقامگیر بوو، خوای گەورە پشتیوانیی کرد بەبەندە باوەڕدارەکانی و لەدوای دوژمنایەتیی، دڵەکانی بۆ هۆگر کرد و لەخۆیان بەلایانەوە لەپێشتربوو، عەرەب و جولەکە بۆی چوونە یەك سەنگەرەوە، قۆڵی دوژمنایەتی و جەنگکردنیان لەدژی هەڵماڵی، لەهەموو لایەکەوە هاواریان دژ بەموسڵمانان دەکرد، خوای گەورەش فرمانی بەباوەڕداران کرد بەئارامگرتن و لێبووردن و چاوپۆشیکردن تاوەکو هێزیان بۆ پەیدا بوو، تۆکمە بوونەوە، ئینجا مۆڵەتی پێدان بۆ جەنگکردن، مۆڵەت بوو نەك فەرزکردن، خوای گەورە فەرمووی:﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ **الحج: ٣٩** ،واتا: ڕێگە درا(بە جەنگ و جیهادکردن)بە ئەو(موسڵمانانەی)شەڕیان لەگەڵدا دەکرێت لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی ستەمیان لێکراوە وە بێگومان خوا بۆ سەرخستنیان بە توانایە.

پاشان فەرزی کرد بەسەریانەوە جەنگی ئەوانە بکەن کە جەنگیان دەکەن و فەرمووی:﴿ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ ﴾ **البقرە: ١٩٠** ،واتا: جەنگ بکەن لە ڕێ ی خوادا لەگەڵ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵدا دەکەن.

پاشان فەرزکرا بەسەریانەوە شەڕی تەواوی هاوبەش پەیداکەران بکەن. پێشتر شەڕکردن حەرام بوو، دواتر ڕێگەیان درا، دواتر فرمانیان پێ کرا جەنگی هەرکەسێ بکەن کە سەرەتا جەنگی موسڵمانان دەکەن، پاشان فرمانکرا شەڕی تەواوی هاوبەش پەیداکەران بکەن، بەیەکێك لەدوو بۆچوونەکە فەرزی عەینە و بەمەشهوریش فەرزی کیفایەیە.

پوختە: جیهاد فەرزی عەینە بەدڵ و بەزمان و سەروەت و سامان و دەست، هەموو موسڵمانێ پێویستە بەجۆرێ لەو جۆرانەی جیهاد، جیهاد بکات.

هەرچی جیهادە بەگیان بەخشین، ئەوە فەرزی کیفایەیە، سەبارەت بەجیهادکردن بەسەروەت و سامان و واجیبێتی ئەوە، دوو بۆچوون هەیە: بەدروست واجیبە، چونکە جیهادکردن بەسەروەت و سامان و جیهادکردن بەگیانبەخشین وەك یەك هاتووە: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ **التوبە: ٤١** ،واتا: بڕۆن و دەرچن(بۆ جیهاد)چ سووك بن(لەش ساغ و دەوڵەمەند و دەسەڵاتداربن)چ قورس و گران بن(نەخۆش و هەژاربن) و تێبکۆشن بەماڵ و گیانتان لەڕێگەی خوادا ئەوەتان چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن.

ڕزگاربوون لەدۆزەخ و لێخۆشبوون لەتاوان و چوونە بەهەشتی بەوەوە پەیوەست کردووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّٰتِ عَدْنٍۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ ﴾ **الصف: ١٠ – ١٢** ،واتا: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئایا بازرگانیەکتان نیشان بدەم کە ڕزگارتان بکات لە سزایەکی پڕ لە ئازار. (بازرگانیەکەش ئەمەیە)باوەڕ بهێنن بەخوا و پێغەمبەرەکەی وە تێبکۆشن لە ڕێی خوادا بە سامان و گیانی خۆتان باشترە بۆ خۆتان ئەگەر ئێوە بزانن. (ئەوسا خوا)لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت وە(لە ڕۆژی دواییدا)دەتان خاتە باخاتێکەوە کە جۆگەی ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات(وە دەتانخاتە)خانوو کۆشکی زۆر پاك و خۆشەوە لە بەهەشتانی جێگای مانەوەی هەمیشەیی دان ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە.

هەواڵی داوە ئەگەر ئەوانە ئەنجام بدەن، ئەوە ئەوەیان پێ دەبەخشێ کە حەزیان پێ هەیە لەسەرکەوتن و ڕزگارکردنێکی نزیك، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ﴾

**الصف:** ١٣ ،واتا:تایبەتمەندییەکی ترتان بۆ هەیە لەجیهاددا حەزتان پێ هەیە، ئەویش:﴿ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ﴾ **الصف:** ١٣ ،واتا: شتێکی تر کە حەزی لێ دەکەن کە یارمەتی دانە لە خواوە وە ڕزگارکردنێکی نزیك(و ئازادکردنی شاری مەککەیە).

خوای گەورە هەواڵی داوە بەوەی:﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم ﴾ **التوبة:** ١١١ ،واتا: بەڕاستی خوا کڕیویەتی لە باوەڕداران گیان و ماڵیان. بەرانبەر بەوە بەهەشتی پێداون.

ئەو کەسەی ئەم ڕێکەوتن و گرێبەستە لەگەڵ خوای گەورە ئەنجام دەدات، با رابمێنێ کە مەترسی و مردنی چەندە گەورەیە! خوای گەورە کڕیارە، پاداشت و نرخیش بەهەشت و بردنەوەی ڕەزامەندیی خواو چێژبینینە بەبینینی خوا لەبەهەشتدا، ئەوەی ئەم گرێبەستەی لەسەر دەست کراوە، بەڕێزترینی نێو پەیامبەران و فریشتەکانە، بێگومان کەلوپەل و شمەکێکی لەم جۆرە بۆ کارێکی زۆر گەورە و گران ڕەخسێنراوە:

کەسێك بەدەم ئەو جوڵەیەی بانگەواز بۆ خواو بەهەشتی شوێنی ئارامی و هیممەت بەرزییەوە دەچێت و بەدەم جاڕدەری ئیمانەوە دەچێ، کە گوێیەکی هۆشیاری هەیە، دڵێکی زیندووی هەیە، ئەوەیە پاڵی پێوەناوە بۆ ڕۆیشتنە شوێنی چاکەکاران و خستوویەتیەسەر ئەو ڕێگەیە، وەهای لێکردووە هیممەتێکی بۆ دروست ببێ لەبەهەشتی ئارامدا کۆڵوبار دابنێت. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"انْتَدَبَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ إِيمَانٌ بِي وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَلَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا قَعَدْتُ خَلْفَ سَرِيَّةٍ ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيَا ، ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا ، ثُمَّ

أُقْتَلُ"[1]،واتا: خوای گەورە کەفیلی و زامنی کردووە بۆ ئەو کەسەی دەردەچێ بۆ جیهاد لەپێناو خواو ئەوەی بووەتە هۆکاری ئەو دەرچوونە، بەڕاستزانینی پەیامبەرەکانی و باوەڕە بەخوای گەورە، بەوەی بەپاداشت بیگێڕێنێتەوە ناو ماڵ و منداڵی یان بیخاتە بەهەشتەوە. ئەگەر سەخت و گران نەدەبوو بەسەر ئوممەتەکەمەوە، ئەوە لەپشت هیچ سریەیەکەوە دانەدەنیشتم، حەزمەکرد لەپێناو خوا بکوژرابامایە و پاشان زیندووبمابایەتەوە، پاشان بکوژرابامایە و پاشان زیندووبکرابامایەتەوە، پاشان بکوژرابامایە.

فەرموویەتی: "مَثَلُ المُجَاهِدِ فِى سَبِيلِ الله كَمَثَلِ الصَّائِمِ القَائِمِ القَانِتِ بِآيَاتِ الله لاَ يَفْتُرُ مِنْ صِيَامٍ وَلاَ صَلاَةَ حَتَّى يَرْجِعَ المُجَاهِدُ فِى سَبِيل الله، وقد تَكَفَّل اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِ فِى سَبِيلِهِ بِأَنْ يَتَوَفَّاهُ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، أَوْ يُرْجِعَهُ سَالِماً مَعَ أَجْرٍ أَو غَنِيمةٍ"[2]،واتا:نمونەی ئەوەی لەپێناو خوای گەورە جیهاد دەکات، نمونەی کەسێکی ڕۆژووەوانی خاوەن شەونوێژی باوەڕداری تەواوە بەئایەتەکانی خوا و دەستبەرداری ڕۆژوو و نوێژ نابێ تاوەکو لەجیهاد بۆ خوای گەورە دەگەڕێتەوە، خوای گەورە بۆ موجاهیدی ڕێگەی خوا ئەوەی لەئەستۆ گرتووە بیمرێنێ و بیخاتە بەهەشت یان بەسەلامەتیی لەگەڵ دەسکەوتدا بیگێڕێتەوە شوێنی خۆی.

فەرموویەتی: "غَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا"[3] ،واتا:بەسەربردنی بەرەبەیانییەك یان ئێوارەیەکی درەنگ لەجیهاد لەپێناو خوای گەورە باشترە لەدونیا و ئەوەی تێدایە.

هەروەها فەرموویەتی: "إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ

---

[1] - بوخاری(٣٦) و موسلیم(١٨٧٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٢٧٨٧) و موسلیم(١٨٧٦) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(٢٨٩٢) و موسلیم(١٨٨١) ئیخراجیان کردووە.

أوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ"[1]،واتا: لەبەهەشتدا سەد پلە هەیە خوای گەورە بۆ ئەوانەی تایبەتیکردووە کە لەپێناویدا جیهاد دەکەن، نێوان پلە بۆ پلەیەك وەك نێوان ئاسمان و زەوییە، ئەگەر داواتان لەخوا کرد، داوای فیردەوس بکەن، چونکە لەناوەڕاستی بەهەشت و لەبەرزترین شوێنی بەهەشتدایە، عەرشی خوای گەورەی لەسەرەوەیە، لەوێشەوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن.

بەئەبو سەعیدی فەرموو:"مَنْ رَضِيَ بِاللهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ"،واتا:هەرکەسێ ڕازیی بێ الله پەروەردگاری بێ و ئیسلام ئایینی بێ و موحەممەدیش پەیامبەری بێ، بەهەشتی بۆ دەبێ. ئەبو سەعید ئەوەی پێ سەیر بوو بۆیە وتی: ئەی پەیامبەری خوا بۆ منی دووبارە بکەرەوە. پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆی دووبارە کردەوە و پاشان فەرمووی:"وَأُخْرَى يَرْفَعُ اللَّهُ بِهَا الْعَبْدَ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ"،واتا: یەکێکی تر، خوای گەورە بەهۆیەوە لەبەهەشتدا سەد پلە بەندەی پێ بەرز دەکاتەوە، پلە بۆ پلەیەك نێوان ئاسمان و زەوییە. وتی: ئەوە چی شتێکە بەندە بەو پلەیە دەگەیەنێ ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی:"الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ"[2]،واتا:جیهاد کردن لەپێناوی خوای گەورە.

فەرموویەتی:"مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، دَعَاهُ خَزَنَةُ الْجَنَّةِ كُلُّ خَزَنَةِ بَابٍ، أَيْ عبدَ الله هَلُمَّ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ"،واتا:هەرکەسێ پارە و سەروەتێ ببەخشێ، ئەوە دەرگاوانانی هەموو دەرگاکانی بەهەشت بانگی لێ دەکەن وەرە ژوورەوە، هەرکەسێ ئەهلی نوێژ بێ، لەدەرگای نوێژەوە فەرمووی چوونە بەهەشتی

[1]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٢٧٩٠).

[2]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٨٨٤).

لێ دەكرێت، هەركەسێ ئەهلی جیهاد بێ، لەدەرگای جیهادەوە فەرمووی چوونە بەهەشتی لێ دەكرێت، هەركەسێ ئەهلی سەدەقە و خێربێ، لەدەرگای خێر و سەدەقەوە فەرمووی چوونە بەهەشتی لێ دەكرێت، هەركەسی ئەهلی ڕۆژوو بێ، ئەوە لەدەرگای ڕەییانەوە فەرمووی چوونە بەهەشتی لێ دەكرێت. ئەبو بەكر وتی: بەدایك و باوكەوە بەفیدات بم ئەی پەیامبەری خوا، كەس هەیە لەو هەموو دەرگایانەوە بانگی لێ بكرێت؟ فەرمووی: "نَعَمْ وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ"[1]، واتا: بەڵێ كەس هەیە، ئومێد دەكەم تۆ یەكێ بێ لەوانەی لەهەموو ئەو دەرگایانەوە فەرمووی چوونە بەهەشتت لێ بكەن.

فەرموویەتی: "مَنِ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ"[2]، واتا: هەركەسێ لەپێناو خوای گەورە قاچەكانی تۆز بگرن، حەرام ئەبێ لەسەر دۆزەخ ئەو قاچانە بسووتێنێ.

فەرموویەتی: "رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا"[3]، واتا: سەنگەرگرتنی یەك ڕۆژ لەپێناو خوای گەورە، لەدونیا و ئەوەی لەسەریدا هەیە خێردارترە.

فەرموویەتی: "رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ، وَإِنْ مَاتَ، جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ وَأَمِنَ الْفَتَّانَ"، واتا: سەنگەرگرتنی ڕۆژ و شەوێ خێری زۆرترە لەڕۆژو و شەونوێژی مانگێ، ئەگەر بمرێ لەسەر ئەو كارەی دەمرێ كە ئەنجامی داوە و ڕزق دەدرێ و لەپرسیاری نێو گۆڕیش دەپارێزرێ.

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە فەرموویەتی: "إِنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ"[1]، واتا: بێگومان دەرگاكانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردان.

---

[1] - بوخاری(٢٨٤١) و موسلیم(١٠٢٧) ئیخراجیان كردووە.

[2] - بوخاری ئیخراجی كردووە(٩٠٧).

[3] - بوخاری(٢٨٩٢) و موسلیم(١٨٨١) ئیخراجیان كردووە.

بەدروست لەپامبەری خۆشەویستەوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ"[2]، واتا:هەرکەسێ بجەنگێ لەپێناو ئەوەی وتە و پەیامی خوا بالآترین بێ، ئەوە لەرێگەی خوادایە.

هەروەها فەرموویەتی:"إنّ النَّارَ أوّلُ مَا تُسَعّرُ بِالْعَالِمِ وَالْمُنَفِقِ وَالْمَقْتُولِ فِي الْجِهَادِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ لِيُقَالَ"[3]،واتا: یەکەمین کەسێك بەئاگری دۆزەخ دەسووتێنرێت و دۆزەخی پێ گڕ دەدرێت، زانا و بەخشەر و کوژراوێکە لەجیهاددا کە بۆ باسکردنیان ئەو کارانەیان کردووە.

## ١٩-سووننەتە لەسەرەتای رۆژدا جیهاد بکرێت

سووننەت و موستەحەب بووە لەسەرەتای رۆژدا جیهاد بکرێت، هەروەك موستەحەب بووە لەسەرەتای رۆژدا بۆ جیهاد دەربچن و سەفەر بکەن، ئەگەر لەسەرەتای رۆژ شەڕیان نەکردبایە، شەڕکردن دوادەخرا تاوەکو خۆر ئاوا دەبوو، رەشەبا هەڵیدەکرد و سەرکەوتن دادەبەزی.

## ٢٠-فەزڵ و گەورەیی جیهادکردن

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يُكْلَمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللهِ-وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ- إِلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَاللَّوْنُ لَوْنُ دَمٍ ، وَالرِّيحُ رِيحُ مِسْكٍ"،واتا:سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هیچ کەسێ لەپێناو خوای گەورەدا خوێنی نارێژرێ-خوا لەو کەسە زاناترە کە خوێنی لەپێناو

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٩٠٢).

[2] - بوخاری(٢٨١٠) و موسلیم(١٩٠٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٩٠٥).

خوادا رژاوه- ئیللا لەڕۆژی قیامەتدا دێت و خوێنی لێ دەچۆڕێ، ڕەنگی ڕەنگی خوێن و بۆنەکەی بۆنی میسکە.

هەروەها بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە فەرموویەتی: "مَا مِنْ عَبْدٍ يَمُوتُ، لَهُ عِنْدَ اللهِ شيءٌ يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، وَأَنَّ لَهُ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، إِلا الشَّهِيدَ لما يَرَى مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ، فَإِنَّهُ يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنيَا، فَيُقْتَلَ مَرَّةً أُخْرى"[1]،واتا:هەر بەندەیەك بمرێ، شتێکی لای خوای گەورە نییە بەهۆیەوە حەز بکات بگەڕێتەوە دونیا ئەگەر دونیا و ئەوەی تیایدایە هی ئەو بێ، تەنیا شەهید نەبێ، کە فەزڵی شەهیدبوون دەبینێ، حەز دەکات بگەڕێتەوە دونیاو جارێکی تر لەپێناو خوای گەورە بکوژرێتەوە. لەلەفزێکی تردا هاتووە: "فَيُقْتَلُ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يرى مِنَ الكَرَامَةِ"[2]،واتا: دە جاری تر بکوژرێ بەهۆی ئەو شکۆ و ڕێزەی بینیوێتی لەفەزڵی شەهیدبووندا.

بە ئوم حاریسی کوڕی نوعمانی فەرموو کاتێك کوڕەکەی لەڕۆژی بەدردا کوژرابوو. ئوم حاریس لەپەیامبەری خوای پرسی(صلی الله علیه وسلم): کوڕەکەم ئێستا لەکوێیە؟ فەرمووی: "إِنَّهُ فِي الفِرْدَوس الأَعْلى"[3]،واتا: لەفیردەوسی بالآدایە.

فەرموویەتی: "إِنَّ أَرْوَاحَ الشُّهَدَاءِ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى الْقَنَادِيلِ، فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ عَزَّ وَجَلَّ اطِّلَاعَةً، فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا؟ قَالُوا: أَيُّ شَيْءٍ نَشْتَهِي، وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا؟ فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَمْ يَتْرُكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا، قَالُوا يَا رَبِّ نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا رَأَى

---

[1] - بوخاری(٥٥٣٣) و موسلیم(١٨٧٦) ئیخراجیان کردووە.
[2] - بوخاری(٢٧٩٥) و موسلیم(١٨٧٧) ئیخراجیان کردووە.
[3] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٢٨٠٩).

أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا"[1]،واتا:روحی شەهیدان لەناو باڵندەیەکی سەوزدان، چراخانی قەندیلیان هەیە و بەستراون بەعەرشەوە، چۆنیان بوێ بەبەهەشتدا دەسوڕێنەوە و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو چراخانانە، خوای گەورە تەماشایەکیان دەکات و ئەفەرمووێ: ئایە ئارەزووی هیچ شتێك دەکەن؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئارەزووی چی شتێکی تر بکەین ئێمە وا چۆنمان بووێ بەبەهەشتدا دەسوڕێینەوە؟ خوای گەورە سێ جار ئەوەیان لەگەڵدا دەفەرمووێ، کە دەبینن هەر داوایەکیان هەبێ بۆیان جێبەجێ دەکرێ و خوای گەورە هەر دەپرسێ ئارەزووی چی دەکەن،ئەڵێن: ئەی پەروەردگار روحمان بکەرەوە بەبەر جەستەماندا تاوەکو جارێکی تر لەپێناوی تۆدا شەهید بین، بەڵام کە خوای گەورە دەبینێ پێویستییەکی تریان نییە، ئیتر لێیان ناپرسێ ئارەزووی چی دەکەن.

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:" لَا يَجْتَمِعُ كَافِرٌ وَقَاتِلُهُ فِي النَّارِ أَبَدًا"[2]،واتا: بێباوەڕ و بکوژەکەی هەرگیز لەدۆزەخدا پێکەوە کۆناکرێنەوە.

بەدروست لەپەیامبەری خۆشەویستەوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:"لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلون عَلَى الْحَقِّ لاَ يَضُرُّهُم مَنْ خَذَلَهُمْ، وَلاَ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ"[3]،واتا:بەردەوام کۆمەڵێ لەئوممەتەکەم لەسەر حەق و راستیی دەجەنگن و ئەوانەی پشتیان لێ دەکەن و ئەوانەش کە پێچەوانەیان دەکەن، زیانیان پێ نادەن هەتاوەکو قیامەت هەڵدەستێ.

---

[1] موسلیم ئیخراجی کردووە(١٨٨٧).

[2] موسلیم ئیخراجی کردووە(١٨٩١).

[3] بوخاری(٣٦٤١) و موسلیم(١٠٣٧) ئیخراجیان کردووە.

## ٢١-ڕێباز و ڕێنمایی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەجەنگدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەیعەتی لەهاوەڵانی وەردەگرت کە لەجەنگدا هەڵنەیەن و بەیعەتی مردنی لێیان وەردەگرت، بەیعەتی لەسەر جیهاد لێیان وەردەگرت هەروەك چۆن بەیعەتی موسڵمانێتیی لێیان وەردەگرت، لەپێش فەتح بەیعەتی کۆچکردنی لێیان وەردەگرت، بەیعەتیان پێ دەدا لەسەر یەکتاپەرستی و پابەندبوون بەگوێڕایەڵیکردنی خوا و پەیامبەرەکەی. بەیعەتی لەکۆمەڵێ لەهاوەڵانی وەرگرت کە داوای هیچ شتێك لەخەڵك نەکەن. قامچیی لەدەست یەکێکیان دەکەوتە خوارەوە، بەخۆی دادەبەزی هەڵیدەگرت و بەکەس نەیدەوت: ئا ئەو قامچییەم پێ بدە.

لەکاروباری جیهاد و رووبەڕووبوونەوەی دوژمن و هەڵبژاردنی شوێنی شەڕدا راوێژی هاوەڵانی دەکرد.

لەڕۆیشتن بۆ جیهاد دەکەوتە دوای کاروانەوە یارمەتیی لاوازی دەدا و ئەوانەی لەپشتی خۆی سەردەخست کە دواکەوتبوون، نەرمترین و بەبەزەییترین کەس بوو لەڕۆیشتندا.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەگەر نیازی جەنگی هەبووایە، پرسیاری شوێنی تری دەکرد و وەهای دەرنەدەخست کام دوژمنی مەبەستە و ئەیفەرموو:"الحربُ خُدعةٌ"[1]،واتا: جەنگ فێڵە.

چاوساغ و سیخوڕانی دەنارد هەواڵی دوژمنی بۆ بهێنن و پاسەوانیی دادەنا. کە بەرانبەر دوژمن دەبوویەوە رادەوەستا و دەپاڕایەوە و داوای سەرکەوتنی لەخوای گەورە دەکرد، خۆی و هاوەڵانی زۆر یادی خوایان دەکرد و دەنگیان نزم دەکردەوە.

---

[1] - بوخاری(٣٠٣٠) و موسلیم(١٧٣٩) ئیخراجیان کردووە.

سوپا و شەڕکەرانی ڕێکدەخست، کەسانی لێهاتووی لەلاشانەکانەوە دادەنا، بەفرمانی خۆی لەهاوەلاّن دەچوونە مەیدان، چەکی خۆی ڕێکدەخست و خۆی دەخستە نێوان دوو قەڵغانەوە. سوپاکەی ئالاّ و بەیداخی هەبوو. ئەگەر بچووبایەتە سەر هەر قەومێك، سێ ڕۆژ دەمایەوە ئینجا دەڕۆیشت، ئەگەر نیازی پەلاماری هەبووایە چاوەڕوانیی دەکرد، ئەگەر گوێبیستی بانگ ببووایە لەو شوێنە، ئەوە پەلاماری نەدەدا، ئەگەرنا پەلاماری دەدا. شەو دەورەی لەدوژمن دەدا و لەڕۆژدا لەپڕ دەچووە سەریان.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) حەزی دەکرد سەرەتای ڕۆژی پێنجشەممە دەربچێ. ئەگەر سوپاکە دابەزیبانایە، هەموویان لەپاڵ یەکدا کۆ دەبوونەوە، تەنانەت ئەگەر عەبایەکت بدابایە بەسەریاندا هەموویانی دەگرتەوە. بەدەستی خۆی ریزەکانی ڕێکدەخست و لەکاتی شەڕدا پڕ تفاقی دەکردن و ئەیفەرموو:"فلاّنە کەس تۆ وەرە پێش و فلاّنە کەس تۆ بچۆرە دواوە". حەزی دەکرد هەرکەسەو لەژێر ئالاّی قەوم و هۆزی خۆیدا بجەنگێت، کە بەدوژمن دەگەیشت دەیفەرموو:"اللهمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، وَمُجْرِي السَّحَابِ، وَهَازِمَ الأحْزَابِ، اهْزِمْهُمْ، وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ"[1]،واتا: خوایە گیان، ئەی دابەزێنەری قورئان و ئەنجامدەری لێپرسینەوە و شکێنەری کۆمەڵ و تاقمەکان، ئەوان بشکێنە و ئێمەیان بەسەردا زاڵ بکە. فەرمووشێتی:

﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾ **القمر: ٤٥ – ٤٦**[2] ،واتا: بێگومان کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێت و هەڵدێن. بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دواییە وە(سزای)ئەو ڕۆژە زۆر سەختر و تاڵترە.

---

[1] – بوخاری(٢٩٣٢) و موسلیم(١٧٤٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٣٩٥٣).

ئەیفەرموو: "اللهمَّ أنزل نصرَك"[1]،واتا: خوایە گیان سەرکەوتنی خۆت دابەزێنە.
هەروەها ئەیفەرموو: "اللهمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي، وَبِكَ أُقَاتِلُ"[2]،واتا: خوایە گیان تۆ هێز و سەرخەری منی و بەپشتیوانیی تۆوە دەجەنگم.
کە شەڕەکە زۆر سەخت بووایە و دوژمن ویستی هەبووایە بیکاتە ئامانج، خۆی دەناساند و ئەیفەرموو: "أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ"[3]،واتا: من پەیامبەرم و درۆ ناکەم، من کوڕی عەبدولموتەلیبم.
کە شەڕ سەخت و دژوار بووایەتەوە، دەورەیان لێ دەدا و نزیکترینی موسڵمانان بوو لەدوژمن.
بۆ هاوەڵانی کۆمەڵێ دروشمی دانابوو بەوتنی ئەیانزانی چییە، جارێك دروشمی(أَمِتْ أَمِتْ)یان هەبوو، جارێکی تر(یا منصور) و جارێکی تریش(حم لا يُنصرون).
قەڵغان و کڵاوی ئاسنینی دەبەست و شمشێر و رم و کەوانی عەرەبیی هەڵدەگرت، لەشەڕدا حەزی بەئەسپ هەبوو. جارێکیان بەمەنجەنیق شەڕی کرد بۆ خەڵکی تائیف دایانابوو. نەهی دەکرد ژن و منداڵ بکوژرێن، سەیری شەڕکەری دەکرد، مووی لێ بهاتبایە دەیکوشت، مووی لێ نەهاتبایە شەرمی دەکرد بیکوژێت.
کە سریەیەکی رەوانە بکردبایە، وەسێت و ئامۆژگارییانی دەکرد لەخوا بترسن و ئەیفەرموو: "سِيرُوا بِسْمِ اللَّهِ قَاتِلُوا أَعْدَاءَ اللَّهِ لَا تَغُلُّوا وَلَا تَغْدِرُوا وَلَا تَمْثُلُوا وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا"[4]،واتا: بەناوی خواوە بەڕێکەون و بۆ خوا بەڕێکەون و شەڕی ئەو کەسە بکەن کە بێباوەڕە بەرانبەر بەخوای گەورە،زیادەڕۆیی مەکەن و هیچ تەرمێ مەشێوێنن، غەدر مەکەن، منداڵ مەکوژن.

---

[1] – ئەبو عوانە ئیخراجی کردووە لە(المستخرج٦٧٦٢).
[2] – ئەبو داوود(٢٦٣٢) و ترمیزی(٣٥٨٤) ئیخراجیان کردووە.
[3] – بوخاری(٤٣١٥–٤٣١٧) و موسلیم(١٧٧٦) ئیخراجیان کردووە.
[4] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٧٣١).

نەهی دەکرد قورئان ببردرێتە خاکی دوژمن.

فرمانی بەفەرماندەی سریەکەی دەکرد، پێش شەڕکردن دوژمن بانگەواز بکات بۆ ئیسلام و کۆچکردن، یان بۆ ئیسلام بێ ئەوەی کۆچ بکەن و بەوە وەک دەشت نشینانی موسڵمانان دەبن و دەسکەوتیان بۆ نییە و جزیەش نادەن، ئەگەر هەرکەسێکیان بەدەم داواکەوە هات، لێی قبوڵ دەکرێت، ئەگەرنا پشت بەخوا ببەستن و شەڕیان بکەن.

کاتێ دوژمن دەدۆڕا، جاڕدەرێك جاڕی دەدا تەواوی دەسکەوتەکان کۆ دەکرانەوە، دابەشی دەکردن بەسەر کەسانی شیاو و پێویستدا، پێنج یەکی دەهێشتەوە و خوای گەورە فرمانی دەکرد لەبەرژەوەندیی موسڵماناندا خەرج بکرێت، پاشان چی دەمایەوە دەدرا بەوانەی پشکیان نەبوو لەژنان و منداڵان و کۆیلەکان، ئەوی تری بەیەکسان دابەش دەکرد بەسەر سوپاکەدا، بۆ هەر سوارێك سێ پشك، پشکێ بۆ خۆی و دوو پشك بۆ ئەسپەکەی، بۆ پیادەش پشکێ، ئەمەش بەپێی گێڕانەوەی دروست و سەلما.

چی بەبەرژەوەندیی ببینایە لەکڕۆکی غەنیمەتدا دەیکرە نەفل. جگە لەنەفل، لەدابەشکردندا کەسی لاواز و بەهێزی وەك یەك بەش دەدا[1]. ئەگەر لەخاکی دوژمندا پەلاماری بدایە و سریەیەکی رەوانە بکردبایە، پێنج یەکی دەردەکرد و یەك لەسەر چوار بەشی دیکەی دەکردە نەفل و ئەودوای لەنێو سوپادا دابەش دەکرد.

پشکی ئەو کەسەی دەدا کە لەبەر بەژەوەندییەکی موسڵمانان لەو رووداوە ئامادە نەبوو،هەروەك لەشەڕی بەدردا پشکی عوسمانی دا.

هاوەڵان لەغەزادا کڕین و فرۆشتنیان دەکرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەیبینین و نەهی ئەو کارەی لێیان نەدەکرد.

---

[1]- ئەحمەد ئیخراجی کردووە٣٧/٤٢١(٢٢٧٦٢).

بەدوو جۆر كاريان بەكرێ دەكرد لەغەزادا:

يەكەم: كەسێكی بەشداربووی جيهاد يەكێكی بەكرێ دەگرت تاوەكو لەسەفەرەكەيدا خزمەتی بكات.

دووەم: كەسێك نەيدەتوانی بەشداری جيهاد بێ، بەپارە كەسێكی دەنارد و پێياندەوت(الجعائل)، لەو بارەيەوە پەيامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموويەتی:"لِلْغَازِي أَجْرُهُ، وَلِلْجَاعِلِ أَجْرُهُ وَأَجْرُ الْغَازِي"[1]،واتا: ئەو كەسەی بەشداری جيهاد ئەبێ پاداشتی خۆی هەيە، ئەو كەسەش كە كەسی تری لەجێگەی خۆی ناردووە پاداشتی خۆی هەيە و ئەو كەس پاداشتی هەيە كە لەجێی كەسی تر بەشدار بووە.

لەغەنيمەتدا لەدوو جۆردا بەشدارييان دەكرد:

يەكەم: هاوبەشيكردن بەجەستە(شركة الأبدان)، هەر شتێكيان بەهەوڵی جەستە بەدەستهێنا، هاوبەش بن لەو شتەدا.

دووەم: ئەوەی يەكێك وشترەكەی يان ئەسپەكەی دەدايە كەسێكی تر بەمەرجی نيوەی غەنيمەت.

**٢٢-رێبازی پەيامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە پشكی خزم و نزيكان(ذي القربى)**

پشكی خزم و نزيكانی دەدا بەبەنی هاشم و عەبدولموتەليب و نەيدەدا بەبرايان و كەسانی تريان لەنەوەی عەبد شەمس و نەوەی مەناف، فەرموويەتی:"إِنَّمَا بَنُو الْمُطَّلِبِ وَبَنُو هَاشِمٍ شَيْءٌ وَاحِدٌ-وشبَّك بينَ أصابعِه، وقال:-إنهم لم يُفارِقونا في جاهليةٍ ولا إسلامٍ"[2]،واتا:نەوەی ئەلموتەليب و نەوەی هاشم يەك شتن-پەنجەكانی خستە پاڵ يەك- و فەرمووی: نە لەجاهيلييەت و نە لەئيسلامدا لەئێمە دانەبڕان.

---

[1] - ئەبو داوود ئيخراجی كردووە(٢٥٢٦).

[2] - بوخاری ئيخراجی كردووە(٣١٤٠).

## ٢٣-لەخواردن لەغەنیمەت پێش دابەش کردن

موسڵمانان لەغەزاکانیاندا هەنگوین و ترێ و خواردنیان دەستدەکەوت و دەیانخوارد و نەیاندەخستە نێو دەسکەوتەکانەوە.

## ٢٤-پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهی دەکرد لەدزیکردن و شێواندنی جەستە

لەغەزاکانیدا نەهی دەکرد لەدزیکردن و شێواندنی جەستەی کوژراوانی دوژمن و فەرموویەتی:"مَنِ انْتَهَبَ أَوِ انْتَهَبَ نُهْبَةً، فَلَيْسَ مِنَّا"[١]،واتا:هەرکەسێ بەناهەق شتێك بۆ خۆی ببات یان شتێك بشارێتەوە، لەئێمە نییە.

نەهی دەکرد کەس سواری وڵاخێکی دەسکەوتی جەنگیی بێ، یان بەرگێکی دەسکەوتی جەنگ لەبەربکرێ کە هێشتا دابەش نەکراوە، بەڵام لەحاڵەتی جەنگدا قەدەغە نەبوو.

## ٢٥-توندبوونی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەبەرانبەر بەزۆر شت بردن

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) زۆر توند دەبوو لەوەدا و ئەیفەرموو:"عَارٌ ونَارٌ وشَنَارٌ على أهْلِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ"[٢]،واتا: بەزۆر شتن بردن، لەقیامەتدا شەرمەزاری و دۆزەخ بۆ ئەو کەسە دەهێنێ کە توونــد و زیادڕۆکارە.

کە میدعمی خزمەتکاری کوژرا، هەندێ لەهاوەڵانی وتیان: خۆش بەحاڵی، بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو. فەرمووی:"كَلَّا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ الشَّمْلَةَ- الَّتِي أَخَذَهَا يَوْمَ خَيْبَرَ مِنَ الْغَنَائِمِ لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ- لَتَشْتَعِلُ عَلَيْهِ نَارًا"[٣]، واتا: نەخێر، سوێند بەو

---

[١]- ئەبو داوود(٤٣٩١) و ترمیزی(١٦٠١) ئیخراجیان کردووە.

[٢]- نەسائی(٣٦٨٨) و ئیبن ماجە(٢٨٥٠) ئیخراجیان کردووە.

[٣]- بوخاری(٤٢٣٤) و موسلیم(١١٥) ئیخراجیان کردووە.

کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەو عەبایەی کە لەڕۆژی خەیبەردا بردی پێش ئەوەی دابەش بکرێت، بووەتە ئاگر و لەبەریدا گڕ دەگرێ.

فرمانی داوە لێدانی ئەو کەسە بکرێ بەزۆر شت دەبات و شتەکەشی بسوتێنرێت.

## ٢٦-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) بەرانبەر دیل

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) منەتی ئەخستەسەر هەندێ دیل و ئازادی دەکردن، هەندێکی تریانی دەکوشت و بەپارە و سامانیش هەندێکیانی ئازاد دەکرد، هەندێکی تریشیان لەئاڵوگۆڕی دیلی موسڵماناندا ئالوگۆڕی دەکردن، هەموو ئەوانەش بەپێی بەرژەوەندییەك ئەنجامی دەدا.

دیلەکانی بەدری بەپارە ئازاد کرد، بەئازادکردنی پیاوێکی هۆزی عەقیل دوو موسڵمانی ئازاد کرد، لەدوای دابەشکردنی دەسکەوت، سەباپایەی هوازنی گەڕاندەوە، دڵی دۆڕاوانی کەمەندکێش کرد و ئیتر بەرانبەری نەرم بوون و بوونە دۆست، هەندێ تری کوشت کە دڵی بەرانبەریان نەرم نەبوو، عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیتی لەنێو دیلەکاندا کوشت، نەزری کوڕی حاریسی کوشت لەبەر ئەوەی دوژمنایەتییەکی سەرسەختی خوا و پەیامبەری دەکرد. ئیمام ئەحمەد لەئیبن عەباسەوە باس دەکات وتوویەتی: کۆمەڵێ لەدیلەکان سەروەت و سامانیان پێ نەبوو، بۆیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خوێنبایی ئەوانی گێڕا بەوەی هەریەکەو دە لەمندالأنی موسڵمانان فێری خوێندەواریی بکەن، ئەمە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی بەپێی پاداشتی کار ڕزگار بکرێن، هەروەك چۆن جائیزە بەپارە ئازاد بکرێن.

ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەو جۆرە بوو، هەرکەسێ پێش دیل کەوتن ببێتە موسڵمان، نەکرێتە کۆیلە. هەروەك چۆن لەئەهلی کیتابی ئەکردە کۆیلە، لەعەرەبیشی ئەکردە کۆیلە، کۆیلەیەکی عەرەب لای عائیشە هەبوو.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) رێگریی دەکرد دایك و منداڵی بەسەبایە کراو لەیەك جیابکرێتەوە و ئەیفەرموو:"مَنْ فَرَّقَ بین والدةٍ وولدها، فرَّقَ الله بینَه وبین أحبَّته یومَ القیامَة"[1]، واتا:هەرکەسێ دایك و منداڵێ لەیەك بکات، لەقیامەتدا خوای گەورە خۆی و خۆشەویستانی لەیەك جیادەکاتەوە.

## ٢٧-رێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیە وسلم ) بەرانبەر بەکەسێ سیخوڕیی بەسەرەوە کردبێ

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیە وسلم) سەلماوە کە سیخوڕێکی هاوبەش پەیداکەرانی کوشتووە[2].

سەلماوە کە حاتەبی نەکوشتووە، لەکاتێکدا حاتەب سیخوڕیی بەسەرەوە کردبوو، عومەر داوای لێکرد مۆڵەتی بدات بیکوژێ، پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) فەرمووی:"وَمَا یُدریك! لعلَّ اللَّهَ اطَّلع عَلَى أهْلِ بدرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ"[3]،واتا:تۆ چوزانی ئەی عومەر! خوای گەورە لەئەهلی بەدر خۆش بووە و فەرموویەتی: چۆنتان بووێ ئەوە بکەن، من وا لە ئێوە خۆش بووم. ئەوانەی وەهای بۆ رۆیشتوون سیخوڕی موسڵمان ناکوژرێت ئەوەیان بەبەڵگە کردووە، ئەوانەش وتوویانە دەکوژرێت هەر بەبەڵگەیان کردووە و وتوویانە: ئەو هۆکارەی رێگر بووە حاتەب بکوژرێ لەموسڵمانی تردا بوونی نییە، چونکە ئەگەر موسڵمانێتی رێگربووایە، ئەوە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) هۆکارێکی تایبەت بەوی نەدەهێنایەوە، چونکە حوکم هێنانەوە بەهۆکاری گشتگیر، وەها دەکات وەرگرتنی هۆکاری تایبەت بێ کاریگەریی بێ، ئەم بۆچوونە بەهێزترە، خواش زاناترە.

---

[1] - ترمیزی ئیخراجی کردووە(١٥٦٦).

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٣٠٥١).

[3] - بوخاری(٣٠٠٧) و موسلیم(٢٤٩٤) ئیخراجیان کردووە.

## ٢٨-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەزەوییەکی بەغەنیمەت وەرگیراو

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە زەوی بەنی قورەیزە و بەنی نەزیر و خەیبەری لەنێوان جەنگاوەراندا دابەش کردووە.

بەڵام مەدینە بەقورئان فەتحکرا و خەڵکەکەی لەسەر قورئان موسڵمان بوون و بەحاڵی خۆیەوە مایەوە، هەرچی مەککە بوو، ئەوە بەزۆر و زەبری هێز فەتح کراو دابەشی نەکرد، کۆمەڵێك وتوویانە: بۆیە دابەش نەکرا، چونکە شوێنی پەرستش و حەجە، وەقفی خوایە بەسەر بەندە موسڵمانەکانیەوە. کۆمەڵێکی تر وتوویانە: پێشەوای موسڵمانان لەبابەت زەوییدا سەرپشکە دابەشی دەکات یان وەقفی دەکات، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) خەیبەری دابەش کرد و مەککەی دابەش نەکرد، بۆیە بەڵگە دەدات لەوەی هەر دوو کار جائیزە، وتوویانە: زەوی ناچێتە خانەی ئەو دەسکەوتانەی فرمان کراوە دابەش بکرێن، ئەوەی بۆ ئەوە بەڵگە بدات، ئەوەیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەتایبەت نیوەی زەوی خەیبەری دابەش کردووە، ئەگەر ئەو کارە حوکمی غەنیمەتی هەبێ، ئەوە دوای دەرکردنی پێنج یەك هەمووی دابەش دەکرد.

## ٢٩-واجیبێتی کۆچکردن بۆ کەسێك توانای کۆچکردنی هەبێ

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کردووە موسڵمانێك توانای کۆچی هەبێ، لەنێو هاوبەش پەیداکەراندا بمێنێتەوە و فەرموویەتی:"أنا بَرِيء من كل مُسلم يُقيم بَين أظهر الْمُشْرِكين"،واتا: من بەرییم لەهەر موسڵمانێك لەنێو هاوبەش پەیداکەراندا نیشتەجێ ببێ. وتیان: بۆچی ئەی پەیامبەری خوا؟ فەرمووی:"لَا تَرَاءى ناراهُما"[1]،واتا:خوای گەورە خاکی باوەڕ و بێ باوەڕی جیاکردووەتەوە.

---

[1]- ئەبو داوود(٢٦٤٥) و ترمیزی(١٦٠٤) ئیخراجیان کردووە.

**٣٠-رێبازی پەیامبەری خوا لە پاراستن و ئاشتەوایی و مامەڵەکردنی نێردراوانی بێباوەڕان و وەرگرتنی جزیە و مامەڵەکردنی ئەهلی کیتاب و دووڕووان و مۆڵەتدانی بێباوەڕێك تاوەکو بێتەلای و گوێبگرێ لەوتەی خوا و پاشان بگەڕێتەوە شوێنی خۆی و ئەمەکداربوونی بەبەڵێن و بەرییوونی لەغەدر و ناپاکی**

لێیەوە سەلماوە فەرموویەتی:"ذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ والملائكة والناس أجمعين، لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلَا عَدْلًا"[1]،واتا:لەئەستۆگرتن و ئەمانەت پێ دانی موسڵمانان یەك شتە و هەموویان پێیەوە پابەندن، هەرکەسێ موسڵمانێکی خستە حاڵەتی شەرم و شکانەوە، ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و تەواوی خەڵکیی لەسەرە و خوای گەورە هیچ پەرستشێکی لێ قبوڵ ناکات.

لێیەوە هاتووە فەرموویەتی:"وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَوْمٍ عَهْدٌ فَلَا يَحِلَّنَّ عُقْدَةً وَلَا يَشُدَّهَا، حَتَّى يَنْقَضِيَ أَمَدُهَا، أَوْ يَنْبِذَ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ"[2]،واتا:هەر موسڵمانێ پەیمانی هەبوو لەگەڵ بێباوەڕاندا، دەبێ چاوەڕێ بکات تاوەکو کاتەکەی تەواو دەبێ یان پێشوەختە ئاگاداریان بکاتەوە لەهەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی نێوانیان.

فەرموویەتی:"لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يومَ القيامة يُرفعُ له بقدرِ غدرته، يُقَالُ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ ابن فُلَانٍ"[3]،واتا: هەموو کەسێکی ناپاك و غەدرکار لەڕۆژی قیامەتدا ئاڵایەکی هەیە و بەپێی غەدرەکەی بۆ بەرز دەکرێتەوە، ئەوترێ: ئەمە غەدری فلانی کوڕی فلانە.

---

[1] - بوخاری(٧٣٠٠) و موسلیم(١٣٧٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەبو داوود(٢٧٥٩) و ترمیزی(١٥٨٠) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری(٦١٧٧) و موسلیم(١٧٣٥) ئیخراجیان کردووە.

## ٣١-لەبارەی بەشەکانی بێباوەڕانی مەدینەوە

کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هاتە مەدینەوە،بێباوەڕان بوونە سێ بەشەوە:

بەشێکی: ڕێکەوتن لەگەڵیدا و بەڵێنیان پێدا کە شەڕی نەکەن و لەدژی پشتی کەس نەگرن و لایەنگری دوژمنی نەکەن، ئەو بێباوەڕانە بوون کە لەخوێن و ماڵیاندا سەلامەتییان پێ درا.

بەشێکی تر: شەڕیان کرد و پشتگیریی دوژمنەکانیان کرد.

بەشێکی تر: وازیان لێهێنا، نە ڕێکەوتنیان لەگەڵدا کرد و نە بوونە دوژمنی، بەڵکو چاوەڕوانییان کرد دۆخەکە بەکوێ دەگات.

بۆیە بەپێی ئەو فەرمانەی پەروەردگاری پێی دابوو، مامەڵەی ئەو کۆمەڵانەی کرد. لەگەڵ جولەکەدا ڕێککەوت و نووسراوی ئارامی و سەلامەتییان لەنێواندا نووسرا، سێ تایەفەی جولەکە بوون: بەنو قینوقاع و بەنو نەزیر و بەنو قورەیزە.

لەدوای بەدر، بەنو قینوقاع شەڕی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)یان کرد، بەڕووداوی بەدر شێت و هار بوون، ستەم و حەسوودییان دەرخست، بۆیە سەربازانی خوا کە پەیامبەری بەندەی خوایان لەپێشەوە بوو، لەڕۆژی شەممەی نیوەی مانگی شەوا لەسەرەتای بیستهەمین مانگی هیجرەتیدا بۆیان بەڕێکەوت. گەمارۆیەکی توندی خستەسەریان، خوای گەورە ئەو ترس و تۆقینەی خستە دڵیانەوە کە ویستی پێی شەرمەزاریان بکات و بەدۆڕانیان بدات،سەرەنجام ملکەچی فرمانی پەیامبەری خوا بوون(صلى الله عليه وسلم)سەبارەت بەخۆیان و ژن و منداڵ و سەروەت و سامانیان، فرمانی لەبارەیانەوە دا، عەبدوڵلەی کوڕی ئوبەی لەبارەیانەوە زۆر پێداگریی لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کرد، بۆیە ئەویش بۆ ئەو،ئەوانی بەخشی، فرمانی دا لەمەدینە دەربچن و لەدەوروبەری

نەمێنن، ئەوانیش دەرچوون بۆ ئەزروعاتی شام، لەوێ کەم مانەوە هەموویان تیاچوون، بازرگان و زەرەنگەر بوون، شەسەد جەنگاوەریان هەبوو، لەلایەکی مەدینە بوون، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سەروەت و سامانەکانیان لێ وەرگرتن.

## ٣٢-هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و بەڵێن لەلایەن بەنو نەزیرەوە

پاشان بەنو نەزیر لەپەیمان و بەڵێنی خۆیان پاشگەزبوونەوە، ئەوەش دوای ئەوەی شەش مانگ بەسەر ئەو پەیمانەدا تێپەڕیبوو، هۆکاری ئەوە، ئەوە بوو پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا ڕۆیشت بۆلایان و قسەی لەگەڵ کردن سەبارەت بەخوێنبایی ئەو دوو کەسە کیلابییەی کە عەمری کوڕی ئوممەیەی ئەلزەمریی کوشتبوونی. جولەکەکانی بەنو نەزیر وتیان: ئەی ئەبا ئەلقاسم ئێمەش لەو خوێنباییەدا بەشدار دەبین، لێرە دابنیشە ئێستا ئێمە داواکارییەکەت جێبەجێ دەکەین، ڕۆیشتن، شەیتانی بەدبەخت وەسوەسەی بۆ دروست کردن پیلانی کوشتن بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) دابڕێژن. وتیان: کێ ئەم دەستاڕە ئەباتە سەربان و ئەوێوە بیدا بەسەریدا و بیکوژێ؟ یەکسەر لەلایەن خوای گەورەوە وەحی بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)هات و پیلانەکەی بۆ ئاشکرا کرد، بۆیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) یەکسەر هەڵساو گەڕایەوە مەدینە، نێردراوی نارد بۆلایان کە لەمەدینە دەربچن و تیایدا نەمێننەوە، دە ڕۆژ مۆڵەتتان دەدەم، ئەگەر لەو دە ڕۆژە تێپەڕی و هەرکەسێ مایەوە، لەگەردنی دەدەم.

چەند ڕۆژێ مانەوە خۆیان ئامادە دەکرد بۆ دەرچوون، کەچی عەبدوڵڵەی کوڕی ئوبەی دووڕوو نامەی بۆیان نارد و وتی: لەشوێنی خۆتان دەرمەچن، من دوو هەزار چەکدارم هەیە دێنە قەڵاکانتانەوە لەگەڵ ئێوەدا شەڕ دەکەن و لەپێناو ئێوەدا



خۆیان دەدەن بەکوشت، قورەیزە و هاوپەیمانەکانتان لەغەتفان بەرگرییتان لێ دەکەن، بۆیە سەرکردەی بەنو نەزیر حویەی کوڕی ئەختەب بەم قسەیەی کوڕی ئوبەی لەخۆبایی بوو، نامەی بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)نارد و تیایدا وتی: ئێمە لەشوێن و وڵاتی خۆمان دەرناچین، چیت دەوێ بۆ خۆتی بکە. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەم هەواڵە(الله أكبر)ی کرد و هاوەڵانیش(الله أكبر)یان کرد و بۆی دەرچوون، کە پێیان گەیشتن، بەتیر و بەرد بۆردوومان کران، قورەیزە کشایە دواوە، کوڕی ئوبەی و هاوپەیمانەکانی غەتفانیشیان ناپاکییان پێیان کرد.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گەمارۆی دان، دار خورماکانیانی بڕی و سووتاندنی، بۆیە نامەیان نارد: ئێمە لەمەدینە دەردەچین، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هێشتی بەخۆیان و منداڵیان دەربچن و لەماڵ و سامانیشیان ئەوەی بارە حوشترێ هەڵیبگرێ جگە لەچەك. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەستیگرتەسەر سەروەت و سامان و باخەکانیان.

خاك و سامانی بەنو نەزیر تایبەت بوو بەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)و بەرژەوەندیی موسڵمانان، پێنجیەکی لێ دەرنەکرد، چونکە بەبێ شەڕ دەسکەوت.

## ٣٣-غەزوەی بەنو قورەیزە

هەرچی هۆزی قورەیزە بوو، ئەوە سەختترین جولەکەیەك بوون دوژمنایەتییان بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) هەبوو، بێباوەڕیکی توون و سەختگیرتربوون، بۆیە ئەوەیان بەسەردا هات کە بەسەر براکانیاندا هات.

هۆکاری شەڕکردن و غەزوکردنیان، ئەوەبوو کاتێ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەرچوو بۆ شەڕی خەندەق و لەگەڵ بەنو قورەیزەدا ئاشتەوایی و ڕێکەوتنی هەبوو، حویەی کوڕی ئەختەب هات بۆلایان و وتی: شکۆی سەردەمم بۆ هێناون،

قورەیشم بەگەورەکانیان و غەتفانم بەسەرکردەکانیانەوە هێناوەتە سەر موحەممەد، ئێوەش خاوەن هێز و چەکن، دەی راپەڕن تاوەکو لەموحەممەد رزگارمان بێ، گەورەی قورەیزە وتی: دەی سوێند بەخوا سەرشۆڕیی سەردەمت بۆ هێناوین، هەورێکت بۆ هێناوین ئاوی لێ رژاوە، وا بروسکە و تریشقەی هەیە، بەلاّم حویەی هەر قسەی بۆ دەکرد و فێڵی دەکرد و بەڵێنی پێ دەدا هەتاوەکو بەمەرجێ بەدەمیەوە هات، ئەویش ئەوە بوو لەگەڵیدا بچێتە قەلاّکەیەوە و سەرەنجامی وەك سەرەنجامی ئەو بێ، حویەیش ئەوەی کرد و لەپەیمان لەگەڵ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پاشگەزبوونەوە، هەواڵی ئەو رووداوە بەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)گەیشت، کەسێکی نارد راست و ناڕاستیی ئەو هەواڵە دڵنیابێتەوە، بینی راستە پەیماننامەکەیان هەڵوەشاندووەتەوە، بۆیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)(الله أكبر)ی کرد و فەرمووی:"أَبْشِرُوا يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ"،واتا:ئەی موسڵمانان مزگێنی بدەن.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە گەیشتە مەدینە و هەر ئەوەندە بوو شمشێری دانا، جبریل هات و وتی:"تۆ چەکت داناوە لەکاتێکدا فریشتەکان چەکیان دانەناوە، بۆیە خۆت و ئەوانەی لەگەڵتن هەڵسن بەڕێکەون بۆ بەنو قورەیزە، منیش لەپێش ئێوەوە بەڕێدەکەوم و قەلاّکانیان دەهێننمە لەرزین بەخۆیانەوە و ترس و تۆقین ئەخەمە دڵیانەوە". جبریل(سەلامی خوای لەسەربێ) بەکەژاوەی فریشتەکانەوە بەڕێکەوت و پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) بەدوایدا بەکەژاوەی پشتیوانان و کۆچەران بەڕێکەوت، دابەزیە قەلاّکانی بەنو قورەیزە و بیست و پێنج شەو گەمارۆی خستەسەر.

پاشان ملکەچ بوون بۆ هەر بڕیارێکی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئەوس هاتن بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتیان: ئەی پەیامبەری خوا، تۆ

دەستت نەهێنایە ڕێگەی بەنو قینوقاع کە هاوپەیمانی براکانمان بوون لەخەزرەج، بەنو قینوقاعیش مەوالیی ئێمەن، بۆیە منەتیان بخەرەسەر، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "ئایە رازیی نابن پیاوێ لەخۆتان بڕیاریان لەبارەوە بدات؟ وتیان: بەڵێ بۆ نا. فەرمووی: "ئەو پیاوەش سەعدی کوڕی موعازە. وتیان: وا رازیی بووین. ناردی بەشوێن سەعددا کە لەمەدینە بوو، بەهۆی برینداریییەوە نەیتوانیبوو لەگەڵیاندا دەربچێ، سەعد خرایەسەر گوێدرێژێك و هێنرا بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم).

کە گەیشتەلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەهاوەڵانی فەرموو: "هەڵسن بچن بۆلای گەورەکەتان"، کە دایانگرت، وتیان: ئەی سەعد ئەوانە رازیین تۆ بڕیاریان لەبارەوە بدەی. وتی: ئایە بڕیاری من بەسەریاندا جێبەجێ دەکرێ؟ وتیان: بەڵێ. وتی: بەسەر موسڵمانانیش؟ وتیان: بەڵێ. وتی: بەسەر ئەوەش کە لێرەیە و رووی نەکردە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وەك رێز و گەورە راگرتنێك؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "بەڵێ، بەسەر منیشەوە جێبەجێ کراوە". سەعد وتی: بڕیاری من لەبارەیانەوە ئەوەیە، پیاوانیان بکوژرێ و وەچەکانیشیان بکرێنە کۆیلە و سەروەت و سامانەکانیش دابەش بکرێن. پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "بڕیارت بەسەریاندا دا بەبڕیاری خوای گەورە لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە".

ئەوەش بڕیاری بوو لەبارەی جولەکەی مەدینەوە، دوا بەدوای هەر غەزوەیەکی گەورە، غەزوی تایەفەیەکی جولەکە دەکرا، دوای شەڕی بەدر چووە سەر بەنو قینوقاع، دوای ئوحود بۆ سەر بەنو نەزیر، دوابەدوای خەندەق بۆ سەر بەنو قورەیزە. هەرچی جولەکەی خەیبەرە، ئەوە دواتر پشت بەخوای گەورە باسی دەکەین.

## ٣٤-رێبازی پەیامبەری خوا لەبارەی قەومێکەوە کە هەندێکیان پەیماننامەیان هەڵوەشاندبێتەوە

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر لەگەڵ قەومێکدا رێکەوتنێکی بکردبایە و هەندێکیان لەو رێکەوتن و پەیماننامەیە پاشگەزببوونایەتەوە، ئەوە شەڕی هەموویانی دەکرد، هەموویانی بەهەڵوەشێنەرەوەی ئەو پەیماننامەیە دادەنا هەروەك بەرانبەر قورەیزە و نەزیر و قینوقاع کردی، هەروەك بەرانبەر خەڵکی مەککە کردی، ئەوە سوونەتی بوو لەبارەی ئەهلی پەیماندەرەوە، بۆیە پێویستە حوکمی ئەهلی زیمەش هەر بەو جۆرە بێ.

## ٣٥-رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) سەبارەت بەوانەی پەیماندەر کە خەڵکانی بێباوەڕ دەهێننە نێو خۆیان

یەکێك لەسوونەتەکانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)،ئەوە بوو ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك رێك بکەوتبایە و ئاشتەوایی بکردبایە،قبوڵی دەکرد دوژمنانی تری لەگەڵ دوژمنی ئاشتیخوازدا تێکەڵ بەو رێکەوتنە ببێ، جا ئەگەر ئەو کۆمەڵە نوێیە شەڕ بەهاوپەیمانێکی بکەن، ئەوە وەك یەك دەڕوانێتە ئەو دوو دوژمنەی تێکەڵی رێکەوتنەکەی بوونە و هەردوو لای دوژمن هاوپەیمانی یەکن، بەو هۆیەوە بوو شەڕی خەڵکی مەککەی کرد.

## ٣٦- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەمامەڵەکردنی نێردراوان و ئەمەکداربوونیشی بەبەڵێنی هاوەڵانیەوە

نێردراوانی دوژمن ئەهاتنەلای و دوژمنی بوون، کەچی قسەی ناخۆشی پێیان نەدەوت و نەیدەکوشتن. دیلی نەدەکردن، رێگریی نەدەکرد بگەنەوە لای قەومی خۆیان هەروەك لەگەڵ ئەبی رافیعدا ئەوەی کرد و گەڕاندیەوە لایان.

یەکێکی تر لەڕێبازی ئەوە بوو، ئەگەر دوژمنانی بەڵێن و پەیمانیان بەموسڵمانێك بدابایە و ئەو پەیمانە زیانی بەموسڵمانان نەدابایە، ئەیهێشت کاری لەسەر بکرێت، هەروەك بەڵێنیان بەحوزەیفە و ئەلبحوسەیلی باوکی دا و بەڵێنیان لێیان وەرگرت لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم)شەڕی ئەوان نەکەن، ئەوەی بۆ هێشتنەوە و بەهەردووکیانی فەرموو:"انصرفا، نفِي لهم بعهدِهم، ونستعينُ بالله عليهم"[1]،واتا: بڕۆن و بەبەڵێنی خۆتانەوە پابەند، ئێمە لەدژ ئەوان پشت بەخوا دەبەستین.

## ٣٧-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەگرێبەستی زیممە و ئەهلی جزیە

هەرچی ڕێبازی پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی گرێبەستی زیممە و ئەهلی جزیەوە، ئەوە بوو لەدوای دابەزینی سورەتی بەرائە لەساڵی هەشتی کۆچی، جزیەی لەبێباوەڕان وەرگرت، کە ئایەتی جزیە دابەزی، لەسێ کۆمەڵ وەریگرت: لەمەجوس و جولەکە و گاوران، لەبتپەرستان جزیەی وەرنەگرت. وتراوە: تەنیا لەبێباوەڕانی ئەو سێ تایەفەیە جزیەی وەردەگرت، لەنێو بێباوەڕاندا لەو سێ کۆمەڵە جزیە وەردەگیردرێت. وتراوە: لەئەهلی کیتاب و بتپەرستانی عەجەم جزیە وەردەگیردرێت.

خاوەن بۆچوونی دووەم ئەڵێن: تەنیا لەهاوبەش پەیداکەرانی عەرەب وەرنەگیراوە، چونکە لەنێو عەرەبدا هاوبەش پەیداکەر نەمابوو کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی، دوای فەتحی مەککە دابەزی کە عەرەب پۆل پۆل هاتبوونە نێو ئیسلامەوە. هەرکەسێکیش لەژیاننامەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و ڕۆژگاری ئیسلام رابمێنێ، دەبینێ کە بەو جۆرە بووە، فەرموودەش لەسەر ئەوە بەڵگە دەدات و

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٧٨٧).

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"إِذَا لَقِيْتَ عَدُوَّكَ مِنَ المُشْرِكِيْنَ، فَادْعُهُمْ إِلَى إحدى خِلالٍ ثَلَاث ، فَأَيَّتُهُنَّ أَجَابُوكَ إليها، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ"،واتا:ئەگەر بەدوژمنانی هاوبەش پەیداکەرت گەیشتی، بانگەوازیان بکە بۆ یەکێ لەم سێ شتە، ئەگەر بەدەمتەوە هاتن، لییان قبوڵ بکە و وازیان لێ بهێنە. پاشان فرمانی پێ دەکات بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام یان جزیە یان شەڕیان بکات[1].

## ٣٨-ڕێکخستنی سیاقی ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ بێباوەڕان و دووڕووان لەوەختی بەپەیامبەر ناردنەوە تاوەکو گەیشتنەوە بەخوای گەورە

یەکەمین وەحییەك خوای گەورە بۆی کردبێتی، ئەوە بوو بەناوی ئەو خواوە بخوێنێتەوە کە مەخلوقی دروستکردووە، ئەوە سەرەتای پەیامبەرایەتیی بوو، فرمانی پێکرد لەدەروونی خۆیەوە بخوێنێتەوە، فرمانی گەیاندنی پێ نەکرد هەتاوەکو ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ ﴾ **المدثر: ١ – ٢** ،واتا: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە. هەستە(خەڵکی) بێدار بکەرەوە.

وریای کردەوە بە(اقرأ)، ڕەوانەشی کرد بە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ **المدثر: ١** ﴾.

پاشان فرمانی پێکرد خزمانی نزیکی وریا بکاتەوە پاشان عەرەبی دەوروبەری، پاشان تەواوی عەرەب، پاشان هۆشدارییەکە بگەیەنێتە هەموو جیهان، دە ساڵ و شتێ دوای پەیامبەرایەتییەکەی بەبێ شەڕ و جزیە بانگەوازی دەگەیاند و خەڵکی وشیار دەکردەوە، فرمانی دەکرد بەخۆڕاگری و لێبووردن.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٧٣١).

پاشان مۆڵەت درا کۆچ بکات، مۆڵەت درا شەڕ بکات، پاشان فرمانی پێ کرا شەڕی ئەوانە بکات کە شەڕی دەکەن، پاشان فرمانی پێکرا شەڕی هاوبەش پەیداکەران بکات تاوەکو هەموو ئایین بۆ خوای گەورە بێ.

پاشان لەبابەت جیهاددا بێباوەڕان لەگەڵیدا بوونە سێ بەشەوە: ئاشتەواییکار، شەڕکەر، ئەهلی زیممە، فرمانی پێکرا لەگەڵ پەیماندەراندا ئەمەکدار بێ هەتاوەکو بەڕاست بەپەیمانی خۆیانەوە پابەند دەبن، ئەگەر ترسا ناپاکیی و غەدر بکەن، پەیمانەکەیان بداتەوە، شەڕیان نەکات هەتاوەکو کۆتاییهاتنی پەیماننامەکەیان پێ رادەگەیەنێ، فرمانیشی پێ کرا شەڕی ئەوە بکات کە پەیمان هەڵدەوەشێنێتەوە.

پاشان پەیماندەر و ئاشتیخوازان بوونە دووبەشەوە: جەنگاوەر، ئەهلی زیممە، جەنگاوەرانی پەیماندەر لێی دەترسان. خەڵکی زەوی لەگەڵیدا بوونە سێ بەشەوە: موسڵمانێك باوەڕی پێ هەبوو. ئاشتەوایکارێك باوەڕی بەسەلامەتییەکەی هەبوو، ترساوێکی شەڕکەر.

سەربوورەی بەرانبەر دووڕووان، فرمانی پێکرا رواڵەتیان قبوڵ بکات و بەزانست و بەڵگە لەگەڵیاندا تێبکۆشێت، فرمانی پێکرا پشتیان تێ بکات و زبر بێ لەگەڵیاندا، نەهی لێکرا نوێژ لەسەر تەرمیان بکرێت و لەسەر گۆڕیان رابووەستێت. فرمانی پێ کرا، ئەگەر ئەو لێیان خۆش بێ یان لێیان خۆش نەبێ، ئەوە خوا لێیان خۆش نابێ.

هەرچی سەربووردەی بوو لەگەڵ دۆست و کۆمەڵی خۆیدا، ئەوە فرمانی پێکرا بەئارام بێ بەرانبەر بەوانەی بەیانیان و ئێواران لەخوا دەپاڕێنەوە و خوایان مەبەستە، بەوەی روویان لێ وەرنەگێڕێ، لێیان خۆش بێ و داوای لێخۆشبوونیشیان بۆ بکات و لەهەندێ کاروباردا راوێژیان پێ بکات و لەسەر تەرمەکانیشیان نوێژ بکات.

فرمانی پێ کرا قسە لەگەڵ کەسێکدا نەکات کە سەرپێچیی فرمانی کردبێ هەتاوەکو تەوبە دەکات.

فرمانی پێ کرا حەد لەسەر ئەوانە جێبەجێ بکات کە حەد دەیانگرێتەوە، لەوەدا جیاوازیی نەکرێ لەگەڵ کەسی خاوەن بنەماڵە و بێ بنەماڵەدا.

فرمانی پێ کرا دوژمنانی خۆی لەشەیتانی مرۆڤ پاڵ بنێت، بەچاکە وەڵامی خراپەیان بداتەوە، بە(أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) شەیتانانی جنۆکە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە.

## دەیەم: بەشی مەغازی و نێردراوانی(بەشێوەی کورت)

### ١- یەکەمین ئالایەك، ئالای حەمزە

یەکەمین ئالایەك کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دایینابێ، ئالا و لیوایەك بوو دایە دەست حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب لەمانگی ڕەمەزاندا، کردیە فەرماندە و بەسەرۆکی حەقدە کۆچەری بەناوبانگ ڕەوانەی کرد و ئالایەکی سپیی بوو، هەلگری ئالا ئەبو مەرسەد کەنازی کوڕی ئەلحوصەین ئەلغەنەوی هاوپەیمانی حەمزە بوو. لەگەڵ سی کۆچەری تایبەتدا ڕەوانەی کرد تاوەکو ڕێ بگرێت بەکاروانێکی وشتری قورەیش کە لەشامەوە دەگەڕایەوە و لەو کاروانەدا ئەبو جەهلی تێدابوو لەگەڵ سێسەد پیاودا، گەیشتنە سەیف ئەلبەحر لەڕووی ئەلعیس، بەیەکگەیشتن و ڕووبەڕوو وەستانەوە، مەجدی کوڕی عەمر ئەلجوهەنی کەوتە نێوان هەردوولا تاوەکو شەڕ ڕوونەدات و هاوپەیمانی هەردوولا بوو، بەوە نەیهێشت شەڕ ڕووبدات.

### ٢- غەزوەی ئەبواء

پاشان بەخودی خۆی غەزوەی ئەبوائی ئەنجام دا، ئەوتریێ: وەددان. یەکەمین غەزایەك بوو بەخۆی ئەنجامی دا، لەمانگی سەفەردا بوو بەسەرۆکایەتی کردنی دوانزە کۆچەری بەناوبانگ، ئالاکەش حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو، ئالایەکی سپیی بوو، سەعدی کوڕی عوبادەی بەسەرپەرشتیاری مەدینە بەجێهێشت، کەسانی تایبەتی کۆچەران دەرچوون بۆ ڕێگرتن لەکاروانی قورەیش و پێی نەگەیشتن.

### ٣- غەزوەی ئەلعەشیرە

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمانگی جەمادی دووەم لەپێشەوەی شانزە کۆچەری بەناوبانگدا دەرچوو، حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب ئالا

هەڵگربوو، ئاڵایەکی سپیی بوو، ئەبا سەلەمەی کوڕی عەبد ئەلئەسەدی ئەلمەخزومیی لەسەر مەدینە بەجێهێشت. بەسەد و پەنجا کەسەوو دەرچوو، ئەوتریّ: سەد و پەنجا کۆچەر و کەسی ناچار نەکرد بۆ دەرچوون، بەسی وشترەوە دەرچوون بۆ ڕێگرتن لەکاروانێکی قورەیش کە بۆ شام دەچوو، هەواڵی پێگەیشتبوو کە لەمکککەوە بەسەرۆەتی قورەیشەوە ئەو کاروانە دەرچووە، گەیشتە زا ئەلعەشیرە کە شوێنێکە لای یەنبوع، لەنێوان یەنبوع و مەدینەدا نۆ بوردە ڕێگە هەیە، بینی بەچەند ڕۆژێك کاروانەکە ڕۆیشتووە. ئەو کاروانە بوو کە لەشامەوە گەڕایەوە بەدوایدا دەرچوو، ئەوە بوو کە خوای گەورە بەڵێنی پیّ دا بۆی ببیّ یان شەڕی بکات، بەڵێنی خۆیشی هێنایەدی.

## ٤- سریەی عەبدواللەی کوڕی جەحش

پاشان عەبدواللەی کوڕی جەحشی ئەلئەسەدیی لەڕەجەبدا ڕەوانە کرد، حەڤدە مانگ بەسەر هیجرەتدا تێپەڕیبوو بەدوانزە کۆچەرەوە ڕەوانەی کرد، هەردوو کەس و لەسەر وشترێك بوون، گەیشتنە نەخلە و چاودێریی کاروانی قورەیشیان دەکرد، کاروانی قورەیش تێپەڕبوو کە مێوژ و گەنم و بازرگانیی هەڵگرتبوو، عەمری کوڕی ئەلحەزرەمی و عوسمان و نەوفەلیان تێدا بوو کە کوڕانی عەبدواللەی کوڕی موغیرە بوون، هەروەها ئەلحەکەمی کوڕی کیسانی خزمەتکاری نەوەی موغیرە، موسڵمانەکان راوێژیان کرد و وتیان: ئێمە لەکۆتا ڕۆژی مانگی ڕەجەبی پیرۆزداین، ئەگەر شەڕی ئەمانە بکەین، ئەوە پیرۆزیی ئەم مانگەمان شکاندووە، ئەگەر ئەمشەویش وازیان لیّ بهێنین ئەوە ئەکەونە ناو حەرەم، پاشان یەکدەنگ بوون ڕووبەڕوویان ببنەوە، یەکێکیان تیری گرتە عەمری کوڕی ئەلحەزرەمیی و کوشتی، عوسمان و ئەلحەکەمیان دیل کرد و نەوفل هەڵهات، پاشان کاروانەکەیان بەدوو

دیلەوە هێنا، پێنج یەکیان لێ دەرکرد، ئەوە یەکەم پێنجیەکێك بوو لەئیسلامدا، هەروەها یەکەمین کوژراو و یەکەمین دوو دیلێك بوو لەئیسلامدا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەو کارەی ئەوانی رەتکردەوە.

قورەیش بەوە زۆر تووڕەبوون، سەخت رەتیان کردەوە و ئەو کارەیان کردە بیانوو و پاساو و وتیان: موحەممەد کوشتاری لەمانگی پیرۆزدا حەلاڵ کردووە، هەروەها بەلای موسڵمانانیشەوە گران بوو هەتا ئەوەی خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ ﴾ **البقرة: ٢١٧** ،واتا: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی مانگی حەرام جەنگ کردن تیایدا بڵێ جەنگ لەمانگی حەرام دا گوناهێکی گەورەیە بەلاّم بەرهەڵستی رێبازی خوا وە بێ بڕوایی پێی وە(رێگری موسڵمانان)لەمزگەوتی حەرام و دەرکردنی خەڵکی ئەو مزگەوتە لێی گەورەترە لای خوا(لە جەنگ کردن لە مانگی حەرامدا) وە هاوەڵ پەیداکردن بۆ خودا و هەوڵ دان بۆ پەشیمان کردنەوەی موسڵمان گەورەترە لە(پیاو)کوشتن.

مەبەست: خوای گەورە بەدادگەرییەوە بڕیاری لەنێوان دۆست و دوژمنانی دا، دۆستەکانی بەریی نەکرد لەوەی لەمانگی پیرۆزدا تاوانیان ئەنجام داوە، هەواڵی دا بەوەی تاوانێکی گەورەیان ئەنجام داوە، بەلاّم ئەوەی هاوبەش پەیداکەرە دوژمنەکانی ئەنجامی دەدەن گەورەتر و خراپترە لەشەڕێ لەمانگی پیرۆز، ئەوە هاوبەش پەیداکەرانن شایەن بەوەن سەرزەنشت بکرێن و جێی عەیب و سزان، بەتایبەت دۆستەکانی لەوەدا تەئویلیان هەبوو، یان جۆرێ کەمتەرخەمییان تێدا هەبووە و خوای گەورە لێیان خۆش دەبێ بەوەی یەکتاپەرستن و گوێڕایەڵییان

هەیە و لەگەڵ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)دا کۆچیان کردووە و پاداشت و ڕەزامەندیی خوایان باو داوە بەسەر شتانی تردا.

## ٥- گۆڕینی قیبلە

لەشەعبانی ئەو ساڵەدا قیبلە گۆڕا، پێشتریش ئەوە باس کرا.

## ٦- شەڕی گەورەی بەدر

کە لەڕەمەزانی ئەو ساڵەدا هەواڵی ئەوە بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) گەیشت، کاروانی وشتری قورەیش بەسەرکردایەتی ئەبو سوفیان لەشامەوە بەڕێکەوتووە و هەمان ئەو کاروانەیە کە لەدەرچوونی لەمەککە بەدوایدا دەرچوون، کاروانێکە نزیکەی چل پیاوی تێدایە بەسەروەت و سامانێکی گەورەی قورەیشەوە بەڕێگەوەیە، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) خەڵکیی هان دا بۆی دەربچن، فرمانی دا هەرکەسێ ئامادەیە با دەربچێ، ئاهەنگی گەورەی بۆ ساز نەدا، چونکە بەپەلە لەسێسەد و دە و شتێ پیاودا بۆی دەرچوو، تەنیا دوو کەسیان تێدابوو ئەسپیان پێ بێ: ئەسپێکی زوبەیری کوڕی عەوام و ئەسپێکی میقدادی کوڕی ئەلئەسوەد ئەلکیندی، حەفتا وشتریان پێ بوو هەر دوو کەس و سێ کەس لەسەر وشترێك بوون، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و عەلی و مەرسەدی کوڕی ئەبی مەرسەد ئەلغەنەوییش لەسەر وشترێك بوون.

بۆ سەرپەرشتیاری مەدینە و پێشنوێژیکردن، ئیبن ئوم مەکتومی بەجێهێشت، لەڕەوحائدا بوو ئەبو لوبابەی کوڕی عەبد ئەلمونزیری ناردەوە و کردیە سەرپەرشتیاری مەدینە، ئاڵاکەشی سپاردە موسعەبی کوڕی عومەیر.

هەرچی ئەبو سوفیان بوو، کە هەواڵی دەرچوونی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ی پێگەیشت کە نیازی هەیە بەو بگات، زەمزەمی(ضمضم)ی کوڕی عەمری ئەلغەفاریی بەکرێ گرت تاوەکو هاوار بباتە بەر قورەیش و خێرا فریای بکەون، بۆیە هەموویان ڕاپەڕین، هیچ گەورەیەك بەجێنەما جگە لەئەبو لەهەب، ئەویش پیاوێکی قەرزداری خۆی نارد، هۆزەکانی عەرەبی دەوروبەری خۆیانیان گردکردەوە و لەهۆزەکانی قورەیشیشدا تەنیا نەوەی عەدی ئامادە نەبوون، کەسیان لەگەڵیاندا دەرنەچوون، لەوڵاتی خۆیان دەرچوون هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ **الأنفال: ٤٧**

،واتا: وەك ئەوانە(وەك بت پەرستەکان) مەبن دەرچوون لەماڵ و وڵاتی خۆیان بەفیزو و ڕووپامایی بۆ خەڵك کرد وە ڕێگری(خەڵکیان)دەکرد لەڕێگەی خوا.

کە هەواڵی دەرچوونی قورەیش بەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) گەیشت، راوێژی بەهاوەڵانی کرد، کۆچەران قسەی چاکیان کرد، پاشان دووبارە راوێژی کردن، کۆچەران قسەی چاکیان کرد، پاشان بۆ جاری سێیەم راوێژی کردن، قسەی چاك و پەسەندیان کرد، پشتیوانان تێگەیشتن کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مەبەستی ئەوانە، بۆیە سەعدی کوڕی عوبادە دەستپێشخەریی کرد و وتی:ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وەك دیارە بۆچوونی ئێمەت مەبەستە. ئەوانی مەبەست بوو، چونکە بەیعەتیان پێ دابوو لەوڵاتی خۆیاندا لەهەموو کەسێکی بپارێزن، بۆیە کە ویستی دەربچێ، راوێژی پێکردن تاوەکو بزانێ ئەوان چی ئەڵێن. بۆیە سەعد وتی: ڕەنگە بترسی لەوەی بەڵێنی ئەوەمان لەگەردنە ئێمەی پشتیوانان لەوڵاتی خۆماندا بەرگریت لێ بکەین نەك لەشوێنانی تر، بەڵام وا من لەجیاتیی پشتیوانان وەڵام دەدەمەوە: چۆنت دەوێ و چی شوێنێکت مەبەستە بەڕێکەوە و لەگەڵتین، چۆنت ویست لەسەروەت و سامانمان ببە، چۆنت ویست ئاوەهامان پێ

بده، فرمانمان پەیوەستە بەفرمانی تۆوە، سوێند بەخوا ئەگەر بەرێبکەوی تاوەکو بگەیتە بەرك لەغەمدان، ئێمە لەگەڵتدا بەرێدەکەوین، سوێند بەخوا ئەگەر بمانبەیتە ئەم دەرگایەوە لەگەڵتدا دەچینە ناویەوە، بۆیە رووی پیرۆزی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گەشایەوە و دڵخۆش بوو بەبیستنی ئەو قسەیە لەهاوەڵانی، فەرمووی:"سيروا وأبْشِرُوا، فإنَّ الله قد وَعَدَني إِحْدَى الطَّائفَتَين، وإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ مَصارعَ القَوْم"،واتا: بەرێکەون و موژدە بدەن، خوای گەورە بەڵێنی سەرکەوتنی بەسەر یەکێك لەو دوو کۆمەڵەیەی پێ داوم، من لەناوچوونی ئەوانەم بینیووە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەرێکەوت بۆ بەدر، ئەبو سوفیانیش خۆی گەیاندە کەنار دەریا، کە بینی رزگاری بووە و کاروانی وشترەکانی سەلامەت بووە، نامەی بۆ قورەیش نووسی: بگەرێنەوە، ئێوە بۆ رزگارکردنی کاروانەکە دەرچوون. کاتێ هەواڵەکەیان پێگەیشت لەجەحفە بوون، ویستیان بگەرێنەوە، بەڵام ئەبو جەهل وتی: سوێند بەخوا ناگەرێینەوە تاوەکو نەگەینە بەدر و لەوێ نەمێنینەوە و نان بەو عەرەبانە نەدەین کە دێنە لامان، دوای ئەوە عەرەب لەئێمە دەترسێن، ئەخنەسی کوری شورەیق داوای کرد بگەرێنەوە، بەڵام بەگوێیان نەکرد، بۆیە خۆی و نەوەی زوهرە گەرانەوە و هیچ کەسێکی زوهرە ئامادەی بەدر نەبوو، ئیتر نەوەی زوهرە پابەند بوون بەبۆچوونی ئەخنەسەوە، ئیتر تیایاندا گەورە و گوێلێگیراو بوو. نەوەی هاشم ویستیان بگەرێنەوە، ئەبو جەهل نەیهێشت و وتی: هەتا نەگەرێینەوە، ئەم کۆمەڵەیە نابێ لەئێمە دابرێن.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەرێکەوت تاوەکو ئێوارە دابەزییە کەنار ئاوەکانی بەدر، فەرمووی:"شوێنی دابەزینم پیشان بدەن". ئەلحوبابی کوری ئەلمونزیر وتی: ئەی پەیامبەری خوا من شارەزام بەکون و کەلەبەری ئەم شوێنە و شارەزام بەقولوب، برۆیتە قولوب(قُلُب) باشە، ئاوەکەی سازگار و زۆرە، ئەگەر



بڕۆیته ئەوەیٚ ڕیٚ دەگرین لەوەی قورەیش دابەزێته ئەو شوێنه و بیرە ئاوەکانی تر پڕ دەکەینەوە.

بۆیه پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان پێش کەوتن بۆ چوونه سەر ئەو ئاوە، لەنیوە شەودا دابەزینه ئەویٚ، حەوزیان بەدەوردا لیٚ دا و بیرەکانی دیکەیان پڕ کردەوە. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی دابەزینه سەر حەوزە ئاوەکان، کەپرێ بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) دروست کرا لەسەر تەپۆڵکەیەك بوو ئەیڕوانیه گۆڕەپانی جەنگ، لەشوێنی جەنگەکەدا ڕێی دەکرد و بەپەنجەی دەستی ئاماژەی دەکرد:" ئەوە شوێنی کوژرانی فلاٚنه کەسە، ئەوە شوێنی کوژرانی فلاٚنه کەسە، ئەوە شوێنی کوژرانی فلاٚنه کەسه ئەگەر خوا ویستی لیٚ هەبیٚ". ئەو شوێنانەی ئەو ئاماژەی پێدان، بوونه شوێنی کوژرانی ئەو کەسانه و کوژرانیان نەکەوته شوێنی ترەوە[1].

که هاوبەش پەیداکەران دەرکەوتن و هەردوولا یەکتریان بینی، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"اللَّهُمَّ أَنْجِزْ مَا وَعَدْتَنِي،اللَّهُمَّ أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ"،واتا:خوایه گیان داوات لیٚ دەکەم ئەو بەڵێنه بەجێبهێنی که بە منت داوە، خوایه گیان داوای بەڵێن و پەیمانی خۆت دەکەم. ئەبو بەکری سدیق لەپشتەوە وەستابوو بەجێی نەدەهێشت و وتی: ئەیٚ پەیامبەری خوا موژدە بدە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، خوای گەورە ئەوەت بۆ بەجێدەهێنیٚ که بەڵێنی پیٚ داوە[2].

موسڵمانان دڵسۆزانه لەخوای گەورە دەپاڕانەوە و داوای سەرکەوتنیان دەکرد، بۆیه خوای گەورە وەحی بۆ فریشتەکانی کرد:﴿أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ﴾ **الأنفال: ١٢** ،واتا: (بیهێنەوە بیر) کاتێك که

[1] – موسلیم نزیك بەوە ئیخراجی کردووە(١٧٧٩).

[2] – بوخاری(٢٩١٥) و موسلیم(١٧٦٣) ئیخراجیان کردووە.

پەروەردگارت نیگای نارد بۆ فریشتەکان(کە بە پێغەمبەر و باوەڕداران ڕابگەیەنن) کە بێگومان من(خوای گەورە) لەگەڵتانم دەی دڵی کەسانێك قایم و دامەزراوکەن کە باوەڕیان هێناوە بە زوویی ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕ بوون.

وەحی بۆ پەیامبەرەکەشی کرد و فەرمووی: ﴿ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ ﴾ **الأنفال: ٩** ،واتا: من دەینێرم بۆ یارمەتیتان هەزار فریشتە بە دوای یەکدا(دێنە خوارێ).

### بەش

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەوێدا ڕووەو دارخورمایەکی بچووك نوێژی دەکرد، شەوی حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دوو بوو، کە بەیانیی بوویەوە، قورەیش ئامادەساز بوون، هەردوولا بەرانبەر بەیەکتر وەستانەوە، حەکیمی کوڕی حیزام و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە لەقورەیش بەڕێکەوتن تاوەکو بگەڕێنەوە و شەڕ نەکەن، بەڵام ئەبو جەهل ڕەتیکردەوە، لەنێوان خۆی و عوتبەدا دەمەقاڵە رووی دا و تووڕەی کرد، ئەبو جەهل داوای لەبراکەی عەمری کوڕی حەزرەمیی کرد داوای خوێنی عەمری برای بکات، تووڕەی کرد و هاواری کرد: ئای عەمر، خەڵکەکە گەرم بوون و شەڕ هەڵگیرسا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ریزەکانی رێکخست و گەڕایەوە لای کەپرەکە، تەنیا خۆی و ئەبو بەکر لەوێ بوون، سەعدی کوڕی موعاز و کۆمەڵێك لەپشتیوانان لەبەر دەرگای کەپرەکە بوون پارێزگارییان لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دەکرد.

عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە دەرچوون و داوایان دەکرد لەڕیزی موسڵمانان کەسانێك دەربچنە بەرانبەریان، بۆیە سێ کەس لەپشتیوانان

دەرچوون: عەبدوللەی کوڕی ڕەواحە و عەوف و میعوەزی کوڕی عەفراء دەرچوون،وتیان: ئێوە کێن؟ وتیان: پشتیوانانین. وتیان: ئێمە ئەمانەوێ بەرانبەر بەکوڕانی مامان شەڕ بکەین. بۆیە عەلی و عوبەیدەی کوڕی حاریس و حەمزە دەرچوون. عەلی، وەلیدی دا بەزەوییدا و کوشتی، حەمزە، عوتبەی کوشت و دای بەزەوییدا، وتراوە شەیبەی کوشت. عوبەیدە دواکەوت و دوو لێدانی کرد، حەمزە و عەلی توانیان بەرانبەرەکەی عوبەیدە بکوژن و عوبەیدە ڕزگار بکەن، عوبەیدە قاچی بڕابوو، بەنەخۆشیی مایەوە لەسەفرائدا کۆچی دوایی کرد.

## بەش

کە دووڕووان ئەوانەی نەخۆشییان لەدڵدا هەبوو کەمیی ڕێژەی کۆمەڵی خواو زۆریی دوژمنانیان بینی،وەهایان گومان کرد ڕێژە زۆری دوژمن سەردەکەوێ، بۆیە وتیان: ﴿ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾ ﴾ **الأنفال: ٤٩** ،واتا: (بیربکەرەوە)کاتێك دووڕووەکان و ئەوانەی نەخۆشی لەدڵیاندا بوو دەیانووت ئەوانە(موسوڵمانەکان) ئاینەکەیان فریوی داوون هەرکەسێك پشت بەخوا ببەستێت ئەوە بەڕاستی خوا بە دەسەلاتی کار دروستە.

بەلام خوای گەورە هەواڵی دا، کە سەرکەوتن بەڕێژە زۆریی نییە، خوا گەورە و شکۆدارە و دۆڕانی بەسەردا نایەت.

کە دوژمن نزیکبوونەوە و ڕووبەڕووبوونەوە، لەنێو خەڵکەکەدا ڕاوەستا و ئامۆژگاریی کردن و باسی ئەوەی بۆ کردن کە سەرکەوتن و برانەوەی گەورە لەئارامگرتن و دامەزراوییدایە، هەروەها پاداشتی قیامەتیی خوای گەورە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەندێ وردە چەو و خۆڵی هەڵگرت و پرژاندی بەرووی دوژمندا، هیچ پیاوێکیان تیدا نەبوو چاوی لەو خۆڵ و تۆزە پڕ نەبێ، سەرقاڵی تەکاندنی دەموچاویان بوون و موسڵمانانیش خەریکی کوشتنیان بوون، خوای گەورە لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ﴾ **الأنفال: ١٧** ،واتا: کاتێ کە(مشتێ خۆڵ و زیخت ڕوو بەکافران) هاوێشت بەتەنها تۆ نەتهاوێشت بەڵکو خوا هاوێشتی.

کە شەڕ ساردبوویەوە و ئەوانیش بەدۆڕاوییەوە پشتیان هەڵکرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"کێ تەماشایەکمان بۆ دەکات ئەبو جەهل چی دەکات؟ ئیبن مەسعود رۆیشت، بینی هەردوو کوڕانی عەفراء ئەبو جەهلیان پێکاوە و خەریکە دەمرێ، ریشی گرت و وتی: تۆ ئەبو جەهلی؟ وتی: ئەمڕۆ سەرکەوتن بۆ کێ بوو؟ وتی: بۆ خوا و پەیامبەرەکەی، ئەی دوژمنی خوا، خوا ریسوای نەکردی؟ وتی:هیچ ریسواییەك بۆ من نییە کە ئێوە لەقەومی خۆم من دەکوژن. عەبدوالله کوشتی، پاشان هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی: کوشتوویەتی. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سێ جار فەرمووی:" اللّٰهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ"، پاشان فەرمووی☹الله أكبرُ، الحمدُ لله الذي صَدَقَ وعدَه، ونصرَ عبدَه، وهزَمَ الأحزابَ وحدَه". بمانبە ببیینین. رۆیشتین تاوەکو پیشانم داو فەرمووی:"ئەمە فیرعەونی ئەم ئوممەتەیە"[1].

کە شەڕ کۆتاییهات، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هات تاوەکو لەسەر کوژراوان راوەستا، پاشان فرمانی دا رابکیشرێن بۆ قولەیب لەبەدر و فڕێ درانە ناویەوە، پاشان لەسەریان راوەستاو فەرمووی: "ئەی رەبیعە، ئەی شەیبەی کوڕی رەبیعە، ئەی فلان، ئەی فلان، ئایە بەوە گەیشتن کە خوای پەروەردگارتان بەحەق

---

[1] – بوخاری(٣٩٦٢) و موسلیم(١٨٠٠) و ئەحمەد٧/ ٢٧٩(٤٢٤٧) ئیخراجیان کردووە.

بەڵێنی پێ دابوون، من وا ئەو بەڵێنە راستییەی پەروەردگارم بینی". عومەری کوڕی خەتاب وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) تۆ لەگەڵ کۆمەڵێ تەرمدا قسە دەکەی؟ فەرمووی:"سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەوان لەئێوە باشتر لەئێوە ئەم قسەیەی منیان گوێ لێیە، بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە"[1]، پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سێ رۆژ لەوێدا مایەوە، ئەگەر بەسەر هەر قەومێکدا سەرکەوتووبووایە، سێ رۆژ لەو شوێن و دەشتەدا دەمایەوە.

پاشان بەسەرکەوتوویی و ئارام و دڵخۆش بەسەرکەوتنی خوایی بۆی بەرێکەوت، دیل و دەسکەوتەکانیشی لەگەڵ بوو. کە لەسەفراء بوو دەسکەوتەکانی دابەش کرد و لەگەردنی نەزری کوڕی حاریسی کوڕی کیندەی دا، پاشان کە دابەزیە عرق ئەلزەبیە، لەگەردنی عوقبەی کوڕی ئەی موعەیتی دا.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەسەرکەوتن و پشتیوانیی خواییەوە چووە نێو مەدینە، هەموو دوژمنانی مەدینە و دەورووبەری لێی دەترسان، بۆیە خەڵکێکی زۆری مەدینە بوونە موسڵمان، ئەوکاتیش عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دووڕوو و هاورێکانی بەڕواڵەت موسڵمانبوونی خۆیانیان دەرخست.

کۆی ئەوانەی لەموسڵمان بەشداری بەدر بوون، سێسەد و دە و شتێ پیاو بوون، هەشتاو شەش کۆچەر و شەست و یەك کەسی ئەوس و سەد و حەفتا کەسی خەزرەج، لەموسڵمانانیش ئەو رۆژە چواردە کەس شەهید بوون: شەش کۆچەر و شەش خەزرەجی و دوو کەسی ئەوس. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەمانگی شەوالدا لەبابەت بەدر و دیلەکان بوویەوە.

---

[1] - بوخاری(١٣٧٠) و موسلیم(٢٨٧٣) ئیخراجیان کردووە.

**بەش**

که هاوبەش پەیداکەره دۆڕاوەکان بەدۆڕان و سەرشۆڕییەوە گەڕانەوە مەککە، ئەبو سوفیان نەزری کرد کە ئاو بەر سەری نەکەوێ تاوەکو شەڕی پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) نەکات، بەدوو سەد سوارەوە دەرچوو تاوەکو گەیشتە عەریزی دەورووبەری مەدینە، یەك شەو لای سەلامی کوڕی میشکەمی جولەکە مایەوە، عەرەقی پێ دا و بۆسەی دانا، لەبەربەیاندا هەندێ دار خورمای بڕییەوە و پیاوێکی پشتیوانی هاوپەیمانی خۆی کوشت، پاشان بەفێڵەوە گەڕایەوە، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)نەزری کرد و بەدوایدا دەرچوو، گەیشتە قەرقەرەی ئەلکیدر، ئەبو سوفیانی لەدەستچوو، بێباوەڕان کۆمەڵێ سەویقیان فڕێ دابوو(خواردنێکە لەهاڕاوەی گەنم و جۆ دروست دەکرێت) تاوەکو شوێنی خۆیانی پێ بشارنەوە، موسڵمانان هەڵیانگرت و ناویان لێنا غەزوەی ئەلسەویق، ئەوەش دوای دوو مانگ لەدوای شەڕی بەدر بوو.

**بەش**

پاشان شەڕی بەنوقینوقاعی کرد، جولەکەی مەدینە بوون، بێ بەڵێنییان کرد، پانزە شەو گەمارۆی دان تاوەکو ناچاربوون بەبڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)، عەبدوڵلەی کوڕی ئوبەی تکای بۆ کردن و وازی نەهێنا هەتاوەکو پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) بۆ ئەو دەستبەرداریان بوو، قەومی عەبدوڵلەی کوڕی سەلام بوون، حەوسەد جەنگاوەر بوون، زەڕەنگەر و بازرگان بوون.

## ٧-شەڕی ئوحود

که خوای گەورە لەبەدردا گەورەکانی قورەیشی کوشت، تووشی کارەساتێکی بێ وێنە بوون، ئەبو سوفیان بووە پێشڕەویان، هەروەك لەغەزوی ئەلسوەیق باسمان کرد، بەڕێکەوت تاوەکو گەیشتە دەورووبەری مەدینە و داخی دڵی دانەمرکایەوە، بەخەفەت بوو بۆ تۆڵەکردنەوە لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان، سەربازی کۆدەکردەوە، نزیکەی سێ هەزار کەسی لەقورەیش و هاوپەیمانان و حەبەشیی کۆکردەوە، بەژنەکانیانەوە هێنانی تاوەکو رانەکەن و بەهۆی ژنەکانیانەوە بجەنگن و شەرم بیانگرێ، پاشان بەڕێیخستن رووە و مەدینە، ئەوەش لەشەوالی ساڵی سێدا بوو.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) راوێژی هاوەڵانی کرد: بۆ دژی بێباوەڕان دەربچێ یان لەمەدینە بمێنێتەوە؟ بۆچوونی خۆیشی وەهابوو لەمەدینە دەرنەچێ و لەمەدینەدا سەنگەر لێ بدات، ئەگەر بێباوەڕان هاتنە مەدینەوە، ئەوە موسڵمانان لەسەر کۆڵانەکان لێیان بدەن و ژنانیش لەسەر خانووەکانەوە لێیان بدەن، بەڵام کۆمەڵێ لەگەورە هاوەڵان لەوەی لەدەستیان چوو بەشداری بەدر بین، ئاماژەیان پێ دا بۆ دەرچوون، هەوڵی زۆریشیان دا بۆ ئەوە، بۆیە هەڵسا رۆیشت بۆ ماڵەوە و خۆی بەست و دەرچوو بۆلایان و لەسەر قسەی ئەوان دەرچوو، وتیان: پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)مان ناچار کرد بۆ دەرچوون، بۆیە وتیان: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر حەز بکەی لەمەدینە بمێنینەوە ئەوە دەمێنینەوە، بەڵام پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"هەر پەیامبەرێ چەکی هەڵگرت، نابێ چەك دابنێ هەتا خوای گەورە بڕیاری نێوان خۆی و دوژمنی دەدات".

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی جومعەدا بەهەزار هاوەڵەوە دەرچوو، کە گەیشتە نێوان مەدینە و ئوحود، عەبدوڵڵەی کوڕی ئوبەی بەنزیکەی یەك لەسەر سێی سەربازانەوە لای دایەوە، بۆیە هاوەڵانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داوایان لەپەیامبەر کرد پشت بەجولەکە هاوپەیمانەکانیان ببەستن، بەڵام پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەو داوایەی رەتکردەوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەردەوام بوو لەڕۆیشتن تاوەکو دابەزیە دۆڵێکی ئوحود لای کەنار دۆڵەکە، پشتی کردە ئوحود، نەهی کرد خەڵك جەنگ بکەن تاوەکو خۆی فرمانیان پێ نەکات، کە بەیانیی رۆژی شەممە هات، ئامادەسازیی بۆ جەنگ کرد، حەوسەد کەس بوون، پەنجایان ئەسپسوار، تیرهاوێژەکان کە پەنجا کەس بوون، عەبدوڵڵەی کوڕی جوبەیری کردە سەرکردەیان، فرمانی بەهەموویان دا لەشوێنی خۆیان نەجوڵێن، ئەگەر ببینن باڵندە هەموو سەربازەکانیش هەڵدەگرێت، ئەوان سەنگەری خۆیان چۆڵ نەکەن، لەپشت سوپاوە بوون، فرمانی پێکردن هاوبەش پەیداکەران تیرباران بکەن نەوەك لەپشتەوە بێنەسەر موسڵمانان.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەو رۆژە لەنێوان دوو قەڵغاندا بوو، ئاڵاکەی دایە دەست موسعەبی کوڕی عومەیر، زوبەیری کوڕی عەوامی کردە سەرکردەی شانێکی سوپا و مونزیری کوڕی عەمریش بەسەرکردەی لایەکی تری.

قورەیشیش ئامادەی جەنگ بوو، سێ هەزار کەس بوون، دوو سەد سواریان هەبوو، خالیدی کوڕی وەلیدیان کردبووە سەرکردەی لای راستی سوپا و عیکریمەی ئەبو جەهلیش لای چەپی سوپا.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) شمشێرەکەی دایە دەست ئەبو دوجانە سیماکی کوڕی خرەشە، پاڵەوانێك بوو لەکاتی جەنگدا لێزانیی دەکرد، دروشمی موسڵمانان لەو ڕۆژەدا(أَمِت أَمِت)بوو.

ئەبو دوجانەی ئەنساری و تەڵحەی کوڕی عوبەیدواللە و شێری خوا و پەیامبەرەکەی کە حەمزەی کوڕی ئەبو تاڵیب بوو، هەروەها عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئەنەسی کوڕی ئەلنەزر و سەعدی کوڕی ڕەبیع ڕۆڵی پاڵەوانانەیان گێڕا.

سەرەتای ڕۆژ موسڵمانان بەسەر بێباوەڕاندا زاڵ بوون، دوژمنانی خوا شکان، رایان کرد و هەڵهاتن تاوەکو لای ژنەکانیان، کە تیرهاوێژانی موسڵمانان بینیان دوژمن شکا، ئەو شوێنەیان بەجێهێشت کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی پێ کردن چۆڵی نەکەن، وتیان: ئەی قەوم فریای دەسکەوت بکەون. فەرماندەکەیان بیری خستنەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) چی فرمانێکی پێکردوون، بەڵام گوێیان نەگرت، وەهایان زانی تازە تەواو هاوبەش پەیداکەران شکان و هەڵهاتن و ناگەڕێنەوە، بۆیە ڕۆیشتن بەدوای دەسکەوتدا، سەنگەریان چۆڵکرد، بەڵام سوارەکانی هاوبەش پەیداکەران لەپشتەوە هاتن و بینیان سەنگەرەکە چۆڵە، لێیەوە هاتنە خوارەوە و دەورەی موسڵمانانیان دا، خوای گەورە ڕێزی لەوانە گرت کە شەهید بوون و حەفتا کەس بوون، هاوەڵان هەڵهاتن، هاوبەش پەیداکەران خۆیان گەیاندە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و ڕوومەتیان رووشاند و دانێکی ڕاستی شکا لەڕووی خوارەوە، کڵاوە ئاسنینەکەی لەسەردا شکا و کەوتە چاڵێکەوە، عەلی دەستی گرت، تەڵحەی کوڕی عوبەیدواللە لەباوەشی گرت و شمشێرەکانی عەمری کوڕی قەمئە و عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاس کە دەیانگرت لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بەر تەڵحە دەکەوت.

ئەنەسی کوڕی ئەلنەزر بەلای کۆمەڵێ لەموسڵمانان تێپەڕبوو بینی چەکیان خواربووەتەوە، وتی: چاوەڕێی چین؟ وتیان: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کوژراوە. وتی: ئەی لەدوای ئەو ژیان چی سوودێکی هەیە؟ هەڵسن با بکوژرێن لەپێناو ئەوەی ئەو لەپێناویدا کوژراوە. پاشان رووی کردە خەڵك و بەسەعدی کوڕی موعاز گەیشت و وتی: ئەی سەعد من لەودیوو ئوحودەوە بۆنی بەهەشت دەکەم. شەڕی کرد هەتاوەکو کوژرا. بینرا لەحەفتا شوێنەوە بریندار بووە، ئەو رۆژە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف نزیکەی بیست برینی پێوە بوو.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رووەو موسڵمانان هات، یەکەمین کەسێك لەژێر کڵاوی میغفەرەوە ئەوی بینی، کەعبی کوڕی مالیك بوو، بەدەنگی بەرز هاواری کرد ئەی کۆمەڵی موسڵمانان موژدە بدەن، ئەمە پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم)، بەدەستی ئاماژەی بۆ کرد و بێدەنگ بوو، موسڵمانان لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کۆبوونەوە، لەگەڵیدا هەڵسان بۆ ئەو دۆڵەی کە دابەزیە ناوی.

کە شەڕ کۆتایی هات، ئەبو سوفیان چووە سەر چیاکە و بانگی کرد: موحەممەدتان تێدایە؟ وەڵامیان نەدایەوە. وتی: کوڕی ئەبو قوحافەتان تێدایە؟ وەڵامیان نەدایەوە. وتی: کوڕی خەتابتان تێدایە؟ وەڵامیان نەدایەوە. تەنیا پرسیاری ئەو سێ کەسەی کرد، چونکە خۆی و قەومەکەی دەیانزانی ئیسلام بەو سێ کەسەوە راوەستاوە. ئینجا وتی: ئەو سێ کەسەتان لەکۆڵ بووەتەوە. عومەر خۆی پێ نەگیرا وتی: ئەی دوژمنی خوا، بزانە ئەوانەی ناوت هێنان زیندوون، خوای گەورە ئەوەی بۆ هێشتوویتەوە دڵتەنگت بکات. ئەبو سوفیان وتی: سەبارەت بەوەی تەرمەکان شێوێندراون، من فرمانم پێ نەکردووە و پێیشم ناخۆش نییە. پاشان وتی: هوبەل بەرز و مەزنە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "ئایە

وەلامی نادەنەوە؟" وتیان: چی بلێین؟ فەرمووی:"بلێن الله بەرز و مەزنە". پاشان وتی: ئێمە عوزامان هەیە و ئێوە عوزاتان نییە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"ئایە وەلامی نادەنەوە؟ وتیان: چی بلێین؟ فەرمووی: بلێن: الله دۆستی ئێمەیە و ئێوە دۆست و پشتیوانتان نییە.

پاشان ئەبو سوفیان وتی: ئەمڕۆ لەتۆڵەی ڕۆژی بەدر، جەنگی نێوانمان بەردەوام و بلێسەدارە. عومەر وەلامی دایەوە: وەك یەك نین، کوژراوانی ئێمە لەبەهەشتن و کوژراوانی ئێوە لەدۆزەخدان.

فریشتە لەڕۆژی ئوحوددا بەرگرییان لەپەیامبەری خوا کرد(صلی الله علیه وسلم)، لەسەحیحەیندا هاتووە لەسەعدی کوڕی ئەبو وەقاسەوە وتوویەتی: لەڕۆژی ئوحوددا پەیامبەری خوام بینی(صلی الله علیه وسلم) دوو پیاوی لەگەڵدا بوو بەرگرییان لێ دەکرد، بەرگی سپییان لەبەردابوو سەختترین شەڕێکیان دەکرد، نە پێشتر و نە دواتر ئەو دوو پیاوەم نەبینی[1].

## ٨-ئەو ئەحکام و فیقهانەی لەو شەڕەدا هەبوون

لەوانە: بەئامادەبوون بۆ جیهاد، جیهادکردنەکە فەرز دەبێ، هەرکەسێ چەك و هۆکارەکانی جەنگ ئەنجام بدات و ئامادەساز بێ بۆ دەرچوون، نابێ پاشەکشە بکات هەتا شەڕی دوژمن نەکات.

لەوانە: ئەگەر دوژمن هاتەسەر خاکی موسڵمانان، واجیب نییە موسڵمانان بچنە دەرەوەی خاکی خۆیان، بەڵکو ئەکرێ لەشار و وڵاتی خۆیاندا شەڕی دوژمن بکەن.

لەوانە: جائیزە پێشەوای موسڵمانان هەندێ سەروەتی هاولاتیانی بەکاربهێنێ.

لەوانە: مۆڵەت نەدان بەدەرچوون بۆ جیهاد بۆ ئەوانەی جارێ بالغ نەبوونە.

---

[1] - بوخاری(٤٠٥٤) و موسلیم(٢٣٠٦) ئیخراجیان کردووە.

لەوانە: جائیزە ژنان بەشداری شەڕبن و پشتیان پێ ببەسترێت.

لەوانە: جائیزە رۆبچیتە نێو دوژمن هەروەك ئەنەسی كوڕی ئەلنەزر و كەسانی تر پەلاماری سەختی دوژمنیان دا.

لەوانە: ئەگەر ئیمام بریندار‌بوو، جائیزە بەدانیشتنەوە نوێژ بەوانی تر بكات و ئەوانیش بەدانیشتنەوە لەدوایەوە نوێژ بكەن هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەو شەڕەدا ئەنجامی دا.

لەوانە: جائیز پیاو دوعا بكات لەشەڕدا بكوژرێ و خۆزگەی ئەوە بخوازێ، ئەمە ناچێتە خانەی ئەو خۆزگە بردنەوەی كە نەهی لێكراوە، هەروەك عەبدوڵڵەی كوڕی جەحش ئەڵێ: خوایە گیان رووبەڕووم بكەرەوە لەگەڵ پیاوێكی بەهێزی كافران كە زۆر تووڕە بێ، هەتا شەڕی لەگەڵدا بكەم و لەپێناو تۆدا بەدەستی ئەو بكوژرێم، لوت و گوێم بكات، تاوەكو كاتێ بە تۆ گەیشتم و لێت پرسیم: ئەی عەبدوڵڵەی كوڕی جەحش بۆ لوت و گوێ بڕاو كراوی؟ بڵێم: ئەی پەروەردگار لەبەر تۆ وەهام پێكراوە.

لەوانە: ئەگەر كەسی موسڵمان خۆی بكوژێ ئەوە لەدۆزەخدایە، ئەوەش بەپێی فەرمایشتی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبارەی قوزمانەوە كە لەڕۆژی ئوحوددا شەڕی سەختی كرد، كە برینەكەی بۆی سەخت بوویەوە خۆی كوشت، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"هُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ"،واتا: لەدۆزەخدایە.

لەوانە: سووننەت ئەوەیە شەهید نەشۆردرێ، نوێژی لەسەر ناكرێ و بەبەرگی خۆیەوە دەنێژرێ، بەبەرگی خوێناویی خۆیەوە.

لەوانە: ئەگەر شەهید لەشگران بوو، ئەوە غوسڵ دەكرێت هەروەك فریشتەكان، حەنزەڵەی كوڕی ئەبی عامریان شۆرد.

لەوانە: سووننەت وەهایە شەهیدان لەشوێنی کوژرانیاندا بەخاك بسپێردرێن و نەگوازرێنەوە شوێنی تر.

لەوانە: جائیزە دوو و دوو و سێ سێ لەیەك گۆڕدا بنێژرێن، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دوو پیاو و سێ پیاوی لەیەك گۆڕدا نێژاوە و فەرموویەتی: "أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ"،واتا: کامەیان زۆرترین قورئانیان لەبەرە؟ ئاماژەیەك بەکوژراوێ درابێ کە ئەوە زۆرتری لەبەرە، ئەوەی پێشتر خستووەتە ئەلحەدەوە.

لەوانە: شەهیدی بەرەی جەنگ نوێژی لەسەر ناکرێت.

لەوانە: ئەگەر موسڵمانان لەشەڕدا یەکێ لەخۆیانیان کوشت بەگومانی ئەوەی یەکێك بێ لەبێباوەڕان، ئەوە پێشەوای باوەڕداران لەبەیتولمالدا خوێنبایی دەدات، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ویستی خوێنبایی یەمانی باوکی حوزەیفە بدات، حوزەیفە رەتیکردەوە و کردیە خێر بۆ موسڵمانان.

## ٩-باسکردنی هەندێ حیکمەت و ئامانجی چاك کە لەشەڕی ئوحوددا هەبوون

خوای گەورە لەسورەتی(آل عمران)دا باسی بنەماکانی کردووە کاتێك چیرۆکەکەی بەم فەرمایشتە دەستپێکردووە و هەتاوەکو تەواوی شەست ئایەت باسیکردووە، بەدەستپێکردن لە:﴿ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ﴾ **آل عمران: ١٢١** ،واتا: (بیهێنەوە بیریان) کاتێك کە بەیانی زوو دەرچوویت لەلای ماڵ و خێزانت بڕوادارەکانت نیشتەجێ ئەکرد لە چەند شوێنێکدا بۆ جەنگ کردن.

لەوانە: ناساندنیان بەسەرەنجامی خراپی بێ گوێی و شکست و ناکۆکی، ئەوەی بەسەریاندا هات بەهۆی ئەو هۆکارانەوە بوو. جا کە سزای ئەو سەرپێچییەیان وەرگرت، ئیتر زۆر وریاییان ئەکرد و بەئاگا و خۆپارێزبوون لەئەنجامدانی هۆکارەکانی دۆڕان و کەوتن.

لەوانە: حیکمەت و سوونەتی خوایی لەپەیامبەران و شوێنکەوتووانیان، ئەوە بووە جارێك بەسەر دوژمندا سەرکەون و جارێك بدۆڕێن، ئەوەش بۆ ئەوەی سەرەنجامیان هەبێ، چونکە ئەگەر هەمیشە سەرکەوتووبوونایە، ئەوە باوەڕداران و بێباوەڕانیش لەگەڵیاندا بەشداری شەڕ دەبوون، راستگۆ و درۆزن لەیەك جیانەدەکرایەوە، ئەگەر هەمیشە دوژمن سەرکەوتووبووایە، ئەوە لەناردنی پەیامبەر و پەیامدارییدا مەبەست نەدەهاتەدی.

لەوانە: بۆ ئەوەی باوەڕداری راستگۆ لەدرۆزنی دووڕوو جیابکرێتەوە.

لەوانە: دەرخستنی بەندایەتیی دۆستەکانی خۆی لەخۆشی و ناخۆشییدا.

لەوانە: ئەگەر هەمیشە خوای گەورە ئەوانی سەربخستبایە، ئەوە تووشی لەخۆبایی بوون دەبوون.

لەوانە: بۆ ئەوەی لەخوای گەورە داوای سەرکەوتن و سەربەرزیی بکەن.

لەوانە: خوای گەورە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی لەبەهەشتی شوێنی ڕێز و شکۆدارییدا، کۆمەڵە خانوو وماڵێکی ساز داوە کە بەکردەوەی خۆیان پێی ناگەن، تەنیا لەڕێگەی بەڵاو کارەساتەوە پێی دەگەن.

لەوانە: شەهیدبوون لای خوای گەورە بەرزترین پلەیەکی دۆستەکانێتی، خوای گەورە حەز دەکات لەنێو بەندەکانیدا کۆمەڵێك بەشەهیدیی هەڵبژێرێت.

لەوانە: ڕووداوی بەدر پێشەکی و ئامادەکارییەك بوو بەوەی، ئاساییە مردن بەسەر پەیامبەری خوادا بێ(صلی الله علیه وسلم)، خوای گەورە بەوە وریای کردنەوە کە ئەگەر شتی وەها ڕووی دا، نەکەن پاشگەزببنەوە و پشت لەئیسلام هەڵبکەن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٤ ،واتا: (موحەممەد صلی الله علیه وسلم) تەنها

پێغەمبەرێکە(نەمر نیە) بێگومان لەپێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان(پاشگەز دەبنەوە) هەرکەس هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوەی خۆی(بۆ بت پەرستی)ئەوە هەرگیز(ئەو کەسە)هیچ زیانێك ناگەیەنێت بەخوا وە بەزوویی خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.

## بەش

کە ویستیان بگەڕێنەوە مەککە، ئەبو سوفیان چووە سەر تەپۆڵکەیەك و بانگی کرد لەموسڵمانان و وتی: کاتی داهاتوومان لەبەدر دەبێ. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"قُولُوا نَعَمْ قَدْ فَعَلْنَا"، واتا: بڵێن: ئێمە وا ئامادەین. ئەبو سوفیان وتی: باشە ئەوە کاتی ڕووبەڕوومان دەبێ. پاشان خۆی و هاوڕێکانی ڕۆیشتن، لەڕێگە بوون دەستیان کردە سەرزەنشتکردنی یەکتر، هەندێکیان بەیەکتریان وت: هیچ شتێکتان نەکردووە، ڕاستە هێزی ئەوانتان شکاند، بەڵام گەورەکانیان هێشتا زیندوون و ئەگەڕێنەوە سەرتان و خۆیان کۆدەکەنەوە، با بگەڕێینەوە تاوەکو لەڕیشەیان بکێشین، ئەم هەواڵە بەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) گەیشت، بانگی کرد لەخەڵك و هانی دان بۆ بەڕێکەوتنی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن و فەرمووی:"لَا يَخْرُجْ مَعَنَا إِلَّا مَنْ شَهِدَ الْقِتَالَ"، واتا: تەنیا ئەوانە لەگەڵماندا دەربچن کە بەشداری شەڕی ئوحود بوون. موسڵمانان بەو برین و ترسەی بەسەریان هاتبوو، بەدەم داوای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ەوە ڕۆیشتن.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان بەڕێکەوتن تاوەکو گەیشتنە(حمراءَ الأسد)، مەعبەدی کوڕی ئەبی مەعبەدی خوزاعیی هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و موسڵمان بوو، پەیامبەری خوا(صلى الله

علیە وسلم) فرمانی پێکرد خۆی بگەیەنێتەلای ئەبو سوفیان و شکستی پێ بگەیەنێ. مەعبەد لەرەوحائدا بەئەبو سوفیان گەیشت، ئەبو سوفیان نەیزانی موسڵمان بووە، وتی: چی هەواڵێکت پێیە ئەی مەعبەد؟ وتی: موحەممەد و هاوەڵەکانی بۆ کوشتنی ئێوە گڕیان گرتووە و ئەسووتێن، لەسوپایەکی گەورەدا بۆ ئێوە دەرچوون من نمونەیم نەبینیووە، ئەوەی لەهاوەڵانی نەیتوانیووە لەگەڵیا دەربچێ پەشیمانیی ئەکێشێ. وتی: ئەی تۆ چی ئەڵێی؟! وتی: من وەهای دەبینم لێرە بڕۆن تاوەکو سەرەتای ئەو سوپایە لەپشت ئەم تەپۆلکەیەوە بۆتان دەرنەکەوتووە. ئەبو سوفیان وتی: سوێند بەخوا ئەوەندە سوپام بۆیان کۆکردووەتەوە تاوەکو بدەم بەسەریاندا و لەڕیشەیان بکێشم. وتی: وەها مەکە من ئامۆژگاریی دڵسۆزانەت دەکەم، ئیتر ئەوانیش بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە مەککە.

### ١٠-شاندی ئەلرەجیع

کە مانگی سەفەر هات، قەومێك لەعەزەل و قارەوە هاتن، باسیان کرد کە خەڵکانێکیان تێدایە بوونەتە موسڵمان، داوایان لەپەیامبەری خوا کرد(صلی الله علیه وسلم) تاوەکو کەسانێکیان لەگەڵدا بنێرێ فێری ئیسلام و قورئانیان بکەن، پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم) شەش هاوەڵی لەگەڵدا ناردن.

لەئەلرەجیع بوون کە ئاوێکی هوزەیلە لەڕووی حیجاز، غەدریان لێیان کرد و هوزەیلیان بۆ سەریان بانگ کرد، دەورەیان لێیان دا و هەموویانیان کوشت، خوبەیبی کوڕی عەدی و زەیدی کوڕی دەسنەیان بەدیلیی برد و لەمەککە هەردووکیان فرۆشت، ئەو دووانە لەڕۆژی بەدردا گەورەکانی قورەیشیان کوشتبوو، خوبەیب بەبەندکراویی لایان مایەوە، پاشان یەکدەنگ بوون لەسەر کوشتنی،لەحەرەم دەریان کرد بۆ تەنعیم، کە ویستیان هەڵیبواسن، وتی: بهێڵن دوو

ركات بكەم. لەسەحيحدا هاتووە: خوبەيب يەكەمين كەسێك بوو لەپێش كوشتن دوو ركات نوێژی هێنايەبوون[1]. هەرچی زەيدی كوڕی دەسنە بوو، ئەوە سەفوانی كوڕی ئومەيە ئەوی كڕی و لەتۆڵەی باوكی خۆيدا كوشتی.

### ١١-ڕووداوی بيری مەعونە

لەهەمان مانگی سەفەری چواری كۆچييدا ڕووداوی بيری مەعونە ڕووی دا، پوختەی ئەو ڕووداوە ئەوە بوو: ئەبو بەراء عامری كوڕی ماليك خاوەن نازناوی(مُلاعِب الأسنة) هات بۆلای پەيامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەمەدينە، پەيامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی كرد بۆ موسڵمانبوون، موسڵمان نەبوو، موسڵمانبوونيشی بەدوور نەگرت، وتی: ئەی پەيامبەری خوا ئەگەر بكرێ هەندێ لەهاوەڵانت بنێری بۆ لای خەڵكی نەجد بانگەوازيان بكەن بۆ سەر ئايينەكەت، چونكە ئومێد دەكەم بەدەم بانگەوازەكەتەوە بێن، پەيامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنِّي أَخَافُ عَلَيْهِمْ أهلَ نجدٍ"،واتا: ئەترسێم خەڵكی نەجد زيانيان لێ بدەن. ئەبو بەراء وتی: من پەنايان دەدەم.

بۆيە حەفتا هاوەڵی لەگەڵدا ناردن، مونزيری كوڕی عەمری كردە ئەميريان كە يەكێك بوو لەبەنی ساعيدە و خاوەن نازناوی(بالمُعْنِق ليَموتَ)بوو،يەكێك بوو لەچاكترين و گەورەترين و قورئانخوێنترينی نێو موسڵمانان. بەڕێكەوتن تاوەكو گەيشتنە سەر بيری مەعونە، پاشان حەرامی كوڕی ميلحان برای ئوم سەليميان بەنووسراوی پەيامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نارد بۆلای دوژمنی خوا كە عامری كوڕی توفەيل بوو، تەماشای نووسراوەكەی نەكرد، فرمانی كردە پياوێك و لەپشتەوە حەربەيەكی دا لەحيرام، حيرام كە بينی لێی دراو خوێنی لێ دەرچوو، وتی:"فزتُ وربِّ الكعبة"، واتا: سوێند بەخوای كەعبە بردمەوە.

---

[1] - بوخاری ئيخراجی كردووه(٣٠٤٥).

پاشان ئەو دوژمنەی خوا راپەڕی بۆ کوشتنی ئەو هاوەڵانەی تر، لەبەر ئەوەی ئەبو بەراء داڵدەی دابوون، بەدەم داواکەیەوە نەهاتن، بەڵام نەوەی سەلیم راپەڕین و عوسیە و ریعل و زەکوان بەدەم داواکەیەوە رۆیشتن و هاتن دەورەیان لەهاوەڵانی پەیامبەری خوا دا(صلی الله علیه وسلم)، یەك بەدوای یەك هاوەڵانی پەیامبەری خوایان کوشت جگە لەکەعبی کوڕی زەیدی کوڕی ئەلنەجاڕ کە لەنێو کوژراواندا خەڵتان بەخوێن هەڵگیرا و ژیا تاوەکو لەڕۆژی خەندەقدا کوژرا.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) یەك مانگ لەدوای رکات قنوتی دەخوێند،دوعای دەکرد لەوانەی هاوەڵانی قورئانخوێنیان کوشت لەبیری مەعونەدا، بەڵام کە دوایی بەتەوبە و پەشیمانییەوە هاتن و بوونە موسڵمان، دەستی لەقنوت هەڵگرت[1].

## ١٢-غەزوەی دووەمی بەدر

ئەبو سوفیان لەکاتی بەجێهێشتنی ئوحوددا هاتە پێش و وتی: کاتی بەیەکگەیشتنی ئێمە و ئێوە لەساڵی داهاتوودا لەبەدر دەبێ. کە شەعبانی ساڵی داهاتوو هات، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەو مەوعیدە بەهەزار و پێنجسەد کەسەوە دەرچوو، دە ئەسپسواریان تێدا بوو، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ئاڵاکەی هەڵگرتبوو، عەبدوڵلای کوڕی رەواحەی بەسەرپەرشتیاری مەدینە بەجێهێشتبوو. دەرچوو تاوەکو گەیشتە بەدر، هەشت رۆژ تیایدا مایەوە و چاوەڕێی هاوبەش پەیداکەرانی دەکرد، ئەبو سوفیانیش بەهاوبەش پەیداکەرانەوە لەمەککە دەرچوو کە دوو هەزار بوون و پەنجا ئەسپسواریشیان لەگەڵ بوو، کە گەیشتنە(مر الظهران) قۆناغێك لەمەککەوە دووره وتی: ئەم ساڵ ساڵی نەهاتییە، وەهای بەباش

---

[1] - بوخاری(١٠٠٢) و موسلیم(٦٧٧) ئیخراجیان کردووە.

دەزانم بتانگەڕێنمەوە مەککە، ئەوانیش گەڕانەوە، بێ بەڵێنییان کرد، ناونرا بەدری بەڵێن(بدر الموعد) و پێیدەوترێ: بەدری دووەم.

## ١٣-غەزوەی ئەلمورەیسیع

ئەم غەزوەیە لەساڵی پێنجەمی کۆچییدا بوو، هۆکارەکەشی ئەوە بوو: هەواڵ بەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گەیشت، بەوەی ئەلحاریسی کوڕی ئەبی زیراری گەورەی بەنی ئەلموستەلیق بەقەومی خۆی و ئەوانەی قسەی بەسەریاندا دەچێ لەعەرەب، ئەیانەوێ جەنگی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بکەن، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) خەڵکی بانگەواز کرد، بۆیە خێرایان کرد بۆ دەرچوون، هەواڵی بەڕێکەوتنی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەئەلحاریسی کوڕی ئەبی زیرار و ئەوانەی لەگەڵیبوو گەیشت کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سیخوڕەکەی ئەوی کوشتووە، زۆر ترسا، ئەو عەرەبانەی لەگەڵی بوون بڵاوەیان لێ کرد و لەدەوری ڕەوینەوە.

شەڕیان لەنێواندا ڕووی نەدا، بەڵکو لەسەر سەرچاوەی ئاوەکە پەلاماری دان، منداڵ و ژن و سەروەتەکانیانی برد وەك لەسەحیحدا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پەلاماری بەنی ئەلموستەلیقی دا کە پێشتر پلانی پەلاماریان دانابوو...فەرموودەکەی باسکردووە[١].

لەنێو سەبایەکاندا جوەیرییەی کچی ئەلحاریسی گەورەی ئەو قەومە هەبوو، کەوتبووە بەشی سابتی کوڕی قەیس، نووسراوی لەگەڵ سابتدا کرد و پەیامبەری خوا پارەکەی دا و مارەی کرد.

---

[١]- بوخاری(٢٥٤١) و موسلیم(١٧٣٠) ئیخراجیان کردووە.

لەم غەزوەیەدا عائیشە ملوانکەکەی کەوت، بەگەڕان بەدوای ئەو ملوانەکەیدا دواکەوتن. عائیشە بەتیروپشك ناوی دەرچوو لەو غەزوەیەدا لەگەڵ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بێ، ئەوە نەریتی پەیامبەر بوو(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ هاوسەرەکانیدا. کە لەو غەزویەدا گەڕانەوە دابەزینە هەندێ ماڵ، عائیشە بۆ پێویستییەك دەرچوو پاشان گەڕایەوە، لەو دەرچوونەدا ملوانکەیەك کە هی خوشکەکەی بوو بەئەمانەت هێنابوو، کەوت. دەرچوو تاوەکو لەو شوێنەی ونی کردووە بیدۆزێتەوە، ئا لەو کاتەدا ئەوانەی جڵەوی وشترەکەیان بۆ دەگرت کە لەنێو کەژاوەی وشترەکەدا دەبوو، وەهایان زانی عائیشەی تێدایە، خستیانەسەر وشترەکە و نەیانزانی عائیشەی تێدا نییە، چونکە کێشی سووك بوو، منداڵی تازە پێگەیشتوو بوو کێشی قورس نەبوو. عائیشە کە ملوانکەکەی دۆزییەوە و گەڕایەوە شوێنی کاروانەکە، بینی هیچ کەسێکی لێ نەماوە، بۆیە لەو شوێنە دانیشت و وەهای گومان کرد ئێستا دێنەوە بەشوێنیدا، لەوێدا خەوی لێکەوت و بەدەنگی سەفوانی کوڕی ئەلموعەتیل بەئاگاهاتەوە کە وتی: إنا لله وإنا إليه راجعون، ئەمە هاوسەری پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم)! سەفوان لەکۆتایی سوپا دەمایەوە چونکە زۆر دەخەوت، کە عائیشەی بینی ناسییەوەی، پێش ئەوەی ئایەتی حیجاب دابەزێ ئەوی بینیبوو، بۆیە گەڕایەوە وشترەکەی یخ دا و لێی نزیکخستەوە، عائیشە سەرکەوتە سەر وشترەکە و سەفوان یەك وشە قسەی نەکرد، خۆی جڵەوی وشترەکەی گرت و بەڕێکەوت تاوەکو گەیاندیە لای سوپا کە دابەزیبوونە(نحر الظهيرة).

کە خەڵك ئەوەیان بینی، هەریەکەو چی شایستە بەدەروونی خۆی بوو بەو جۆرە قسەی دەکرد، دوژمنی خوا عەبدوallaی کوڕی ئوبەیی چەپەڵ ئۆخەی کرد، ئۆخەی کرد بۆ هەڵڕشتنی ئەو دووڕوویی و حەسوودییەی ناخی تەنیبوو، دەستیکردە

هەڵبەستنی درۆ و بڵاوەپێکردنی، شوێنکەوتووانی خۆی کۆدەکردەوە و هەواڵی درۆی بڵاوە پێ دەکردن.

کە گەیشتنە مەدینە، خەڵکانی بوختانچیی درۆکەیان گەورەتر کردەوە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) بێدەنگ و قسەی نەدەکرد، پاشان راوێژی هاوەڵانی کرد بۆ جیابوونەوەی، عەلی بەئامازە ئەوەی وت تەڵاقی بدات و ژنێکی تر بهێنێ، ئوسامە و ئەوانی تر ئاماژەیان کرد بیهێڵێتەوە بەڵکو دەرکەوێ ئەو دەنگۆیە راست نییە و ئەو گومانە بڕەوێتەوە. ئوسامە دەیزانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) چەندە عائیشە و ئەبو بەکری باوکی خۆشدەوێ و ئەیزانی چەندە ئافرەتێکی داوێنپاك و ئایینداره، هەروەك ئەبو ئەیوب و ئەوانی تری گەورەکانی هاوەڵان کە ئەوەیان گوێ لێبوو وتیان: ﴿ سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ١٦ ﴾ النور: ١٦ ، واتا: پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە، ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە.

رابمێنە لەتەسبیحاتی هاوەڵان و پاکڕاگرتنیان بۆ خوای گەورە کە بەشیاویان نەبینی و بەدووریان گرت، خوای گەورە ئافرەتێکی ناپاك بداتە پەیامبەر و دۆستی خۆی و بەڕێزترینی نێو مەخلوقات!

ئەگەر بووترێت: ئەی بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەڵوێستەی لەسەر کرد و راوێژی هاوەڵانی کرد کە لەوانی تر باشتر دەیزانی چی رێز و پایەیەکی لای خوا هەیە و بۆ نەیفەرموو: ﴿ سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ١٦ ﴾ النور: ١٦ ، واتا: پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە، ئەمە بوهتانێکی زۆر گەورەیە.

هەروەك هاوەڵانی ئەوەیان وت؟

وەڵام بۆ ئەوە: خوای گەورە ویستی وەهابوو پایەی پەیامبەرەکەی و خێزانەکانی و رێزدارکردنیان دەربخات، پەیامبەرەکەی لەو دۆسیەیە دەربخات و بەخۆی بەرگری



لێ بکات و وەڵامی دوژمنانی بداتەوە و سەرزەنشت و عەیبداریان بکات، خۆی لەجیاتی پەیامبەر و بنەماڵەکەی، بەڕووی درۆزناندا بچێ.

هەروەها لەو تۆمەتەی خرایە پاڵ خێزانەکەی، مەبەست بۆ عەیبدارکردنی پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم)، بۆیە شیاو نەبوو خۆی بێ تاوانیی عائیشە دەربخات ئەگەرچی دەیزانی داوێنپاکە و بێ تاوانە. هەرگیز گومانێکی وەهای بەرانبەر نەبوو، بۆیە کاتێك بەدرۆزن و بوختانچیانی فەرموو:"مَنْ يَعْذِرُنِي مِنْ رَجُلٍ قَدْ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أهلي، فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا خَيْرًا، وَلَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلًا مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا، وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا معي"،واتا:کێ پیاوێکم بۆ لەکۆڵ دەکاتەوە کە بەخێزانەکەم ئازارم دەدات، سوێند بەخوا تەنیا چاکەم لەخێزانەکەم بینیووە، باسی پیاوێکیان کردووە لەوەدا تەنیا چاکەم لێ ناسیووە و تەنیا لەگەڵ خۆمدا هاتووەتە ماڵم.

زیاتر لەبەڵگەی بێ تاوانیی عائیشە لای باوەڕداران، بەڵگە لای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) هەبوو، بەڵام کەماڵی ئارامگرتن و دامەزراوی و جوان گومانبردنی بەخوای گەورە و متمانە بوونی بەخوا بوو تاوەکو لەلایەن خوای گەورەوە وەحی بۆ هات و ئۆقرەیی پێ دا و دڵی خۆش کرد و ڕێزی گەورەتربوو، گرنگیدانی لەلایەن خوای گەورەو بۆ ئوممەتەکەی دەرکەوت.

کە وەحی هات لەبارەی بێ تاوانیی عائیشەوە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڕیاری دا هەرکەسێ بەو بوختانە تێوەگلاو بێ، هەشتا جەڵدی لێ بدرێت. حەد لەعەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی چەپەڵ نەدرا ئەگەرچی سەرۆکی بوختانچیان بوو، وتراوە: چونکە جێبەجێکردنی حەد بۆ کەمکردنەوەی تاوانی کەسەکە و سڕینەوەی ئەو تاوانەیە لەسەری، ئەو چەپەڵە شیاوی ئەوە نەبوو لەو تاوانە پاك بکرێتەوە،

خوای گەورە بەڵێنی پێ دا بەسزای سەخت لەئاخیرەت،سزای سەختی ئاخیرەت بەسە تاوەکو حەدی لەسەر جێبەجێ نەکرێ.

میستەحی کوڕی ئوساسە(أثاثة) و حەسسانی کوڕی سابت و حمنەی کچی جەحش جەڵد کران، ئەوان لەباوەڕدارە راستگۆکان بوون و بەو جەڵدکردنە لەو تاوانە پاك کرانەوە.

## ١٤-جەنگی خەندەق

لەساڵی پێنجی کۆچی و لەمانگی شەوالدا رووی دا، هۆکارەکەی ئەوە بوو، جولەکە کە زانی لەشەڕی ئوحود هاوبەش پەیداکەران بەسەر موسڵماناندا سەرکەوتن، زانیان ئەبو سوفیان کاتی داناوە بۆ شەڕکردنی موسڵمانان، بۆ ئەوەش دەرچوو، پاشان بۆ ساڵی دواتر دەرچوو، گەورەکانی جولەکە وەك سەلامی کوڕی ئەبی ئەلحوقەقیق و سەلامی کوڕی میشکەم و کینانەی کوڕی ئەلرەبیع و ئەوانی تریان دەرچوون بۆ لای قورەیش لەمەککە و هانی قورەیشیان دا بۆ پەلاماردانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەڵێنیان پێ دا کە ئەوانیش پشتیوانییان بکەن، قورەیش بەدەم ئەو داوایەوە رۆیشت، پاشان دەرچوون بۆ لای غەتفان و هەمان داوایان لەئەوانیش کردەوە، ئەوانیش بەدەم داواکەیانەوە رۆیشتن، پاشان تەواوی هۆزەکانی عەرەبیان گەڕی و ئەوانیش بەدەم داوایانەوە هاتن، قورەیش و ئەبو سوفیانی سەرکردەیان بەچوار هەزار کەسەوە دەرچوون، لە(مر الظهران)دا نەوەی سەلیمیش پێیان گەیشتن، نەوەی ئەسەد و فەزارە و ئەشجەع و نەوەی مورەش دەرچوون، غەتفان و عویەینەی کوڕی حصنی فەرماندەیان دەرچوون، ئەوانەی لەبێباوەڕان هاتنە خەندەق، دە هەزار کەس بوون.

کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەواڵی بەڕێکەوتنی بێباوەڕانی پێگەیشت، ڕاوێژی هاوەڵانی کرد، سەلمانی فارسی ئاماژەی پێ کرد لەنێوان دوژمن و مەدینەدا خەندەق لێ بدرێت، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کرد خەندەق لێ بدرێت. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەسێ هەزار موسڵمانەوە دەرچوو، سەنگەری گرت و چیاکەی خستە پشتەوەی موسڵمانان و لەپێشیەوەی خەندەق هەبوو.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی بەژنان و منداڵان کرد لەمەدینە بمێننەوە و کوڕی ئوم مەکتومی بەسەرپەرشتیاری مەدینە بەجێهێشت.

حویەی کوڕی ئەختەب ڕۆیشت بۆلای بەنی قورەیزە و لەقەڵاکانیان نزیکبوویەوە، کەعبی کوڕی ئەسەد نەیویست دەرگای بۆ بکرێتەوە، هەر قسەی بۆ دەکرد تاوەکو قەناعەتی پێکرد دەرگای بۆ کردەوە، وازی لێ نەهێنا تاوەکو گەیاندی بەوەی پەیماننامەی لەگەڵ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێ هەڵوەشاندەوە و لەگەڵ هاوبەش پەیداکەراندا چووە سەنگەری شەڕکردنی پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم). کەعب مەرجی خستەسەر حویەی، ئەویش ئەوە بوو ئەگەر موحەممەدیان دەستگیر نەکرد یان بەسەریدا زاڵ نەبوون، حویەی لەگەڵیدا بێتە قەڵاکەیەوە، هەمان سەرەنجامی ئەوی هەبێ، حویەی ئەو بەڵێنەی پێ دا و بۆی وەفادار بوو.

هەواڵی بەنو قورەیزە و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانیان بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) گەیشت، ئەوە زۆر گران بوو بەسەر موسڵمانانەوە، بۆیە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) هەڵسا و فەرمووی: "الله أكبر، ئەی کۆمەڵی موسڵمانان مژدە بدەن"، بەڵاو کارەسات سەخت بوویەوە، دووڕوویی دەرکەوت، هەندێ لەوانەی حاریسە داوایان لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) کرد مۆڵەتیان بدات بگەڕێنەوە مەدینە و

وتیان: ﴿إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾﴾ الأحزاب: ١٣ ، واتا: دەیانووت: خانووەکانمان بێ پارێزەر و ڕووت و کەلێناویە لەکاتێکدا واش نەبوو(کە دەیانووت) ئەوان تەنها مەبەستیان هەڵهاتن بوو(لەجیهادکردن).

بەنو سەلیم نیازی شکست پێکهێنانیان هەبوو، بەڵام خوای گەورە هەردوولای دامەزراو کرد.

هاوبەش پەیداکەران بۆ ماوەیی یەك مانگ پەیامبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) گەمارۆ دا، هیچ شەڕێکیان لەنێواندا رووی نەدا، چونکە خوای گەورە بەو خەندەقە سنووری خستبووە نێوانیانەوە، تەنیا چەند سوارێکی قورەیش نەبێ لەوانە عەمری کوڕی عەبد وەد و کۆمەڵێکیان رووەو خەندەق هاتن و لەسەری راوەستان و وتیان: ئەمە فێڵێکە عەرەب نایزانێ، پاشان شوێنێکی بەرتەسکیان لەخەندەقەکە دۆزیەوە و دزەیان کردە دیوی موسڵمانان و لەنێوان خەندەق و سەلعدا داوای بەرانبەربوونەوەیان لەموسڵمانان کرد، عەلی کوڕی ئەبو تالیب(خوای لێ رازیی بێ) بۆ رووبەڕووبوونەوەی عەمر دەرچوو، کوشتی، عەمر لەپاڵەوانانی هاوبەش پەیداکەران بوو، بەوە ئەوانی تر دۆڕان و گەڕانەوە لای هاوڕێکانیان. دروشمی ئەو رۆژەی موسڵمانان ئەمە بوو:"حم لا يُنصرون".

کە ئەم حاڵە بەسەر موسڵماناندا درێژەی کێشا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ویستی لەگەڵ عویەینەی کوڕی حوصن و ئەلحاریسی کوڕی عەوف کە گەورەی غەتفان بوون، ویستی لەگەڵیاندا رێکبکەوێ لەسەر پێدانی یەك لەسەر سێی بەرووبوومی مەدینە و بەقەومەکانیانەوە بڕۆن و گەمارۆی سەر مەدینە هەڵبگرن،بۆ ئەوە هەوڵی راکێشانی ئەوان و پەشیمانکردنەوەیان لەڕیزی دوژمن دەستپێکرد. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) راوێژی هەردوو سەعدی کرد، هەردووکیان وتیان: ئەی پەیامبەری خوا، ئەگەر ئەوە فرمانی خوایە ئەوە ئێمە

گوێڕایەڵ و فەرمانبەرین، بەڵام ئەگەر شتێکە و لەبەر ئێمەی دەکەی پارێزراوبین، ئەوە ئێمە پێویستمان بەوە نییە ئێمە و ئەوان هاوبەش پەیداکەربووین و بتمان دەپەرست، بەبێ کڕین و فرۆشتن نەیاندەتوانی تەماح بکەنە بەرووبوومی ئێمە، لەکاتێکدا وا خوا ڕێزی لێناین بەئیسلام و هیدایەتی ئێمەی دا و شکۆمەندی کردین، ئا ئێستا سەروەتی خۆمانیان پێ بدەین؟! سوێند بەخوا تەنیا شمشێریان پێ دەدەین و شمشێریان بۆ دەکێشین. پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) بۆچوونەکەیانی پێ پەسەند بوو فەرمووی:"إِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ أَصْنَعُهُ لَكُمْ لَمَّا رَأَيْتُ الْعَرَبَ قَدْ رَمَتْكُمْ عَنْ قَوْسٍ وَاحِدَةٍ"،واتا:کە بینینم هەموو عەرەب بەیەکجار لەدژتان کۆبوونەتەوە و دەیانەوێ بەیەکجار تیربارانتان بکەن، بۆیە ویستم ئەوەتان بۆ بکەم.

پاشان خوای گەورە سوپاس و ستایش بۆ مەزنیی خۆی، لەلایەن خۆیەوە کارێکی کرد دوژمن دۆڕا و ژمارەیان کەمبوویەوە، یەکێك لەوانەی بۆ موسڵمانانی ڕەخساند ئەوە بوو، پیاوێك لەغەتفان کە پێیدەوترا: نوعەیمی کوڕی مەسعودی کوڕی عامر(خوای لێ ڕازیی بێ) هات بۆ لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، من وا بوومە موسڵمان، چیت دەوێ فەرمان بکە ئەنجامی بدەم. پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّمَا أَنْتَ رَجُلٌ وَاحِدٌ فَخَذِّلْ عَنَّا مَا اسْتَطَعْتَ فَإِنَّ الْحَرْبَ خُدْعَةٌ"[1]،واتا: تۆ تەنیا یەك کەسی، بەڵام چی لەتواناتدا هەبوو لەوانە لێمان دووربخەرەوە، بێگومان شەڕ فرتوفێڵە.

یەکسەر نوعەیم ڕۆیشت بۆلای بەنی قورەیزە، لەسەردەمی نەفامییدا دۆست و هاوڕێیان بوو، چووە لایان و ئەوان نەیانزانی موسڵمان بووە. وتی: ئەی بەنی قورەیزە ئێوە وا چوونە جەنگی موحەممەدەوە، قورەیش ئەگەر دەرفەتێکی

---

[1] – ئیبن هیشام ئیخراجی کردووە لە السیرة النبویة٢/٢٢٩ و ئیبن سەعد لە الطبقات٤/٢٠٩ و تەبەری لە تاریخەکەیدا٢/٥٧٧.

دەستكەوێ بۆ خۆی دەیقۆزێتەوە، ئەگەر دەرفەتیشی دەستنەكەوێ دەگەڕێتەوە ولاتی خۆی و ئێوە و موحەممەد رووبەڕووی یەكتر بەجێدەهێڵێ، موحەممەدیش تۆڵەتان لێ دەكاتەوە. وتیان: چارە چییە ئەی نوعەیم؟ وتی: شان بەشانیان مەجەنگێن هەتاوەكو بارمتەتان لا دانەنێن. وتیان: بەڕاستی بۆچوونی جوانت دەرخست. پاشان دوای ئەوە راستەوخۆ رۆیشت بۆلای قورەیش. پێیانی وت: دەزانن چەندە دڵسۆزی ئێوەم؟ وتیان: بەڵێ دەزانین. وتی: جولەكەكان پەشیمانن لەوەی لەپەیمانی خۆیان لەگەڵ موحەممەد پەشیمان بوونەتەوە، وا ئەیانەوێ داوای بارمتەتان لێ بكەن تاوەكو رادەستی موحەممەدی بكەن و پاشان دەچنە پاڵی دژ بەئێوە، ئەگەر داوای بارمتەیان كرد، بارمتەیان پێ مەدەن. پاشان رۆیشت بۆلای غەتفان و نمونەی ئەوەی پێیان وت. كە شەوی شەممە لەمانگی شەوال هات نوێنەریان نارد بۆلای جولەكەو وتیان: ئێمە لەخاكی خۆماندا نین، وا ئەسپەكانمان توانایان لێ بڕاوە، بۆیە وەرن تاوەكو بدەین بەسەریدا و نەیانهێڵینەوە. ئەوانیش وەڵامیان ناردەوە: ئەمڕۆ رۆژی شەممەیە و دەزانن ئەوانەی پێش ئێمە كە لەڕۆژانی شەممەدا شەڕیان دەكرد چییان بەسەردا هات، بشزانن ئێمە شان بەشانی ئێوە شەڕ ناكەین تاوەكو بارمتەمان بۆ نەنێرن. كە شاندەكە ئەو هەواڵەی هێنایەوە، قورەیش وتی: سوێند بەخوا نوعەیم راستی لەگەڵدا كردین. پەیامیان بۆ جولەكە ناردەوە و وتیان: سوێند بەخوا ئێمە یەك بارمتەتان بۆ نانێرن، وەرن با بەیەكجار بدەین بەسەر موحەممەدا. ئەوكات قورەیزەش وتیان: سوێند بەخوا نوعەیم راستی لەگەڵدا كردین. بۆیە بەو جۆرە هەردوولا لەیەك دووركەوتنەوە و پشتی یەكتریان بەردا.

خوای گەورە رەشەبای لەڕیزی سەربازانی خۆیدا نارد و خێوەت و دەواری بێباوەڕانی لەبن دەركرد و حەبل و گوریسەكانی پچڕاند، فریشتەكان زەوییان

لەژێریاندا لەرزاندەوە و ترس و تۆقینیان خستە دڵی هاوبەش پەیداکەرانەوە، موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) حوزەیفەی کوڕی یەمانی نارد بۆ نێو هاوبەش پەیداکەران تاوەکو هەواڵ بهێنێتەوە. حوزەیفە بینی هاوبەش پەیداکەران کەوتوونەتە چی حاڵێکەوە و ئامادەسازن بۆ ڕۆیشتن، لەشەودا گەڕایەوە لای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەواڵی ڕۆیشتنی ئەوانی پێ دا. خوای گەورە دوژمنەکانی بەسەرشۆڕیی گەڕاندەوە و شەڕی ئەوانی لەکۆڵ موسڵمانان کردەوە، بەڵێنی خۆی بەجێهێنا و سەربازانی خۆی شکۆدار کرد، بەندەی خۆی سەرخست و پێڕ و دەستەکانیشی بەتەنیا دۆڕاند.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هاتەوە مەدینەو چەکی دانا، جبریل(سەلامی خوای لەسەربێ) هات بۆلای لەکاتێکدا پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەماڵی ئوم سەلەمەدا خۆی دەشۆرد، وتی: چەکتان دانا ! فریشتەکان هێشتا چەکیان دانەناوە، هەڵسە بۆ سەر ئەوانە—واتا بەنی قورەیزە— پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) بانگی کرد: "مَنْ كَانَ سَامِعًا مُطِيعًا، فَلَا يُصَلِّيَنَّ الْعَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ"[1]، واتا: هەرکەسێ گوێڕایەڵە نوێژی عەسر نەکات لەبەنی قورەیزە نەبێ. موسڵمانان خێرا دەرچوون، پێشتریش باسی ئەوەمان کرد بەنو قورەیزە چییان کرد و پەیوەندییان چی بەسەرهات، لەڕۆژی خەندەق و قورەیزەدا نزیکەی دە لەموسڵمانان شەهید بوون.

---

[1] بوخاری(٩٤٦) و موسلیم(١٧٧٠) ئیخراجیان کردووە.

**١٥-چیرۆك و باسی حودەیبییە**

ساڵی شەشی کۆچیی بوو لەمانگی زیلقیعدەدا، هەزار و چوارسەد کەس بوون، لە(ذي الحُليفة)بوون پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئیحرامی بەست، لەخوزاعە چاوساغی ڕێگەی نارد هەواڵی قورەیشی بۆ بهێنێ. لەنزیك عوسفان بوو چاوساغەکەی گەڕایەوە لای و وتی: کەعبی کوڕی لوئەیم بینی ئەحباشەکانی لەدژی تۆ کۆدەکردەوە، زۆرێك جەنگاوەریان کۆکردووەتەوە تاوەکو ڕێگرییت بکەن لەگەیشتن بەماڵی خوا. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕاوێژی بەهاوەڵانی کردو فەرمووی:"أَتَرَوْنَ أنْ نَمِيلَ على ذَرَارِي هَؤُلَاءِ الَّذِينَ أعانُوهُمْ فَنُصِيبَهُمْ، فإنْ قَعَدُوا قَعَدُوا مَوْتُورِينَ مَحْزُونِينَ وإنْ لَحُّوا تَكُنْ عُنُقا قَطَعَها الله؟ أَمْ تَرَوْنَ أنَّا نَؤُمُّ الْبَيْتَ، فَمَنْ صَدَّنا عَنْهُ قاتَلْناهُ؟"،واتا:بۆچوونتان چییە بدەین بەسەر ژن و منداڵی ئەوانەی هاوکارییان کردوون، ئەگەر دانیشتن، بەبێ منداڵ و خەفەتەوە دابنیشن یان کە شەڕیان کرد بکوژرێن؟ یان ڕووبکەینە ماڵی خوا، ئەگەر ڕێگرییان لێ کردین، شەڕیان بکەین؟

ئەبو بەکر(خوای لێ ڕازیی بێ) وتی: خواو پەیامبەری خوا باشتر دەزانن، ئێمە بۆ عومرە دەرچووین و بۆ کوشتنی کەس نەهاتووین، بەڵام ئەگەر هاتوو نەیانهێشت سەردانی ماڵی خوا بکەین، ئەوە شەڕیان دەکەین. پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"فَرُوحُوا إذًا"،واتا:کەوابوو بەڕێکەون.

بەڕێکەوتن هەتاوەکو ماوەیەك ڕۆیشتن و پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ بِالْغَمِيمِ فِي خَيْلٍ لِقُرَيْشٍ طَلِيعَةً، فَخُذُوا ذَاتَ الْيَمِينِ"،واتا: خالیدی کوڕی ئەلوەلید لەغەمیمدایە و لەپێشڕەویی ئەسپسوارەکانی قورەیشدایە، بۆیە لای ڕاست توندوتۆڵ بکەن.. سوێند بەخوا خالید لەنێو

تەپوتۆزی سوپادا بوو هەستی پێ نەکردن، کە هەستی بەوە کرد، بەڕاکردنەوە ڕۆیشت بۆ ئاگادارکردنەوەی قورەیش.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەڕێکەوت تاوەکو گەیشتە ئەو لوتکە و دەلاقەیەی کە ولاخەکەی لێیەوە دەرکەوت و خەڵکیی وتیان:حل حل(وشەیەکە بەوشتر دەوترێت کاتێك بەڕێدەکەوێ). پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم فەرمووی:"مَا خَلَأَتْ وَمَا ذَاكَ لَهَا بِخُلُقٍ، وَلَكِنَّهَا حَبَسَهَا حَابِسُ الْفِيلِ"، قەسواء دوانەکەوتووە و دواکەوتن خووی ئەو نییە، ئەوە خوای گەورە گلی دایەوە و رایگرت هەروەك فیلی راگرت. پاشان فەرمووی:"وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يَسْأَلُونِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ بِهَا حُرُمَاتِ اللَّهِ إِلَّا أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا"،واتا:سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەمڕۆ داوای ئەوەم لێ بکەن لەم مانگە پیرۆزەدا شەڕیان نەکەم، ئەوە ئەو بەڵێنەیان پێ دەدەم.

پاشان ژەنیە وشترەکەیەوە و لای دا تاوەکو دابەزیە ئەوپەڕی حودەیبییە و لەسەر ئاوێکی کەم کە خەڵکیی لەسەر کۆببوونەوە، زۆری نەبرد ئاو نەما و گازندەی تینوێتییان هێنایە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەویش تیرێکی لەتیردانەکەی دەرکرد و فرمانی کرد بیکەن بەشوێنی ئەو ئاوەدا. ئەڵێ: سوێند بەخوا تەواوی سوپاکە تێراو بوون و لەئاوەکە دوورکەوتنەوە.

بەو دابەزینەی دابەزیە سەریان، قورەیش تووشی تۆقین بوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) حەزی کرد هاوەڵێکی خۆی بنێرێتە لایان، بۆیە عوسمانی کوڕی عەفانی رەوانە کرد. لەبەلدەح بەلای قورەیشدا تێپەڕیوو، وتیان: ئەتەوێ بچی بۆ کوێ؟ وتی: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ناردوومی بانگەوازتان بکەم بۆ ئیسلام و هەواڵیشتان پێ بدەم کە بۆ شەڕ نەهاتووین، بەڵکو هاتووین بۆ

ئەنجامدانی عومرە. وتیان: گوێبیستی قسەت بووین، پێویستیی خۆت جێبەجێ بکە.

ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی وەقاس هەڵسا بۆلای و پێشوازیی لێکرد و ئەسپەکەی بۆ گرت، عوسمان سەرکەوتە سەر ئەسپەکە و خۆیشی لەپشتییەوە سەرکەوت تاوەکو چووە مەککە.

لەبابەت ئاشتەواییدا موسڵمانان و هاوبەش پەیداکەران تێکەڵ بوون، پیاوێکی ئەملا تیرێکی لەپیاوێکی ئەو لا دا، بەرانبەر یەکتر وەستانەوە، هەواڵ بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) گەیشت کە عوسمان کوژراوە، بۆیە داوای وەرگرتنی بەیعەتی کرد، موسڵمانان راپەڕین و خۆیان گەیاندە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ ژێر درەختەکە و بەیعەتیان پێ دا کە هەڵنەیەن و را نەکەن، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەستی خۆی گرت و فەرمووی:"هَذِهِ عَنْ عثمان"[1]،واتا: ئەم بەیعەتەش لەبری عوسمان. کە بەیعەت هاتەدی، عوسمان گەڕایەوە.

ئا لەو حاڵەدا بوون بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعیی لەگەڵ چەند کەسێکی خوزاعەدا هات و بەنهێنی هەواڵیان بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دا سەبارەت بەخەڵکی تیهامە و وتیان: کەعبی کوڕی لوئەی و عامری کوڕی لوئەی دابەزیوونەتە سەر سەرەتای ئاوی حودەیبییە و ژن و منداڵیشیان لەگەڵە، هاتوون بۆ شەڕکردنی تۆ و رێگریکردنت لەوەی بچیتە ماڵی خوا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"إِنَّا لَمْ نَجِئْ لِقِتَالِ أَحَدٍ وَلَكِنْ جِئْنَا مُعْتَمِرِينَ، وَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ نَهِكَتْهُمُ الْحَرْبُ وَأَضَرَّتْ بِهِمْ، فَإِنْ شَاءُوا مَادَدْتُهُمْ وَيُخَلُّوا بَيْنِي وَبَيْنَ النَّاسِ، وَإِنْ شَاءُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِيمَا دَخَلَ فِيهِ النَّاسُ فَعَلُوا وَإِلَّا فَقَدْ جَمُّوا، وَإِنْ هُمْ أَبَوْا إِلَّا الْقِتَالَ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى أَمْرِي هَذَا حَتَّى تَنْفَرِدَ سَالِفَتِي أَوْ لَيُنْفِذَنَّ اللَّهُ أَمْرَهُ"،واتا: ئێمە بۆ

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٣٦٩٨).

شەڕکردنی هیچ کەسێك نەهاتووین، بەڵکو هاتووین بۆ ئەنجامدانی عومرە. قورەیش شەڕ ماندووی کردوون و زیانی پێ گەیاندوون، ئەگەر بیانەوێ وازم لێبهێنن باشە، ئەگەر ڕێکەوتنیان بووێ باشە، ئەگەر شەڕیشیان بووێ، ئەوە سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە لەسەر ئەم بانگەوازەم شەڕیان دەکەم یان لەنێو دەچین یان فرمانی خوا بەجێدەگەیەنین. بودەیل وتی: قسەی تۆیان پێ دەگەیەنم. ڕۆیشت هەتاوەکو گەیشتەلای قورەیش و ئەو پەیامەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی پێیان گەیاند.

عورەوەی کوڕی مەسعود ئەلسەقەفیی ئەڵێ: ئەمە پلانێکی چاکە خستوویەتییە بەردەستی ئێوە، قبولی بکەن و بهێڵن بچمە لای. وتیان: بچۆ بۆلای. هات و قسەی لەگەڵ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) کرد، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) ئەوەی پێ فەرموو کە بەبودەیلی گەیاند، عوروە ئەوکات وتی: ئەی موحەممەد لەنێو عەرەبدا گوێت لێ بووە کەسێ هەبووبێ قەومی خۆی لەڕیشە بکێشێ، ئایە تۆ ئەوە ئەکەی؟ سوێند بەخوا کەسانێکی هەرچی و پەرچی دەبینم هەڵدێن و بەتەنیا بەجێت دەهێڵن.

ئەبو بەکر وتی:برۆ دەم بخەرە عەورتی لاتەوە،بۆ ئێمە کەسانێکین بەجێیبهێڵین و هەڵبێین؟! وتی: کێ ئەوەی وت؟ وتیان: ئەبو بەکر. وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر پیاوەتیی رابردووت بەسەرمەوە نەدەبوو وەڵامی تۆم دەدایەوە. پاشان عوروە چاوی خستبووەسەر پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، سوێند بەخوا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تفی فڕێ بدایە هاوەڵانی دەیانگرتەوە و بەدەموچاوی خۆیانیاندا دەهێنا، کە فرمانی شتێکی پێیان بکردبایە خێرا ئەنجامیان دەدا، کە دەستنوێژی دەشۆرد وەخت بوو لەسەر دەستنوێژەکەی شەڕ بکەن، کە قسەی دەکرد هاوەڵان بێدەنگ دەبوون، ئەوەندە گەورە بۆیان

دەڕوانی چاویان لەسەر لانەدەبرد. عوروە گەڕایەوە لای هاوڕێکانی و وتی: ئەی قەومەکەم، سوێند بەخوا چوومەتە لای کیسرا و قەیسەر و نەجاشی، سوێند بەخوا نەمبینیووە هیچ پادشایەك هەبێ ئەوەندە گەورە و مەزن تەماشا بکرێت وەك ئەوەی هاوەڵانی موحەممەد بۆ موحەممەدی دەکەن، پێشنیارێکی چاکی خستووەتە بەردەمتان قبوڵی بکەن.

پیاوێکی بەنی کینانە وتی: بهێڵن بڕۆم بۆلای. وتیان: بڕۆ. کە هات و لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی دەرکەوت، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"هَذَا فُلَانٌ، وَهُوَ مِنْ قَوْمٍ يُعَظِّمُونَ الْبُدْنَ، فَابْعَثُوهَا لَهُ"،واتا:ئەوە فلانە کەسە، لەقەومێکە وشتر گەورە رادەگرن، بەشێك لەو برژاوەی بۆ ببەن. بۆیان برد، کە ئەوەی بینی وتی: پاك و بێگەردیی بۆ خوای گەورە ناکرێ رێگریی ئەمانە بکرێت لەگەیشتن بەکەعبە. گەڕایەوە لای هاوڕێکانی و وتی: بینیم وشتریان سەربڕیووەو ئەیبرژێنن، وەهای نابینم رێگری بکرێن لەگەیشتن بەماڵی خوا.

میکرەزی کوڕی حەفس هەڵسا و وتی: بهێڵن بچم بۆلای. وتیان: بچۆ. کە هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"هَذَا مِكْرَزُ بْنُ حَفْصٍ، وَهُوَ رَجُلٌ فَاجِرٌ"،واتا:ئەوە میکرەزی کوڕی حەفسە، پیاوێکی خراپەکارە. دەستی کردە دواندنی پەیامبەری خوا و لەقسەکردندا بوو سوهەیلی کوڕی عەمر هات، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"قَدْ سُهِّلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ"،واتا:کارەکەتان بۆ ئاسان کرا. وتی: نووسراوێکم پێ بدە لەنێوان ئێمە و ئێوەدا. بانگیکرد لەنووسەرێك و فەرمووی:"اكْتُبْ:بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ" بنووسە،بەناوی خوای گەورەی میهرەبان. سوهەیل وتی: سەبارەت بەناوی ئەلرەحمان ئەوە ئێمە نایناسین، بەڵکو بنووسە(بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ- خوایە بەناوی تۆ)وەك چۆن لەکۆندا وەهامان نووسیووە.

موسڵمانەکان وتیان: واللە ئەوە نانووسین، بەڵکو دەنووسین:بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. پەیامبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) فەرمووی:بنووسە(بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ- خوایە بەناوی تۆ). پاشان فەرمووی:"اكْتُبْ: هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ"،واتا: بنووسە: ئەمە ئەو نووسراوەیە کە موحەممەدی پەیامبەری خوا ئیمزای لەسەر کردووە. سوهەیل وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بمانزانیبایە تۆ پەیامبەری خوای، ئەوە ڕێگرییمان لێ نەدەکردی بچیتە ماڵی خوا و شەڕی تۆمان نەدەکرد، بەڵکو بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵەی. پەیامبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) فەرمووی:"إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَإِنْ كَذَّبْتُمُونِي، اكْتُبْ: مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ"،واتا: من پەیامبەری خوام ئەگەرچی ئێوەش بەدرۆم بزانن، بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوالله. پەیامبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) فەرمووی:"عَلَى أَنْ تُخَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَنَطُوفَ بِهِ"،واتا: لەسەر ئەوەی بهێڵن سەردانی ماڵی خوا بکەین و تەوافی ماڵی خوا بکەین. سوهەیل وتی: سوێند بەخوا نابێ عەرەب قسە لەسەر ئەوە بکات فشارمان خرابێتەسەر، دەبێ لەساڵی داهاتوودا عومرە بکەن.

عومەری کوڕی خەتاب وتی: سوێند بەخوا لەوەتەی موسڵمان بوومە تەنیا ئەو ڕۆژە گومانم کردووە، هاتمە لای پەیامبەری خوا(صلی اللە علیە وسلم) و وتم: ئەی پەیامبەری خوا، تۆ پەیامبەری خوا نیت؟ فەرمووی: بەڵێ بۆ نا. وتم: ئەی ئێمە لەسەر حەق نین و دوژمنانیشمان لەسەر باتڵ؟ فەرمووی: بەڵێ بۆ نا. وتم: ئەی بۆچی لەئایینماندا باج بدەین و بگەڕێینەوە و شەڕی دوژمنانمان نەکەین؟ فەرمووی:"إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ وَهُوَ نَاصِرِي وَلَسْتُ أَعْصِيهِ"،واتا: من پەیامبەری خوام، خوا سەرخەری منە و سەرپێچیی ناکەم. وتم: ئەی نەتدەفەرموو دێین بۆ ماڵی خوا و تەواف دەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ بۆ نا، ئەی پێم نەوتی ساڵی داهاتوو دێی بۆ ماڵی خوا؟ وتم: نە، فەرمووی:"تۆ دێی بۆ ماڵی خوا و تەوافیشی دەکەی". ئەڵێ

هاتم بۆلای ئەبو بەکر و چی شتێکم بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) باس کرد، بۆ ئەویشم باسکرد، ئەبو بەکریش هەمان وەڵامی پەیامبەری خوای پێ وتم، ئەوەشی زیاتر کرد: بەکۆڵەکەیەوە پەیوەست بە هەتاوەکو ئەمری، سوێند بەخوا لەسەر حەقە. عومەر ئەڵێ: بۆ ئەوە زۆرێك كارم کرد.

کاتێ لەباسی نووسراو بوویەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"قُومُوا فَانْحَرُوا ثُمَّ احْلِقُوا"،واتا:هەڵسن قوربانییەکانتان بکەن و پاشان سەربتاشن. ئەڵێ: سێ جار ئەوەی فەرموو کەس لەشوێنی خۆی هەڵنەستا، خۆی هەڵساو چووە لای ئوم سەلەمە، بۆ ئوم سەلەمەی باسکرد چۆن وەڵام دراوەتەوە، ئوم سەلەمەش وتی: ئەی پەیامبەری خوا، حەز ئەکەی ئەوە بکەی؟ خۆت بڕۆرە دەرەوە و قسە مەکە هەتاوەکو بەدەستی خۆت قوربانیی خۆت سەردەبڕی و بانگ دەکەی لەسەرتاشەکەت سەرت بتاشێ. پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) چووە دەرەوەی خێمەکە و قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد: قوربانییەکەی خۆی ئەنجام دا و بانگیکردە سەرتاشەکەی و سەری تاشی، کە خەڵکیی ئەوەیان بینی، بەخۆیان هەڵسان و قوربانیی خۆیانیان سەربڕی و سەری یەکتریان تاشی، لەداخ و پەژارەدا وەختە یەکتر بکوژن.

**بەش**

لەنێوان موسڵمانان و خەڵکی مەککەدا ئاشتەوایی کرا کە دە ساڵ جەنگ لەنێوانیاندا روو نەدات، سەلامەتیی بدەنە یەکتر، ئەو ساڵە بگەڕێنەوە و ساڵی داهاتوو بێنە مەککە و سێ رۆژ تیایدا بمێننەوە و تەنیا چەکی پێویستیان پێ بێ و هەڵنەکێشرێت. هەر هاوەڵێك گەڕایەوە لای بێباوەڕان رادەست نەکرێت، بەڵام هەر بێباوەڕێك بێت بۆ نێو موسڵمانان رادەست بکرێتەوە، دزی و ناپاکیی لەنێوانیاندا

نەبێت. وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ئەم بەڵێنەیان پێ بدەین؟ فەرمووی: "مَنْ أَتَاهُمْ مِنَّا فَأَبْعَدَهُ اللَّهُ، وَمَنْ أَتَانَا مِنْهُمْ فَرَدَدْنَاهُ إِلَيْهِمْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُ فَرَجًا وَمَخْرَجًا"،واتا: هەرکەس لەئێمە گەڕایەوە بۆلای ئەوان و بۆ سەر ئایینی ئەوان، ئەوە خوای گەورە دوورتری بخاتەوە، هەرکەس لەوانیش هات بۆلای ئێمە و ئێمە گەڕاندمانەوە، ئەوە خوای گەورە دەرووی خێری لێ دەکاتەوە.

لەچیرۆکی حودەیبییەدا خوای گەورە فیدیەی(الأذى)ی داناوە بۆ کەسێ سەری بتاشێ بەفیدیەی رۆژوو یان خێرکردن یان قوربانیکردن، لەبارەی کەعبی کوڕی عوجزەوە.

تیایدا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سێ جار داوای لێخۆشبوونی کرد بۆ ئەوانەی سەریان تاشی و یەکجاریش داوای لێخۆشبوونی کرد بۆ ئەوانەی سەریان نەتاشی.

تیایدا رووی دا: وشترێ بۆ حەوت کەس بکرێتە قوربانی، مانگاش بۆ حەوت کەس بکرێتە قوربانی.

تیایدا رووی دا: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەکۆی وشترەکانی قوربانییدا وشترێکی کردە قوربانیی کە هی ئەبو جەهل بوو، ئەڵقەیەکی زیووی لەلوتدا بوو، ئەوەش تاوەکو هاوبەش پەیداکەران پێی پەست و تووڕە بن.

تیایدا رووی دا: سورەتی(الفتح) دابەزی، خوزاعە بوونە هاوپەیمانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و بەنو بەکریش بوونە هاوپەیمانی قورەیش.

## ١٦-هەندێ لەو سوودە فیقهییانەی لەچیرۆکی حودەیبییەدا روویان دا

لەوانە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەمانگەکانی حەجدا عومرەی کرد.

لەوانە: ئیحرامکردن بۆ عومرە لەمیقاتەوە باشترە.

لەوانە: هێنانی ئاژەڵی قوربانیی لەعومرەی تاکدا(المفردة) سووننەتە هەروەك لەقیرانیشدا سووننەتە.

لەوانە: دیاریکردنی گوێی ئاژەڵی قوربانیی سووننەتە.

لەوانە: موستەحەب و رێپێدراوە دوژمنانی خوا تووڕە بکرێن.

لەوانە: پێویستە ئەمیری سوپا لەپێش خۆیەوە چاوساغ و هەواڵگر رووەو دوژمن رەوانە بکات.

لەوانە: جائیزە لەکاتی پێویستی جیهاددا متمانە بەهاوبەش پەیداکەری دەستپاك بکرێ.

لەوانە: موستەحەب و سووننەتە ئیمامی موسڵمانان راوێژی هاوڵاتیان و سوپاکەی بکات بۆ وەرگرتنی بۆچوون و دڵخۆشکردنیان و پەنا نەباتە بەر سەرزەنشتکردن و گلەیی کردن لێیان، بەپشت بەستن بەفەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت:﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ﴾ آل عمران: ١٥٩ ،واتا:ڕاوێژیان پێ بکە لە کاروباردا.

هەروەها خوای گەورە بەم فەرمایشتەی، ستایش و پیاهەڵدانی بەندەکانی کردووە: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ الشورى: ٣٨ ،واتا:کاروباری نێوانیان بە پرس و ڕاوێژەوە ئەنجام دا.

لەوانە: جائیزە پێش شەڕکردنی پیاوان، ژن و منداڵانی هاوبەش پەیداکەران بکرێت بەسەبایە ئەگەر لەپیاوانیان جیابوون.

لەوانە: گەشبین بوون موستەحەبە و بەشێك نییە لەڕەشبینیی حەرام، کە سوهەیل هات، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:"کارەکەتان بۆ ئاسان بووە".

لەوانە: جائیزە لەبەر بەرژەوەندییەکی ئومێدکراو، بەهەندێ شت لەگەڵ هاوبەش پەیداکەراندا ئاشتیی بکرێت کە بەلای موسڵمانانەوە زۆردارانەی لایەنی هاوبەش پەیداکەر دەرکەوێ.

لەوانە: سەرتاشین بەشێکە لەڕێوڕەسمی پەرستشی عومرە، باشترە لە کورتکردنەوەی قژ، لەعومرەدا ئەوە پەرستشە هەروەك لەحەجکردنیشدا پەرستشە.

## ١٧-ئاماژەکردن بەهەندێ لەو حوکمانەی لەو ئاگربەست و ڕێکەوتنەدا هاتووە

زۆرتر و گەورەترە لەوەی مرۆڤ سوودەکانی بژمێرێ، تەنیا خوای گەورە دەیزانێ کە هۆکارەکانی بڕیار دا و ئامانجەکەی بەو جۆرە بوو کە پێویستی کرد.

لەوانە: ئەو ئاگربەستە گەورەترین فەتحێك بوو، چونکە خەڵکیی بەرانبەر یەکتر کەوتنە دڵنیاییەوە، موسڵمانان تێکەڵ بەبێباوەڕان بوون و بانگەوازیان کردن و قورئانیان بۆیان دەخوێندەوە، بەئاشکرا و بێ ترس قسەو باسیان لەبارەی ئیسلامەوە بۆیان دەکرد، ئەوەی بەشاراوەیی موسڵمان بوو، موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا دەکرد، لەماوەی ئەو ئاگربەستەدا ئەوانە هاتنە نێو ئیسلامەوە کە خوای گەورە ویستی موسڵمان بن، بۆیە خوای گەورە ناوی لێناوە رزگارکردنی روون(فتحا مبینا).

لەوانە: ئەوەی خوای گەورە بۆ باوەڕدارانی کردە هۆکار لەزیاتربوونی ئیمان و ملکەچی و گوێڕایەڵیی بۆ هەر شتێ حەزیان پێ کردبێ و حەزیان پێ نەکردبێ، لەوانەی بۆیان رووی دا لەڕازیبوون بەقەزا و قەدەری خوای گەورە و راستخستنەوەی بەڵێن و چاوەڕوانیکردنی ئەوەی بەڵێنی هاتنەدیی داوە، هەروەها بینینی منەتی خوای گەورە بەسەریانەوە بەو ئارامییەی کە خستیە دڵیانەوە و پێشتر پێویستیان پێ هەبوو بۆ ئەو حاڵ و بارانەی چیاکان بۆیان دەهاتنە لەرزین.

**١٨-شەڕی خەیبەر**

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) حودەیبییەی بەجێهێشت، لەنێوان مەککە و مەدینەدا سورەتی(الفتح)ی بۆ دابەزاند، خوای گەورە لەو سورەتەدا خەیبەری پێ بەخشی: ﴿ وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِ ﴾ **الفتح: ٢٠** ،واتا: خوا بەڵێنی پێ داوون کە غەنیمەتی زۆر(لە بێ باوەڕان) دەگرن بۆیە ئەم(غەنیمەتەی خەیبەر)ی بۆ پێش خستن.

پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەزیلحیجەدا هاتەوە مەدینە، تیایدا مایەوە تاوەکو لەموحەڕەمدا بەڕێکەوت بۆ خەیبەر، لەئەلڕەجیع دابەزی کە دۆڵێکە لەنێوان خەیبەر و غەتفاندا، ترسا غەتفان پەلاماریان بدات، ئەو شەوە مایەوە و بەیانی بۆیان بەڕێکەوت. کۆتایی.

کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتە خەیبەر، نوێژی بەیانیی لەوێ کرد، موسڵمانان ئەو دەشت و دەرەیان گرتبوو، خەڵکی خەیبەر کە لەبەیانییدا بێ ئەوەی بزانن دەرچوونە دەرە و چوونە سەر کشتوکاڵییەکانیان و سوپاکەیان بینی، وتیان: موحەممەد سوێند بەخوا، موحەممەد و پێنجشەممە. پاشان بەڕاکردنەوە رایانکرد بۆ شارەکەی خۆیان، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ"،واتا: الله أكبر خەیبەر کاول بوو، الله أكبر خەیبەر کاول بوو، ئێمە دابەزینە گۆڕەپانی قەومێك کە خراپترین بەیانییەکی ئەوانە بوو ئاگادارکرانەوە.

کە شەوی چوونە نێو خەیبەر هات، فەرمووی:"لَأُعْطِيَنَّ هذه الرَّايَةَ غَدًا رَجُلًا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ"،واتا: بەیانیی ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست پیاوێك خوا و پەیامبەرەکەی خۆشدەوێ و خوا و پەیامبەریش ئەویان خۆشدەوێ، خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو، خەیبەر فەتح دەکات.

کە بەیانیی بوویەوە، هەمووان ڕۆیشتن بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و هەریەکەو ئومێدی دەکرد ئالاکە بەو بدات. فەرمووی: "أَيْنَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ؟"، واتا: عەلی کوڕی ئەبو تالیب کوا؟ وتیان: ئەی پەیامبەری خوا وا چاوی ئێشێ. فەرموو: "فَأَرْسِلُوا إِلَيْهِ"، واتا: بنێرن بەدوایدا. عەلییان هێنا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تفی کردە چاوی، یەکسەر چاوی چاك بوویەوە و ئازاری نەما، ئالاکەی پێ دا، عەلی وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) شەڕیان بکەم هەتاوەکو وەك ئێمە ببنە موسڵمان؟ فەرمووی: "انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ، وَأَخْبِرْهُمْ بِمَايَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللَّهِ فِيهِ، فَوَاللَّهِ لَأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلًا وَاحِدًا خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمُرُ النَّعَمِ"[1]، واتا: لەسەرخۆت و وریاییەوە بچۆ تاوەکو دادەبەزیتە گۆڕەپانەکەیان، بانگەوازیان بکە بۆ ئیسلام و هەواڵیان پێ بدە بەو حەقەی خوا لەسەریانە و جێبەجێی بکەن، سوێند بەخوا ئەگەر خوای گەورە بەهۆی تۆوە یەکێ هیدایەت بدات باشترە لەوەی وشتر سوورت هەبێ.

مەرحەب دەرچوو وتی:

أَنَا الَّذِي سَمَّتْنِي أُمِّي مَرْحَبُ
شَاكِي السِّلَاحِ بَطَلٌ مُجَرَّبُ
إِذَا الْحُرُوبُ أَقْبَلَتْ تَلَهَّبُ

واتا: من ئەوەم کە دایکم ناوی لێناوم مەرحەب، ئەوەی هەمیشە چەکی هەڵکێشراوەو پاڵەوانی جەنگە کاتێ شەڕ هەڵدەگیرسێ و کڵپە دەسێنێ.

عەلییش بۆی دەرچوو ئەیووت:

أَنَا الَّذِي سَمَّتْنِي أُمِّي حَيْدَرَهْ
كَلَيْثِ غَابَاتٍ كَرِيهِ الْمَنْظَرَهْ

---

[1]- بوخاری(٤٢١٠) و موسلیم(٢٤٠٦) ئیخراجیان کردووە.

أُوفِيهِمُ بِالصَّاعِ كَيْلَ السَّنْدَرَهْ

واتا: من ئەوەم کە دایکم ناوی لیّ ناوم حەیدەر(شێر)، وەك شێری دارستان، روو گرژ و توند و بەیەك لێدانی شمشێر، کێشانەی سندرەیان بۆ پڕ دەکەم کە قەبارەی گەورە کێش دەکات.

دای لەمەرحەب سەری لەجەستەی کردەوە، ئەوە فەتح بوو[1].

موسای کوڕی عوقبە ئەڵێ: پاشان جولەکە چوونە قەڵایەکی زۆر سەختەوە پێیان دەوت: ئەلقەموس، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نزیکەی بیست شەو گەمارۆی دان، زەوییەکی نەسازی گەرمای سەخت بوو، موسڵمانان بەسەختیی ماندووبوون[2].

واقیدی ئەڵێ: جولەکە چوونە قەڵای ئەلزوبەیرەوە- قەڵایەکی سەخت بوو- پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سێ رۆژ گەمارۆیانی دا، پیاوێکی جولەکە هات پێیدەوترا: عزال، وتی: ئەی ئەبو ئەلقاسم، ئەگەر یەك مانگیش لێرە بی ئەوان خەمیان نییە، ئەوان کانی و چاوگە ئاویان هەیە لەژێر زەوی، شەوان دەردەچن لێی دەخۆنەوە و دەگەڕێنەوە قەڵاکانیان و خۆیان لە تۆ دەپارێزن، ئەگەر سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەیان لێ ببڕیت، ناچار دەبن بێنە ژێر بار. پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڕێکەوت بۆ سەر ئاوەکەیان و لێیانی بڕی. کە ئاوەکەی لێیان بڕی، دەرچوون بۆ سەختترین شەڕ، چەند کەسێ لەموسڵمانان کوژران و نزیکەی دە لەجولەکەکان پێکران، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەتحی کرد[3].

پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) رۆیشتە سەر خەڵکی قەڵای کەتیبە و وەتیح و سولالمی قەڵای کوڕی ئەبی ئەلحوقەیق، خەڵکی قەڵاکە سەنگەرەکانیان

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٨٠٧).

[2] - بڕوانە: (تاريخ الإسلام)ی زەهەبی٢/٢٣٩.

[3] - مغازي الواقدي٢/٦٦٦- ٦٦٧.

قایم کرد، دۆڕاوی قەڵاکانی تر خۆیانیان پێیان گەیاندبوو، خەیبەر دوو تەنیشتی هەبوو، تەنیشتی یەکەم:شەق و نەتات و دووەمیش: کەتیبە و وەتیح و سولالم بوو. لەقەڵاکانیان خۆیان توند کرد و دەرنەدەچوون، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) مەنجەنیقی بۆیان بەکارهێنا، کە دڵنیابوون تیادەچن و پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) چواردە رۆژ گەمارۆی دابوون، داوای رێککەوتن و ئاشتییان کرد لەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم). کوڕی ئەبی ئەلحوقەیق هەواڵی نارد بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و وتی: دابەزم قسەت لەگەڵ بکەم؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"بەڵێ". کوڕی ئەبی ئەلحوقەیق دابەزی و رێککەوت لەگەڵ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسەر پاراستنی خوێنی جەنگاوەرانیان و دەستهەڵگرتن لەژن و منداڵیان، بەخۆیان و ژن و منداڵیانەوە لەخەیبەر دەربچن و تەنیا بەرگی خۆیان دەربکەن و دەستبەرداری زەوی و هەموو سەروەتێکیان ببن. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"ئەگەر شتێکم لێ بشارنەوە، ئەوە لەئەستۆی خوا و پەیامبەرەکەی نامێنن"، ئەوانیش لەسەر ئەوە لەگەڵیدا رێککەوتن.

### ١٩-مەڕی ژەهراویکراو

لەم شەڕەدا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ژەهر خوارد کرا،زەینەبی کچی ئەلحاریسی جولەکە کە خێزانی سەلامی کوڕی میشکەم بوو، مەڕێکی برژاوی هێنا ژەهراویی کردبوو، پرسی: حەزی بەچی گۆشتێکە؟ وتیان: حەزی بەدەستە، بۆیە ژەهری زیاتری بەو شوێنەوە کرد. کە پەیەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گازی لەدەستەکە گرت، دەستەکە هەواڵی پێ دا کە ژەهراویی کراوە، بۆیە پارووەکەی لەدەم فڕێ دا و فەرمووی:"اجْمَعُوا لِي مَنْ هَا هُنَا مِنَ الْيَهُودِ"،واتا: ئا لێرەدا

جولەکەم بۆ کۆبکەنەوە. بۆیان کۆ کردەوە و فەرمووی: "إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ فِيهِ؟"،واتا: من لەبارەی شتێکەوە پرسیارتان لێ دەکەم، ئایە راست وەڵامی پرسیارەکەم دەدەنەوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی ئەبا ئەلقاسم. فەرمووی: "مَنْ أَبُوكُمْ؟"،واتا: کێ باوکی ئێوەیە. وتیان: فلان باوکی ئێمەیە. فەرمووی: "كَذَبْتُمْ، أَبُوكُمْ فُلَانٌ"،واتا: درۆتان کرد، بەڵکو فلانە کەس باوکی ئێوەیە. وتیان: راستتفەرموو پێکات. فەرمووی: "هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟"،واتا: بەڕاستیی وەڵامم دەدەنەوە ئەگەر لەبارەی شتێکەوە پرسیارتان لێ بکەم؟ وتیان: بەڵێ ئەی ئەبا ئەلقاسم بەڕاست وەڵامت دەدەینەوە، ئەگەر درۆ بکەین تۆ دەزانیت هەروەك باوکی راستەقینەی ئێمەت ناسی. فەرمووی: "مَنْ أَهْلُ النَّارِ؟"،واتا: کێ خەڵکی دۆزەخە؟ وتیان: ئێمە دەچینە ناویەوە و ئێوەش بەدواماندا. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "اخْسَئُوا فِيهَا، فَوَاللَّهِ لَا نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَدًا"،واتا:تیایدا سووك بن، سوێند بەخوا هەرگیز دوای ئێوە ناکەوین تیایدا. پاشان فەرمووی: "هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟"،واتا: راستم لەگەڵدا ئەکەن ئەگەر لەبارەی شتێکەوە پرسیارتان لێ بکەم؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: "أَجَعَلْتُمْ فِي هَذِهِ الشَّاةِ سُمًّا؟"،واتا: ژەهرتان کردە ئەم مەڕەوە؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: "فَمَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ؟"[1]،واتا: چی شتێك پاڵی پێوەنان ئەوە بکەن؟ وتیان: وتمان ئەگەر درۆزن بێ،ئەوە بەو ژەهرە لەکۆڵمان دەبێتەوە، ئەگەر پەیامبەریش بێ ئەوە زیانی پێ نادات.

جیاوازیی هەیە: ئایە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لێی خوارد یان نە؟ زۆربەی گێڕانەوەکان لەگەڵ ئەوەن کە لێی خواردووەو دوای ئەوە سێ ساڵ ژیاوە، تەنانەت لەو ئازار و نەخۆشییەی کە تیایدا کۆچی دوایی کرد فەرمووی: "مَا زِلْتُ

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٧٧٧).

أَجِدُ مِنَ الْأُكْلَةِ الَّتِي أَكَلْتُ مِنَ الشَّاةِ يَوْمَ خَيْبَرَ، فَهَذَا أَوَانُ انْقِطَاعِ الْأَبْهَرِ مِنِّي "[1]،واتا: ئەو پارووەی لەمەڕەکەی ڕۆژی خەیبەر خواردم ئێستاش ئازارم دەدات، وا خەریکە هەناسەم لێ دەبڕێ. زوهریی ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەشەهیدیی کۆچی دوایی کرد.

## ٢٠-ئەحکامە فیقهییەکانی شەڕی خەیبەر

لەوانە: جائیزە لەمانگە پیرۆزەکاندا شەڕی بێباوەڕان بکرێت.

لەوانە: ئەگەر لەدوای لێبوونەوەی شەڕ، هاوکاریی بەسوپا گەیشت لەهاوکاریی جەنگاوەر، ئەوە بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی سوپا، پشکی سەربازانی تر نادرێت کە دوای تەواوبوونی شەڕ گەیشتوون. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ تەواوی هاوەڵانیدا قسەی کرد لەبارەی کۆچەرانی حەبەشەوە کە لەخەیبەردا پێیان گەیشتن لەجەعفەر و هاوڕێکانی، ڕازیبوون پشکیان هەبێ، بۆیە پشکی بۆیان دیاریی کرد.

لەوانە: حەرامکردنی گۆشتی گوێدرێژ، بەدروست لەخەیبەردا حەرامی کرد، بەدروست لێیەوە هاتووە کە گۆشتەکەی پیسە بۆیە حەرامی کردووە.

لەوانە: جائیزە بەبەش زەوی بدرێ بەکرێ بۆ کشتوکاڵیکردن، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەر ئەوە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا کرد.

لەوانە: جائیزە بەمەرج ئاشتەوایی و سەلامەتیی بدرێت، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەمەرجی نەشاردنەوەی ڕاستیی، ئاشتیی لەگەڵیاندا ئەنجام دا.

لەوانە: جائیزە سەربڕاوی ئەهلی کیتاب بخورێت.

لەوانە: قبوڵکردنی دیاریی بێباوەڕ.

---

[1] - بوخاری موعەللەقی کردووە(٤٤٢٨) و بەزار١٨/١٤٩(١١٥) و حاکم٢/٦٠(٤٣٩٣) ئیخراجیان کردووە.

## ٢١-چیرۆكی وادي القرى و تەیماو و فەدك

پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) لەخەیبەرەوە ڕۆیشت بۆ وادي القرى، كۆمەڵێكی جولەكەی لێ بوو، كۆمەڵێكی عەرەبیش چووبوونە پاڵیان، كە دابەزینە ئەوێ، جولەكە تیربارانیان كرد و موسڵمانان لەئامادەسازییدا نەبوون، بۆیە پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) موسڵمانانی ئامادەی شەڕ كرد و ریزی كردن، پاشان داوای لەجولەكەكان كرد ببنە موسڵمان. پیاوێكیان دەرچووە گۆڕەپان، زوبەیری كوڕی عەوام دەرچووە بەرانبەری و كوشتی، پاشان یەكێكی تریان دەرچوو، ئەویشی كوشت، پاشان یەكێكی تر دەرچوو، عەلی دەرچووە بەرانبەری و كوشتی، هەتا ئەوەی یانزە پیاویان كوژرا، هەركاتێ یەكێكیان لێ بكوژرایە، پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) بانگەوازیانی دەكرد بۆ موسڵمانبوون، ئەو ڕۆژە نوێژی تەواو دەكرا،نوێژی بەهاوەڵانی دەكرد و پاشان دەگەڕایەوەو بانگەوازیانی ئەكرد بۆ موسڵمانبوون، بۆ ملكەچبوون بۆ خوا و پەیامبەرەكەی، شەڕی كردن هەتاوەكو ئێوارەیان بەسەردا هات، بەیانییەكەی بەئەندازەی تیرێك خۆر هەڵ نەهاتبوو خۆیان رادەست كرد، پەیامبەری خواش(صلى الله علیه وسلم) لەدوای ئەو فەتحە گەڕایەوە مەدینە.

پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) چوار ڕۆژ لەوادي القرى مایەوە، پشكەكانی (وادي القرى)ی بەسەر هاوەڵانیدا دابەشكرد، زەوی و دارخورماكانی بەدەست جولەكەوە هێشتەوە و كردنی بەكرێكاری ئەو زەوی و دارخورمایانە، كە هەواڵ بەجولەكەی تەیماء گەیشت كە پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) بەسەر خەڵكی (خەیبەر و فەدك و وادي القرى) سەركەوتووە، لەگەڵ پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) ڕێككەوتن.

## ٢٢-ناردنی سریەکان لەلایەن پەیامبەری خواوە( صلی الله علیه وسلم )

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دوای هاتنەوەی لەخەیبەر تاوەکو شەوال، لەو ماوەیەدا سریەکانی رەوانە کرد.

## ٢٣-عومرەی قەزا

موسای کوڕی عوقبە ئەڵێ: پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەساڵی دوای حودەیبییە لەمانگی زیلقیعدەی ساڵی حەوتی کۆچی، دەرچوو، لەو مانگەدا کە هاوبەش پەیداکەران نەیانهێشت سەردانی ماڵی خوا بکات، کە گەیشتە یەئجەج، هەموو چەکێکیان دانا تەنیا شمشێری سواریان پێ بوو[١].

کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ مەککە هات، فرمانی کردە هاوەڵانی و فەرمووی:"اكْشِفُوا عَنِ الْمَنَاكِبِ، وَاسْعَوْا فِي الطَّوَافِ"،واتا: شانتان دەربخەن و لەتەوافدا سەعی و شێوە خێرا بکەن. بۆ ئەوەی هاوبەش پەیداکەران هێز و ئەستوریی موسڵمانان ببینن. بەهەموو ئەوەی لەتوانایدا بوو لەخشتەی ئەبردن.

خەڵکی مەککە بەپیاو و ژن و منداڵەوە راوەستابوون و ئەیانڕوانیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان کە خەریکی تەوافکردن بوون.

پیاوانێك لەقورەیش لەمەککە دوورکەوتبوونەوە و لەڕق و تووڕەییدا حەزیان نەدەکرد پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ببینن. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سێ رۆژ لەمەککەدا مایەوە، کە بەیانیی رۆژی چوارەم هات، سوهەیلی کوڕی عەمر و حوەیتبی کوڕی عەبدولعوزا هاتن، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمەجلیسی پشتیوانانددا بوو لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەدا قسەی دەکرد، حوەیتب هاواری کرد و وتی: بۆ خوا و رێکەوتنی نێوانمان تکا دەکەم لەخاکمان

[١]- بەیهەقی لە دلائل النبوة٤/٣١٤ ئیخراجی کردووە لەڕێگەی موسای کوڕی عوقبەوە.

دەربچی، وا سێ ڕۆژەکە کۆتایی هات، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کردە ئەبو رافیع و ئەویش جارِی رۆیشتنی دا.

## ٢٤-شەڕی موئتة

لەمپەڕی بەلقائە لەخاکی شام، لەجەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچییدا بوو، هۆکاری ئەو شەڕە ئەوە بوو،پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەلحاریسی کوڕی عومەیر ئەلئەزدیی-یەکێك بوو لەنەوەی لیهب-بەنووسراوەوە نارد بۆ شام بۆلای پادشای رۆم یان بوسرا، شەرحەبیلی کوڕی عەمری غەسسانیی رێی پێگرت و بەستییەوە و لەگەردنی دا، ئەوەش تاکە نێردراوێکی پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم)لەپێناو پەیامبەردا بکوژرێت، کە هەواڵی کوژرانی ئەلحاریسی پێگەیشت، زۆر سەخت بوو بەسەریەوە، بۆیە سوپای نارد و زەیدی کوڕی حاریسەی کردە فەرماندەی سوپاکە و فەرمووی:"إِنْ أُصِيبَ فَجَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ عَلَى النَّاسِ، فَإِنْ أُصِيبَ جعفر،فَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ"[١]،واتا:ئەگەر زەید کوژرا، ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب بکرێتە ئەمیری سوپا، ئەگەر جەعفەریش کوژرا، ئەوە عەبدوڵڵەی کوڕی رەواحە بکرێتە ئەمیری سوپا.

پاشان بەرێکەوتن تاوەکو دابەزینە موعان، هەواڵ بەسوپا گەیشت کە هیرقەل بەسەد هەزار جەنگاوەری رۆمەوە لەبەلقائە و لەخم و جوزام و بولقین و بەهرائو بەلییش چوونەتە پاڵی کە سەد هەزار کەسن،کە ئەو هەواڵە بەموسڵمانان گەیشت، بۆ دوو شەو لەموعان مانەوە و ئەیانڕوانی چی بکەن، وتیان: با نووسراو بنێرین بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و بۆی باس بکەین دوژمن ژمارەی چەندە، ئەوکات یان سەربازمان بۆ دەنێرێ یان فرمانمان پێ دەکات بگەڕێینەوە، بەڵام

---

[١]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٤٢٦١).

عەبدوڵڵەی کوڕی ڕەواحە هانی ئەو خەڵکەی دا و وتی: ئەی قەوم، سوێند بەخوا ئەوەی ئێوە حەزی پێ ناکەن و لەپێناویدا دەرچوون کە شەهیدبوونە، ئێمە بەژمارە و هێز شەڕ ناکەین، بەڵکو بەم ئایینە شەڕیان دەکەین کە خوای گەورە پێیەوە ڕێزی لێناین، ئێمە یەکێ لەم دوو چاك و خۆشیەمان بۆ دەبێ: یان سەرکەوتن یان شەهیدبوون.

خەڵکیی بەڕێکەوتن تاوەکو گەیشتنە سنووری بەلقاء، ڕۆم و عەرەبەکان لەدێیەکدا پێیان گەیشتن پێیدەوترێ: مشارف، دوژمن نزیکبوویەوە و موسڵمانان لایاندایە لای موئتە، لەوێ بەرانبەر بوونەوە، موسڵمانان ئامادەساز بوون، پاشان شەڕیان کرد و ئاڵا لەدەستی زەیدی کوڕی حاریسەدا بوو، بەئاڵاکەوە شەڕی کرد هەتاوەکو بەتیری دوژمن کەوت، ئینجا جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت، بەئاڵاکەوە شەڕی کرد هەتاوەکو شەڕ ماندووی کرد و لەئەسپەکەی هاتەخوارەوە و ئەسپەکەی سەربڕی و شەڕی کرد تاوەکو کوژرا. جەعفەر یەکەمین کەسێك بوو لەئیسلامدا لەشەڕدا ئەسپی سەربڕی. دەستی ڕاستی لێبوویەوە بەدەستی چەپ ئاڵاکەی هەڵگرت، دەستی چەپیشیان لێکردەوە بەباوەش ئاڵاکەی هەڵگرت هەتاوەکو کوژراو تەمەنی سی و سێ ساڵ بوو.

پاشان عەبدوڵڵەی کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و پێیەوە چووە پێشەوە بەئەسپەکەیەوە و شەڕی کرد تاوەکو کوژرا، پاشان سابتی کوڕی ئەقرەمی برای نەوەی عەجلان ئاڵاکەی هەڵگرت و وتی: ئەی موسڵمانان ڕێکبکەون لەسەر ئەوەی یەکێك لەنێوتاندا ببێتە ئەمیر، وتیان: تۆ ببە. وتی: من نایکەم. بۆیە خەڵکەکە یەکدەنگ بوون لەسەر خالیدی کوڕی وەلید، کە ئاڵاکەی هەڵگرت پەلاماری ڕۆمی دا گەڕاندنیە دواوە و پاشان موسڵمانانی هێنایە دواوە و خەڵکەکەی بەڕێخست.

ئیبن سەعد باس دەکات کە لەو شەڕەدا موسڵمانەکان شکستیانهێنا[1]، بەڵام لەسەحیحی بوخارییدا هاتووە کە ڕۆمەکان شکستیانهێنا[2]. دروست ئەوەیە کە ئیبن ئیسحاق باسی کردووە، هەر کۆمەڵێك دەستی لەوی تر هەڵگرت[3].

## ٢٥-فەتحی مەزن

ئەوەی خوای گەورە بەهۆیەوە ئایین و پەیامبەر و سەربازانی خۆی شکۆدار کرد و شار و ماڵی خۆی پێ ڕزگار کرد، کە کردوویەتییە هیدایەتی جیهانیان و ڕزگارکردنی لەدەست بێباوەڕان و هاوبەش پەیداکەران، ئەو فەتحە بوو کە فریشتەکانی ئاسمان مزگێنییان پێ دەدا و خەڵکیش بەهۆیەوە بەکۆمەڵ دەهاتنە نێو ئیسلامەوە و پێیەوە سەردەم ڕووی جوانیی وەرگرت و گەشایەوە، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)یش بەکەتیبەکانی ئیسلام و سەربازانی پەروەردگارەوە لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتی کۆچیی کە هەشت ڕۆژ لەمانگی ڕەمەزان ڕۆیشتبوو، بۆی دەرچوو.
لەبەر ئەوەی لەڕێکەوتنی حودەیبییە لەنێوان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و قورەیشدا ئەو مەرجە جێگیر بوو کە هەر عەشیرەتێك ئازادبێ ببێتە هاوپەیمانی پەیامبەری خوا، با ببێتە هاوپەیمانی پەیامبەر، هەر عەشیرەتێکیش ویستی ببێتە هاوپەیمانی قورەیش با ببێتە هاوپەیمانی قورەیش. خوزاعە بووە هاوپەیمانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، کە ئاگربەست جێی خۆی گرت، نەوەی بەکر پلانی دانا بۆ پەلاماردانی خوزاعە و تۆڵەکردنەوەی کۆنی نێوانیان، بۆیە نەوفەلی کوڕی موعاویە ئەلدەیلیی بەکۆمەڵێکی نەوەی بەکر دەرچوو، شەو کە خوزاعە لەسەر چاوگە ئاوێك بوون لەخوار مەککە ئەلوەتیر، پەلاماری خوزاعەیان دا،

---

[1]- الطبقات الکبری لابن سعد ٢/٩٨.
[2]- بوخاری ئیخراجی کردووە(١٢٤٦).
[3]- بڕوانە: سیرة ابن هشام٢/٣٨٠.

کۆمەڵێ پیاویان لەخوزاعە کوشت و شەڕ لەنێوانیاندا رووی دا، قورەیش بەچەک هاوکاریی نەوەی بەکریان کرد و بەشەو و شاراوەییش چەکدارانی قورەیش هاوکاریی نەوەی بەکریان کرد، کە خوزاعە چووە مەککەوە پەنایان بردە بەر ماڵی بودەیلی کوڕی وەرقاء ئەلخوزاعی و ماڵی مەوالییەکیان کە پێیدەوترێ: رافیع.

لەمەدا عەمری کوڕی سالمی خوزاعیی دەرچوو تاوەکو گەیشتە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمەدینە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەنێو هاوەڵانیدا لەمزگەوت دانیشتبوو، عەمر لەسەری راوەستاو وتی:

يَا رَبِّ إِنِّي نَاشِدٌ مُحَمَّدًا

حِلْفَ أَبِينَا وَأَبِيهِ الْأَتْلَدَا

إِنَّ قُرَيْشًا أَخْلَفُوكَ الْمَوْعِدَا

وَنَقَضُوا مِيثَاقَكَ الْمُؤَكَّدَا

واتا:ئەی پەروەردگارا من وا داوا لەموحەممەد دەکەم کە هاوپەیمانیی کۆن لەنێوان باوکم و باوکیدا هەیە، قورەیش وا بێ بەڵێنییان لەگەڵ تۆدا کرد و پەیماننامەی بەهێزی تۆیان هەڵوەشاندەوە. ئەیووت: لەئێمەیان کوشت لەکاتێکدا لەشەڕدا نەبووین. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"نُصِرْتَ يَا عمرو بن سالم"،واتا: وا سەرخرای و پشتیوانیی کرای ئەی عەمری کوڕی سالم.

پاشان بودەیلی کوڕی وەرقاء لەگەڵ چەند کەسێکی خوزاعە دەرچوو تاوەکو هاتنە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و بۆیان گێڕایەوە چی شتێکیان بەسەردا هاتووە و قورەیش لەدژیان پشتیوانیی نەوەی بەکریان کردووە، پاشان گەڕانەوە مەککە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"كَأَنَّكُمْ بأبي سفيان وَقَدْ جَاءَ لِيَشُدَّ الْعَقْدَ وَيَزِيدَ فِي الْمُدَّةِ"،واتا: بۆ ئەمە ئەبو سوفیان دێت تاوەکو پەیماننامەکە توندوتۆڵ بکاتەوە و ماوەکەی زیاتر بکات.

بودەیلی کوڕی وەرقاء بەهاوڕێکانییەوە ڕۆیشت تاوەکو لەعەسفان بەئەبو سوفیانی کوڕی حەرب گەیشت کە قورەیش ناردبووی بۆ توندوتۆڵکردنی پەیماننامەکە و زیاترکردنی ماوەکەی، چونکە بەوەی کردبوویان تۆقیبوون. کە ئەبو سوفیان بەبودەیل گەیشت، وتی: لەکوێوە دێی ئەی بودەیل؟ بودەیل وتی: خوزاعەی ئەم کەنارانە و نێو ئەم دۆڵەم بەسەرکردەوە. وتی: لای موحەممەدەوە نەهاتووی؟ وتی: نە. کە بودەیل بەرەو مەککە بەڕێکەوت، ئەبو سوفیان وتی: ئەگەر لەمەدینەوە هاتبێ، ئەوە خورمای وەك ئالیك بەوشترەکانی داوە، بۆیە هات بۆ شوێن کوڵوبار و وشترەکان و بینی لەپاشەڕۆی وشترەکاندا ناوکە خورما هەیە، وتی: بەخوا سوێند دەخۆم بودەیل لای موحەممەدەوە هاتبوو.

پاشان دەرچوو تاوەکو گەیشتە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بەلاّم پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەهیچ شتێك قسەی لەگەڵدا نەکرد، پاشان ڕۆیشت بۆلای ئەبو بەکر و داوای لێکرد لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) قسە بکات. ئەبو بەکر وتی: من ئەوە ناکەم. پاشان هات بۆلای عومەری کوڕی خەتاب و قسەی لەگەڵدا کرد. عومەر وتی: من بۆ ئێوە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) تکا بکەم؟! سوێند بەخوا ئەگەر هیچ شتێکم دەستنەکەوێ جگە لەخۆڵ و تەپۆتۆز، ئەوە شەڕی ئێوەی پێ دەکەم. پاشان هات بۆلای عەلی کوڕی ئەبو تالیب کە فاتیمەی لا بوو حەسەنیش منداڵ بوو لەبەردەست فاتیمە یاریی دەکرد. وتی: ئەی عەلی، تۆ خزم و قەومی و لەوانی تر لێمەوە نزیکتری، بۆ پێویستییەك هاتبووم بێ ئومێدانە مەمگێڕەوە، لای موحەممەدە تکام بۆ بکە. عەلی وتی: ئەی ئەبو سوفیان لەباردایکت بچی، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆ کارێك پێداگرە کە ناتوانین لەسەری قسەی لەگەڵدا بکەین. لای کردەوە بەلای فاتیمەدا و وتی: ناتوانی ئەم کوڕەت بکەیتە تکاکار و بەوە تاوەکو

ئاخر زەمان گەورەی عەرەب بێ؟ فاتیمە وتی: سوێند بەخوا کوڕەکەم نابێتە ئەوەی تۆ باسی دەکەی و هیچ کەسێ نابێتە تکاکار لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم).

ئەبو سوفیان وتی: ئەی باوکی حەسەن، ئەبینم دۆخەکەم بەسەردا سەخت هاتووەتەوە، ئامۆژگاریم بکە چی بکەم؟ وتی: سوێند بەخوا هیچ شتێك نازانم پێتی بڵێم و سوودت پێ بگەیەنێ، بەڵام تۆ گەورەی نەوەی کینانەی، هەڵسە داوای سەلامەتیی خەڵك بکە و خۆت بگەیەنە خاکی خۆت. وتی: شتی تر، رێگەی تر نییە؟ وتی: نە سوێند بەخوا شتی تر نازانم، تەنیا ئەو رێگەیە دەزانم کە پێم وتی. ئەبو سوفیان لەنێو مزگەوت هەڵسا و وتی: ئەی خەڵکینە سەلامەتیی لەئێوە دەخوازم، پاشان سەرکەوتە سەر وشترەکەی و دەرچوو.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی بەخەڵك کرد ئامادەسازبن، فرمانی کردە خێزانەکانی ئامادەسازبن. ئەبو بەکر چووە لای عائیشەی کچی(خوای لێ رازیی بێ) کە هەندێ شتی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی ئامادە دەکرد. وتی: کچە شیرینەکەم، ئایە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی پێکردوون ئامادەی بکەن؟ وتی: بەڵێ. تۆش ئامادە بە. وتی: نیازی کوێی هەیە؟ وتی: واللە نازانم. پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەخەڵکی فەرموو نیازی چی شوێنێکی هەیە و فەرمووی:"من بەرەو مەککە دەڕۆم. فرمانی کرد خێرا بکەن و ئامادەسازبن و فەرمووی:"اللَّهُمَّ خُذِ الْعُيُونَ وَالْأَخْبَارَ عَنْ قُرَيْشٍ حَتَّى نَبْغَتَهَا فِي بِلَادِهَا"،واتا: خوایە گیان چاوساغ و سیخوڕەکانی قورەیش سەرگەردان بکەی و بێ ئاگابن تاوەکو لەوڵاتی خۆیدا بچینە سەر قورەیش. خەڵکیی ئامادەسازبوون.

پاشان بەڕێکەوت تاوەکو دابەزیە (مَرَّ الظهران) و دە هەزار جەنگاوەری لەگەڵ بوو، خوای گەورە سیخوڕ و چاوساغەکانی قورەیشی نابیناکرد تاوەکو بزانن چی رووی داوە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کردە سوپا ئاگر بکەنەوە، دە هەزار کەس هەریەکە و ئاگرێکی کردەوە و عومەری کوڕی خەتابیشی کردە سەرپەرشتیاری پاسەوانەکان(خوای لێ رازیی بێ).

عەباس سەرکەوتەسەر (البیضاء)ئێسترەکەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، دەرچوو بەڵکو هەندێ سووتەمەنیی پەیدا بکات یان یەکێك بدۆزێتەوە هەواڵ بەقورەیش بدات تاوەکو دەربچن و داوای سەلامەتیی لەپەیامبەری خوا بکەن پێش ئەوەی بەزەبری هێز بچێتە مەککەوە. وتی: سوێند بەخوا من بەرەو دۆزینەوەی ئەو کەسە دەچم، چونکە گوێبیستی قسەی ئەبو سوفیان و بودەیلی کوڕی وەرقاء بوو کە دەگەڕانەوەو ئەبو سوفیان ئەیووت: هەرگیز نمونەی ئەم شەوەم نەبینیووە لەبلێسەی ئاگر و سەربازگە. بودەیلیش ئەیووت: سوێند بەخوا ئەمە خوزاعەیە گڕی جەنگی گرتووە. ئەبو سوفیانیش ئەیووت: خوزاعە کەمتر و سەرکزترە لەوەی ئەوەندە ئاگر و سەربازگەی هەبێ. ئەڵێ: دەنگەکەیم ناسیەوە، وتم: ئەی ئەبو حەنزەلە. ئەویش دەنگی منی ناسیەوە وتی: ئەبو ئەلفەزڵ؟ وتم: بەڵێ. وتی: ئەوە چییە دایك و باوکم بەفیدات بێ؟ وتم: ئەوە پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ سوپاکەیدا، سوێند بەخوا بەیانی چی بەیانییەك ئەبێ بۆ قورەیش.

وتی: چارە چییە دایك و باوکم بەفیدات بێ؟ وتم: سوێند بەخوا ئەگەر دەستی پێت بگات لەگەردنت دەدات، لەپشتمەوە لەسەر ئەم ئێسترە سەرکەوە تاوەکو بتبەمە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و سەلامەتییت بۆ وەربگرم. ئەبو سوفیان لەپشتمەوە سەرکەوت و دوو هاوڕێکەی گەڕانەوە. هێنام بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، بەلای هەر ئاگرێکی موسڵمانانەدا تێدەپەڕین ئەیانوت: ئەمە کێیە؟ کە ئەیانبینی ئێسترەکەی پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم) و منیشی لەسەرم، ئەیانووت: مامی پەیامبەری خوایە و لەسەر ئێسترەکەی

پەیامبەری خوایە. هەتا ئەوەی بەلای ئاگری عومەری کوڕی خەتابدا تێپەڕبووین وتی: ئەمە کێیە؟ هەڵسا هات بۆلام، کە بینی ئەبو سوفیان لەپشتەوە سوار بووە وتی: ئەمە ئەبو سوفیانی دوژمنی خوایە؟ سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەبێ هیچ پەیمان و بەڵێنێك کەوتیتە بەردەستمان، پاشان دەرچوو بەتووندیی بەرەو لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، منیش ئێسترەکەم تاودا و پێشکەوتم و لەسەر ئێسترەکە خۆمم فڕێ دا بۆ چوونە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و عومەریش هاتەژوورەوە وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەمە ئەبو سوفیانی دوژمنی خوایە، بهێڵە لەگەردنی بدەم. منیش وتم: ئەی پەیامبەری خەوا(صلی الله علیه وسلم) من پەنام داوە و سەلامەتییم پێ داوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"اذْهَبْ بِهِ يَا عباس إِلَى رَحْلِكَ، فَإِذَا أَصْبَحْتَ فَأْتِنِي بِهِ"،واتا: ئەی عەباس لەگەڵ خۆتدا بیبە بۆلای کۆڵوبارەکەت، بەیانیی بیهێنەوە لام. منیش ڕۆیشتم. کە بەیانیی بوویەوە هێنام بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەبو سوفیانی بینی فەرمووی:"وَيْحَكَ يَا أبا سفيان! أَلَمْ يَأْنِ لَكَ أَنْ تَعْلَمَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ؟"،واتا: لەباردایکت بچی ئەی ئەبو سوفیان! بۆ تۆ ڕوون نەبووەتەوە کە هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە الله؟ وتی: دایك و باوکم بەفیدات بێ تۆ چەندە نەرم و نیان و بەڕێز و خزم دۆستی، ئەگەر جگە لە الله خوایەکی تر بوونی هەبووایە، ئەوە شتێکی بۆ دەکردم. فەرمووی:"وَيْحَكَ يَا أبا سفيان! أَلَمْ يَأْنِ لَكَ أَنْ تَعْلَمَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟"،واتا: ئەی ئەبو سوفیان لەباردایکت بچی!هێشتا بۆت ڕوون نەبووەتەوە من پەیامبەری خوام؟ ئەبو سوفیان وتی: دایك و باوکم بەفیدات بێ تۆ چەندە نەرم و نیان و بەڕێز و خزم دۆستی، سەبارەت بەمە لەدەروونما هێشتا شتێك ماوە. عەباس پێیووت: لەباردایکت بچی! موسڵمان بە و بڵێ اشْهَدْ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا

رَسُولُ اللّٰهِ پێش ئەوەی لەگەردنت بدرێ. موسڵمان بوو بەحەق شایەتومانی هێنا. عەباس وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئەبو سوفیان پیاوێکە حەزی بەشانازییە، شتێ لەوەی بۆ بکە. فەرمووی: "نَعَمْ،مَنْ دَخَلَ دَارَ أبي سفيان فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ أَغْلَقَ عَلَيْهِ بَابَهُ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ دَخَلَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ فَهُوَ آمِنٌ"،واتا: بەڵێ، هەرکەسێ چووە ماڵی ئەبو سوفیانەوە ئەوە سەلامەتە، هەرکەسێ دەرگای داخست سەلامەتە، هەرکەسێ چووە کەعبەوە سەلامەتە.

فرمانی کردە عەباس تاوەکو لەڕێگەی دەرچوونی نێو دۆڵەکە لای(خطم الجبل) ئەبو سوفیان رابگرێ تاوەکو سەربازانی خوا بەوێدا تێپەڕبن و بیانبینێ. هۆزەکان بەئاڵاکانی خۆیانەوە تێپەڕبوون، هەر هۆزێك تێپەڕ دەبوو ئەبو سوفیان ئەیووت: ئەی عەباس ئەمە هۆزی کێیە؟ ئەیوت: هۆزی سولەیم. ئەویش ئەیووت: من لەکوێ و سولەیم لەکوێ. پاشان هۆزێکی تر تێپەڕ دەبوو ئەیپرسی: ئەی عەباس ئەی ئەمانە کێن؟ ئەویش ئەیووت: موزەینە. ئەیووت: من لەکوێ و موزەینە لەکوێ. هەتا تەواوی هۆزەکان تێپەڕین، ئەو دەیپرسی: ئەمانە کێن؟منیش ئەموت ئەمە فلأنە و ئەوە فلأنە و ئەویش ئەیووت: من لەکوێ و فلأن لەکوێ، هەتاوەکو پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەکەتیبە سەوزەکەیدا کە کۆچەران و پشتیوانانی تێدا بوو تێپەڕی و تەنیا بەرگی ئاسنی لەسەریان دەبینی. وتی: سبحان الله ئەی عەباس ئەمانە کێن؟ وتم: پەیامبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ کۆچەران و پشتیواناندا. وتی: هیچ کاتێ تاقەت و توانای رووبەڕووبوونەوەی ئەمانەی نییە. پاشان ئەڵێ: ئەی ئەبو ئەلفەزڵ، سوێند بەخوا تاج و پادشایەتیی ئەمرۆی برازاکەت زۆر مەزنە. وتم: ئەی ئەبو سوفیان ئەمە پەیامبەرایەتییە. وتی: کەوابوو چاکترە. وتم: برۆ فریای قەومەکەت بکەوە.

ئەبو سوفیان ڕۆیشت تاوەکو بەدەنگی بەرز و هاوارەوە بانگی لەقورەیش کرد و وتی: ئەی قورەیش، ئەوە موحەممەدە وا هاتە سەرتان و توانای هیچتان نییە بەرانبەری، هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان سەلامەت دەبێ. وتیان: خوا بتکوژێ خانووەکەی تۆ جێگەی هەموومانی تێدا دەبێتەوە؟ وتی: هەرکەسێ دەرگاکەی دابخات سەلامەت دەبێ، هەرکەسێ بچێتە ماڵی خواوە سەلامەت دەبێ، بۆیە خەڵکییش بڵاوەیان لێکرد بۆ چوونە ماڵەکانیان و پەنابردن بۆ ماڵی خوا.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەڕێکەوت و لەسەرەوەی مەککەوە چووە مەککەوە، لەوێدا گومەزێکی بۆ دروست کرا، فرمانی کردە خالیدی کوڕی وەلید لەڕووی خوارەوە بچێتە مەککەوە، لەلای ڕاستی سوپاوە بوو، ئەبو عوبەیدەش فەرماندەی پیادەڕەوان و ئەوانە بوو کە چەکیان پێ نەبوو، بەخالید و ئەوانەی لەگەڵی بوون فەرمووی:"إِنْ عَرَضَ لَكُمْ أَحَدٌ مِنْ قُرَيْشٍ فَاحْصُدُوهُمْ حَصْدًا حَتَّى تُوَافُونِي عَلَى الصَّفَا"،واتا: ئەگەر هەرکەسێکی قورەیش هاتەسەر ڕێگەتان ئەوە بیکوژن تاوەکو لەسەر سەفا پێم دەگەنەوە. جا هەرکەسێ ڕووبەڕویان بووایەتەوە ئەیانکوشت.

ئاڵای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەئەلحەجون لای مزگەوتی(الفتح) چەقێندرا، پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و کۆچەران و پشتیوانان لەپاش و پێش و دەورووبەریەوە بەڕێکەوتن تاوەکو چوونە ماڵی خواوە، ماچی بەردە ڕەشەکەی کرد و سەلامی لێکرد و پاشان تەوافی کەعبەی کرد، کەوانێ لەدەستیدا بوو، بەدەورووبەری کەعبە و سەرەوەی سێسەد و شەست بت هەبوون، بەکەوانەکە دەیشکاندن و ئەیفەرموو:﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ **الإسراء: ٨١** ،واتا: بڵێ ئاینی ڕاست هات وە ئاینی ناحەق و بەتاڵ نەما و ڕۆیشت بەڕاستی بەتاڵ هەمیشە لە ناوچووە.

هەروەها ئەیفەرموو: ﴿ قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ ﴾ سبأ: ٤٩ ، واتا: (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم) بڵێ(ئاینی)ڕاست هات و بەتاڵ(نەما) و دروست نابێتەوە و دووبارە ناگەڕێتەوە.

بتەکان بەسەریەکدا دەشکان.

بەسەر وشترەکەیەوە تەواف دەکرد، ئەو ڕۆژە ئیحرامی نەکردبوو، تەنیا تەواف دەکرد، کە تەوافی تەواو کرد، بانگی عوسمانی کوڕی تەڵحەی کرد،کلیلی کەعبەی لێ وەرگرت، فرمانی کرد دەرگای بکەنەوە، دەرگاکەی کرایەوە و چووە ناوی و بینی کۆمەڵێ وێنەی تێدایە، وێنەی ئیبراهیم و ئیسماعیلی بینی دار و شتیان بەکارهێناوە بۆ دیاریکردنی چارەنووس، فەرمووی:"قَاتَلَهُمُ اللَّهُ وَاللَّهِ إِنِ اسْتَقْسَمَا بِهَا قَطُّ"،واتا: خوا هاوبەش پەیداکەران بکوژێ ئەگەر رووی دابێ ئیبراهیم و ئیسماعیل ئەوەیان کردبێ. لەکەعبەدا کۆترێکی لەخورما دروستکراوی بینی و بەدەستی خۆی شکاندی، فرمانی کرد وێنەکان سڕدرانەوە.

پاشان دەرگای لەسەر خۆی و ئوسامە و بیلال داخست، رووی کردە ئەو دیوارەی کە روو بەدەرگاکەیە و لەنێوان خۆی و دیوارەکەدا سێ باڵ ماوە بوو، لەوێدا راوەستا و نوێژی کرد، پاشان بەکەعبەدا سووڕایەوە و لەهەموو لایەکانییەوە تەکبیرەی ئەکرد و یەکتاناسیی خوای ئەوتەوە، پاشان دەرگای کردەوە، قورەیشییەکانیش بەڕیز مزگەوتیان پڕ کردبوو دەیانڕوانی فرمانی چی شتێکیان لەسەر دەدات. چوارچێوەی دەرگاکەی گرت و ئەیفەرموو:" لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ، لَا شَرِيكَ لَهُ، صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، أَلَا كُلُّ مَأْثُرَةٍ أَوْ مَالٍ أَوْ دَمٍ، فَهُوَ تَحْتَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ إِلَّا سِدَانَةَ الْبَيْتِ وَسِقَايَةَ الْحَاجِّ، أَلَا وَقَتْلُ الْخَطَإِ شِبْهُ الْعَمْدِ السُّوطُ وَالْعَصَا، فَفِيهِ الدِّيَةُ مُغَلَّظَةً، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ أَرْبَعُونَ مِنْهَا فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا. يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ نَخْوَةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَتَعَظُّمَهَا بِالْآبَاءِ، النَّاسُ مِنْ آدَمَ

وآدَمُ مِنْ تُرَابٍ "،واتا: هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە الله، تەنیا و بێ هاوبەشە، بەڵێنی خۆی بەجێگەیاند، بەندەی خۆی سەرخست و بەتەنیا کۆمەڵ و دەستەکانی دۆڕاند، هەموو تۆڵەکردنەوە و سەروەت و خوێنێك لەژێر ئەم دوو قاچەمدایە جگە لەکلیلی کەعب و ئاودانە حاجیان، کوشتنی نیمچە ئەنقەست و کوشتن بەهۆی لێدانی قامچی و گۆچانەوە خوێنبایی توندی لەسەرە کە سەد وشترە. ئەی قورەیش بزانن کە خوای گەورە شکۆمەندیی سەردەمی نەفامی و گەورەڕاگرتنی باوباپیرانی بردن، هەموو خەڵکیی لەئادەمن و ئادەمیش لەگڵ دروست بووە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴾ **الحجرات: ١٣** ،واتا: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێر و مێیەك وە کردومانن بەچەند گەل و هۆزێکەوە تا یەکتری بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان زیاتر لەخودا دەترسێت، بێگومان خوا زانا و ئاگادارە.

پاشان فەرمووی:"يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ مَا تَرَوْنَ أَنِّي فَاعِلٌ بِكُمْ؟"،واتا: ئەی کۆمەڵی قورەیش چاوەڕوانیی چی لە من دەکەن؟ وتیان: چاوەڕێی چاکەت لێ دەکەین تۆ برایەکی بەڕێز و بەخشندە و برازایەکی بەڕێز و بەخشندەی. فەرمووی: من ئەوەتان پێ ئەڵێم کە یوسف بەبراکانی خۆی فەرموو: ﴿ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ ﴾ **یوسف: ٩٢** ،واتا: (یوسف)ووتی ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشت و تەشەرێکتان لەسەر نیە(لەلایەن منەوە).

بڕۆن ئێوە ئازادن.

## ٢٦-لەوانەی کوژران

کە فەتح جێی خۆی گرت و پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) سەلامەتیی دا بە هەموو خەڵك جگە لە نۆ کەس نەبێ، فرمانی کرد ئەو نۆ کەسە بکوژرێن ئەگەر خۆیان بە کەعبەشدا هەڵواسیبێ، ئەوانیش بریتی بوون لە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح و عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل و عەبدولعوزای کوڕی خەتەڵ و ئەلحاریسی کوڕی نوفەیلی کوڕی وەهەب و میقیەسی کوڕی صەبابە و هەبباری کوڕی ئەلئەسوەد و دوو ژنە رەشی گۆرانیبێژی کوڕی ئەختەڵ کە گۆرانیی داشۆرینیان بەپەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) دەچڕی و سارەی خزمەتکاری هەندێ لەبەنی عەبدولموتەلیب.

هەرچی کوڕی ئەبی سەرح بوو، ئەوە بووە موسڵمان، عوسمانی کوڕی عەفان هێنای و لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) داوای سەلامەتیی بۆ کرد و داواکەی قبوڵ کرد.

هەرچی عیکریمە بوو، ئەوە ژنەکەی سەلامەتیی بۆ وەرگرت دوای ئەوەی هەڵهاتوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) سەلامەتیی پێ دا و گەڕایەوەو بەجوانترین شێوە بووە موسڵمان.

کوڕی ئەختەڵ و ئەلحاریس و میقیەس و یەکێك لەو دوو ئافرەتە گۆرانیبێژە کوژران، میقیەس پێشتر موسڵمان بوو، دواتر لەئیسلام هەڵگەڕابوویەوەو چووە ریزی هاوبەش پەیداکەرانەوە، سەبارەت بەهەبری کوڕی ئەلئەسوەدیش، ئەوە بوو رێی بەزەینەبی کچی پەیامبەری خوا گرت کاتێ کۆچی کرد، تەنگی پێ هەڵچنی هەتاوەکو کەوتەسەر تاشەبەردێك و کۆرپەلەکەی لەبارچوو، هەڵهات پاشان بووە موسڵمان و بەجوانترین شێوە موسڵمان بوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) سەلامەتیی دا بەسارە و یەکێك لەو دوو ئافرەتە گۆرانیبێژە و هەردووکیان موسڵمان بوون.

لەبەیانیی ڕۆژی دوای فەتح، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەڵسا و بۆ خەڵك وتاری دا، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد بەو جۆرەی شایستە بەخوای گەورە بێ، پاشان فەرمووی:"يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ مَكَّةَ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ، فَهِيَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَلَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ فِيهَا دَمًا، أَوْ يَعْضُدَ بِهَا شَجَرَةً، فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ لِقِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقُولُوا: إِنَّ اللَّهَ أَذِنَ لِرَسُولِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ، وَإِنَّمَا حَلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وَقَدْ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالْأَمْسِ، فَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ"[1] ،واتا:ئەی خەڵکینە، ئەو ڕۆژەی خوای گەورە ئاسمانەکان و زەویی دروست کرد، مەککەی پیرۆز کرد هەتاوەکو ڕۆژی قیامەت، بۆ هیچ بەندەیەك کە باوەڕی بەخوا و ڕۆژی ئاخیرەتە حەڵاڵ نییە خوێنی تێدا بڕێژێ یان درەختێك ببڕێتەوە. ئەگەر کەسێك بەم شەڕەی پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ویستی شەڕی تێدا بکات، بڵێن: خوای گەورە مۆڵەتی ئەوەی بەپەیامبەرەکەی داوە و مۆڵەتی بە ئێوە نەداوە. تەنیا کاتژمێری ڕۆژێك ئەوەی بۆ حەڵاڵکردم، حەرامێتیی ئەمڕۆی گەڕایەوە و وەك چۆن لەدوێنێدا حەرام بوو، با ئەوەی لێرەدا ئامادەیە ئەم حوکمە بەوانە بگەیەنێ کە ئێستا لێرەدا ئامادە نین.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سریەکانی نارد بۆ سەر ئەو بتانەی دەورووبەری کەعبە، هەموویان شکێنران، لەوانە: لات و عوزا و مەنات، جاڕدەری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمەککە جاڕی دا:"هەرکەسێ باوەڕی بەخوا و ڕۆژی ئاخیرەت هەیە، هەر بتێکی لەماڵدا هەیە با بیشکێنێ".

---

[1] – بوخاری(٤٢٩٥) و موسلیم(١٣٥٤) ئیخراجیان کردووە.

## ٢٧-ئاماژەکردن بەو بابەتە فیقهییانەی لەم غەزوەدا هەیە

ئاشتەوایی حودەیبییە پێشەکی و دەستپێکی ئەم فەتحە گەورەیە بوو، چونکە ئەو ئاشتەوایییە ئارامیی هێنایە بوون و خەڵکیی بەبێ ترس لەئیسلامیان دەکۆڵییەوە، ئەو موسڵمانانەی لەمەککە بەنهێنیی موسڵمان بوون، توانییان موسڵمانبوونیان ئاشکرا بکەن و بانگەوازی بۆ بکەن و گفتوگۆی لەسەر بکەن، بەهۆیەوە زۆرێك کەس بوونە موسڵمان، لەبەر ئەوە خوای گەورە ناوی لێنا(الفتح): ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ ﴾ **الفتح: ١** ،واتا: (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ دایت(کە ڕێکەوتنی حودەیبییەیە).

لەبارەی حودەیبییەوە دابەزی. عومەر وتی: ئەی پەیامبەری خوا ئەوە فەتح بوو؟ فەرمووی:"بەڵێ"[١].

خوای گەورە دووبارەی دەکاتەوە کە ئەو ڕێکەوتنە، فەتح بووە و ئەفەرمووێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ ﴾ **الفتح: ٢٧** ،واتا: سوێند بە خوا بێگومان خوا ئەو خەوەی کە پێغەمبەرەکەی دیبوی بەڕاستی گێڕاو هێنایەدی کە(ووتبوی) دڵنیابن دەچنە ناو مزگەوتی حەرام(کەعبەی پیرۆز)بەوویستی خوا بە ئارامی و بێ ترس، سەرتان تاشیووە یان کورتان کردۆتەوە،(لەدوژمن) ناترسن، جا ئەوەی(خوا)دەیزانی ئێوە نەتان دەزانی(کە خێر لەڕێکەوتن دایە) وە جگە لە(چوونە مەککە)بڕیاری داوە سەرکەوتنێکی نزیك(بۆ ئێوە کە ڕێکەوتنی حودەیبییەیە).

---

[١] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٧٣٦).

ئەمە کاری خوای مەزنە، کە لەپێش کارە مەزن و گەورەکانەوە کۆمەڵێ پێشەکی و ڕێوشوێنی بۆ بسازێنێ تاوەکو بۆی ببێتە دەروازە و ئامادەپێدەر بێ.

**بەش**

**ئەمانەی تێدا دەبینرێت:**

- ئەگەر خەڵکانی پەیماندەر شەڕی کەسانێك بکەن کە لەئەستۆی پێشەوادان، ئەوە دەبێتە جەنگ بۆ پێشەوا و پەیمان و بەڵێنی لەنێوانیاندا نامێنێ، چونکە پەلاماری کەسانێکیان داوە پارێزگاری لێکردنیان لەئەستۆی پێشەوای موسڵمانانە.
- ئەگەر هەموویان بەو کارە ڕازیی بن و ڕەتی نەکەنەوە، ئەوە هەموویان بەهەڵوەشێنەری ئەو پەیمانە دادەنرێن.
- جائیزە لەگەڵ شەڕکەراندا ئاشتیی بکرێت بۆ ماوەی دە ساڵ.
- نێردراوی بێباوەڕان ناکوژرێت.
- جائیزە لەوڵاتی بێباوەڕاندا شەوبمێنیتەوە ئەگەر بانگەوازیان پێ گەیشتبێ.
- جائیزە کەسی سیخوڕ بکوژرێت ئەگەر موسڵمانیش بووبێت، لەبەر ئەوە بوو عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ ڕازیی بێ) داوای لەپەیامبەری خوا کرد(صلى الله عليه وسلم) کە ڕێگەی بدات حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە بکوژێت، چونکە حاتەب هەواڵی بۆ خەڵکی مەککە نارد، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەیفەرموو ناکوژرێت لەبەر ئەوەی موسڵمانە، بەڵکو فەرمووی:"تۆ چوزانی کە خوای گەورە بەئەهلی بەدری فەرمووە

چۆنتان بووێ وەها بکەن"[1] پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وەڵامی دایەوە، ئەوەی ڕێگرە حاتەب بکوژرێ، ئەوەیە بەشداری بەدر بووە.

- تاوانی گەورە جگە لەهاوبەش بڕیاردان بەچاکەی گەورە دەسڕدرێتەوە، هەروەك تاوانی ئەو سیخوڕییەی حاتەب بەبەشداربوونی لەبەدر سڕایەوە.
- جائیز و بەڵکو موستەحەبە لەبەردەم نێردراوی دوژمندا زۆریی و هێز و توانای موسڵمانان دەربخرێت ئەگەر نێردراوانی دوژمن هاتن بۆلای پێشەوای موسڵمانان، هەروەك چۆن پادشایانی ئیسلام ئەوە دەکەن، هەروەك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەشەوی چوونە مەککەوە فرمانی کرد ئاگر بکەنەوە و فرمانی بەعەباسیش کرد لای(خطم الجبل) ئەبو سوفیان ڕابگرێت، تاوەکو لەو تەنگەبەرییەدا سەربازانی ئیسلام ببینێ.
- جائیزە بۆ شەڕی موباح(ڕێپێدراو) بەبێ ئیحرام بچیتە مەککەوە.
- ڕاگەیاندنی ڕوون و ڕاشکاو بەوەی بەزەبری هێز مەککە فەتح کرا، هەروەك کۆڕای زانایان بۆ ئەوە دەچن، تەنیا شافیعی[2] و ئەحمەد لەبۆچوونێکدا پێچەوانەی ئەوەن.

شتێکی تری تێدایە ڕێگر بوو لەوەی دابەش بکرێت، چونکە ئەو شوێنە شوێنی خواپەرستی وماڵی پیرۆزی خوای گەورەیە و وەقفە لەلایەن خوای گەورەوە.

- هەروەها پێویستە ئەو کەسە بکوژرێت کە جنێوی بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دەدات، کوشتنی حەدێکە و دەبێ جێبەجێ بکرێت، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەلامەتیی نەدا بەمیقەیسی کوڕی صەبابە و کوڕی ئەختەڵ و ئەو دوو ژنە جاریەیەی کە بەداشۆرینی ئەو گۆرانییان دەوت، هەروەك دیارە ژنانی خەڵکانی شەڕکەر و منداڵیان ناکوژرێت.

---

[1] - بوخاری(٣٩٨٣) و موسلیم(٢٤٩٤) ئیخراجیان کردووە.
[2] - الأم للشافعي ٩/٢٥٨-٢٥٩.

## ٢٨-غەزوەی حونیەین کە ناودەبرێت بەغەزوەی ئەوتاس

دوو شوێنن لەنێوان مەککە و تائیف،ئەو شەڕە بەشوێنی ڕوودانەکەیەوە ناونراوە، هەروەها ناودەبرێت بەشەڕی هوازن، چونکە چەکدارانی هوازن بوون هاتن بۆ شەڕی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم).

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: کە هوازن ئەوەیان بیستەوە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) مەککەی فەتح کردووە و خوای گەورە سەرکەوتووی کردووە، مالیکی کوڕی عەوف ئەلنەسریی کۆیکردنەوە، لەگەڵ هوازندا تەواوی سەقیفیش کۆبوونەوە، موزەر و تەواوی جوشەم و سەعدی کوڕی بەکر و خەڵکانێکی نەوەی هیلال کە کەم بوون کۆبوونەوە. لەقەیسی عیلان تەنیا ئەو خەڵکە کۆبوونەوە، لەهوازنیشدا تەنیا کەعب و کیلاب ئامادە نەبوون، لەجەشمیشدا تەنیا دورەیدی کوڕی ئەلسسیمە ئامادە نەبوو کە پیاوێکی بەتەمەن بوو، بەڵام بۆچوون و شارەزایی بەشەڕ هەبوو، کەسێکی ئازاو ئەزموندار بوو، سەقیفیش دوو گەورەکەی و لەئەحلافیش قاربی کوڕی ئەلئەسوەد و لەنەوەی مالیکیش سەبیعی کوڕی ئەلحاریس و براکەی کە ئەحمەری کوڕی ئەلحاریس بوو، سەرپەرشتیاریی ئەو خەڵکە درایە دەست مالیکی کوڕی عەوف ئەلنەسری.

کە بەڕێکەوتن بۆ سەر پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، سەروەت و ژن و منداڵیشیان هێنا، کە دابەزیە ئەوتاس، خەڵکەکە لای کۆبوونەوە و دورەیدی کوڕی ئەلسسیمەشیان تێدا بوو، پێیووتن: وتی: چییە گوێم لەدەنگی وشتر و زەڕینی کەر و گریانی منداڵ و بارەی مەڕ و بزنە؟ وتی:مالیکی کوڕی عەوف ژن و منداڵ و مەڕەو ماڵاتیشی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا هێناوە. وتی: بۆچی؟ وتی: ئەمەوێ ئەو پیاوانەی لێرەن، شەڕی مان و نەمان بکەن لەبەر ژن و منداڵەکانیان. وتی: سوێند بەخوا تۆ شوانی مەڕی و لەم بوارە نەزانی، هیچ شتێك نییە مرۆڤی دۆڕاو

بگێڕێتەوە. ئەوەی سوود بەتۆ بگەیەنێ تەنیا پیاوێکە بەهۆی شمشێر و تیرەکەیەوە سوودت پێ دەگەیەنێ، ئەگەر لەم شەڕەشدا بدۆڕێی، ئەوە بەتیاچوونی کەسوکار و سەروەکەت شەرمەزار و ریسوا ئەبی. وتی: تۆ چووی بەتەمەندا و عەقڵیشت پیر بووە، ئەی هوازن سوێند بەخوا یان دەبێ گوێڕایەڵم بن، یان خۆم دەدەم بەسەر ئەم شمشێرەمدا تاوەکو لەپشتمەوە دەردەچێت. بۆیە ئەوەی وت، حەزی نەکرد دورەید لەو شەڕەدا بۆچوون و باسی هەبێ.

ئەوانیش وتیان: گوێڕایەڵییت دەکەین. دورەید وتی: ئەمە رۆژێکە لەژیانمدا نەمبینیووە.

پاشان مالیك بەخەڵکەکەی وت: ئەگەر ئەوانتان بینی، ئەوە کالانی شمشێرەکانتان بشکێنن و توند و تۆڵ وەك پەلاماردانی یەك کەس پەلامار بدەن.

کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەواڵی ئەوانی گوێ لێبوو، عەبدواللەی کوڕی ئەبی حەدرد ئەلئەسلەمیی نارده لایان، فرمانی پێ کرد بچێتە نێو ئەو خەڵکە و تیایاندا بمێنێتەوە تاوەکو بزانێ چییان دەوێ و پاشان هەواڵی ئەوانیان بۆ بهێنێ. کوڕی حەدرد رۆیشت و چووە نێویان هەتا زانیی بۆچی کۆبوونەتەوە، بۆی دەرکەوت کۆبوونەتەوە بۆ شەڕکردنی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و گوێبیستی مالیك لە هەوازن بوو کە نیازیان چیە، پاشان گەڕایەوە بۆ لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و هەواڵەکەی پێگەیاند.

کاتێك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سوپای بەڕێخست بۆ هوزان، بۆی باسکرا کە سەفوانی کوڕی ئومەیە کۆمەڵێ قەڵغان و چەکی هەیە، ئەگەرچی لەو کاتەدا سەفوان هاوبەش پەیداکەر بوو، هەواڵی بۆ نارد و فەرمووی:"يَا أبا أمية أعِرْنَا سِلَاحَكَ هَذَا نَلْقَى فِيهِ عَدُوَّنَا غَدًا"،واتا: ئەی ئەبو ئومەیە، چەکەکەتمان بەئەمانەت پێ بدە بەیانیی بۆ شەڕی دوژمنەکەمان دەوێ. ئەویش وتی: ئەمە

بەزۆرە ئەی موحەممەد؟ فەرمووی:"بَلْ عَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ حَتَّى نُؤَدِّيَهَا إِلَيْكَ"[1]،واتا: نەخێر، بەڵکو بەئەمانەت و پارێزراوییەوە بۆت دەیگێڕینەوە. وتی: بۆ ئەمە کێشەیەك نییە. سەد قەڵغانی دا بەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەوەی پێویستی بوو[2].

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: لەجابری کوڕی عەبدوللەوە وتی: کە گەیشتینە سەرەتای دۆڵی حونەین، لاماندایە دۆڵێك لەدۆڵەکانی تیهامە، بەرەو خوارەوە دەچووین، لەتاریکایی بەربەیاندا بوو، بەڵام ئەوان پێش ئێمە گەیشتبوونە ئەو دۆڵە و لەو شوێنە و بەرتەسکاییەکانیدا بۆسەیان دانابوو، سوێند بەخوا وەك پەلاماردانی یەك پیاو پەلاماریان داین، کەس نەیدەپرژا بەسەر ئەوی تردا، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لای دایەوە لای راست و فەرمووی:"إِلَى أَيْنَ أَيُّهَا النَّاسُ؟ هَلُمَّ إِلَيَّ، أَنَا رَسُولُ اللَّهِ، أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ"،واتا: ئەی خەڵکینە بەرەو کوێ دەچن؟ وەرن بۆلای من، من موحەممەدی کوڕی عەبدوللەم.

چەند کەسێکی پشتیوانان و کۆچەران و بنەماڵەکەی لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) مابوونەوە، لەوانەی لەکۆچەران لای مابوونەوە، ئەبو بەکر و عومەر بوون، لەبنەماڵەکەشی عەلی و عەباس و ئەبو سوفیانی کوڕی ئەلحاریس و کوڕەکەی و فەزڵی کوڕی عەباس و رەبیعەی کوڕی ئەلحاریس و ئوسامەی کوڕی زەید و ئەیمەنی کوڕی ئوم ئەیمەن بوون، ئەیمەن ئەو رۆژە کوژرا[3].

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: لەعەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە، وتی:من لەگەڵ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)دا بووم، جڵەوی ئێسترەکەیم گرتبوو، پیاوێکی چوارشانە و دەنگ گڕ بووم، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە بینی ئەو

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٥٦٢).

[2] – بروانە: سیرة ابن هشام٢/٤٣٧–٤٤٠.

[3] – بروانە: سیرة ابن هشام٢/٤٤٢–٤٤٣.

خەڵكە چۆن شپرز بوون، فەرمووی:"إِلَى أَيْنَ أَيُّهَا النَّاسُ؟"،واتا: ئەی خەڵكینە بۆ كوێ؟ بینی كەس ئاگای لەهیچ نەماوە، بۆیە فەرمووی:"يَا عباس اصْرُخْ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، يَا مَعْشَرَ أَصْحَابِ السَّمُرَةِ"،واتا: ئەی عەباس هاوار بكە ئەی كۆمەڵی پشتیوان، ئەی كۆمەڵی هاوەڵان. ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: بەفیدات بین بەفیدات بین. خۆیان كۆكردەوە و خۆیانیان گەیاندە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم). كە سەد كەس لای كۆبوویەوە، دەستیان كردە شەڕكردن. یەكەمین بانگەوازێك: ئەی پشتیوانان بوو، دواتر: ئەی خەزرەج. لەشەڕدا خۆڕاگربوون، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەیڕوانی و كە بینی شەڕ گەرم بوو، فەرمووی:"ئا ئێستا ئەوتاس گڕی گرتووە"[1].

كەسانی تر ئەمەشیان زیاتر كردووە:

أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبَ

أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ[2]

واتا: من پەیامبەرم و درۆش نییە، من كوڕی عەبدولموتەلیبم.

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە: پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) كۆمەڵێ وردە چەو و بەردی هەڵگرت و هاوێشتی بەدەموچاوی بێباوەڕاندا و پاشان فەرمووی:"انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ"،واتا: دۆڕان بەپەروەردگاری موحەممەد. هەر بۆیانی دەهاوێشت هەتاوەكو وەهایان لێهات پێشەوەی خۆیانیان نەدەبینی و هەڵدەهاتن[3].

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ[4]: كە هاوبەش پەیداكەران دۆڕاند، ڕۆیشتن بۆ تائیف و مالیكی عەوفیشیان لەگەڵ بوو، هەندێكیان لەئەوتاس سەربازگەیان كردەوە، هەندێكیشیان

---

[1] - بڕوانە: سيرة ابن هشام٢/٤٤٤-٤٤٥.

[2] - بوخاری(٢٨٦٤) و موسلیم (١٧٧٦) ئیخراجیان كردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی كردووە(١٧٧٥).

[4] - بڕوانە:سيرة ابن هشام٢/٤٥٣.

روویان کردە نەخلە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەبو عامری ئەشعەریی نارد بەشوێن ئەوانەی روویانکردە ئەوتاس. لەوانەی دۆڕابوون و روویانکردبووە ئەوێ شەڕیان کرد هەتاوەکو ئەبو عامر بەتیرێك کوژرا، ئەبو موسای ئەشعەریی ئالاکەی هەڵگرت کە برازای ئەبو عامر بوو، شەڕی کرد هەتاوەکو خوای گەورە بەسەر ئەو هاوبەش پەیداکەرانەدا سەریخست، بکوژی ئەبو عامری کوشت، دواتر پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأبي عامرٍ، وَاجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ"،واتا: خوایە گیان لەئەبو عامر خۆش بە و لەرۆژی قیامەتدا بیخەرە سەرەوەی زۆرێك لەمەخلوقاتی خۆت، داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەبو موساش کرد[1].

مالیکی کوڕی عەوف رۆیشت تاوەکو لەقەلایەکی سەقیف خۆی قایم کرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کرد سەبایە و دەسکەوتەکان کۆبکرێنەوە، هەموو ئەوانە کۆکرانەوە و بەرێیخستن بۆ جیعرانە، شەش هەزار سەبایە و بیست و چوار هەزار وشتر و زیاتر لەچل هەزار سەر مەڕ و چوار هەزار ئوقیەی زیوو بوو، دوای دە شەو و شتێك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەو شتانەی دابەشکرد بەسەر موسڵماناندا و بەشی دڵڕاگیراوانیشی(الْمُؤَلَّفَةَ قُلُوبُهُمْ) دا، لەسەرەتای بەشەکانی تردا بەشی ئەوانی دا.

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ[2]: لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ئەڵێ: کە پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو دەسکەوتانەی دابەشکرد بەسەر قورەیش و هۆزەکانی عەرەب و هیچ شتێکی بەپشتیوانان نەدا، ئەمە لای پشتیوانان گران بوو، هەتا ئەوەی ورتە ورتیان زۆرتر بوویەوە و یەکێکیان وتی: سوێند بەخوا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەقەوم و کەسی خۆی گەیشتەوە. سەعدی کوڕی عوبادە رۆیشت بۆلای

---

[1] - بوخاری(٤٣٢٣) و موسلیم(٢٤٩٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بڕوانە: سيرة ابن هشام٢/٤٩٨-٥٠٠.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، بەو دەسکەوتانەی دابەشت کرد و پشکی پشتیوانانت نەدا، قەومەکەم شتێکیان لەدڵدا بۆ دروست بووە، پشکی گەورەت بەقەومی خۆت و هۆزەکانی عەرەب دا و پشتیوانان هیچ شتێکیان بۆ نەبوو. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"ئەی تۆ چی ئەڵێی ئەی سەعد؟". سەعد وتی: ئەی پەیامبەری خوا منیش یەکێکم لەقەومەکەم. فەرمووی:"ئا لەم شوێن و دەشتەدا قەومەکەتم بۆ کۆبکەرەوە". تەنیا پشتیوانان لەو شوێنەدا کۆبوونەوە و خەڵکانی تر لەوێ هەڵسان.

کە کۆبوونەوە، سەعد هات و وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وا کۆمەڵی پشتیوانانم بۆت کۆکردەوە. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هات بۆلایان و سوپاس و ستایشی شایستە بەخوای گەورەی فەرموو، پاشان فەرمووی:"يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، مَا قَالَةٌ بَلَغَتْنِي عَنْكُمْ، وَجِدَةٌ وَجَدْتُمُوهَا فِي أَنْفُسِكُمْ، أَلَمْ آتِكُمْ ضُلَّالًا فَهَدَاكُمُ اللَّهُ بِي، وَعَالَةً فَأَغْنَاكُمُ اللَّهُ بِي، وَأَعْدَاءً فَأَلَّفَ اللَّهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ؟!"،واتا: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، پێمگەیشتووە کە شتتان لەدڵدا بۆ دروست بووە، ئاخۆ ئێوە گومڕا نەبوون، خوای گەورە بە من هیدایەتی ئێوەی دا، هەژار بوون بە من دەوڵەمەندی کردن، دوژمنی یەك بوون خوای گەورە کردنی بەبرای یەکتر و هۆگری یەکتری کردن؟! وتیان: بەڵێ، خوا و پەیامبەرەکەی خاوەن منەت و فەزڵن بەسەرمانەوە. پاشان فەرمووی:"أَلَا تُجِيبُونِي يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ؟"،واتا: ئاخۆ وەڵامم دەدنەوە ئەی کۆمەڵی پشتیوانان؟ وتیان: بەچی وەڵامت بدەینەوە ئەی پەیامبەری خوا، فەزڵ و منەت هی خوا و پەیامبەرەکەیەتی.

فەرمووی:"أَمَا وَاللَّهِ لَوْ شِئْتُمْ لَقُلْتُمْ، فَلَصَدَقْتُمْ وَلَصُدِّقْتُمْ: أَتَيْتَنَا مُكَذَّبًا فَصَدَّقْنَاكَ، وَمَخْذُولًا فَنَصَرْنَاكَ، وَطَرِيدًا فَآوَيْنَاكَ، وَعَائِلًا فَآسَيْنَاكَ، أَوَجَدْتُمْ عَلَيَّ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ

فِي أَنْفُسِكُمْ فِي لُعَاعَةٍ مِنَ الدُّنْيَا، تَأَلَّفْتُ بِهَا قَوْمًا لِيُسْلِمُوا، وَوَكَلْتُكُمْ إِلَى إِسْلَامِكُمْ، أَلَا تَرْضَوْنَ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاءِ وَالْبَعِيرِ، وَتَرْجِعُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ إِلَى رِحَالِكُمْ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَمَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ، وَلَوْلَا الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَءًا مِنَ الْأَنْصَارِ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ شِعْبًا وَوَادِيًا، وَسَلَكَتِ الْأَنْصَارُ شِعْبًا وَوَادِيًا لَسَلَكْتُ شِعْبَ الْأَنْصَارِ وَوَادِيَهَا، الْأَنْصَارُ شِعَارٌ وَالنَّاسُ دِثَارٌ، اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْأَنْصَارَ، وَأَبْنَاءَ الْأَنْصَارِ، وَأَبْنَاءَ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ "،واتا:سوێند بەخوا ئەگەر ئەمە بڵێن ئەوە راست دەکەن و بەڕاستیش دەخرێنەوە ئەگەر ئێوەش بڵێن: تۆ کە هاتی بۆلای ئێمە خەڵك تۆیان بەدرۆ دەزانی، ئێمە تۆمان بەڕاست زانی، پشتت تێکرابوو ئێمە بووینە پشتیوانت، دەرکرابووی ئێمە دالدەمان دای، دڵشکاو بووی ئێمە دڵمان دایتەوە، ئەی پشتیوانان ئێوە لەسەر لیکی دونیا لەدەروونتاندا بەرانبەر بە من شت دروست بووە، من ئەوەم بەخەڵکێ داوە تاوەکو ببنە موسڵمان، ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئایە رازیی نابن خەڵکیی بەمەڕ و وشترەوە بگەڕێنەوە و ئێوەش بەپەیامبەری خواوە بگەڕێنەوە بۆلای کۆڵوبارەکانتان، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەوەی ئێوە پێی دەگەڕێنەوە باشترە لەوەی ئەوان پێی دەگەڕێنەوە. ئەگەر هیجرەت نەدەبوو ئەوە یەکێك دەبووم لەپشتیوانان، ئەگەر خەڵکیی بەدۆڵێکدا بچن و پشتیوانانیش بەدۆڵێکی تردا، ئەوە من دۆڵی پشتیوانان دەگرمەبەر، پشتیوانان بەرگی پارێزەری جەستەن کە نزیکترن بەپەیامبەری خوا،خەڵکییش بەرگی سەرووترن، خوایە گیان بەزەییت بەپشتیوانان و منداڵی پشتیوانان و منداڵی منداڵانی پشتیوانانیدا بێتەوە.

ئەڵێ: ئەو خەڵکە گریان تاوەکو ریشیان تەڕبوو، وتیان: ئێمە رازیین بەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەپشکی ئێمە بێ، پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رۆیشت و ئەوانیش بڵاوەیان لێکرد[1].

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٥٠٦).

**بەش**

شاندی هوازن هاتن بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە چواردە پیاو بوون و بەسەرۆکایەتی زوهەیری کوڕی سرد، ئەبو برقانی مامی شیریی پەیامبەری خوایان لەگەڵبوو، داوایان کرد بەپێدانەوەی سەبایە و سەروەتەکان منەتیان بخاتەسەر، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ مَعِي مَنْ تَرَوْنَ، وَإِنَّ أَحَبَّ الْحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَأَبْنَاؤُكُمْ وَنِسَاؤُكُمْ أَحَبُّ إِلَيْكُمْ، أَمْ أَمْوَالُكُمْ؟"،واتا: ئەبینن ئەو خەڵکەم لەگەڵە و منیش بەشم کردوون بەسەریاندا، کامەتان بەلاوە خۆشەویسترە پێتان بدرێتەوە، ژن و منداڵتان یان سەروەتەکەتان؟ وتیان: ئێمە ژن و منداڵمان بەهیچ شتێکی تر بەراورد ناکەین، فەرمووی:"إِذَا صَلَّيْتُ الْغَدَاةَ فَقُومُوا فَقُولُوا: إِنَّا نَسْتَشْفِعُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْمُؤْمِنِينَ وَنَسْتَشْفِعُ بِالْمُؤْمِنِينَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – أَنْ يَرُدُّوا عَلَيْنَا سَبْيَنَا"،واتا: ئەگەر نوێژی بەیانییمان کرد، ئێوە هەڵسن بڵێن: بەتکای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داوا لەباوەڕداران دەکەین و بەتکای باوەڕدارانیش داوا لەپەیامبەری خوا دەکەین سەبایەکانمان بۆ بگێڕنەوە.

کە نوێژی بەیانیی کرا و هەڵسان و ئەوەیان وت، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"أَمَّا مَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَهُوَ لَكُمْ، وَسَأَسْأَلُ لَكُمُ النَّاسَ"،واتا: ئەوەی بۆ من و نەوەکانی عەبدولموتەلیب بووە ئەوە ئەتاندەمەوە، بۆ ئەوی تر لەخەڵکیی داواتان بۆ دەکەم.

کۆچەران و پشتیوانان وتیان:ئەوەی بۆ ئێمە بووە وا ئەیدەینە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم). ئەقرەعی کوڕی حابس وتی: بەشی خۆم و نەوەی تەمیم نادەینەوە. عویەینەی کوڕی حصن وتی: بەشی خۆم و فزارە نادەینەوە. عەباسی کوڕی مرداس وتی: من و نەوەی سولەیمیش نایدەین، بەڵام نەوەی سولەیم وتیان:

ئەوەی بەشی ئێمە بووە بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم). عەباسی کوڕی مرداس وتی:ئێوە منتان شەرمەزار کرد. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ هَؤُلَاءِ الْقَوْمَ قَدْ جَاءُوا مُسْلِمِينَ، وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ سَبْيَهُمْ، وَقَدْ خَيَّرْتُهُمْ فَلَمْ يَعْدِلُوا بِالْأَبْنَاءِ وَالنِّسَاءِ شَيْئًا، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ فَطَابَتْ نَفْسُهُ بِأَنْ يَرُدَّهُ فَسَبِيلُ ذَلِكَ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَسْتَمْسِكَ بِحَقِّهِ فَلْيَرُدَّ عَلَيْهِمْ وَلَهُ بِكُلِّ فَرِيضَةٍ سِتُّ فَرَائِضَ مِنْ أَوَّلِ مَا يَفِيءُ اللَّهُ عَلَيْنَا"،واتا: ئەمانە بەموسڵمانێتیی هاتوونەتە لای من، ئەوانم سەرپشك کرد، ژن و منداڵیان بەهیچ شتێکی نەگۆڕییەوە، هەرکەسێ ژن و منداڵی ئەمانی بەرکەوتووە و بەدڵەوە دەیگێڕێتەوە بیگێڕێتەوە، هەرکەسێکیش ئەیەوێ پشکی خۆی بپارێزێ، با ئەوەیان بۆ بگێڕێتەوە و بەرانبەر بەهەر کەسێك زگ و زای شەش جاری بۆ ئەبێ.

خەڵکەکە وتیان: ئێمە بەدڵەوە بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەیگێڕینەوە. پەیامبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"إِنَّا لَا نَعْرِفُ مَنْ رَضِيَ مِنْكُمْ مِمَّنْ لَمْ يَرْضَ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ"،واتا: ئێمە نازانین کامەتان رازیین و کامەتان ناڕازیین، بگەڕێنەوە و گەورەکانتان بۆچوونی ئێوەمان بۆ بهێنێ.

ئەوانیش ژنان و مناڵەکانیان گەڕاندەوە و پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) هەر سەبایەیەك بەرگێکی قیپتیی کردە بەری.

## ٢٩-ئاماژەدان بەهەندێ لەو بابەتە فیقهی و حیکمەتانەی لەو شەڕەدا هەبوون

خوای گەورە بەڵێنی بەپەیامبەرەکەی دابوو، کە بەڵێنی راستگۆیانەیە،بەڵێنی پێ دابوو کە مەککەی فەتح کرد، خەڵکیی بەکۆمەڵ کۆمەڵ دێنە نێو ئایینەکەیەوە، تەواوی عەرەبی بۆ ملکەچ کرد. کە فەتحی روون هاتەدی، حیکمەتی خوا وەها بوو

دڵی هوازن و شوێنکەوتەکانی رەق بین بۆ سەر ئیسلام و ئامادەسازین بۆ شەڕی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان، ئەوەش تاوەکو فرمانی خوا و شکۆدارکردنی پەیامبەرەکەی و سەرخستنی ئایینەکەی دەربخات، تاوەکو دەسکەوتەکانیان ببێتە سوپاسێك بۆ ئەهلی فەتح، تاوەکو خوای گەورە پەیامبەری بەندەی خۆی پیشانی ئەو هێزە گەورەیە بدات کە موسڵمانەکان نمونەیان نەبینیبوو، جارێکی تر هیچ عەرەبێك نەتوانێ رووبەڕوویان ببێتەوە، تاوەکو زۆرێك حیکمەتی تر کە بۆ ئەوانە دەرکەوێ کە لێی رادەمێنن.

حیکمەتی خوای گەورە وەهای پێویست کرد، سەرەتا تاڵیی شکست بداتە موسڵمانان سەرباری زۆریی رێژە و تفاقیان، ئەوان بەهۆی فەتحەوە سەریان بەرزکردبووەوە و وك پەیامبەری خوایان نەکرد کە چووە مەککەوە سەری نزم کردبووەوە وەخت بوو چەناگەی لەزینی وشترەکەی بدات وەك ملکەچییەك بۆ گەورەیی خوای گەورە، بەوەی حەرەمی پیرۆزی بۆ حەلاڵکرد کە لەپێشتر و دواتردا بۆ هیچ کەسێکی حەلاڵ نەکردووە، تاوەکو خوای گەورە روونی بکاتەوە بۆ ئەو کەسەی ئەیووت: ئەمڕۆ بەهۆی ژمارە کەمییەوە ناشکێین. بێگومان سەرکەوتن هەمیشە لای خوای گەورەیە، بیەوێ هەرکەسێ سەرکەوێ، ئەو کەسە دۆڕانی بەسەر نایەت، هەرکەسێکیش بدۆڕێنێ سەرخەرێکی بۆ پەیدا نابێ. ئەوە خوای گەورە بوو سەرکەوتنی ئایین و پەیامبەرەکەی هێنایەدی نەك ئەو زۆریەتان کە پێی سەرسام بوون، ئەو زۆرییە هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ، بۆیە هەڵهاتن، کە دڵیان شکا، ئەم ئایەتەی بۆیان نارد و دڵیانی راگرت:﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمۡ تَرَوۡهَا ﴾ **التوبة: ٢٦** ،واتا: لەپاش ئەوە خوا ئارامی خۆی نارد بۆ سەر پێغەمبەرەکەی و بۆ سەر بڕواداران وە سەربازانێکی(لەئاسمانەوە)ناردە خوارەوە کە ئێوە نەتاندەبینین.

حیکمەتی خوا وەهای پێویست کرد، سەرکەوتن و دەسکەوتەکان بداتە شکاوەکان:
﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾ **القصص: ٥ – ٦** ،واتا: ئێمە دەمانەوێت(بەچاکەی خۆمان) منەت بنێین بەسەر ئەوانەی کە لاواز و ژێر دەستکرابوون لەووڵاتی(میصر)دا وە بیان کەینە پێشەواو بیان کەینە میراتگرانی(فیرعەون و و شوێنکەوتوانی). وە دەسەڵاتداریان بکەین لەو زەویەدا وە نیشانی فیرعەون و هامان و لەشکری هەردووکیان بدەین لە(بەنو ئیسرائیلی یەکانەوە) ئەوەی خۆیان لێ دەپاراست.

لەوانە: خوای گەورە کە ڕێگریی کرد دەسکەوتەکانی مەککە بەسوپا بدرێت و هیچ دەسکەوتێکیان لەو شارە بۆ نەبوو نە لەئاڵتوون و نە لەزیوو و سەبایە و زەوی و سوپاش پێویستی بەهۆکارەکانی هێز هەبوو، خوای گەورە دڵی هاوبەش پەیداکەرانی جوڵاند تاوەکو شەڕی موسڵمانان بکەن، ئەوەی خستە دڵیانەوە سەروەت و سامانیان دەربکەن و ئەوە ببێتە بەش و ڕێزی سەربازانی خۆی و سەرکەوتن بەسەر ئەوانەدا بەموسڵمانان بدات.

لەوانە: خوای گەورە بەشەڕی بەدر، شەڕی عەرەبی دەستپێکرد، بەشەڕی حونەینیش کۆتایی پێهێنا، بۆیە هەردوو شەڕ بەزیکر(یاد)کۆکراوەتەوە و ئەوترێ: بەدر و حونەین، ئەگەرچی حەوت ساڵیان نێوان بوو، فریشتەکان لەو دوو شەڕەدا شان بەشانی موسڵمانان شەڕیان کرد، لەهەردوو شەڕدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وردە بەرد و خۆڵی پرژاند بەدەموچاوی هاوبەش پەیداکەراندا. بەو دوو شەڕە، پشکۆی عەرەب دامرکایەوە کە جارێکی تر بیانەوێ شەڕی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان بکەن. شەڕی یەکەم کە بەدر بوو، توونديی و هێزی عەرەبی شکاند، شەڕی دووەمیش کە حونەین بوو، هێزیانی نەهێشت و

گردبوونەوەیانی سەرکز کرد، هیچ ڕێگەیەکی بۆیان نەهێشتەوە ناچار موسڵمان بوون نەبێ.

لەوانە: خوای گەورە بەو شەڕە، دڵی خەڵکی مەککەی ڕاگرتەوە، خۆشحاڵی کردن بەو سەرکەوتن و دەسکەوتەی دەستیان کەوت، دەرمانی شکانیان بوو، هەروەها بەوەی شەڕ و خراپەی هوازنی لەسەریان هەڵگرت.

ئەو بابەتە فیقهییانەی لەو شەڕەدا هەبوو: ئەوەیە، پێویستە پێشەوای موسڵمانان چاوساخ و سیخوڕ ڕەوانە بکات و بچێتە نێو دوژمن تاوەکو هەواڵیان بۆ بهێنێ، ئەگەر پێشەوا بۆی دەرکەوت دوژمن هێزی کۆکردووەتەوە و نیازی شەڕی هەیە، نابێ دابنیشێ و چاوەڕوانیی بکات، بەڵکو بۆیان بەڕێکەوێ هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەڕێکەوت بۆ سەر هوازن تاوەکو لەحونەیندا پێیان گەیشت.

لەوانە: جائیزە پێشەوای موسڵمانان چەك و تفاقی هاوبەش پەیداکەران بەکرێ و بەئەمانەت وەربگرێ بۆ شەڕی دوژمنان، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) قەڵغانەکانی سەفوانی بەکرێ وەرگرت، لەو ڕۆژەدا سەفوان هاوبەش پەیداکەر بوو، جارێ موسڵمان نەبوو.

لەوانە: یەکێك لەتەواوێتی پشت بەستن بەخوای گەورە، بەکارهێنانی ئەو هۆکارانەیە کە خوای گەورە دایناوە بۆ هێنانەدیی ئەو کارە لەڕووی قەدەر و شەرعەوە، پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چووە مەککەوە و کڵاوی ئاسنین لەسەری بوو، لەکاتێکدا خوای گەورە پێی فەرموو:﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ ﴾ **المائدة: ٦٧** ، واتا:خوا تۆ دەپارێزێ لەخەڵکی(کە بتکوژن).

لەوانە: لێبووردنی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەو کەسەی ویستی بیکوژێ، نەیکوشت، بەڵکو بۆی پاڕایەوە و دەستی بەسەر سنگیدا هێناوە و وەهای لێکرد وەك ئەوەی دۆستێکی خۆشەویستی بێ.

لەوانە: جائیزە پێشەوای موسڵمانان لەدابەشکردنی دەسکەوتەکاندا چاوەڕێی موسڵمانبوونی بێباوەڕان بکات و ببنە موسڵمان، بەوە دەسکەوت و سەبایەکانیان بگێڕێتەوە بۆیان.

لەوانە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"مَنْ لَمْ يُطَيِّبْ نَفْسَهُ، فَلَهُ بِكُلِّ فَرِيضَةٍ سِتُّ فَرَائِضَ مِنْ أَوَّلِ مَا يَفِيءُ اللَّهُ عَلَيْنَا"،واتا:هەرکەسێ دڵی ئارام نابێ بەگەڕاندنەوەی ژنان و منداڵ، با بیگێڕێتەوە بەرانبەر بەئازادکردنی کەسێ بێچووی شەش زگ و زای ئاژەڵی بۆ ئەبێ. لەمەدا بەڵگە هەیە کە جائیزە کۆیلە یان ئاژەڵ بدرێ لەبری ئافرەت و بەزیاتریشەوە.

### ٣٠- غەزوەی تائیف لەشەوالی ساڵی هەشتی کۆچی

ئیبن سەعد ئەڵێ: وتیان:کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ویستی بۆ تائیف بەڕێکەوێ، توفەیلی کوڕی عەمری نارد بۆ (ذو الكفين) بتی عەمری کوڕی حمەی ئەلدوسیی تاوەکو بیڕوخێنێ،داوای لێکرد هاوکاریی لەقەومەکەی ببات و لەتائیفدا پێی بگات، ئەویش خێرا دەرچوو بۆ لای قەومەکەی و ئەو بتەی روخاند، ئاگری بەردا لەدەمووچاوی بتەکە و ئەیووت:

يَا ذَا الْكَفَّيْنِ لَسْتُ مِنْ عُبَّادِكَا

مِيلَادُنَا أَقْدَمُ مِنْ مِيلَادِكَا

إِنِّي حَشَشْتُ النَّارَ فِي فُؤَادِكَا

واتا:ئەی(ذَا الْكَفَّيْنِ) من بەندەی تۆ نیم، لەدایكبوونی ئێمە كۆنترە لەدایكبوونی تۆ، من وا ئاگرم بەرداوەتە دڵەی تۆ.

لەگەڵ چوارسەد كەسی قەومەكەیدا خێرا خواربوویەوە لەتائیف گەیشتنە پەیامبەری خوا و زرییۆش و مەنجیقی دابەست[1].

ئیبن سەعد ئەڵێ: كە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەحونەین دەرچوو ویستی رۆیشتنی هەبوو بۆ تائیف، خالیدی كوڕی وەلیدی لەپێشدا رەوانە كرد. سەقیف قەلاَكانیان قایم كردبوو، پێویستیی یەك ساڵیان دابین كردبوو، كە لەئەوتاس دۆڕان، چوونە قەلاَكانیانەوە و دەرگاكانیان لەسەر خۆیان داخست و ئامادەی جەنگ بوون. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەرێكەوت و لەنزیك قەلاَی تائیف دابەزی، لەوێدا سەربازگەی كردەوە، ئەوانیش موسڵمانانیان تیرباران كرد و وەك كولە ئەكەوتن بەسەر موسڵماناندا، كۆمەڵێك لەموسڵمانەكان برینداربوون و دوانزە كەسیان كوژران، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) چووەسەر شوێنی مزگەوتی ئەمڕۆی تائیف و ئوم سەلەمە و زەینەبی خێزانی لەگەڵ بوو، دوو گومەزی بۆیان دروست كرد، لەماوەی گەمارۆی تائیفدا لەنێوان هەردوو گومەزدا نوێژی دەكرد، هەژدە رۆژ گەمارۆی دان[2]. مەنجەنیقی بۆ سەریان دابەست، ئەوە یەكەمجار بوو لەئیسلامدا مەنجەنیق بەكاربهێنرێت.

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: كۆمەڵێك لەهاوەڵانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) چوونە ژێر زرییۆشێكەوە و پێیەوە چوونە لای دیواری تائیف تاوەكو لەوێوە دزە بكەنە ئەو شارەوە، بەلاَم سەقیف سكەی ئاسنی بەئاگر گەرمكراویان ناردە سەریان، بۆیە لەژێر زرییۆشەكە دەرچوون و لەوكاتەدا سەقیف ئەو موسڵمانانەیان تیرباران كرد، پیاوانێك لەموسڵمانەكان كوژران، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه

---

[1] - الطبقات الكبرى لابن سعد٢/١٢٠.

[2] - هەمان سەرچاوە.



وسلم) فرمانی کرد رەزی ترێی سەقیف ببڕنەوە، ئیتر خەڵکییش دەستیان کردە بڕینەوەی[1].

ئیبن سەعد ئەڵێ: داوایان لێکرد لەبەر خوا و بەزەیی دەستهەڵبگرێت، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"فَإِنِّي أَدَعُهَا لِلَّهِ وَلِلرَّحِمِ"،واتا: وا بۆ خوا و بەزەیی وازدەهێنم، بانگیکرد لەجاڕدەری خۆی تاوەکو جاڕ بدات، هەر بەندەیەك لەو قەڵایە دابەزێ و دەربچێ بۆ لای ئێمە، ئازادە. بەوە دە پیاو و شتێك دەرچوون، ئەبو بەکرەیان تێدا بوو، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) ئازادی کردن و خواردنی هەریەکەیانی سپاردە موسڵمانێ، ئەوە زۆر سەخت بوو بەسەر خەڵکی تائیفەوە.

رێگە نەدرا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تائیف فەتح بکات، بۆیە فرمانی کردە عومەری کوڕی خەتاب تاوەکو جاڕی رۆیشتن بەخەڵك بدات. خەڵکیی لەوەدا کردیانە هەرا و وتیان: ناڕۆین، تائیفمان بۆ فەتح نەکراوە؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"کەوابوو ئامادەبن بۆ جەنگ. جەنگیان کرد، کۆمەڵێ لەموسڵمانان پێکران، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"إن شاء الله بەیانی دەڕۆین"،بەوە دڵخۆش بوون و ملکەچی فرمان بوون، دەستیانکردە رۆیشتن و پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) پێدەکەنی[2].

وترا: ئەی پەیامبەری خوا لەخوا بپاڕێرەوە دژ بەتائیف، بەڵام پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"اللَّهُمَّ اهْدِ ثَقِيفًا وَائْتِ بِهِمْ"[3]،واتا: خوایە هیدایەتی سەقیف بدە و خۆت بیانهێنە لای ئێمە.

---

[1]- بڕوانە: سیرة ابن هشام٢/٤٨٣.
[2]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٤٣٢٥).
[3]- بڕوانە: الطبقات الکبری لابن سعد٢/١٢١.

لەتائیف کۆمەڵێك شەهید کران، پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەتائیفەوە دەرچوو بۆ جعرانە، پاشان بەبەستنی ئیحرامی عومرەوە چووە ناویەوە، عومرەکەی ئەنجام دا و پاشان گەڕایەوە مەدینە.

**بەش**

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەمانگی رەمەزاندا لەتەبوکەوە هاتەوە مەدینە، لەو مانگەدا شاندی سەقیف هاتەلای.

یەکێك لەقسە و باسەکانیان، ئەوە بوو کاتێك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوانی بەجێهێشت، عورووەی کوڕی مەسعود بەدوایدا رۆیشت، پێش ئەوەی بچێتە مەدینەوە پێیگەیشت، موسڵمان بوو، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داوای لێکرد بەموسڵمانێتییەوە بگەڕێتەوە لای قەومەکەی، کە لێیان دەرکەوت لەسەر بەرزاییەك بانگی کردن بۆ موسڵمان بوون و بۆیانی ئاشکرا کرد کە بووەتە موسڵمان، بۆیە لەهەموو لایەکەوە تیربارانیان کرد، تیرێك بەریکەوت و کوشتی.

لەدوای کوژرانی عورووە، چەند مانگێك سەقیف مایەوە، پاشان کە بینیان توانای شەڕی عەرەبی دەورووبەری خۆیانیان نییە، بەیعەتیان دا و موسڵمان بوون.

کۆبوونەوە تاوەکو پیاوێك بنێرنە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەروەك چۆن عورووەیان نارد، لەگەڵ عەبد یالیلی کوڕی عەمر قسەیان کرد کە لەتەمەنی عورووەی کوڕی مەسعود بوو، پێشنیاریان کرد بچێتە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بەڵام رەتیکردەوە، ترسا وەك عورووەی بەسەر بهێنن، وتی: من ئەوە ناکەم تاوەکو کۆمەڵێ پیاوم لەگەڵ نەنێرن، ئەوانیش یەکدەنگ بوون دوو پیاوی ئەحلاف و سێ پیاوی نەوەی مالیکی لەگەڵدا بنێرن کە هەموویان دەبنە شەش کەس، بەڕێیخستن لەگەڵ خۆیدا تاوەکو هاتنەلای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)،

پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) لەڕوویەکی مزگەوتەکەیدا گومەزێکی بۆیان دانا وەك وەهای دادەنێن.

خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی ئەلعاس لەنێوان ئەوان و پەیامبەری خوادا هاتووچۆی دەکرد تاوەکو نووسراویان نووسی، خالید بۆی دەنووسین. هەر خواردنێکیان بۆ بهاتبایە لەلایەن پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) لێیان نەدەخوارد تاوەکو پێش ئەوان خالید لێی نەخواردبایە و ئەوە بەردەوام بوو تاوەکو بوونە موسڵمان.

یەکێك لەو داواکارییانەیان کە داوایان کرد لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەوە بوو بۆ ماوەی سێ ساڵ بتی (لات)یان نەڕوخێنێ، بەڵام پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەو داوایەی رەتکردەوە، داوایان کرد بۆ دوو ساڵ نەیڕوخێنێ، رەتیکردەوە، داوایان کرد بۆ یەك ساڵ نەیڕوخێنێ، رەتیکردەوە، داوایان کرد لەدوای گەڕانەوەیان بۆ یەك مانگ نەیڕوخێنێ، ئەوەشی رەتکردەوە. بەو داوایەیان ئەیانویست لەتانەی ژن و منداڵ و نەفامەکانیان رزگاریان بێ و حەزیان نەدەکرد بەڕوخاندنی ئەو بتە، قەومی خۆیان بتۆقێنن تاوەکو کاتێ دەبنە موسڵمان، بەڵام پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رەتیکردەوە، پێداگربوو ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و موغیرەی کوڕی شوعبە بنێرێ بیڕوخێنن. داوایان کرد نوێژ نەکەن و بەدەستی خۆیان بتەکە نەشکێنن، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "أَمَّا كَسْرُ أَوْثَانِكُمْ بِأَيْدِيكُمْ فَسَنُعْفِيكُمْ مِنْهُ، وَأَمَّا الصَّلَاةُ فَلَا خَيْرَ فِي دِينٍ لَا صَلَاةَ فِيهِ"، واتا: سەبارەت بەشکاندنی بتەکە بەدەستی خۆتان، ئەوە ئێمە ئەو ئەرکە ناخەینەسەر ئێوەو خۆمان دەیشکێنین، بەڵام سەبارەت بەنوێژ، ئەوە خێر و خۆشیی لەئاینێکدا نییە نوێژی تێدا نەبێ.

که بوونه موسڵمان، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نووسراوێکی بۆیان نووسی، هەروەك عوسمانی کوڕی ئەلعاس کە منداڵترینیان بوو، کردیە سەرپەرشتیاریان، چونکە لەهەموویان پێداگرتربوو بۆ فێربوونی ئیسلام و قورئان.

## بەش

ئەو بابەتە فیقهییانەی لەو ڕووداوەدا دەریانهێناوە:

- جائیزە لەمانگە پیرۆزەکاندا شەڕ بکرێت و حەرامبوون بەو کارە هەڵوەشاوەتەوە.
- جائیزە پیاو بەئامادەبوونی ژن و منداڵی بجەنگێ، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەو شەڕەدا ئوم سەلەمە و زەینەبی لەگەڵ بوو.
- جائیزە مەنجەنیق بۆ سەر بێباوەڕان دابنرێت و بۆردوومان بکرێن ئەگەر بگات بەکوشتنی ئەوانەی ناکوژرێن لەژن و منداڵ.
- جائیزە دارو درەختی بێباوەڕان ببڕدرێتەوە، ئەگەر هاتوو ئەو کارە تووڕە و لاوازی کردن.
- ئەگەر کۆیلە لەگەورەی هاوبەش پەیداکەری هەڵهات و خۆی گەیاندە موسڵمانان، دەبێتە کەسێکی سەربەست.
- ئەگەر پێشەوای موسڵمانان قەلایەکی گەمارۆ دا و بۆی فەتح نەکرا و بینی بەجێهیشتنی لەبەرژەوەندیی موسڵمانانداییە، ناچار نییە زیاتر بمێنێتەوە و چاوەڕوانیی بکات.
- خوای گەورە پاڕانەوەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی قبوڵکرد، هیدایەتی سەقیفی دا و خۆیان هاتن لەکاتێکدا پێشتر شەڕیشیان کردبوو، کۆمەڵێ لەهاوەڵانیان کوشتبوو، نێردراوی پەیامبەری خوایان کوشت کە

ناردبووی بۆ ناویان تاوەکو بانگەوازیان بکات بۆ ئایینی خوا، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا پاڕایەوە خوای گەورە هیدایەتیان بدات و دوعای شەڕی لێیان نەکرد، ئەوەش کەماڵی بەزەیی و سۆز و دڵسۆزیی پەیامبەری ئازیز بوو(صلی الله علیه وسلم).

- کەماڵی خۆشەویستیی ئەبو بەکری سدیق بۆ پەیامبەری ئازیز(صلی الله علیه وسلم)، بۆیە داوای لەموغیرە کرد بهێڵێ خۆی مزگێنیی هاتنی شاندی تائیف بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بدات، تاوەکو بەوە دڵخۆشی بکات، ئەمە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی جائیزە پیاوێك داوا لەبراکەی بکات شتێکی گرنگی وەها بەو بدات تاوەکو لەکەسێکی نزیك نزیکتربێتەوە.
- ئەگەر لەتوانادا هەبوو شوێنی هاوبەش پەیداکردن بڕوخێنرێت، جائیز نییە بۆ یەك ڕۆژیش بێ بهێڵرێت وەك خۆی بمێنێتەوە، چونکە ئەوە دروشمی بێباوەڕی و هاوبەش پەیداکردنە.

کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هاتە مەدینە و ساڵی نۆی کۆچیی هات، کۆکردنەوەی زەکات لەئەعراب دەستپێکرد.

### ٣١-شەڕی تەبوك

لەمانگی رەجەبی ساڵی نۆی کۆچییدا بوو. ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: لەسەردەمی بێبارانی و سەختییدا بوو، بەڵام کاتێ بەرووبووم پێگەیشت و خەڵکیی حەزیان دەکرد لەنێو رەز و باخ و سێبەری باخی خۆیاندا بن و حەزیان نەدەکرد لەو حاڵەدا دەربچن. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەهەر غەزایەك دەربچووایە درکەی بەکاردەهێنا تاوەکو دوژمن نەزانێ رووەو ئەو رێگە دەگرێتەبەر، تەنیا لەشەڕی تەبوکدا نەبێ بەهۆی سەختیی رێگە و گەرمای توندەوە ئەوەی نەکرد.

کۆمەڵێك لەدووڕووان بەیەکتریان وت: لەگەرمادا دەرمەچن بۆ شەڕ، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ﴾ **التوبة: ٨١** ،واتا: بەئیماندارانیان دەوت لەم وەرزی گەرمایە دەرمەچن بۆ جیهاد.

پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سووربوو لەسەر دەرچوون و فرمانی بەخەڵك کرد ئامادەبن، هانی دەوڵەمەندانی دا لەپێناو خوای گەورە ببەخشن و وڵاخ ئامادە بکەن، کۆمەڵێك پیاوی دەوڵەمەند بەخشییان، بەڵام عوسمانی کوڕی عەفان لەوەدا بەجۆرێك سەروەتی بەخشی، نمونەی نەبوو[١].

ئیبن سەعد باس دەکات و ئەڵێ: هەواڵ بەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گەیشت کە ڕۆم سوپایەکی زۆری لەشام کۆکردووەتەوە، هیرقەل خواردنی ساڵێکی بۆ دابین کردوون و لخم و جوزام و عامله و غەسسانیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

کەسانی ئەعراب بەعوزر و بیانووەوە هاتن بۆلای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) تاوەکو مۆڵەتیان بدات دەرنەچن، ئیبن سەعد ئەڵێ: هەشتا و دوو پیاو بوون داوای مۆڵەتیان کرد. کاتێ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەڕێکەوت، عەبدواللەی کوڕی ئوبەی و ئەوانەی لەگەڵی بوون خۆیان دواخست و نەهاتن، چەند کەسێك لەموسڵمانانیش دواکەوتن و نەڕۆیشتن، لەوانە کەعبی کوڕی مالیك و هیلالی کوڕی ئومەییە و مورارەی کوڕی ئەلرەبیع و ئەبو خەیسەمە ئەلسالمی و ئەبو زەڕ بوون، بەڵام دواتر ئەبو خەیسەمە و ئەبو زەڕ خۆیان گەیاندە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم). پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەسی هەزار سەرباز و دە هەزار ئەسپسوارەوە دەرچوو، بیست شەو مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە، هیرقەل ئەوکات لەحیمس بوو[٢].

---

[١] – بروانە: سیرة ابن هشام٢/٥١٥–٥١٨.

[٢] – الطبقات الكبرى لابن سعد٢/١٢٥.

ئیبن هیشام ئەڵێ: لەئەلزوهرییەوە پێمگەیشتووە وتی: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەلای بەرد و تاوێرەکاندا ڕۆیشت، بەرگەکەی دابەسەر دەموچاویدا و وشترەکەی زیاتر تاودا و پاشان فەرمووی:"لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ إِلَّا وَأَنْتُمْ بَاكُونَ خَوْفًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مَا أَصَابَهُمْ"[1]،واتا: بەبێ گریان مەچنە خانووەکانی ئەوانەی ستەمیان دەکرد، نەوەك تووشی ئەو غەزەبە ببن کە ئەوان تووشی هاتن.

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: خەڵکیی ئاویان لێ بڕا، بۆ ئەوە بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)یان وت، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) پاڕایەوە، خوای گەورە بارانی داباراند تاوەکو ئەو خەڵکە ئاویان خواردەوە و بەشی پێویستی ئاویان هەڵگرت[2].

پاشان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ڕۆیشت و ئەیانبینی پیاوێك دوادەکەوت،ئەیانوت: فلان دواکەوت. ئەویش ئەیفەرموو:"دَعُوهُ فَإِنْ يَكُ فِيهِ خَيْرٌ فَسَيُلْحِقُهُ اللَّهُ بِكُمْ، وَإِنْ يَكُ غَيْرَ ذَلِكَ فَقَدْ أَرَاحَكُمُ اللَّهُ مِنْهُ"،واتا:وازی لێبهێنن، ئەگەر خێری تێدا بێ ئەوە خوای گەورە بە ئێوەی دەگەیەنێتەوە، ئەگەر خێری تێدا نەبێ، ئەوە خوای گەورە لەدەستی دەتانحەسێنێتەوە.

کۆمەڵێك لەدووڕووان لەوانە وەدیعەی کوڕی سابت برای عەمری کوڕی عەوف و یەکێکیان تێدا بوو لەئەشجەع هاوپەیمانی بەنی سەلیمە پێیدەوترا: مەخشیی کوڕی حمیر بەیەکتریان دەوت: وەها دەزانن شەڕی بەنی ئەسفەر وەك شەڕی نێوان عەرەبە؟! سوێند بەخوا وەك دەیبینین بەیانیی بەپەت هەڵواسراون- ئەمە بۆ ترساندنی موسڵمانان وەهایان دەوت- مەخشیی کوڕی حمیر وتی: سوێند بەخوا حەزم دەکرد یەکی سەد جەڵدمان لێ بدرایە،بێگومان لێرە ناجوڵێینەوە قورئان لەبارەی ئەم دەمەتەقێیەمانەوە دادەبەزێت.

---

[1]- سیرة ابن هشام٢/٥٢٢.

[2]- سەرچاوەی پێشوو.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەعەماری کوڕی یاسری فەرموو: "أَدْرِكِ الْقَوْمَ فَإِنَّهُمْ قَدِ احْتَرَقُوا فَسَلْهُمْ عَمَّا قَالُوا، فَإِنْ أَنْكَرُوا فَقُلْ: بَلْ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا"،واتا: بگە بەوانە وا گڕیان گرتووە و سووتان، بپرسە چییان وت، ئەگەر نکۆڵییان کرد، بڵێ بەڵکو ئەوەو ئەوەتان وت. عەمار ڕۆیشت بۆلایان و ئەوەی پێیان وت، ئەوانیش هاتنە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) عوزریان ئەهێنایەوە، وەدیعەی کوڕی سابت وتی: ئێمە تەنیا گاڵتەمان دەکرد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی لەبارەیانەوە دابەزاند:﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ﴾ **التوبة: ٦٥**، واتا: سوێند بێت ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت بەڕاستی دەڵێن دڵنیابن ئێمە هەر دەمەتەقێ و گاڵتە دەکەین.

مەخشیی کوڕی حمیر وتی: ئەی پەیامبەری خوا ناوی خۆم و باوکم منی دانیشاندووە. ئەو لەو ئایەتەدا بەخشرا، ناونرا عەبدولڕەحمان و داوای لەخوای کرد شەهید ببێ و شوێنەکەی نەناسرێتەوە، بۆیە لەڕۆژی یەمامەدا کوژرا و کەس شوێنەواری نەدۆزییەوە.

کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گەیشتە تەبوك، فەرمانڕەوای ئەیلە هات بۆلای و لەگەڵیدا ڕێککەوت و جزیەی پێ دا، خەڵکی جربا و ئەزروحیش هاتن و جزیەیان دا، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) نووسراوی بۆ نووسین و پێی دان.

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆلای ئوکەیدر دومە، ئوکەیدری کوڕی عەبدولمەلیك بوو، پیاوێکی کیدنیی گاور بوو، پاشای کیندە بوو. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەخالیدی فەرموو: "إِنَّكَ سَتَجِدُهُ يَصِيدُ الْبَقَرَ"،واتا: ئەیبینیتەوە خەریکی ڕاوە مانگایە. خالید دەرچوو، بەڕوانینی چاو لەقەڵاکەی دوور بوو، لەمانگە شەودا

لەسەربان بوو ژنەکەشی لەگەڵ بوو، مانگەکەش قۆچی دەخشاند بەدەرگای کۆشکدا، ژنەکەی وتی: نمونەی ئەمەت بینیووە؟ وتی: نە سوێند بەخوا. وتی: کێ ئەمەی بەجێهێشتووە؟ وتی: هیچ کەسێ. دابەزی و فرمانی کرد ئەسپەکەی بۆ زین بکرێت. ئەسپی بۆ ئامادەکرد، چەند کەسێکی بنەماڵەکەی لەگەڵی دەرچوون، لەوانە برایەکی بوو پێیان دەوت: حەسسان. ئەوانیش بەدوایاندا دەرچوون. ئەسپسوارەکانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێیان گەیشت و خۆیان گرت و براکەشیان کوشت. عەبایەکی ئاورێشمی بەئاڵتوون چنراوی لەبەر بوو، خالید لەبەری دایکەند و ناردی بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێش ئەوەی خۆی بگاتەوە لای. خالید ئوکەیدری هێنا بۆ لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و خوێنی پاراست و لەسەر جزیە لەگەڵی رێککەوت، پاشان ئازادی کرد و گەڕایەوە دێیەکەی خۆی[1].

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دە شەو و شتێ لەتەبوک مایەوە و ئەوێی تێپەڕ نەکرد، پاشان بەکاروان گەڕایەوە مەدینە[2].

لەگەڕانەوە لەتەبوک، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«إِنَّ بِالْمَدِينَةِ لَأَقْوَامًا مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا وَلَا قَطَعْتُمْ وَادِيًا إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ؟ قَالَ: " نَعَمْ، حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ»[3]،واتا: لەمەدینەدا خەڵکانێك هەن، هەر رێگە و دۆڵێکتان بڕی بێ لەگەڵتاندا بوون. وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ئەوان لەمەدینەن و نەهاتن؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام عوزرێك هۆکار بوو نەتوانن لەگەڵتاندا دەربچن.

---

[1] – بڕوانە: سيرة ابن هشام٢/٥٢٦.

[2] – سەرچاوەی پێشوو.

[3] – بوخاری(٢٨٣٩) و موسلیم(١٩١١) ئیخراجیان کردووە.

## ٣٢-بابەتی مزگەوتی ئەلزەرار کە خوا و پەیامبەرەکەی ڕەتیان کردەوە نوێژی تێدا بکرێت و پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) رووخاندی

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەتەبوکەوە دەهاتەوە، دابەزیە(ذي أوان)، یەك کاتژمێر ماوەی مابوو بگاتە مەدینە، دەستەی مزگەوتی زرار هاتبوون، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا، ئێمە مزگەوتێکمان دروست کردووە بۆ نەخۆش و خاوەن پێویستی و شەوانی سەرمای زستان، حەز دەکەین بێی بۆ لامان و لەوێ نوێژمان بۆ بکەی، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنِّي عَلَى جَنَاحِ سَفَرٍ وَحَالِ شُغْلٍ، وَلَوْ قَدِمْنَا إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَأَتَيْنَاكُمْ فَصَلَّيْنَا لَكُمْ فِيهِ"،واتا: ئێمە وا لەڕێی سەفەرین و سەرقاڵین، ئەگەر خوا ویستی و گەڕاینەوە دێین بۆ لاتان و بۆتان نوێژی تێدا دەکەین.

کە دابەزییە(ذي أوان)، لەئاسمانەوە هەواڵی ئەو مزگەوتەی پێگەیشت، بانگیکرد لەمالیکی کوڕی ئەلدوخشم برای نەوەی سەلیمەی کوڕی عەوف و مەعنی کوڕی عەدی ئەلعجلانیی، فەرمووی:"انْطَلِقَا إِلَى هَذَا الْمَسْجِدِ الظَّالِمِ أَهْلُهُ فَاهْدِمَاهُ وَحَرِّقَاهُ"،واتا: بڕۆن بۆ ئەو مزگەوتەی خەڵکەکەی ستەمکارن، بیڕوخێنن و بیسوتێنن. هەردووکیان خێرا دەرچوون تاوەکو گەیشتە نەوەی سالمی کوڕی عەوف کە دەستەی مالیکی کوڕی ئەلدوخشم بوون، مالیك بەمەعنی وت: چاوەڕێ بکە تاوەکو لای کەسوکارم ئاگر دەهێنم. چووە ماڵەوە و چڵە دار خورمایەکی هێنا و بەئاگر گڕی دا، پاشان بەتووندییەوە دەرچوون و چوونە ناو مزگەوتەکەوە و ئاگریان تێ بەردا و روخاندیان کە خەڵکەکەی تێدا بوو، بلاوەیان لێ کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ **التوبة: ١٠٧** ،واتا☹لەناپاکان) ئەوانەی

مزگەوتێکیان دروست کرد بۆ زیان گەیاندن(بە موسڵمانەکان) و خوانەناسی و جیاوازی خستنە نێوان ئیمانداران و بۆ چاوەڕوانی کردنی کەسانێك کە دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەیان کردووە لەوەو پێش بێگومان(ئەو دوو ڕووانە) سوێند دەخۆن(دەڵێن)تەنها چاکەمان ویستووە بەڵام خوا شایەتی دەدات کە بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

بەش

کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەمەدینە نزیکبوویەوە، خەڵکیی دەرچوون بۆ پێشوازی و ژنان و منالأن دەرچوون و ئەیانووت:

طَلَعَ الْبَدْرُ عَلَيْنَا مِنْ ثَنِيَّاتِ الْوَدَاعِ
وَجَبَ الشُّكْرُ عَلَيْنَا مَا دَعَا لِلَّهِ دَاعِي

واتا:لەڕێگای(ثَنِيَّاتِ الْوَدَاعِ)ەوە مانگی چواردەمان لێ دەرکەوت، لەوەی خوا بۆ ئێمە ناردی، سوپاسگوزارییمان لەسەرە.

بەش

کاتێ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هاتە مەدینەوە، سەرەتا چووە مزگەوت و دوو رکات نوێژی تێدا کرد، پاشان دانیشت بۆ خەڵك، ئەوانەی نەهاتبوون و لەگەڵیدا دەرنەچوون هاتن، دەستیان کردە عوزر هێنانەوە و سوێندخواردن بۆی، هەشتا و شتێ پیاو بوون. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) قسەی رواڵەتی لێیان قبولّ کرد و بەیعەتی ئەوانی وەرگرت و داوای لێخۆشبوونی بۆیان کرد، نهێنییەکانیشیانی دایە دەست خوا. کەعبی کوڕی مالیك هات بۆلای، کە سەلامی لێکرد، بزەی تووڕەی بەڕوودا کرد، پێی فەرموو:"وەرە". ئەڵێ: هاتم تاوەکو

لەبەردەمیدا دانیشتم. فەرمووی:"مَا خَلَّفَكَ، أَلَمْ تَكُنْ قَدِ ابْتَعْتَ ظَهْرَكَ؟ "،واتا: چی بووە هۆکاری دواکەوتن و نەهاتنت، ئەی تۆ کاروبارت رێك و تەواو نەبوو؟ وتم: بەڕێ والله ئەی پەیامبەری خوا، ئەگەر لای یەکێکی تر بووایەم لەئەهلی دونیا، ئەوە بیانوویەکم دەدۆزییەوە، بەلاّم دەزانم ئەگەر ئەمڕۆ هۆکاری درۆیەنەت بۆ بهێنمەوە، خوای گەورە لەدژم تووڕەت دەکات، بەلاّم راستییت بۆ باس دەکەم و ئومێد دەکەم بەو راستییە لێبووردنی خوا دەستبخەم، نە سوێند بەخوا عوزر و بیانووم نەبوو لەو دەرنەچوونەدا، سوێند بەخوا هیچ پێویستی و ناچارییەك لەئارادا نەبوو. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"أَمَّا هَذَا فَقَدْ صَدَقَ، فَقُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِيكَ"،واتا: ئەمە راستە و راستت وت، بەلاّم هەڵسە تاوەکو خوای گەورە بڕیارت لەبارەوە دەدات.

هەڵسام، پیاوانێکی نەوەی سەلیمە هەڵسان و دوامکەوتن و سەرکۆنەیان کردم،وتم: لەم کارەدا کەسی تر وەك من هەیە؟ وتیان: بەڵێ دوو پیاو هەیە، هەمان قسەی تۆیان کردووە و هەمان فەرمایشتی تۆی بەوان داوە. وتم: ئەو دووانە کێن؟ وتیان: مورارەی کوڕی ئەلڕەبیع ئەلعامری و هیلالی کوڕی ئومەییە ئەلواقیفی. دوو پیاوچاکی بەشداربووی بەدریان پیشان دان کە پێشەنگییان تێدا بوو، منیش رۆیشتم.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهیکرد لەموسڵمانان سەلاممان لی بکەن و قسەمان لەگەڵدا بکەن، پشتیان تێ کردین، تەنانەت زەوییش حەزی بەچارەمان نەدەکرد.

کە نوێژی بەیانییم کرد، بەیانیی پەنجا رۆژی ئەو رووداوە و لەسەر بانی ماڵەوە نوێژم کرد، گوێم لەدەنگێك بوو لەسەر چیای سەلعەوە بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی کەعبی کوڕی مالیك مزگێنیی بدە. یەکسەر چوومە سجود و زانیم لەلایەن خوای گەورەوە مزگێنیی هاتووە و پەیامبەری خوا لەکاتی نوێژی بەیانییدا تەوبەی خوای بۆ ئێمە راگەیاندووە.

## ٣٣-ئاماژەدان بەهەندێ بابەتی فیقهی و سوودی ئەو غەزایە

- جائیزە لەمانگە پیرۆزەکاندا شەڕ بکرێت.
- راگەیاندنی پێشەوای موسڵمانان بەخەڵکەی بەوەی ئەگەر نیازەکەی ئاشکرا بکەن،زیانیان پێ دەدات،بۆیە بیشارنەوە و دەری نەخەن تاوەکو بۆی ئامادەساز دەبن.
- پێشەوای موسڵمانان کە سوپای خستە حاڵەتی ئامادەباشییەوە، دەبێ ئامادەباش بن و هیچ کەسێ بەبێ مۆڵەتی خۆی دوانەکەوێ.
- هەروەك چۆن جیهادکردن بەگیان واجیبە، بەسەروەت و سامانیش واجیبە.
- ئەوەی لەو غەزایەدا عوسمانی کوڕی عەفان پێی دەرکەوت و پێیەوە پێشی خەڵکیی کەوت، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"مَا ضَرَّ عثمان مَا فَعَلَ بَعْدَ الْيَوْمِ"[1]،واتا: بەو کارەی عوسمان ئەنجامی دا، لەمڕۆوە ئیتر هیچ کارێك زیان لەباوەڕی عوسمان نادات.
- ئەوەی سەرەوتی نییە لێی ببەخشێ، پێویستە توانای جەستەیی ببەخشێ.
- پێشەوای موسڵمانان ئەگەر سەفەری کرد، یەکێك لەدوای خۆی بەجێبهێڵێ بۆ سەرپەرشتیکردنی خەڵکی لاواز و خاوەن عوزر و ژنان و منداڵان.
- ئاوی بیرەکانی سەمود جائیز نییە بخورێتەوە و چێشتی پێ لێ بنرێت و هەویری پێ بشێلرێت و تەهراتی پێ ناکرێت، جائیزە ئاژەڵانی پێ ئاو بدرێت تەنیا بیری(الناقة) نەبێ.
- هەرکەسێ بەشار و شوێنی ئەوانەدا تێپەڕبوو کە خوای گەورە غەزەبی لێ گرتبوون و سزای داون، نابێ بچێتە ماڵەکانیانەوە و تیایدا بمێنێتەوە، بەڵکو دەبێ هەنگاوەکان خێرا بکات و بەرگەکەی بەخۆیەوە بگوشێ تاوەکو

---

[1] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٧٠١).

لەو شوێنە دەردەچێ، بەگریان و پەند وەرگرتن لەسەرەنجامی ئەوانە بچێتە ئەو شوێنەوە.

– پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەفەردا نوێژی کۆدەکردەوە.

– پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بیست رۆژ لەتەبوکدا مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە.

– دووڕووانی نەکوشت، لەبارەیانەوە بێباوەڕیی روون و ئاشکرای پێگەیشت(الكفر الصريح).

– پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«إِنَّ بِالْمَدِينَةِ لَأَقْوَامًا مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا وَلَا قَطَعْتُمْ وَادِيًا إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ؟ قَالَ: " نَعَمْ، حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ»،واتا: لەمەدینەدا خەڵکانێك هەن، هەر ڕێگە و دۆڵێکتان بڕی بێ لەگەڵتاندا بوون. وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ئەوان لەمەدینەن و نەهاتن؟ فەرمووی: بەڵێ، بەلاَم عوزرێك هۆکار بوو نەتوانن لەگەڵتاندا دەربچن.

ئەم لەگەڵبوونە بەدڵ و خەم و پەژارەوە بوو، نەك وەك ئەوەی خەڵکانی نەفام وادەزانن بەجەستە لەگەڵیان بوونە.

– سوتاندنی شوێنی سەرپێچی و تاوان کە تیایدا سەرپێچیی خوا و پەیامبەرەکەی دەکرێت، دەڕوخێنرێت، هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مزگەوتی زەراری سووتاند.

– جائیزە شیعر بەو کەسەدا بووترێت کە دێتەوە، شیعرێك بێ حەرامی لەگەڵدا نەکرێت وەك شمشاڵ و دووزەلە و مۆسیقا و ئامێرەکانی، شیعری نابەجێ و حەرام نەبێ.

- لەو حیکمەت و سوودە زۆرانەی لەبارەی ئەو سێ کەسەوە هاتووە کە بەشداری دەرچوونەکە نەبوون، ئاماژە دەکەینە هەندێ لەو حیکمەت و سوودانە:
- جائیزە هەواڵ بەکەسێ بدرێت لەبارەی کەمتەرخەم بوونی لەئاست گوێڕایەڵیی خوا و پەیامبەرەکەی و هۆکاری ئەوە و سەرەنجامەکەی.
- ئەگەر کەسێ دەرفەتی خواپەرستیی بۆ هەڵکەوت، پێویستە بیقۆزێتەوە و دەستپێشخەریی بۆ بکات، دوای نەخات و ئەمڕ و بەیانیی نەکات.
- سێ جۆر پیاو دواکەوتن و لەگەڵ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دەرنەچوون: یان دووڕوویی بەسەردا زاڵ بوو، یان کەسێك عوزری هەبوو، یان ئەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەسەرپەرشتیاری مەدینە و ئەوەی بۆ بەرژەوەندییەك هێشتی لەمەدینە بمێنێتەوە.
- سوننەتە بۆ ئەو کەسەی لەسەفەر دەگەڕێتەوە، بەدەستنوێژەوە بێتە شار و شوێنی خۆیەوە و سەرەتا بچێتە ماڵی خوا پێش چوونی بۆ ماڵی خۆی و لەمزگەوتدا دوو ركات بكات.
- پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رووی ئاشکرای موسڵمانێتیی دووڕووانی قبوڵ دەکرد، نهێنییەکانیشیان ئەگەڕاندەوە بۆ لای خوای گەورە و حوکمی دیار و رواڵەتی دەدا و لەسەر زانینی نهێنی و ناخیان سزای کەسیانی نەدەدا.
- پێشەوا و فەرمانڕەوا وەڵامی سەلامی کەسێك نادەنەوە کە رووداوێکی خوڵقاندووە، ئەوەش بۆ تەمبێکردنی ئەو کەسە و ئاگادارکردنەوەی کەسانی تر.
- بزەکردن بەتووڕەیی هەیە هەروەك چۆن بزەی سەرسامبوون و خۆشحاڵبوونیش هەیە.

## بەش

لەنەهیکردنی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەلامکردن لەو سێ کەسە لەنێو کۆی ئەوانەی بەشدار نەبوون و دواکەوتن،بەڵگە هەیە لەسەر سەرڕاستیی ئەو سێ کەسە و درۆزنیی ئەوانی تر، ویستی قسە لەگەڵ ئەو ڕاستگۆیانەدا نەکات و لەسەر ئەو تاوانە تەمبێیان بکات، بەڵام هەرچی دووڕووانە، ئەوە تاوانەکەیان گەورەترە لەوەی قسەیان لەگەڵدا نەکرێت، دەرمانی ئەو دەردە، سوود بەنەخۆشیی دووڕوویی ناگەیەنێ. خوای گەورە لەسزای تاوانەکاندا ئاوەها مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، تەمبێی بەندەی باوەڕداری خۆی دەکات بەئەنجامدانی کەمترین هەڵە و ساتمەیەك،تاوەکو هەمیشە ئەو بەندەیە وریا و بەئاگابێ،بەڵام ئەگەر ئەو بەندەیەی لەبەرچاو کەوت و بەلایەوە سووك بوو، وازی لێ دەهێنێ و ئەهێڵێ بەتاوانی خۆیەوە سەرقاڵ بێ، هەرچکاتێ ئەو بەندەیە تاوانێ بکات، نیعمەتێکی پێ دەدات، بەڵام بەندەی لەخۆبایی وەها دەزانێ ئەوە ڕێزی خوایە بۆ ئەو، نازانێ خودی ئیهانەیە و خوای گەورە بەوە دەیەوێ سزا سەختی بدات،ئەو سزایەی کە سزای هاوشێوەی نییە، هەروەك لەفەرموودەی مەشهوردا هاتووە:"إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا عَجَّلَ لَهُ عُقُوبَتَهُ فِي الدُّنْيَا، وَإِذَا أَرَادَ بِعَبْدٍ شَرًّا أَمْسَكَ عَنْهُ عُقُوبَتَهُ فِي الدُّنْيَا، فَيَرِدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِذُنُوبِهِ"[1]،واتا: ئەگەر خوای گەورە ویستی خێر و چاکەی بۆ بەندەیەکی هەبوو، لەدونیادا سزای دەدات، بەڵام ئەگەر خێر و چاکەی بۆ بەندەیەك نەویست، لەدونیادا سزای لێ دووردەخاتەوە و بۆی دەخاتە قیامەت.

---

[1] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٣٩٦).



بەش

- لەوانە: گەورەیی ئەندازەی راستگۆیی و پەیوەستبوونی بەختەوەریی دونیا و ئاخیرەت و رزگاربوون لەخراپیی حاڵی دونیا و ئاخیرەت بەراستگۆییەوە. خوای گەورە هەرکەسێ رزگار بکات بەهۆی راستگۆییەوە رزگاری دەکات، هەرکەسێکیش لەنێوببات بەهۆی درۆوە لەنێوی دەبات. بێگومان خوای گەورە فرمانی کردووە بەبەندە باوەڕدارەکانی بەوەی لەگەڵ راستگۆیاندا بن و فەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩ ﴾ **التوبة: ١١٩** ،واتا: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە(تۆڵەی)خوا وە لەگەڵ ڕاست گۆیاندا بن و لەڕیزی ئەواندابن.

## ٣٤-حەجی ئەبو بەكری سدیق(خوای لێ رازیی بێ) لەساڵی نۆی كۆچی دوای هاتنەوەی لەتەبوك

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دوای گەڕانەوەی لەتەبوك، رۆژەكانی دواتری رەمەزان و شەوال و زیلقیعدە مایەوە لەمەدینە و پاشان لەساڵی نۆی كۆچییدا ئەبو بەكری بەئەمیری كاروباری حەج نارد تاوەكو حەجی باوەڕداران راپەڕێنێت، هاوبەش پەیداكەران ئەو ساڵە نەچوون بۆ حەج. ئەبو بەكر و باوەڕداران دەرچوون بۆ حەجكردن[1].

ئیبن سەعد ئەڵێ: ئەبو بەكر بەسێسەد كەسەوە لەمەدینە دەرچوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بیست وشتری لەگەڵدا نارد و بەدەستی خۆی دیاری و نیشانی كرد و ئەبو بەكریش پێنج وشتری لەگەڵ خۆیدا برد[2].

---

[1] – بڕوانە:سیرة ابن هشام٢/٥٤٣.

[2] – الطبقات الكبری لابن سعد٢/١٧٢.

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: لەئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی نێوان پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و هاوبەش پەیداکەراندا (برآءة)دابەزی،عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبیش لەسەر وشتری(العَضباء)کە هی پەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) دەرچوو بۆ حەج[1].

ئیبن سەعد ئەڵێ: ئەبو بەکر پێیووت: ئایە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تۆی کردووەتە سەرپەرشتیاری حەج؟ وتی: نە، بەڵکو ناردوومی(برآءة)بەسەر خەڵکدا بخوێنمەوە و ماوەی بەڵێن بەکەسانی بەڵێن پێدراو رابگەیەنم[2].

خۆی و ئەبو بەکر حەجیان بۆ خەڵکیی راپەڕاند هەتا رۆژی قوربانیکردن هات، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب هەڵسا و لای جەمرە جاڕی دا بۆ خەڵك، جاڕدانی ئەو فرمانەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) داوێتی و پەیمانی هەموو پەیمانپێدراوێ بگێڕێتەوە، وتی: ئەی خەڵکینە ! مرۆڤی بێباوەڕ ناچێتە بەهەشتەوە، لەدوای ئەم ساڵە مرۆڤی هاوبەش پەیداکەر نابێ حەج بکات، بەڕووتیی بەدەوری کەعبەدا تەواف ناکرێت، هەرکەسێ لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەڵێن و پەیمانێکی هەیە، هەتا ماوەی دیاریکراو بەردەوام دەبێ.

**٣٥-هاتنی شاندەکانی عەرەب و ئەوانی تر بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)**

شاندی سەقیف هاتن هەروەك لەمیانەی غەزوەی سەقیفدا باسمان کرد.

لەچیرۆکی ئەو شاندەدا ئەمە تێدەگەین:

- جائیزە مرۆڤی هاوبەش پەیداکەر ببرێتە مزگەوت، بەتایبەت ئەگەر ئومێدی ئەوەی لێ بکرێت ببێتە موسڵمان و قورئانی بەگوێدا بخوێنرێتەوە و ئیسلام و پەرستنی پیشان بدرێت.

---

[1] - بروانە:سیرة ابن هشام٢/٥٤٥-٥٤٦.

[2] - الطبقات الکبری لابن سعد٢/١٢٨.

– ئەوەی شایستە بێ بەئەمیرێتی و پێشەوایەتیی قەومێك، ئەوەیانە كە باشترینە و زاناترینە بەقورئان و تێگەیشتووترینە بەئایینی خوا.

– روخاندنی شوێنی هاوبەش پەیداكردن، ئەو شوێنەی كراوەتەماڵی بتپەرستی و هاوبەش پەیداكردن، روخاندنی، شیرینترین شتێكە بەلای خوای گەورە و پەیامبەرەكەیەوە و بۆ موسڵمانانیش بەسوودترە لەڕوخاندنی قومارخانە و شوێنی خراپەكاریی، حاڵی ئەو گومەز و شوێنانەش هەمان شتە كە لەسەر ئەو گۆڕانە دانراون كە لەجیاتیی خوا دەپەرسترێن و خاوەن گۆڕ شان بەشانی خوای گەورە پەرستن دەكرێن، بێگومان دروست نییە لەگەڵ بوونی ئیسلام لەو شوێنەدا ئەو شتانە بوونیان هەبێ.

– موستەحەبە لەشوێنی بتی پەرستراودا مزگەوت دروست بكرێت، لەو شوێنەی پێشتر بتپەرستیی كراوە، خواپەرستیی بكرێت بەبێ هاوبەش بۆ بڕیاردان.

## بەش

ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: كە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مەككەی فەتح كرد و لەتەبوك بوویەوە و سەقیفیش موسڵمان بوون و بەیعەتیان دا، لەهەموو لایەكەوە شاندەكانی عەرەب هاتنەلای، پۆل پۆل لەهەموو لایەكەوە هاتنە نێو ئیسلامەوە[1].

[1] – بڕوانە: سيرة ابن هشام٢/٥٥٩–٥٦٠.

## بەشی سێیەم: پزیشکی پەیامبەرایەتیی

### ١- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لە پزیشکییدا

نەخۆشیی دوو جۆرە: نەخۆشییەکانی دڵ، نەخۆشییەکانی جەستە، هەردوو جۆریش لەقورئاندا باس کراون.

نەخۆشییەکانی دڵ دوو جۆرە: نەخۆشیی شوبهە و گومان، نەخۆشیی شەهوەت و گومڕایی، هەردوو جۆر لەقورئاندا باس کراون. خوای گەورە لەبارەی نەخۆشیی شوبهە و گومانەوە ئەفەرمووێ:﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا ﴾ **البقرە: ١٠** ، واتا: لە دڵیاندا نەخۆشی(ناپاکی)هەیە خواش نەخۆشی یەکەی زۆرتر کردن(بەهاتنی قورئان).

هەروەها فەرموویەتی:

﴿ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا ﴾ **المدثر: ٣١** ،واتا: تا بڵێن ئەوانەی کە نەخۆشی(ناپاکیی)یان لە دڵایە وە بێ بڕواکان، خوا چی مەبەستە بەم ژمارەیە کە لە غەریبیدا وەك مەتەڵ وایە.

خوای گەورە سەبارەت بەو کەسەی بانگ دەکرێت بۆلای بڕیاری قورئان و فەرموودە، کەچی ڕەتیدەکاتەوە و پشت هەڵدەکات، دەفەرمووێت:﴿ وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ارْتَابُوا أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ بَلْ أُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ **النور: ٤٨ — ٥٠** ،واتا: کاتێك بانگ بکرێن بۆ لای(شەریعەتی)خوا و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی حوکم بکات لەنێوانیاندا یەکسەر کۆمەڵێك لەوانە ڕوو وەردەگێڕن. بەڵام ئەگەر(لەحوکمدانەکەدا) حەقەکە بۆ ئەوان بێت دێن بۆ لای(حوکمەکە)بەوپەڕی ملکەچیەوە. ئایە دڵەکانیان نەخۆشی تێدایە

یان لەگوماندا بوون یان دەترسن خواو پێغەمبەرەکەی(صلی الله علیه وسلم) ستەمیان لێ بکەن(نەخێر هیچ لەوانە نیە) بەڵکو ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن.
ئەوە نەخۆشیی گومان و شوبهە بوو.

هەرچی نەخۆشیی شەهوەتە، ئەوە خوای گەورە لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّۚ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٣٢﴾ ﴾ **الأحزاب: ٣٢** ،واتا: ئەی ژنانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئێوە وەك هیچ یەك لەئافرەتانی دیکە نین ئەگەر خۆتان بپارێزن و لەخوا بترسن کەواتە بەخەمزە و نازەوە قسە مەکەن(وەك ئافرەتانی ڕەوشت نزم)نەوەکو ئەوەی کە دڵی نەخۆشە(دەرون نزمە) نیازی خراپ بکات(کەواتە) قسەی چاك و بەجێ بکەن.
ئەوە نەخۆشیی شەهوەتی داوێنپیسییە، خواش زاناترە.

هەرچی نەخۆشییەکانی جەستەیە، ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ ﴾ **النور: ٦١** ،واتا: کوێر گوناهی لەسەر نیە و شەل گوناهی لەسەر نیە هەروەها نەخۆش گوناهی لەسەر نیە.
لەحەج و ڕۆژوو و دەستنوێژدا باسی نەخۆشیی جەستەی کردووە، ئەوەش لەبەر هۆیەکی ناوازە و بەهۆیەوە گەورەیی قورئانت بۆ دەردەکەوێ،بۆ کەسێ لێی تێبگات ئەوە بەسە و پێویستی بەشتی تر نابێ، ئەویش ئەوەیە ڕێساکانی پزیشکی جەستەیی سێ شتە: پاراستنی لەشساغی، خۆپاراستن لەهەر شتێك بێتە مایەی ئازار، خاڵیکردنەوەی شتە خراپەکان لەجەستەدا. خوای گەورە لەو سێ شوێنەدا ئەو سێ شتەی باسکردووە.

لەئایەتی ڕۆژوودا فەرموویەتی: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ ﴾ **البقرة: ١٨٤** ، واتا: هەرکەسێك لەئێوە نەخۆش بوو یا لەسەفەردا

بوو(وه بەڕۆژوو نەبوو) ئەوە پێویستە بەئەندازەی ئەو ڕۆژانەی(بەڕۆژوو نەبووە) قەزای بکاتەوە لەڕۆژانی تردا.

خوای گەورە ڕێگەی داوە کەسی نەخۆش بەهۆی عوزری نەخۆشییەوە بەڕۆژوو نەبێ، ڕێبواریش لەبەر پاراستنی لەشساغی و هێزی تاوەکو بتوانێ سەفەرەکەی بکات، بەڕۆژوو نەبێ، چونکە بەهۆی جوڵەی زۆرەوە ئەگەر بەڕۆژووبێ، ئەوە مەترسیی نەخۆشکەوتن و کەمبوونەوەی هێزی لێ دەکرێت، چونکە نەخواردن و نەخواردنەوە هێزی لاواز دەکات، بۆیە دەتوانێ بەڕۆژوو نەبێ تاوەکو هێزی خۆی بپارێزێ.

لەئایەتی حەجدا ئەفەرمووێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴾ **البقرة: ١٩٦** ،واتا: هەرکەسێك لەئێوە نەخۆش بوو یا ئازارێك لەسەریدا بوو(ئەگەر سەری تاشی)بریتیەك بدات کە ڕۆژووی(سێ ڕۆژە)یان خێرێك یان قوربانیەك بکات.

خوای گەورە ڕێگەی داوە بۆ نەخۆش یان ئەو کەسەی ئازار لەسەریدا هەیە بەهۆی ئەسپێ یان خوران و شتی ترەوە، لەئیحرامدا سەری بتاشێ تاوەکو ئەو مادده و شتە پیسە لەسەریدا نەمێنێ و ئەو ئازار و بێزارییەی بۆ دروست کردووە لەژێر ئەو قژەدا. جا ئەگەر کەسەکە سەری تاشی، کونە وردیلەی سەری دەکرێنەوە و ئەو هەڵم و پیسییەی لێ دەردچێ. ئەو خاڵیکردنەوەیە، هەموو خاڵیکردنەوەکانی تری لەسەر قیاس دەکرێت کە گلدانەوە و هێشتنەوەی لەلاشەدا ئازار و نارەحەتیی دروست دەکات.

ئەو شتانەی گلدانەوە و هێشتنەوەی لەلاشەدا ئازار و نارەحەتیی دروست دەکات، دە شتە: خوێنی زۆر، مەنیی(تۆو)ی زۆر، میز، پیسایی(پاشەڕۆ)، ڕشانەوە، پژمە،

خەو، برسێتی، تینوێتی، هەریەك لەو دە شتە ئەگەر گل بدرێنەوە و خاڵیی نەکرێنەوە، هەر یەکەو دەردێك دروست دەکەن.

هەرچی خۆپارێزییە، ئەوە خوای گەورە لەئایەتی دەستنوێژدا فەرموویەتی:﴿ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾ **النساء: ٤٣** ،واتا:ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بوون یان کەسێك لەئێوە هاتەوە لەشوێنی دەست بەئاو گەیاندنەوە یان جووت بوون لەگەڵ خێزانەکانتاندا(یا لە یەك کەوتن لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەمدا)ئەمجا ئاوتان دەست نەکەوت ئەوە بەخۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن.

خوای گەورە رێگەی بەنەخۆش داوە لەجیاتی ئاو، خۆڵ بەکار بهێنێ، وەك خۆپارێزییەك بۆ جەستەی لەڕووبەڕووبوونەوەی هەر ئازار و ناڕەحەتییەك تووشی بێ، ئەمە وریاکردنەوەیە بۆ خۆپارێزیی لەهەر ئازارێك لەناوەوەی جەستە یان لەدەرەوەی جەستە بۆ کەسەکە دروست ببێ.

هەرچی پزیشکیی دڵانە، ئەوە تەنیا لەڕێگەی پەیامبەرانەوە(سەلامی خوایان لەسەربێ) لێی تێدەگەین. چاکی و لەبارێتیی دڵ ئەوکاتە دێتەدی، کە پەروەردگار و بەدیهێنەری خۆی بناسێ و ناو و سیفەت و کار و ئەحکامەکانی خوا بناسێ، رەزامەندیی و خۆشویستنی خوای بەلاوە گرنگ بێ و دووربگرێ لەنەهی و ئەو شتانەی خوا تووڕە دەکەن. بێگومان تەنیا بەوە لەبارێتی و ژیانی دڵ فەراهەم دەبێ.

هەرچی پزیشکیی جەستەییە، ئەوە دوو جۆرە:

جۆرێکی، ئەوەیە کە خوای گەورە مرۆڤ و گیانلەبەرانی لەسەر فێرەت داوە، پێویستی بەچارەسەر نییە، وەك پزیشکی برسێتی و تینیوێتی و سەرمابوون و ماندوویەتی، بەرانبەرەکانیان جێبەجێ بکرێت چارەسەر دەبن.

دووەم: ئەوەی پێویستی بەبیرکردنەوە و رامان هەیە، وەك پاڵدانی ئەو نەخۆشییانەی لەمیزاجی مرۆڤدا روودا‌و دروست دەکەن و لەبارێتی و ساغیی لەمرۆڤدا دەشێوێنن.

## ٢- رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەخۆ چارەسەرکردنی بەدەرمانی تەنیا

یەکێك لەرێباز و رێوشوێنەکانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، بەخۆی دەرمان و چارەسەری بەکارهێناوە، فرمانی بەخێزان و کەسوکار و هاوەڵانیشی کردووە لەوانەی نەخۆشکەوتوون، ئەوە بکەن. رێباز و رێنمایی خۆی و هاوەڵانی نەبووە دەرمانی تێکەڵ و ئاوێتە بەکاربهێنن، زۆربەی دەرمانەکانیان تەنیا بووە، هەندێجار شتی تریان تێکەڵ کردووە لەوەی یارمەتیی ئەو دەرمانە بدات یان توندییەکەی کەم بکاتەوە.

## ٣- سەلماندنی هۆکار و چارەسەر لەلایەن پەیامبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)

موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەجابری کوڕی عەبدوڵڵاوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ، بَرَأَ بِإِذْنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»[1]،واتا:هەموو دەردێ دەرمانێکی هەیە، ئەگەر دەرمانەکە دەردەکە بپێکێ، ئەوە بەویستی خوا لەو نەخۆشییە چارەسەری دەبێ.

---

[1] = موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٠٤).

لەئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: «مَا أَنْزَلَ اللّٰهُ مِنْ دَاءٍ إِلَّا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً»[1]،واتا: خوای گەورە هەر دەردێکی دابەزاندبێ، شیفا و چارەسەرێکیشی بۆ دابەزاندووە.

ئەم فەرموودانە هۆکار و چارەسەری ئەو هۆکارانەیان لەخۆگرتووە، قسە ئەو کەسە پوچەڵ دەکاتەوە کە ئەوە رەتدەکاتەوە، بەڵام ئەوە هەیە زانستێکە خوای گەورە بۆ هەموو مرۆڤێك فەراهەمی نەکردووە، تەنیا ئەوانە دەیزانن کە خوای گەورە رێگەی فێربوونی بۆ کردوونەتەوە.

لەفەرموودە سەحیحەکاندا هاتووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فرمانی کردووە بەچارەسەر وەرگرتن، ئەوەش دژ نییە بەپشت بەستن(التوکل)بەخوای گەورە، هەروەك دژ نییە بەوەی بەئاوخواردنەوە چارەسەری دەردی تینوێتی و بەخواردن چارەسەری برسێتی بکرێت، هەروەها بەخۆگەرمکردنەوە چارەسەری سەرمابوون بکرێت. بەڵکو حەقیقەتی یەکتاپەرستیی بەوە دێتەدی، ئەو هۆکارانە وەربگری کە خوای گەورە بەپێی قەدەر و شەرع دایناون، لەکارخستنی وەرگرتنی چارەسەر و هۆکار بۆ چارەسەر، لەخودی خۆیدا زیانە لەباوەڕی پشت بەستن.

کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"هەموو دەردێك دەرمانێکی هەیە"، ئەوە بەهێزکردنی دەروونی نەخۆش و پزیشکە، هانی نەخۆش و پزیشك دەدات بۆ گەڕان بەدوای چارەسەردا.

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٧٨).

## ٤- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) بۆ خۆپارێزی لەزیادەخۆری و ئەو یاسایەی کە پێویستە لەخواردن و خواردنەوەدا ڕەچاو بکرێت

لەموسنەد و شوێنانی تردا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:«مَا مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ لُقَيْمَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ فَاعِلًا، فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ»[1]،واتا: مرۆڤ هیچ شتێك پڕ ناکات خراپتربێ لەپڕکردنی سکی، زیاتر لەوە بێ هێزی پێ بدەن، ئەگەر کەسێ نانی خوارد، با یەك لەسەر سێی گەدەی بۆ خواردن بێ، یەك لەسەر سێی بۆ ئاو و یەك لەسەر سێی بۆ هەناسە بهێڵێتەوە.

پڕکردنی گەدە بەخواردن، زیانی بۆ دڵ و جەستە هەیە، ئەمە ئەگەر هاتوو هەمیشە یان زۆربەی کات بەو جۆرە بوو، بەڵام هەندێجار کێشە نییە. ئەبو هورەیرە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە شیری خواردووەتەوە تاوەکو وتوویەتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە، ڕێ نەما تێی بکەم. هاوەڵانیش چەند جارێك لەئامادەبوونی ئەودا ئەوەندەیان خواردووە تاوەکو تێربوونە.

## ٥- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەچارەسەر وەرگرتن بەدەرمانی سرووشتی و خوایەتی و ئاوێتەکردنی هەردوو چارەسەر

چارەسەری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ نەخۆشیی سێ جۆر بووە:

یەکەم: چارەسەر بەدەرمانی سرووشتی.

دووەم: چارەسەر بەدەرمانی خوایی.

سێیەم: بەئاوێتەکردنی هەردوو جۆر.

ئێمەش لێرەدا هەرسێ جۆری چارەسەری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)باس دەکەین:

---

[1] – ترمیزی(٢٣٨٠) و ئیبن ماجە(٣٣٤٩) ئیخراجیان کردووە.

یەکەم: چارەسەر بەدەرمانی سرووشتی:

## ٦- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەچارەسەری تا

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەنافیعەوە ئەویش لەئیبن عومەرەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«إِنَّمَا الْحُمَّى –أَوْ شِدَّةُ الْحُمَّى– مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَأَبْرِدُوهَا بِالْمَاءِ»[1]،واتا: تا یان تای سەخت لەهەڵمیی و گڕی دۆزەخە، بەئاو، فێنك و ساردی بکەنەوە.

هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە:«شِدَّةُ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»،واتا:گەرمای سەخت، بەشێکە لەگڕیی دۆزەخ.

فەرمایشتی بەئاو چارەسەری بکەن(بِالْمَاءِ) دوو بۆچوونی لەسەر هەیە:

یەکەم: هەموو ئاوێك دەگرێتەوە، ئەمە سەحیح و تەواوە.

دووەم: ئاوی زەمزەم، خاوەنانی ئەم بۆچوونە بەڵگە دەهێننەوە بەوەی بوخاری گێڕاویەتییەوە لەسەحیحەکەیدا لەئەبو جەمرە نەسری کوڕی عیمران ئەلزەبعی، ئەڵێ: لەمەککە لای ئیبن عەباس دادەنیشتم، تا گرتمی، وتی: بەئاوی زەمزەم لەخۆتی بکەرەوە و خۆت چارەسەر بکە، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: :«إِنَّمَا الْحُمَّى –أَوْ شِدَّةُ الْحُمَّى– مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَأَبْرِدُوهَا بِالْمَاءِ، أو قال: بماء زمزمَ»[2]،واتا: تا یان تای سەخت لەهەڵمیی و گڕی دۆزەخە، بەئاو فێنك و ساردی بکەنەوە، یان فەرمووی: بەئاوی زەمزەم. گێڕەوەی ئەو باسە گومانی تێدا کردووە، ئەگەر دڵنیابووایە، ئەوە بۆ خەڵکی مەککە زۆر ئاسان دەبوو، چونکە زەمزەم لەمەککە و زۆرتر بۆ خەڵکی مەککە فەراهەم ترە و خەڵکی تر ئاوی تریان هەیە.

---

[1] – بوخاری(٥٧٢٣) و موسلیم(٢٢٠٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٢٣٦١).

**٧- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەسەرکردنی سکچوون**

لەسەحیحەیندا هاتووە: لەئەبو سەعیدی خودرییەوە، کە پیاوێك هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتی: براکەم بەدەست ئازاری سکییەوە دەناڵێنێ، لەگێڕانەوەیەکدا:سکچوونی. فەرمووی:"هەنگوینی پێ بدە". کابرا ڕۆیشت و پاشان گەڕایەوە وتی: هەنگوێنم پێ دا بەلاَم هیچ سوودی لێ نەبینێ، سکچوونەکەی زیاتر کرد، دوو جار یان سێ جار هاتەوە و پەیامبەری خوا هەر دەیفەرموو:"هەنگوینی پێ بدە"، لەسێیەم جار یان چوارەم جاردا فەرمووی: "صَدَقَ اللَّهُ، وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ"[1]،واتا: خوا ڕاستی کرد و سکی براکەت درۆی کرد. لەسەحیحی موسلیمدا بەلەفزی خۆی هاتووە: براکەم هەرسی خراپ بووە[2] و گەدەی دەردەدار بووە.

لەفەرمایشتی:«صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ» ئاماژەیە بۆ ئەوەی سوودی ئەو دەرمانە بەدیهاتووە، مانەوەی دەرد و نەخۆشییەکە بەهۆی دەرمانەکەوە نییە، بەڵکو بەهۆی درۆی ئەو سکەوەیە و ماددەی خراپی زۆر تێدایە، بەهۆی زۆریی ئەو ماددانەی دۆخیان خراپ کردووە، فرمانی پێ کردووە ئەو دەرمانە چەند جارێك دووبارە بکاتەوە.

**بەش**

خەڵکیی جیاوازن لەبارەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەوە:﴿ يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ ﴾ **النحل: ٦٩** ،واتا: لەسکی ئەو(هەنگانەوە)دێتە دەر خواردنەوەیەك(هەنگوین) کە ڕەنگەکانی جیاوازە کە شیفای تێدایە بۆ خەڵکی.

---

[1] - بوخاری(٥٦٨٤) و موسلیم(٢٢١٧) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢١٧).

ئایە جێناوی(فِيهِ) بۆ هەنگوین دەگەڕێتەوە یان بۆ قورئان؟ بۆ ئەوە بوونەتە دوو بەشە، بەڵام دروست ئەوەیە بۆ هەنگوین(شَرَابٌ) دەگەڕێتەوە.

## ٨- ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەتاعون و چارەسەرکردن و خۆپاراستن لەو نەخۆشییە

لەسەحیحەیندا هاتووە لەعامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە ئەویش لەباوکیەوە کە گوێی لێبووە پرسیاری لە ئوسامەی کوڕی زەید کردووە: لەبارەی تاعونەوە چی شتێکت لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) گوێ لێبووە؟ ئوسامە وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«الطَّاعُونُ رِجْزٌ أُرْسِلَ عَلَى طَائِفَةٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، وَعَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ، فَلَا تَدْخُلُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلَا تَخْرُجُوا مِنْهَا فِرَارًا مِنْهُ»[1]،واتا:تاعون سزایەکە خوای گەورە ناردوویەتییە سەر بەنی ئیسرائیل و خەڵکانی پێش ئێوە، ئەگەر گوێتان لێ بوو تاعون لەشوێنێك هەیە، مەچنە ئەو شوێنەوە، ئەگەر لەشوێنێکدا رووی دا و ئێوەش لەو شوێنەدا بوون، لێی دەرمەچن و هەڵبێن.

لەسەحیحەیندا هاتووە لەحەفسەی کچی سیرینەوە وتی: ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»[2]،واتا: تاعون بۆ هەموو موسڵمانێك شەهادەتە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەوەی بۆ ئوممەتەکەی دایناوە نەچنە ئەو شوێنەی تاعونی تێدا بڵاوبووەتەوە و ئەگەر لەو شوێنەش بن لێی دەرنەچن، تەواوی خۆپارێزیی تێدایە، مرۆڤ بچێتە شوێنێکی لەو جۆرە کە خۆی ڕووبەڕووی

---

[1] - بوخاری(٣٤٧٣) و موسلیم(٢٢١٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٥٧٣٢) و موسلیم(١٩١٦) ئیخراجیان کردووە.

تیاچوون دەکات، پێچەوانەی شەرع و عەقڵە، ئەوەشی نەهیکردووە لەو شوێنە دەربچێت، هاندانی دەروونە بۆ متمانە بوون بەخوا و پشت بەستن بەخوا و ئارامگرتن لەسەر قەزای خوا و رازیبوون پێی.

## ٩- رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەدەردی تینووبردن و چارەسەرکردنی

لەسەحیحەیندا هاتووە:لەفەرموودەیەکی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتی: هەندێ لەعورەینە و عوکەل هاتن بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەمەدینە و شەکوای حاڵی تینووبردنی خۆیانیان لا کرد،پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فرمانی پێکردن:"لَوْ خَرَجْتُمْ إِلَى إِبِلِ الصَّدَقَةِ فَشَرِبْتُمْ مِنْ أَلْبَانِهَا و أَبْوَالِهَا"،واتا: بچن بۆلای وشترەکانی زەکات، لەشیر و میزیان بخۆنەوە. ئەوانیش ئەوەیان کرد، کە چاکبوونەوە، دەستیان دایە کوشتنی شوانەکان و سەربڕینی وشتر، شەڕی خوا و پەیامبەریان کرد، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خەڵکی بەدوایاندا نارد و دەست و قاچی بڕینەوە و چاوی هەڵکۆڵین و فڕێ درانە بەر خۆر هەتاوەکو مردن[1].

بەڵگە لەسەر ئەوەی تێرنەبوون بەئاوخواردنەوە نەخۆشیی ئەوان بوو، ئەوەیە کە موسلیم لەسەحیحەکەیدا دەیگێڕێتەوە کە وتوویانە: کە چووینە مەدینە، سکمان گەورە بوویەوە و ئێسکمان لاوازبوویەوە. تەواوی فەرموودەکەی باس کردووە[2].

لەمەدا بەڵگەیە هەیە لەسەر تیمارکردن و چارەسەریی، هەروەها پاکیی میزی ئاژەڵێ گۆشتی بخورێت. چارەسەروەرگرتن بەشتی حەرام جائیز نییە. ئەگەرچی تازە موسڵمان بووبوون، فرمانیان پێ نەکرا بۆ نوێژکردن دەمیان و ئەو پۆشاکەیان پاك بکەنەوە کە میزی وشتری بەرکەوتبوو.

---

[1] - بوخاری(٦٨٠٢) و موسلیم(١٦٧١) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٢٣٣) و موسلیم(١٦٧١) ئیخراجیان کردووە و ئەبو عوانەش لە المستخرج(٦٠٩٦) و لەفزەکە هی ئەوە.



## ١٠-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەچارەسەرکردنی برینیدا

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەبو حازمەوە، کە گوێی لێیبووە سەهلی کوڕی سەعد پرسیاری کردووە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەچی چارەسەر کراوە کە ڕۆژی ئوحود بریندار بووە، وتویەتی: دەموچاوی برینداربووە و هەر چوار دانی پێشەوەی شکاوە، کڵاوە ئاسنینەکەی لەسەردا شکاوە، فاتیمەی کچی پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) خوێنەکەی پاك دەکردەوە،عەلیش بەقەڵغانەکەی ئاوی پێدا کردووە، کە فاتیمە بینیوێتی زیاتر خوێنی لەبەر دەڕوا، پارچە حەسیرێك دەهێنێ و ئەیسوتێنێ هەتا دەیکاتە خۆڵەمێش و ئەینوسێنێ بەبرینەکەی پەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) و بەوە خوێنەکە دەوەستێتەوە[1].

## ١١-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەچارەسەرکردن بەخواردنەوەی هەنگوین و کەڵەشاخ و داخ کردن

لەسەحیحی بوخارییدا هاتووە: لەئیبن عەباسەوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە فەرموویەتی:«الشِّفَاءُ فِي ثَلَاثٍ: شَرْبَةِ عَسَلٍ، وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ، وَكَيَّةِ نَارٍ، وَأَنَا أَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ»[2]،واتا: چارەسەر و شیفا لەسێ شتدایە: هەنگوین، کەڵەشاخ، داخ کردن، بەڵام من نەهی ئوممەتەکەم دەکەم لەداخ کردن.

سەبارەت بەکەڵەشاخ: ئەوە لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەنەسەوە کە ئەبو تەیبە کەڵەشاخی بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)کردووە، فرمانی داوە دوو ساع خۆراکی پێ بدرێت و قسەی لەگەڵ خزمەتکارەکەی کردووە و ئەوانیش شوێنی لێدراوەکەیان لەسەر سووك کردووەتەوە،فەرموویەتی:"خَيْرُ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ"[3]، واتا: کەڵەشاخ کردن باشترین شتێکە خۆتانی پێ چارەسەر بکەن.

---

[1]- بوخاری(٢٩١١) و موسلیم(١٧٩٠) ئیخراجیان کردووە.

[2]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٨٠).

[3]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٩٦).

ئەنەس(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پشتە مل و ناوشانی کەڵەشاخی کردووە[1].

لەسەحیحدا لێیەوە هاتووە کە لەئیحرامدا بووە بەهۆی ئێشی سەریەوە، لەسەری کەڵەشاخی کردووە[2].

لەسووننەنی ئەبو داوودا هاتووە لەفەرموودەیەکی جابرەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم):لەسمتی کەڵەشاخی کردووە بەهۆی لەجێ چوونەوە[3].

## ١٢-رێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەکاتەکانی کەڵەشاخکردندا

ترمیزی لە(جامع)ەکەیدا ئەگێڕێتەوە لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسەوە کە رەفعی ئەکات:«إِنَّ خَيْرَ مَا تَحْتَجِمُونَ فِي يَوْمِ سَابِعَ عَشْرَةَ، أَوْ تَاسِعَ عَشْرَةَ، وَيَوْمِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ»[4]،واتا: باشترین کاتێك کەڵەشاخ بکەن، رۆژی حەڤدەیەم یان نۆزدەیەم یان بیست و یەکە.

## بەش

لەنێو ئەو فەرموودانەی پێشوودا ئەمە دەبینین: سووننەتە(موستەحەبە) تیمارکردن و کەڵەشاخ بکرێت، لەو شوێنەی پێویستی پێ هەیە، جائیزە کەسێ لەئیحرامدایە کەڵەشاخ بکات. ئەگەر پێویست بکات هەندێ قژیش ببڕدرێت هەر جائیزە. لەبابەت واجیببوونی فیدیە لەسەر ئەو کارە تێبینیی هەیە و واجیببوون بەهێز نییە. جائیزە کەسی رۆژووەوان کەڵەشاخ بکات، چونکە لەسەحیحی بوخارییدا هاتووە، پەیامبەری

---

[1] – ئەبو داوود(٣٨٦٠) و ترمیزی(٢٠٥١) ئیخراجیان کردووە.
[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٩٩، ٥٧٠٠، ٥٧٠١).
[3] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٨٦٣).
[4] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٢٠٥٣).

خوا(صلى الله عليه وسلم) بەڕۆژوو بووە کەڵەشاخی کردووە[1]. بەڵام ئایە بەوە ڕۆژووی دەشکێ یان نە؟ ئەمە بابەتێکی ترە، دروست: ئەوەیە بەکەڵەشاخ کردن ڕۆژوو دەشکێ، بەهۆی ئەوەی دروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە.

## ١٣-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبڕینی دەمار و داخکردن

لەسەحیحدا سەلماوە لەفەرموودەیەکی جابری کوڕی عەبدوڵلاوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پزیشکێکی ناردووە بۆلای ئوبەی کوڕی کەعب، پزیشکەکە دەمارێکی بۆ کەعب بڕیووەو داخی کردووە[2]. کە سەعدی کوری موعاز دەمارێکی قۆڵی برینداربوو، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داخی کرد، پاشان ئاوسا بۆ جاری دووەم داخی کردەوە[3]. لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسەوە کە بەهۆی هەوکردنی پەردەی سییەوەی داخبوونی کردووە و پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) زیندوو بووە[4].

لەفەرموودەی(متفق عليه)دا هاتووە:«وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ»[5]،واتا: حەز بەداخکردن ناکەم. بەلەفزێکی تر هاتووە:«وَأَنَا أَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ»[6]،واتا: من نەهی ئوممەتەکەم دەکەم لەداخ کردن. لەسەحیحدا سەلماوە لەفەرموودەی ئەو حەفتا هەزار کەسەی بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت، ئەوانەن کە: «الَّذِينَ لَا يَسْتَرْقُونَ وَلَا يَكْتَوُونَ وَلَا يَتَطَيَّرُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ»[7]،واتا: داوای روقیە ناکەن، خۆیان داخ ناکەن و ڕەشبین نین و پشت بەپەروەردگاریان دەبەستن.

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٩٤).

[2] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٠٧).

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٠٨).

[4] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٧١٩، ٥٧٢١).

[5] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٧٠٤) و موسلیم(٢٢٠٥) ئیخراجیان کردووە.

[6] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٨٠).

[7] - بوخاری(٥٧٥٢) و موسلیم(٢٢٠) ئیخراجیان کردووە.

فەرموودەکانی داخ کردن ئەم چوار جۆرە لەخۆ دەگرێت:

یەکەم: ئەنجامدانی.

دووەم: حەزی پێ نەکردووە.

سێیەم: پیاهەڵدانی ئەو کەسەی وازی لێهێناوە.

چوارەم: نەهی لێکردووە.

سوپاس بۆ خوا دژ و ناتەواوییان لەنێواندا نییە، ئەوەی ئەنجامی داوە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی ئەنجامدانی جائیزە، حەزی پێ نەکردووە واتای حەرامبوون ناگەیەنێ، پیاهەڵدانی بۆ ئەو کەسەی وازی لێدەهێنێ، بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی نەکردنی باشتر و لەپێشترە، سەبارەت بەنەهی لێکردنیشی، ئەوە بۆ سەرپشکی و کەراهەتە، یان ئەو جۆرەیە کە پێویست نییە، یان لەترسی روودانی دەرد و نەخۆشییدا ئەنجامدانی دەدات، خواش زاناترە.

## ١٤-رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه و سلم ) لەچارەسەکردنی پەرکەمدا( الصرع )

لەسەحیحەیندا بوخاری و موسلیم ئیخراجیان کردووە لەفەرموودەیەکی عەتائی کوڕی ئەبی رەباحەوە ئەڵێ: ئیبن عەباس وتی: ئافرەتێکت پیشان بدەم کە ئەهلی بەهەشتە؟ وتم: بەڵێ بۆ نا. وتی: ئەو ئافرەتە رەشە هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتی: من پەرکەم دەمگرێ و جەستەم ئەکەوێتە دەر، لەخوا بۆم بپاڕێرەوە، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ لَكِ أَنْ يُعَافِيَكِ"،واتا: ئەگەر بتەوێ ئارام بگری ئەوە بەهەشتت بۆ دەبێ، ئەگەر بشتەوێ ئەوە لەخوا بۆت دەپاڕێمەوە و چاک دەبیتەوە. ژنەکە وتی: ئارام دەگرم، بەڵام ئەوکاتە جەستەم بەدەردەکەوێ، لەخوا بپاڕێرەوە بەدەر نەکەوێ، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم)بۆی پاڕایەوە[1].

---

[1] -بوخاری(٥٦٥٢) و موسلیم(٢٥٧٦)ئیخراجیان کردووە.

## ١٥-رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەچارەسەرکردنی دەردەلاق-بادارپی(عرق النّسا)

ئیبن ماجە لەسووننەکەیدا ئیخراجی کردووە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو:«دَوَاءُ عِرْقِ النَّسَا أَلْيَةُ شَاةٍ أَعْرَابِيَّةٍ، تُذَابُ ثُمَّ تُجَزَّأُ ثَلَاثَةَ أَجْزَاءٍ، ثُمَّ يُشْرَبُ عَلَى الرِّيقِ فِي كُلِّ يَوْمٍ جُزْءٌ»،واتا:دەرمانی دەردەلاق، بریتییە لەدوگی شەك مەڕی ئەعرابی، دەتوێنرێتەوە و پاشان دەکرێتە سێ بەشەوە، هەموو ڕۆژێك لەسەر سکی ڕووت بەشێکی دەخورێتەوە.

دەردەلاق(عِرق النِّسا): ئازارێکە لەجومگەی سمتەوە دەستپێدەکات و لەپشتەوە دادەبەزێ بۆ سەر ران و هەندێجاریش بۆ سەر پاژنە پێ، هەرکاتێ ماوەکەی درێژە بکێشێ، دابەزینیشی درێژە ئەکێشێ و قاچ و رانیش لەگەڵیدا لاواز دەبێ.

شەك مەڕی ئەعرابیی دەستنیشان کردووە، ئەوەش لەبەر کەمیی پسیی لەجەستەی و بچووکیی ئەندازەکەی و ناسك و جوانییەکەی و تایبەتمەندیی لەوەڕاندنی، چونکە گژو گیای دەشتی گەرم دەخوات نمونەی تاڵیشك و جاترە و شتانی تر.

## ١٦- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەسەرکردنی سرووشت وشك و پێویستبوونی ئەو کەسە بەو شتەی سرووشتی نەرم بکات

لەسووننەنی ئیبن ماجەدا هاتووە: لەعەبدوڵلای کوڕی ئوم حەرامەوە، کە رووەو هەردوو قیبلە لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) نوێژی کردووە ئەڵێ: گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو:"عَلَيْكُمْ بِالسَّنَا وَالسَّنُّوتِ، فَإِنَّ فِيهِمَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ "،واتا: سەننا و سسەننوت[1] بەکاربهێنن، شیفای هەموو دەردێکن تەنیا ئەلسام نەبێ. وترا: ئەی پەیامبەری خوا السام چییە؟ فەرموو: مردن.

---

[1]- السنا: رۆکێکە لەنێو دەرمانەکاندا ناسراوە. السنوت: وتراوە واتا هەنگوین، وتراویشە: زیرەیە، وتراوە شتی ترە.

## ١٧- ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەکردنی خورانی جەستە و ئەوەی ئەسپێ دروستی دەکات

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەڵێ:پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕێگەی دا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری عەوام(خوایان لێ ڕازیی بێ) حەریر(ئاورێشم)لەبەر بکەن بەهۆی ئەوەی تووشی خورانی جەستە هاتبوون. لەگێڕانەوەیەکدا: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەوام(خوایان لێ ڕازیی بێ) شەکوای ئەوەیان هێنایەلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە ئەسپێ دۆخی تێکداون، ئەویش مۆڵەتی دان ئاورێشم لەبەر بکەن و لەبەریشیان بینیم[1]. بەرگی ئاورێشم دژە دروستبوونی ئەسپێیە.

## ١٨-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەسەرکردنی سەرئێشە و ژانی نیوە سەر( شەقیقە )

لەسەحیحدا هاتووە لەنەخۆشیی سەرەمەرگدا فەرموویەتی:"وا رأساهُ"[2]،واتا: ئای ئێشی سەرم. سەری بەشتێ گرێ دەدا، سەرگرێدان سوودی هەیە لەکەمکردنەوەی شەقیقە و ئازارەکانی دیکەی سەرئێشەدا.

بوخاری لە(التاریخ)ەکەیدا و ئەبو داوودیش لە(السنن)دا گێڕاویانەتەوە کە کەسێك شەکوای ئازاری سەری هێناوەتە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)یش فەرموویەتی:"احتجِم"،واتا: کەڵەشاخ بکە. لەئازاری قاچیشدا فەرموویەتی:"اخْتَضِبْ بِالْحِنَّاءِ"[3]،واتا: لەخەنەی بگرە.

---

[1] – بوخاری(٢٩١٩–٢٩٢٢) و موسلیم(٢٠٧٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٦٦).

[3] – بوخاری لە التاریخ الکبیر١/٤١١(١٣١٠) و ئەبو داوود ئیخراجیان کردووە(٣٨٥٨).

**١٩-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەچارەسەرکردنی نەخۆش بەوازهێنان لە پێدانی ئەو خواردن و خواردنەوەیەی حەزیان پێ نەدەکرد**

ترمیزی لەجامیعەکەیدا و ئیبن ماجەش گێڕاویانەتەوە لەعوقبەی کوڕی عامر ئەلجوهەنی ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: «لَا تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُطْعِمُهُمْ وَيَسْقِيهِمْ»[١]،واتا: نەخۆشەکانتان ناچار مەکەن بۆ خواردن و خواردنەوە، ئەوە خوای گەورە خواردن و خواردنەوەیان پێ دەدات.

**٢٠-ڕێبازی پەیامبەری خوا لەچارەسەرکردنی ئازاری قوڕگ و بۆنکردن**

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: «خَيْرُ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ، وَلَا تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ»[٢]،واتا: باشترین شتێك خۆتانی پێ چارەسەر بکەن، کەلەشاخ کردن و قیستی دەریایە، ئازاری منداڵەکانتان مەدەن بەپەنجە خستنە قوڕگیانەوە.

**٢١-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەخۆپارێزییدا**

دوو جۆر خۆپارێزیی هەیە:خۆپارێزییەك ڕێگر بێ لەتووشبوون بەنەخۆشی، خۆپارێزییەك نەخۆشەکە بەهێز ئەکات و ئەهێڵێ لەحاڵی خۆیدا بووەستێ. بنچینە لەخۆپارێزییدا ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە:﴿ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾ **النساء: ٤٣** ،واتا: ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون یان لەسەفەردا بوون یان

---

[١] - ترمیزی(٢٠٤٠) و ئیبن ماجه(٣٤٤٤) ئیخراجیان کردووە.

[٢] - بوخاری(٥٦٩٦) و موسلیم(١٥٧٧) ئیخراجیان کردووە.

کەسێك لەئێوە هاتەوە لەشوێنی دەست بەئاو گەیاندنەوە یان جووت بوون لەگەڵ خێزانەکانتاندا(یا لە یەك کەوتن لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەمدا)ئەمجا ئاوتان دەست نەکەوت ئەوە بەخۆڵێکی پاك تەیەموم بکەن.

نەخۆشی پاراستووە لەبەکارهێنانی ئاو، چونکە بەکارهێنانی ئاو لەو کاتەدا زیانی لێ ئەدات.

لەسوونەنی ئیبن ماجەدا هاتووە لەسوهەیبەوە ئەڵێ: هاتم بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و نان و خورمای لەبەردەم بوو، فەرمووی:"ادْنُ فَكُلْ"،واتا: وەرە پێشەوە بخۆ. منیش خورمایەکم هەڵگرت و خواردم، فەرمووی:"أَتَأْكُلُ تَمْرًا وَبِكَ رَمَدٌ؟"،واتا:خورما ئەخۆی لەکاتێکدا چاو ئێشەت هەیە و چاوت داهاتووە؟ وتم: ئەی پەیامبەری خوا بەم لایەی تر ئەیجوم، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بزەی کرد[1].

لەفەرموودەیەکی پارێزراو لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە:«إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا حَمَاهُ مِنَ الدُّنْيَا، كَمَا يَحْمِي أَحَدُكُمْ مَرِيضَهُ عَنِ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ»[2]،واتا:خوای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆشبووێ، لەدونیا ئەیپارێزێ چۆن یەکێ لەئێوە نەخۆشەکەی لەخواردن و خواردنەوە دەپارێزێ.

[1]–ئیبن ماجە(٣٤٤٣) ئیخراجی کردووە.

[2]– ئەحمەد٣٩/٣٣(٢٣٦٢٢) ئیخراجی کردووە لەمەحمودی کوڕی لەبیدەوە، ئیبن ئەبی ئەلدونیا لە الزهد(٣٨) و ئەلحاکم٤/٣٤٤(٧٨٥٧) لەمەحمودی کوڕی لەبیدەوە ئەویش لەقەتادەی کوڕی نوعمانەوە، ئەحمەد لە الزهد(١٨٣٢) لەبەکری کوڕی عەبدواللە ئەلموزەنی، ئەبو یەعلا لەموسنەدەکەیدا١٢/٢٧٨(٦٨٦٥) لەعوقبەی کوڕی رافیعەوە.

## ٢٢-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەچاککردنەوەی ئەو خواردنەی کە مێشی تێ دەکەوێ و ڕێنمایی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ نەهێشتنی زیانەکانی ژەهری ئەو مێشەی بەدژی خۆی

لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَامْقُلُوهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً وَفِي الْآخَرِ شِفَاءً»[1]،واتا: ئەگەر مێش کەوتە ناو قاپ و دەفری یەکێ لەئێوە، ئەوە مێشەکە قووت بدەنە ناو ئەو قاپە، چونکە لەباڵێکیدا دەرد و نەخۆشیی هەیە و لەباڵەکەی تریدا شیفا هەیە.

ئەبو عوبەید ئەڵێ: امقلوه، واتا:بیخەنە بن قاپەکە تاوەکو شیفاکەی لێ دەربچێ هەروەک چۆن لەسەرەتا دەردەکەی لێ دەرچووە[2].

## ٢٣-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەچارەسەرکردنی زیپکە

ئیبن ئەلسونی لەکتێبەکەیدا باسی لەهاوسەرێکی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ی کردووە وتوویەتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هات بۆلام و لەپەنجەیەکمدا زیپکە دەرچووبوو، فەرمووی:"عِنْدَكِ ذَرِيرَةٌ؟"،واتا:زەریرەت لا هەیە؟ وتم: بەڵێ. لەسەری دایبنێ و بڵێ:"اللَّهُمَّ مُصَغِّرَ الْكَبِيرِ، وَمُكَبِّرَ الصَّغِيرِ صَغِّرْ مَا بِي"[3]،واتا:خوایە گیان، تۆ کە بچووک گەورەتر ئەکەیتەوە و گەورەش بچووک دەکەیتەوە، ئەمەی من بچووک بکەرەوە.

الذَرِيرَةٌ: دەرمانێکی هیندییە لەقامیشی الذَرِيرَةٌ وەردەگیردرێت. لەسەحیحەیندا لەعائیشەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) هاتووە وتوویەتی:لەحەجی ماڵ ئاوای و لەئیحرام

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٧٨٢).

[2] - غريب احديث لأبي عبيد٢/٢١٥.

[3] - ابن السني ئیخراجی کردووە لە عمل اليوم والليلة(٦٣٥).

و غەیری ئیحرامدا بەدەستی خۆم زەریرەم بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بەکارهێنا[1].

## ٢٤-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەپێدانی نەرمترین خواردنێك كە نەخۆشەكە نەریتی پێ گرتووە

لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی عورووەوە ئەویش لەعائیشەوە، کەسێك لەبنەماڵەکەی مردبوو،ژنان کۆبوونەوە و دواتر بڵاوەیان لێکرد و گەڕانەوە ماڵی خۆیان، فرمانم کرد تەلبینەیەك لێبنرێ، لێی نرا، تریتم کرد و تەلبینەکەم کرد بەسەریدا. پاشان وتی: لێی بخۆن، گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) ئەیفەرموو: "التَّلْبِينَةُ مَجَمَّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ تَذْهَبُ بِبَعْضِ الْحُزْنِ"[2]،واتا: تەلبینە دڵی نەخۆش ئارام دەکاتەوە و بەشێ لەخەفەت ناهێڵێ.

## ٢٥-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەچارەسەرکردنی ئەو ژەهرەی لەلایەن جولەکەوە لەخەیبەر تووشی هات

عەبدولڕەزاق باسیکردووە لەعەبدولڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە:ئافرەتێکی جولەکە شەك مەڕێکی برژاوی لەمەسلیە لەخەیبەر کردە دیاریی. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"ئەمە چییە؟" وتی: دیارییە، وریایی کرد بڵێ سەدەقەیە، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەدەقەی نەدەخوارد. خۆی و هاوەڵانی لێیان خوارد، پاشان فەرمووی: "أَمْسِكُوا"،واتا: دەستهەڵگرن. بەئافرەتەکەی فەرموو:"هَلْ سَمَمْتِ هَذِهِ الشَّاةَ؟"، واتا: ژەهرت کردووە بەم شەك مەڕەوە؟ وتی: کێ ئەم هەواڵەی پێت دا؟ دەستی

---

[1] - بوخاری(٥٩٣٠) و موسلیم(١١٨٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] -بوخاری(٥٤١٧) و موسلیم(٢٢١٦) ئیخراجیان کردووە.

ئاژەڵەکەی بەدەستەوە بوو فەرمووی:"هَذَا الْعَظْمُ لِسَاقِهَا"،واتا: ئێسقانی ئەم دەستە. ژنەکە وتی: بەڵێ. فەرمووی:"لِمَ؟"،واتا: بۆچی؟ وتی: وتم ئەگەر درۆزن بی، ئەوە خەڵك لەدەستت ئەحەسێنەوە، ئەگەر پەیامبەر بی، ئەوە هیچ زیانێکت لێ نادات. ئەڵێ: پەیامبەری خوا لەسەر شانی سێ کەڵە شاخی کرد، فرمانی کردە هاوەڵانیشی کەڵەشاخ بکەن. کەڵەشاخیان کرد و چەند کەسێکیان کۆچی دواییان کرد[1].

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە لەسەر شان کەڵەشاخی کرد، بەوپێیەی نزیکترین شوێنێکە کەڵەشاخی بۆ بکرێ بۆ دڵ، ئەوە ژەهری تێکەڵ بەخوێن دەرچوو، هەمووی نە، بەڵکو کاریگەرییەکی لاوازی مایەوە، کە خوای گەورە ویستی بەشەهیدبوون رێز لەپەیامبەرەکەی بگرێت، کاریگەریی ئەو ژەهرەی دەرخست و نهێنیی فەرمایشتی خوا لەبارەی دوژمنانی خۆی لەجولەکە دەرکەوت کە فەرموویەتی:﴿ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾ **البقرە: ٨٧** ،واتا: جا هەرکاتێ پێغەمبەرێکتان بۆ بهاتایە بە جۆرێك کە بەدڵی خۆتان نەبوایە لووت بەرز بوون و خۆتان بەگەورە گرتووە جا دەستەیەکتان(لە پێغەمبەران)بە درۆ زانیوە وە دەستەیەکتان کوشتوون.

خوای گەورە بەرانبەریان بێژەی(كَذَّبْتُمْ )ی بەکارهێناوە بەشێوە فرمانی رابردوو، ئەمە لەڕابردوودا لێیان رووی داوە، هەروەها بێژەی(تَقْتُلُونَ )ی بەکارهێناوە بەشێوەی داهاتوو کە ئەگەر و چاوەڕوانیی دەکەن، خواش زاناترە.

---

[1]- عەبدولڕەزاق لە(المصنف)ەکەیدا ئیخراجی کردووە٦/٦٥(١٠٠١٩).

**٢٦-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) بەو سیحرەی کە جولەکە لێی کردبوو**

کۆمەڵێ خەڵك ئەمەیان ڕەتکردووەتەوە و وتوویانە: ناکرێ سیحر لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بکرێ، ئەمەیان بەعەیب و ناتەواویی وەرگرتووە، بەڵام بەو جۆرە نییە کە بۆی ڕۆیشتوون، چونکە ئەمە لەجۆری ئەو ئازار و ناخۆشییانەیە کە بەسەر پەیامبەری خوادا هاتووە(صلى الله عليه وسلم)، ئەوەش نەخۆشییەکە لەنەخۆشییەکان، وەك ئەو ژەهرەی تووشی هات و جیاوازیی لەنێوان ئەو دوو شتەدا نییە. لەسەحیحەیندا سەلماوە لەعائیشەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: سیحر لەپەیامبەری خوا کرا(صلى الله عليه وسلم) و وەهای بۆ خەیاڵ دەکرا لەگەڵ خێزانەکانیدا جووت بووە، کەچی ئەوەش ڕووی نەدابوو، سەختترین جۆری سیحر بوو[١].

قازیی عەیاز ئەڵێ:سیحر نەخۆشییەکە لەکۆی نەخۆشییەکان و دەردێکە، ئەکرێ وەك جۆرەکانی تری نەخۆشیی بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕوویدات، ئەوە ڕەتناکرێتەوە و تانەیەکیش نییە بۆ پەیامبەرایەتییەکەی، بەڵام ئەوەی خەیاڵی بۆ دەهات کارێکی ئەنجام دابێ لەکاتێکدا ئەوەی نەکردبێ، بەڕاست نازانرێ، چونکە بەڵگە و کۆدەنگیی هەیەو لەو کارە پارێزراو بووە[٢].

مەبەست: باس لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کراوە لەچارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییەدا، ئەویش دەرکردن و بەتاڵکردنەوەی سیحرەکەیە،هەروەك بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە بۆ ئەوە داوای لەپەروەردگاری کردووە، پێشانی داوە ئەو سیحرە لەنێو بیرێکدایە و گلۆڵەیەك قژە بەشانەیەکەوە و لەنێو شێوە قاپێکی لەدار خورما دروستکراودایە.

---

١- بوخاری(٥٧٦٥) و موسلیم(٢١٨٩) ئیخراجیان کردووە.

٢- (الشفا)ی القاضي عياض٢/١٨١.

بەش
دەرمانی خوایی لەبەسوودترین چارەسەرییەکانی سیحرە، بەخودی خۆی دەرمانی بەسوودی ئەو دەردەیە. سیحر کاریگەریی روحە پیس و نزمەکانە، ئەبێ بەبەرانبەر و پێچەوانەی خۆی ئەو کاریگەرییە لابدرێت، بەزیکر و ئایەت و ئەو دوعایانەی کاریگەرییەکەی پووچەڵ دەکەنەوە، ئەو ویرد و ئایەتانە چەندە بەهێزبن، زیاتر کاریگەریی لەپووچەڵبوونەوەی دەکەن.

## ٢٧-رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبابەت کەسێ چارەسەری خەڵك بکات، لەکاتێکدا نەزان بێ بە پزیشکیی

ئەبو داوود و نەسائی و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە لەفەرموودەیەکی عەمری کوڕی شوعەیبدا ئەویش لەباوکیەوە ئەویش لەباپیرەیەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«مَنْ تَطَبَّبَ وَلَمْ يُعْلَمْ مِنْهُ الطِّبُّ قَبْلَ ذَلِكَ فَهُوَ ضَامِنٌ»[1]،واتا:هەرکەسێ چارەسەری کەسێك بکات و پێشتر پزیشکێتی و چارەسەرکردنی لێ نەبینرابێ، هەرشتێك رووبدات لەئەستۆی ئەودایە.

## ٢٨-رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەخۆپاراستن لەنەخۆشیی گوازەرەوە و رێنماییکردنی ئەو جۆرە نەخۆشە لەدوورگرتنی لەکەسوکار

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەفەرموودەیەکی جابری کوڕی عەبدوڵلەدا(خوای گەورەی لێ رازیی بێ) کە لەنێو شاندی سەقیفدا پیاوێکی گەڕ هەبوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کەسێکی ناردە لای و پێیفەرموو:"ارْجِعْ فَقَدْ بَايَعْنَاكَ"[2]،واتا: بگەڕێرەوە بەیعەتی تۆمان وەرگرت.

---

[1] - ئەبو داوود(٤٥٨٦) و نەسائی(٤٨٣٠) و ئیبن ماجە(٣٦٤٤) ئیخراجیان کردووە.
[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٣١).

لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«لَا يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ»[1]،واتا: کەسی نەخۆشتان نزیکی لەشساغتان نەبێتەوە.

## ٢٩-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەڕێگریکردنی خۆ چارسەرکردن بەشتە حەرامکراوەکان

بوخاری لەسەحیحەکەیدا باسیکردووە لەئیبن مەسعودەوە: خوای گەورە شیفای نەخۆشیی ئێوەی نەخستووەتە ئەو شتانەی لێی حەرام کردوون[2].

لەسووننەندا لەئەبو هورەیرەوە هاتووە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهیکردن لەدەرمانی پیس[3].

لەسەحیحی موسلیم لەتاریقی کوڕی سوەید ئەلجەعفییەوە: کە پرسیاری لەپەیامبەری خوا کردووە(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی عەرەقەوە، نەهی لێکردووە، یان ڕەتیکردووەتەوە دروستی بکات. تاریق وتوویەتی: من بۆ دەرمان دروستی دەکەم. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّهُ دَاءٌ»[4]،واتا: دەرمان نییە، بەڵکو نەخۆشییە.

لێرەدا نهێنییەکی جوان هەیە لەوەی لەشتە حەرامکراوەکاندا شیفا بوونی نییە، چونکە یەکێك لەمەرجەکان چارەسەر وەرگرتن بەدەرمان، ئەوەیە دەرمانەکە قبوڵ کراو بێت و کەسەکە باوەڕی بەسوودی ئەو دەرمانە هەبێ، دیارە مرۆڤی

[1] - بوخاری(٥٧٧١) و موسلیم(٢٢٢١) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری پێش فەرموودەی(٥٦١٤) بەجەزم موعەللەقی کردووە.

[3] - ئەبو داوود(٣٨٧٠) و ترمیزی(٢٠٤٥) و ئیبن ماجە(٣٤٥٩) ئیخراجیان کردووە.

[4] -موسلیم ئیخراجی کردووە(١٩٨٤).

موسڵمانیش ئەو شتە بەحەرام دەزانێ و وەهای لێ دەکات سوودی لێ نەبینێ، جا کە لەو کاتەدا خواردی، بۆی دەبێتە دەرد نەك دەرمان.

**٣٠-رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەسەر کردنی ئەسپێی سەر و لابردنی**

لەسەحیحەیندا هاتووە لەکەعبی کوڕی عوجرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: ئازاری سەرم هەبوو،هەڵگیرام بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و ئەسپێ بەدەموچاومەوە بڵاوببووە، فەرمووی:"مَا كُنْتُ أَرَى الْجَهْدَ قَدْ بَلَغَ بِكَ مَا أَرَى"،واتا: ئەبینم ئەسپێ توانای لێ بڕیووی. لەگێڕانەوەیەکدا: فرمانی پێکرد سەری بتاشێت و نانی شەش کەس بدات یان شەك مەڕێ بکاتە خێر یان سێ ڕۆژ بەڕۆژووبێ.

**دووەم: بەشەکانی تایبەت بەرێبازی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەسەر کردنی بەدەرمانی روحانیی خوایی بەتەنیا و ئاوێتە کراو لەگەڵ دەرمانی سرووشتی**

**٣١-رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەسەر کردنی ئەو کەسەی بەچاو و نەفەس تووش بووە**

موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەئیبن عەباسەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«الْعَيْنُ حَقٌّ وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ»[1]،واتا: چاو لێدان(چاوپیسی)حەقە، ئەگەر بهاتبایە شتێك پێش قەدەر بکەوتبایە، ئەوە چاو پێشی دەکەوت.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٨٨).

لەسەحیحەکەیدا لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رێگەی داوە بەڕوقیەکردن بۆ تا و چاو و نەفەس و مێرووله[1].

لەسوونەنی ئەبو داوددا لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:فرمانی دەکرد بەچاولێدەر دەستنوێژ بشوات و چاولێدراو بەئاوی ئەو دەستنوێژە خۆی بشوات[2].

مالیك(بەڕەحمەت بێ) گێڕاویەتییەوە لەئیبن شیهابەوە ئەویش لەئەبی ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حەنیفەوە ئەڵێ:"عامری کوڕی ڕەبیعە، سەهلی کوڕی حەنیفی بینی خۆی دەشۆرد، وتی: سوێند بەخوا وەك ئەمڕۆ پێستی وەهام نەبینیووە. ئەڵێ: سەهل تووشی پەرکەم بوو، عامریان هێنایەلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و لەسەری توڕە بوو فەرمووی:"عَلَامَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ أَلَا بَرَّكْتَ اغْتَسِلْ لَهُ"،واتا: ئەوە بۆچی یەکێك لەئێوە برای خۆی دەکوژێ! ئەی بۆ بەرەکەتت بۆ نەکرد، خۆتی بۆ بشۆ. عامر دەمووچاو و دەستی هەتا ئانیشك و دەورووبەری قاچی شۆرد و بالاپۆشەکەی کردە ناو پەرداخێك و پاشان پرژاندی بەسەریدا و لەگەڵ خەڵکدا هەڵسا و ڕۆیشت"[3].

دوو جۆر چاو هەیە: چاوی مرۆڤ، چاوی جنۆکە، بەدروست لەئوم سەلەمەوە هاتووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەماڵیدا جاریەیەکی بینی شوێنی زللەی بەدەموچاووە بوو، فەرمووی:«اسْتَرْقُوا لَهَا، فَإِنَّ بِهَا النَّظْرَةَ»[4]،واتا:روقیەی بۆ بکەن، شوێنەواری چاوی جنۆکەی پێوەیە.

---

[1] - بوخاری(٥٧١٩) و موسلیم(٢١٩٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٨٨٠).

[3] - مالیك ئیخراجی کردووە لە الموطأ ٢/٩٣٨(١).

[4] - بوخاری(٥٧٣٩) و موسلیم(٢١٩٧) ئیخراجیان کردووە.

**بەش**

لەڕوقیە و موعەویزات: زۆر خوێندنی سورەتی(قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس) و سورەتی فاتیحا و ئایەتولکورسی، موعەویزاتی پەیامبەرایەتییش ئەمانەیە:«أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ»[1]،واتا:پەنا بەوتە و فەرمایشتی تەواوی خوا دەگرم لەهەر شەیتانێك و بوونەوەرێکی زیاندەری ژەهراوی و هەموو چاوێکی خراپ. هەروەها وتنی:«أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ»[2]،وات: پەنا دەگرم بەفەرمایشتی تەواوی خوای گەورە لەهەر خراپەیەك کە دروستی کردبێ.

هەرکەسێ ئەو ویردانەی تاقیکردبێتەوە، دەزانێ سوودی چەندە زۆرە و مرۆڤ چەندە پێویستی پێ هەیە بۆ ڕێگریکردن لەوەی چاوی چاو لێدەر پێی بگات، هەروەها دوای ئەوەش لێی دا چۆن بتوانێ بەهێزی ئیمانی خۆی لەخۆی دووربخاتەوە، هێزی ئیمان و باوەڕ و ئامادەیی و هێزی پشت بەستن و دڵ دامەزراویی چەکە، چەکیش بەپێی بەکارهێنان دەپێکێت.

**بەش**

کە چاو لێدەر لەزیانی چاوی خۆی ترسا و پێکانی چاولێدەر ترسا، با بەم پاڕانەوەیە زیان دووربخاتەوە و بڵێ(اللهم بارِك عليه)،واتا: خوایە گیان بەرەکەتدار بکەی. هەروەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەعامری کوڕی ڕەبیعەی فەرموو کاتێ چاوی لەسەهلی کوڕی حەنیف دابوو:"أَلَا بَرَّكْتَ"،واتا: ئەی بۆ نەتووت خوایە گیان بەرەکەتداری بکەی.

---

[1] - بوخاری(٥٧٣٩) و موسلیم(٢١٩٧) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧٠٨، ٢٧٠٩).

لەوانە: روقیە کردنی جبریل(سەلامی خوای لیّ بیّ) بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە:«بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ، اللهُ يَشْفِيكَ بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ»[1] واتا: بەناوی خواوە روقیەت دەکەم لەهەر شتێك ئازارت پیّ بگەیەنیّ، لەخراپەی هەر نەفسیّ، یان لەچاوی هەر حەسودیّ، خوای گەورە شیفات دەدات و بەناوی خواوە روقیەت دەکەم.

یەکێکی تر لەچارەسەرییەکان و وریاییکردن لێی: شتە چاك و گرنگەکانی ئەو کەسە بشاریتەوە کە ترسی چاوت لەسەر هەیە.

## ٣٢-رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەچارەسەری گشتیی هەموو شەکواکارێك لەرێگەی روقیەی خواییەوە

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبو سەعیدی خودرییەوە(خوای لیّ رازیی بیّ) کە جبریل(سەلامی خوای لیّ بیّ) هاتەلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و فەرمووی: ئەی موحەممەد ئازارت هەیە؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"بەلیّ". جبریل(سەلامی خوای لیّ بیّ)فەرمووی:«بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ، اللهُ يَشْفِيكَ بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ»[2]،واتا:بەناوی خوا روقیەت دەکەم لەهەر شتێك زیانت پیّ بدات، لەخراپەی هەموو دەروون و چاوێکی حەسود، خوا شیفات بدات، بەناوی خواوە روقیەت دەکەم.

---

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٨٦).

[2]- موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٨٦).

ئەگەر بووترێت: چی ئەڵێین لەبارەی ئەو فەرموودەیەی کە ئەبو داوود گێراویەتییەوە:"لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ"،واتا: هیچ ڕوقیەیەك نییە تەنیا لەچاو و ژەهرەکان نەبێ.

لەوەلامدا ئەڵێین: ئەوە ناگەیەنێ لەشتانی تردا ڕوقیە ڕەتکرابێتەوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە هیچ ڕوقیەیەك لەپێشتر و باشتر نییە لەڕوقیەی چاو و ژەهرەکان. سیاقی فەرموودە و تەواوی فەرموودە گشتی و تایبەتییەکانی ڕوقیە بەڵگە لەسەر ئەوە دەدەن.

## ٣٣-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەڕوقیەکردنی کەسێك بەسورەتی فاتیحە کە مار و دووپشك پێوەی دابێ

لەسەحیحەیندا بوخاری و موسلیم ئیخراجیان کردووە لەفەرموودەیەکی ئەبو سەعیدی خودرییەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: چەند هاوەڵێکی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ڕۆیشتن بۆ گەشتێك تاوەکو دابەزینە لای کۆمەڵە ماڵێکی عەرەب، داوایان کرد میوانداریيان لێ بکرێت، بەڵام ماڵەکان میوانداریيان لێیان نەکرد، گەورەی ئەو دێیە دووپشك پێوەی دا، هەموو هەوڵێکیان دا سوودی نەبوو بۆ گەورەکەیانی بکەن.

یەکێکیان وتی: بچینە لای ئەو چەند کەسەی لایان دایە لامان چۆنە بەڵکو شتێك لای ئەوان هەبێ پێی چارەی بکەین. هاتن بۆلایان و وتیان:گەورەکەمان دووپشك پێوەی داوە و هەرچی لەتوانامان‌دا بێ کردوومانە سوودی نەبووە، ئایە یەکێ لەئێوە هیچی پێ ناکرێت؟

یەکێ لەهاوەڵانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وتی: بەڵێ پێمان چارسەر دەکرێت، بەڵام ئێمە داوامان کرد میوانداریيمان بکەن و ئێوە ڕەتتان کردەوە، بۆیە چارەی ناکەم تاوەکو شتێکمان پێ نەدەن، لەئەنجام لەسەر چەند سەر مەڕێك

ڕێککەوتن، هاوەڵەکە ڕۆیشت و تفی کردە سەر شوێنی پێوەدانەکە و ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾ الفاتحة: ٢ خوێند، کابرای گەورەی دێ وەك ئەوەی گوریس و حەبلی لێ کرابێتەوە ڕاپەڕی و دەستی کردە ڕۆیشتن و هیچ شوێنەوار و ئازارێکی نەما، ئەوەیان پێ دان کە لەسەری ڕێککەوتبوون.

هەندێکیان وتیان: با مەڕەکان بەش بکەین. بەڵام ئەوەی کە روقیەکەی کرد وتی: ئەوە ناکەین تاوەکو نەچینە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و بۆی باس نەکەین چی شتێکمان کردووە. ڕۆیشتن بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و ئەو بەسەرهاتەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی:"وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟"،واتا: چۆن زانیت ئەوە روقیەیە؟! پاشان فەرمووی:"قَدْ أَصَبْتُمْ، اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا"[١]،واتا:بێگومان پێکاوتانە، بەشی بکەن و پشکێکیش بۆ من دابنێن.

ئەوەی سورەتی فاتیحا لەخۆی گرتووە لەپوختی و ئیخلاسیەتی خواپەرستی و ستایشی خوا و سپاردنی هەموو کارێك بەخوای گەورە و پشت پێ بەستن و داواکردنی تەواوی نیعمەتەکان لەخوای گەورە، کە بریتییە لەو هیدایەت و ڕێنیشاندانەی کە ناز و نیعمەت دەهێنێ و نەهامەتیی دووردەخاتەوە، لەگەورەترین دەوای شیفادەری تەواو و بەسە.

## ٣٤-ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەچارەسەرکردنی پێوەدانی دووپشك بەروقیە

ئیبن ئەبی شەیبە گێڕاویەتییەوە لەموسنەدەکەیدا لەفەرموودەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ئەڵێ:"پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نوێژی دەکرد، کە چووە سوجدە، دووپشکێ دای بەپەنجەیەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)

[١]- بوخاری(٢٢٧٦) و موسلیم(٢٢٠١) ئیخراجیان کردووە.

دەستیهەڵگرت و فەرمووی: "لَعَنَ اللَّهُ الْعَقْرَبَ مَا تَدَعُ نَبِيًّا وَلَا غَيْرَهُ"، واتا: نەفرەتی خوا لەدووپشك بێ، دەست لەپەیامبەر و کەسی تر هەڵناگرێ. ئەڵێ: پاشان داوای قاپێکی کرد ئاو و خوێی تێدا هەبێ، شوێنی پێوەدانەکەی ئەکردە ناو ئاو و خوێیەکە، و (قل هو الله أحد) و (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس)ی خوێند هەتا ئارامبوویەوە"[1].

موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەئەبو هورەیرەوە ئەڵێ: پیاوێك هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، دوێنێ ئێوارە دووپشکێ پێوەی دام! فەرمووی: "أَمَا لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ تَضُرَّكَ»[2]، واتا: ئەگەر ئێوارە ئەمەت بووتبایە، ئەوە زیانی لێت نەدەدا "أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ".

بشزانە کە چارەسەری خوایی لەدوای ئەنجامدانی ئەو چارەسەرییە سوود دەگەیەنێ و رێگریی دەکات دەرد و نەخۆشییەکە روو بدات، ئەگەر دەردەکەش روو بدات، بەجۆرێك نابێ زیانێك بخاتەوە، بۆیە روقیە و خۆدانە پاڵ خوا، بەکاردەهێنرێت بۆ پاراستنی لەشساغی و نەهێشتنی نەخۆشی.

### ٣٥-رێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەروقیەی مێروولەدا

پێشتر لەفەرموودەیەکی ئەنەسدا باسمان کرد کە لەسەحیحی موسلیمدا هەیە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رێگەی دا روقیە بکرێت بۆ ژەهر و چاو و مێروولە[3].

---

[1] - ئیبن ئەبی شەیبە ئیخراجی کردووە لەعەلییەوە(خوای لێ رازیی بێ)٤/٥٥(٢٣٥٥٣)، ئەوە هەیە ئیبن عەدی لە الکامل٣/١٠٦ لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە(خوای لێ رازیی بێ گێڕاویەتییەوە.

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧٠٩).

[3] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢١٩٦).

لەسوونەنی ئەبو داوددا لەئەلشیفائی کچی عەبدوڵڵەوە هاتووە ئەڵێ: لای حەفسە بووم پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هاتەژوورەوە فەرمووی: "أَلَا تُعَلِّمِينَ هَذِهِ رُقْيَةَ النَّمْلَةِ كَمَا عَلَّمْتِيهَا الْكِتَابَةَ"[1] ،واتا: بۆ فێر روقیەی مێروولە نابی وەك چۆن فێری نووسین بووی.

مێروولە:برین و تلۆقێکە لەهەردوو کەلەکەی مرۆڤەوە دەردەچێت، دەردێکی بەناوبانگە، ناونراوە مێروولە، چونکە ئەو کەسەی تووشی ئەو نەخۆشییە دەبێ، هەست دەکات لەو شوێنەدا مێروولە دەجوڵێتەوە و گازی لێ دەگرێت.

## ٣٦- رێبازی لەڕوقیەی ماردا

پێشتر باسمان کرد کە فەرموویەتی:"لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ"[2]، [3] ،واتا: هیچ روقیەیەك نییە تەنیا لەچاو و ژەهرەکان نەبێ.

لەسوونەنی ئیبن ماجەدا هاتووە لەفەرموودەیەکی عائیشەدا(خوای لێ رازیی بێ): پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) رێگەی داوە بۆ روقیەکردن لەمار و دووپشك[4].

## ٣٧- رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەڕوقیەی برین و زامداریی

بوخاری و موسلیم لەسەحیحەکەیاندا ئیخراجیان کردووە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەگەر کەسێك ئازارێکی هەبووایە یان برینێك، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پەنجەی ئاوەها دەگرت و سەر پەنجەی شایەتومانی ئەخستە زەوی و پاشان بەرزی دەکردەوە و ئەیفەرموو:"بِسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٨٨٧).

[2] – (الحُمَة): ناوی دووپشك و گیانلەبەرە ژەهردارەکانە.

[3] – بوخاری(٥٧٠٥) و موسلیم(٢٢٠) ئیخراجیان کردووە.

[4] – ئیبن ماجە(٣٥١٧) ئیخراجی کردووە.

سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا"[1]،واتا: بەناوی خوا، بەخۆڵی خاك و تفی هەندێکمان، نەخۆش و دەردەدارمان چاك دەبێتەوە بەویستی خوا.

واتای ئەو فەرموودەیە: لەتفی خۆی ئەخستەسەر پەنجەی شایەتومانی، پاشان ئەیخستە ناو خۆڵەکە و هەندێ لەو خۆڵە دەنووسا بەپەنجەیەوە و بەو خۆڵە مەسحی برینەکەی دەکرد و ئەوەی دەفەرموو کە بەرەکەتی یادی خوای تێدایە و کارەکە بەخوا دەسپێردرێت و پشت بەخوا دەبەسترێت لەچارەسەردا، هەردوو چارەسەر دەچنە پاڵ یەك و بەوە کاریگەرییەکە بەهێزتر دەبێت.

## ٣٨-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەچارەسەرکردنی ئازار بەڕوقیە

موسلیم لەسەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە لەعوسمانی کوڕی ئەبی ئەلعاسەوە(خوای گەورەی لێ رازیی بێ) کە شەکوای بردووەتە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بەئازارێك لەوەتەی موسڵمان بووە تووشی هاتووە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ، وَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ ثَلَاثًا، وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ"[2]،واتا: دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی لەجەستەتدا ئازاری هەیە و سێ جار بڵێ(بسمِ الله)، حەوت جاریش بڵێ(أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ)،واتا: پەنا دەگرم بەشکۆ و توانای خوای گەورە لەخراپەی هەر شتێك دەیبینم و ئەوەی وریایی لێ دەکەم.

لەم چارەسەرییەدا یادی خوای گەورە و سپاردنی کارەکە بەوە و پشت دەبەسترێتە شکۆ و توانای خوای گەورە لەخراپەی ئەو ئازارەی کە هەیە و چەند جارەکردنەوەی ئەو ویردەیە تاوەکو کاریگەرتر وەك کاریگەریی چەند

---

[1] - بوخاری(٥٧٤٥) و موسلیم(٢١٩٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٠٢).

بارەكردنەوەی دەرمان بۆ دەكردنی ئەو مادده زیانبەخشە، لەو حەوت جارەدا تایبەتمەندییەك هەیە لەشتی تردا نییە.

لەسەحیحەیندا هاتووە كە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ویردی بۆ هەندێ لەخێزانەكانی خوێندووە و بەدەستی راست ئەو شوێنەی مەسحكردووە و فەرموویەتی:"اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ أَذْهِبِ الْبَاسَ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا"[1]،واتا: خوایە گیان ئەی پەروەردگاری خەڵك، ئەم ئازارە مەهێڵە، شیفا بدە ئەی شافی، هیچ شیفایەك نییە تەنیا شیفای تۆ نەبێ، شیفایەك ئازارێ بەجێ نەهێڵێ.

بۆیە لەو روقیەیەدا تەوسولكردن بەخوای گەورە دەكرێت بەكەماڵی پەروەردگارێتی و كەماڵی بەزەیی لەشیفادا، تەنیا ئەوە شیفا دەدات، دەبینین تەوەسولكردنەكە یەكتاپەرستی و چاكە و پەروەردگارێتیی لەخۆگرتووە.

## ٣٩-رێبازی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەچارەسەركردنی سووتان و گڕ و خەفەتی كۆست و ناخۆشی

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ **البقرة:** ١٥٥ – ١٥٧ ،واتا: مژدە بدە بەخۆڕاگران. ئەوانەی كە لەگەڵ دوچاری سەختی و نەهامەتی و ناخۆشیەك بوون دەڵێن ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە. ئا ئەوانە درووود و بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە وە ئەوانە ئەو كەسانەن هیدایەتیان وەرگرتووە.

---
[1] - موسلیم ئیخراجی كردووە(٢٢٠٢).

لەموسنەددا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«مَا مِنْ أَحَدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا، إِلَّا أَجَارَهُ اللَّهُ فِي مُصِيبَتِهِ، وَأَخْلَفَ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا»[1]،واتا: هەرکەسێك تووشی کۆست و ناخۆشییەکی گەورە بێ و بڵێ(إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا)،واتا: هەموومان هی خواین و هەموومان بۆلای خوا دەگەڕێینەوە، خوایە گیان لەم کۆستەدا پاداشتم بدەرەوەو باشتر لەوم بۆ بەجێبهێڵە. ئەوە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە و باشتر لەوەی پێ دەدات.

ئەم وشەیە لەباشترین چارەسەرییەکانی کەسی مەینەتبارە، بۆی بەسوودترە بۆ کاتی مەینەتییەکە و ئاخیرەتی، دوو بنەمای گەورەی لەخۆگرتووە، ئەگەر بەندە بەناسینی بیهێنێتەدی، لەو کۆست و ناخۆشییەی بار سووك دەبێ:

یەکەم: لەڕاستییدا، خودی بەندە و کەسوکار و ماڵ و سامانی هی خوای گەورەن ،خوای گەورە بەئەمانەت بەو کەسەی سپاردووە.

دووەم: پاشەڕۆژی بەندە و گەڕانەوەی بۆ لای خوایە کە خاوەنی ڕاستەقینەیەتی، پێویستە دونیا لەدوای خۆی بەجێبهێڵێ، چۆن دڵخۆش دەبێ بەبوونی شتێك و بێئومێد دەبێ لە لەدەستچوویەك، ئەوە بیرکردنەوەی لەگەڕانەوە و شوێنی ڕاستەقینەی خۆی، بۆی دەبێتە گەورەترین چارەسەری ئەو دەردە.

لەچارەسەرکردنی: کەسەکە بەزانستی یەقین بزانێ، ئەوەی تووشی بووە بۆ ئەوە نییە بەهەڵەیدا ببات، ئەوەشی تووشی هەڵە بووە بۆ ئەوە نەبووە تووشی بەڵاو کارەساتی بکات.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٩١٨).

لەوە: بڕوانێتە ئەوەی بەهۆیەوە تووشی بووە، ئەوکات دەبینێ پەروەردگاری هاوشێوەی ئەوە یان باشتر لەوەی بۆ هێشتووەتەوە.

لەوانە: ئاگری کۆست و مەینەتبارییەکەی بکوژێنێتەوە بەدڵدانەوە وەرگرتن بەمەینەتباران.

لەوانە: بزانێ هاوار و پەلەقاژە کردن، کۆست و ناخۆشییەکە ناگێڕێتەوە، بەڵکو زیاتری ئەکات.

لەوانە: بزانێ لەدەستچوونی پاداشتی ئارامگرتن و خۆڕادەستکردن بەخوای گەورە–کە سەڵەوات و بەزەیی و هیدایەتە–لەڕاستییدا لەو کۆستەی تووشی هاتووە سەختترە.

لەوانە: بزانێ کە پەلەقاژەکردنی، دوژمنەکانی دڵخۆش دەکات و دۆست و هاوڕێیانی خەفەتبارتر و پەروەردگاریشی تووڕە ئەکات.

لەوانە: بزانێ ئەوەی لەئارامگرتن و چاوەڕێی پاداشتی خوایی بەدەستیدەهێنێ لەچێژ و دڵخۆشی، چەندان ئەوەندەی ئەوەیە کە لەدەستی داوە.

لەوانە: دڵی ئارام بکاتەوە بەگیانی ئومێدی مانەوەی باشتر لەلایەن خوای گەورەوە.

لەوانە: بزانێ پشکی کۆست و بەڵای بەئەندازەی ئەوەیە کە بۆی رووی داوە و باسی دەکات، هەرکەسێ رازیی بێ، ئەوە رازیبوونی بۆ هەیە، هەرکەسێکیش تووڕە بێ، ئەوە تووڕەبوونی بۆ هەیە.

لەوانە: بزانێ بگات بەوپەڕی پەلەقاژەش، سەرەنجام ناچارانە ئارام دەگرێ.

لەوانە: بزانێ بەسوودترین دەرمانێك بۆ ئەو، ئەوەیە کارێك بکات بەلای خواوە شیرین و خۆشەویست بێ.

لەوانە: بزانیٚ ئەوەی ئەو تاقیکردووەتەوە، باشترین بڕیاردەر و بەبەزەییترینە، ئەوە خوای گەورەیە، کۆستی بۆ نەناردووە تاوەکو بەهۆیەوە لەنێوی بدات، بەڵکو بۆ ئەوەیە تاقییبکاتەوە و گوێبیستی کڕوزانە و پاڕانەوەی بێت.

لەوانە: بزانیٚ کە ناخۆشی و کۆستی دونیا نەبوایە، ئەوە تووشی دەردی خۆبەگەورەزانی و کردەی فیرعەونیانە و دڵڕەقیی دەبوو، کە هۆکارە بۆ تیاچوونی بەندە.

لەوانە: بزانیٚ کە تاڵیی دونیا، بەخودی خۆی شیرینیی ئاخیرەتن.

## ٤٠-لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەچارەسەرکردنی خەم و خەفەت و ناخۆشی و پەژارە

لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسەوە(خوای لیٚ ڕازیی بیٚ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەکاتی ناخۆشییدا ئەیفەرموو:«لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَ الْأَرْضِ، رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمُ»[1].

لەسووننەنی ئەبو داوود هاتووە لەئەبی بەکرەوە(خوای لیٚ ڕازیی بیٚ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«دَعَوَاتُ الْمَكْرُوبِ: اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو، فَلَا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»[2]،واتا: لەپاڕانەوەی خاوەن کێشە و خەم، ئەمە بلیٚ:" اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو، فَلَا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ"،واتا: خوایە گیان تکای بەزەیی تۆم هەیە، بۆ چاوترووکانێکیش بیٚ رادەستی خۆمم مەکە، هەموو کاروبارم بۆ چاك بکە، هیچ خوایەکی بەحەق بوونی نییە جگە لە تۆ.

---

[1] – بوخاری(٦٣٤٥) و موسلیم(٢٧٣٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٥٠٩٠).

هەروەها تیایدا هاتووە لەئەسمائی کچی عومەیسەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)پێیفەرمووم: «أَلَا أُعَلِّمُكِ كَلِمَاتٍ تَقُولِيهِنَّ عِنْدَ الْكَرْبِ، أَوْ فِي الْكَرْبِ: اللَّهُ رَبِّي لَا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا»[1]،واتا: چەند وشەیەکت فێر بکەم لەکاتی ناخۆشییدا بیڵێی: بڵێ: اللَّهُ رَبِّي لَا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا.

## ٤١-رێبازی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لە پاراستنی لەشساغییدا

لەبەر ئەوەی لەشساغی و عافێت لەگەورەترین نیعمەتەکانی خوای گەورەیە بەسەر بەندەوە و باشترین دیاری و بەخششێکە بەرەهایی، بۆیە حەقە ئەو کەسەی خوای گەورە لەشێکی ساغی پێ داوە، پارێزگاریی لێ بکات و بیپارێزێ لەهەر شتێك تووشی نەخۆشیی بکات. بوخاری لەسەحیحەکەیدا گێڕاوێتییەوە لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی:«نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ»[2]،واتا: دوو نیعمەت هەن زۆربەی خەڵکیی نەزانن بەگەورەییان و نایقۆزنەوە، ئەوانیش: لەشساغی و دەستبەتاڵییە.

ترمیزی و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە لەفەرموودەیەکی عوبەیدوڵڵای کوڕی محصن ئەلئەنساریی ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«مَنْ أَصْبَحَ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ، آمِنًا فِي سِرْبِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا»[3]، واتا: هەرکەسێ بەیانیی کردەوە بە لەشساغی و لەگیانی خۆی سەلامەت بوو، خۆراکی ئەو رۆژەی هەبوو، وەك ئەوەیە خوای گەورە هەموو دونیای پێ دابێ.

---

[1]- ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١٥٢٥).

[2]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٤١٢).

[3]- ترمیزی(٢٣٤٦) و ئیبن ماجە(٤١٤١) ئیخراجیان کردووە.

لەترمیزی و کەسی تردا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ رازیی بێ) ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«أَوَّلُ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ النَّعِيمِ، أَنْ يُقَالَ لَهُ: أَلَمْ نُصِحَّ لَكَ جِسْمَكَ، وَنَرْوِكَ مِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ؟!»[1]، واتا: یەکەمین شتێك لەبابەت نیعمەتەکان لەڕۆژی قیامەتدا لەبەندە بپرسرێتەوە، ئەوەیە پێی دەوترێت: ئایە جەستەمان بۆت ساغ نەکرد و بەئاوی سارد تینوێتیی تۆمان نەشکاند؟!

ئا لێرەدا کەسانی پێشین ئەم ئایەتەیان خوێندووەتەوە:

﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ۝٨ ﴾ **التكاثر: ٨** ،واتا: لەپاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا (لەسەر هەموو ناز و نیعمەتێك کە خوا پێی دابوون لەدونیادا)لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت.

واتا: لەبارەی لەشساغییەوە لێتان دەپرسینەوە.

ئەمە ئەگەر کاروباری لەشساغیی بێ، با لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) باسی رەچاوی ئەو کاروبارانە بکەین کە بەڕەهاییانە تەواوی رێنیشاندەرییان تێدایە و پێیەوە جەستە و دڵ و ژیانی دونیا و ئاخیرەت پارێزگاریی دەکرێت، پشت بەستن هەر بەخوایە و هەموو گۆڕانکارییەکیش هەر لەدەست خوای گەورەیە.

## بەش

هەرچی خواردن و خواردنەوەیە، ئەوە نەریتی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) نەبووە تەنیا یەك جۆر بخورێت، چونکە ئەو کارە زۆر زیان بەسرووشت دەدات، هەندێجار روو دەدات وەهابێ، ئەگەر زیاتر لەیەك جۆر نەخورێت، ئەوە لاوازیی و تیاچوون بەسەر مرۆڤدا دەهێنێ، یان ئەگەر شتانێکیش بخورێت کە سرووشتی

---

[1] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(٣٣٥٨).

کەسەکە پێیەوەی نەریتی نەگرتووە. پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەو شتانەی دەخوارد کە خەڵکی وڵاتەکەی نەریتیان بەخواردنی گرتبوو. کە حەزی بەخواردنێ نەبووایە نەیدەخوارد و زۆری لەخۆی نەدەکرد، جا ئەمە بنەمایەکی گەورەیە لەپاراستنی لەشساغییدا، چونکە ئەگەر دەروون حەزی بەخواردنێك نەکرد و بەزۆر دەرخواردی درا،زیاتر لەوەی سوودی پێ بگەیەنێ، زیانی لێ ئەدات.

ئەبو هورەیرە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) قەت عەیبەی لەخواردنێ دەرنەکردووە، ئەگەر حەزی لێ بووایە لێی دەخوارد، ئەگەر حەزی لێ نەبووایە لێی نەدەخوارد[1].

حەزی لەگۆشت بوو، لەگۆشتیشدا حەزی لەباڵ و سنگی شەك مەڕ دەکرد، لەسەحیحەیندا هاتووە: گۆشتێ بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) هێنرا و باڵێکی پێ درا، پێی سەرسام بوو[2].

حەزی بەحەڵوا و هەنگوینیش بوو، ئەو سێ شتە: گۆشت و هەنگوین و حەڵوا خۆشترین خواردنێك بوو بەلایەوە، مەگەر نەخۆش بوایە، ئەگینا لێیان دووری نەدەگرت.

چی هەبووایە لەگەڵ ناندا دەیخوارد، هەندێجار نانی بەگۆشتەوە دەخوارد، هەندێجاریش بەخەڵ و ئەیفەرموو: «نِعْمَ الْأُدْمُ الْخَلُّ»[3]،واتا:خەڵ باشترین شتێکە لەگەڵ ناندا بخورێت.

ئەمە بەپێی حاڵەت ستایشی دەکرد نەك ئەوەی بەسەر خواردنی تردا فەزڵی بدات.

---

[1] - بوخاری(٥٤٠٩) و موسلیم(٢٠٦٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٣٣٤٠) و موسلیم(١٩٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٥٢).

لەمیوەی ولاتی خۆی دەخوارد کاتێ دەهات و خۆی لێ بەدوور نەدەگرت، ئەوەش یەکێکە لەگەورەترین هۆکارەکانی پاراستنی تەندروستی و لەشساغی، خوای گەورە حیکمەتی ئاوەهایە لەهەر شوێن و ولاتێکدا کۆمەڵێ میوە هەیە خەڵکی ئەو ولاتە لەکاتی خۆیدا سوودی لێ ببینن.

**٤٢-رێبازی پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەشێوازی دانیشتنی بۆ خواردن**

بەدروست لێیەوە هاتووە فەرموویەتی: "لَا آكُلُ مُتَّكِئًا"[١]،واتا: بەپاڵکەوتنەوە نان ناخۆم.

(الاتکاء) لێکدراوەتەوە بەچوار مشقی دانیشتن، لێکدراوەتەوە بەخۆ خستنەسەر شتێ و پاڵدانەوە بەشتێکدا، لێکدراوەتەوە بەپاڵکەوتن. هەرسێ جۆر دەگرێتەوە.

**بەش**

بەسێ پەنجەی نانی دەخوارد، ئەوە بەسوودترین شتێکە لەخواردندا.

خواردنی لەکاتی گەرمیی توندیدا نەدەخوارد،هەروەها گەرمکراوی دوێنێی نەدەخوارد کە لەئەمڕۆدا بۆی گەرمکرابێتەوە، خواردنی کەرو لێدراو و سوێری نەدەخوارد.

**بەش**

هەرچی رێبازی پەیامبەری ئازیزە(صلی الله علیه وسلم) لەخواردنەوەدا، ئەوە لەباشترین و کامڵترین رێنماییەکدا بوو کە لەشساغیی پێ بپارێزرێت.

---

[١]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٣٩٨).

لەبەر ئەوەی ئاوی دوێنێ بەسوودتترە بۆ خواردنەوە، ئەوە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) چووە نێو باخی ئەبی ئەلهەیسەمی کوڕی ئەلتیهان و فەرمووی:«إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّة؟فأتاه به، وَإِلَّا كَرَعْنَا»،واتا: ئەگەر ئاوی نێو جەوەنەت هەیە شەو مابێتەوە تیایدا بیهێنی یان دەم بەئاوەکەوە بنێین. بوخاری گێڕاویەتییەوە،لەفزەکەشی ئەمەیە«إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّةٍ وَإِلَّا كَرَعْنَا»[1]،[2]،واتا: ئاوی نێو جەوەنەت هەیە شەوی بەسەردا تێپەڕبووبێ یان دەم بنێین بەئاوەکەوە.

عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:"خۆشترین خواردنێ بەلای پەیامبەری خواوە، حەڵوای ساردبوو"[3].

## بەش

یەکێکی تر لەڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، خواردنەوە بوو بەدانیشتنەوە، ئەوە خووی بوو. بەدروست لێیەوە هاتووە، فرمانی کردووە بەیەکێك کە بەپێوە ئاوی خواردووەتەوە، تاوەکو بیڕشێنێتەوە. بەدروست لێیەوە هاتووە کە نەهی کردووە بەڕاوەستانەوە ئاو بخورێتەوە، بەدروست لێیەوە هاتووە کە بەڕاوەستانەوە ئاوی خواردووەتەوە.

کۆمەڵێ وتوویانە: ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ نەهییەکەی هەڵوەشاندووەتەوە. کۆمەڵێکی تر ئەڵێن: بەڵکو روونیکردووەتەوە کە نەهییەکە بۆ حەرامیی نییە، بەڵکو بۆ رێنیشاندان و ئەوەیە بەپێوە نەخواردنەوە لەپێشترە. کۆمەڵێکی تر وتوویانە: لەبنچینەدا لەنێوان هەردووکیدا دژیەکییەك بوونی نییە، بەڵکو لەبەر پێویستیی

---

[1] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦١٣).

[2] - الكَرْع: خواردنەوەیە بەدەم بەبێ بەکارهێنانی لەپی دەست یان پەرداخ.

[3] - ترمیزی ئیخراجی کردووە(١٨٩٥).

بەپێوە خواردوویەتی. هاتووە بۆلای زەمزەم و هاوەڵانیش ئاویان خواردووەتەوە، ئەویش ئاوی خواردووەتەوە لەو کاتەدا ویستوویانە دۆڵەکەی(سەتڵەکەی) لەدەست وەربگرن، بۆیە بەپێوە خواردوویەتییەوە، ئەوەش شوێنی پێویستیی بووە.

### بەش

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسی کوڕی مالیکدا(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەخواردنەوەدا سێ هەناسەی دەدا و ئەیفەرموو:"إِنَّهُ أَرْوَى وَأَمْرَأُ وَأَبْرَأُ"[1]،واتا:تینوێتی شکاند و گڕی گەدەی نەهێشت و ئارامیی دایە جەستە.

واتای: هەناسەدانی لەخواردنەوەدا: ئەوەیە پەرداخەکە لەدەمی دووردەخستەوە و لەدەرەوەی پەرداخەکە هەناسەی هەڵدەمژی و پاشان خواردنەوەکەی دەخواردەوە، هەروەك لەفەرموودەیەکی تردا بەڕوون و راشکاو هاتووە:"إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْقَدَحِ"[2] بەڵام"وَلَكِنْ لِيُبِنِ الْإِنَاءَ عَنْ فِيهِ"[3]،واتا: ئەگەر یەکێ لەئێوە شتی خواردەوە با هەناسەی نەخاتە نێو پەرداخەکە، بەڵکو لەدەمی دووریبخاتەوە و هەناسە بدات.

### بەش

موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەجابری کوڕی عەبدوڵڵاوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: گوێم لێبوو پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو: «غَطُّوا

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٢٨).

[2] – بوخاری ئیخراجی کردووە(١٥٣) بەلەفزی:"الإناء".

[3] – ترمیزی ئیخراجی کردووە(١٨٨٧) لەئەبو سەعیدی خودرییەوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی کردووە لەفووکردن لەخواردنەوە. پیاوێك وتی: ئەی ئەگەر لەنێو قاپەکەدا پیسییم بینی؟ فەرمووی:بیرێژە. وتی: من بەیەك هەناسە هەمووی ناخۆمەوە؟ فەرمووی:کەوابوو پەرداخەکە لەدەمت دووربخەرەوە.

الْإِنَاءَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ لَا يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ، أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ إِلَّا وَقَعَ فِيهِ مِنْ ذَلِكَ الدَّاءِ»[1]،واتا: قاپ و مەنجەڵەکانتان سەر بنێنەوە، لەساڵدا شەوێك هەیە پەتای تێدا دادەبەزێت، هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی سەر لێ نراو نییە ئەو پەتا و دەردەی تێ نەکەوێ.

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)هاتووە کە فرمانی کردووە سەری قاپ داپۆشرێ ئەگەر بەچڵە داریش ئەبێ[2].

بەدروست لێیەوە هاتووە: فرمانی کردووە لەکاتی سەرلێنانی قاپ و مەنجەڵدا(بسم الله)بووترێت.

بوخاری لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسدا(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهیکردووە لەخواردنەوە لەجەوەندە[3].

## بەش

لەسووننەنی ئەبو داوود هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو سەعیدی خودرییدا(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهی کرد لەخواردنەوە لەکەل و پەرداخی شکاو، لەوەشی فوو بکرێت لەخواردنەوە[4]. لەم ئەدەب و رەوشتانەی کە بەرژەوەندیی مرۆڤی تێدایە، ئەوە خواردنەوە لەپەرداخی شکاو چەند خراپییەکی هەیە: یەکەمیان: ئەگەر لەڕووی ئاوەکەدا پیسی و شتێك هەبێ، ئەوە لای کەلی پەرداخەکە کۆدەبێتەوە. دووەم: رەنگە کەلەکە تیژییەکی هەبێ و دەمی کەسەکە بریندار بکات.

---

[1] - بوخاری(٣٢٨٠) و موسلیم(٢٠١٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٥٦٢٣) و موسلیم(٢٠١١) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٦٢٩).

[4] - ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٧٢٢).

هەرچی فووکردنە لەخواردنەوە و ئاو، ئەوە لەدەمی کەسەکەوە بۆنی ناخۆشی تێکەڵی دەبێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەندێجار شیری بەتەنیا دەخواردەوە و هەندێجاریش ئاوی تێکەڵ دەکرد.

لەجامیعی ترمیزییدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ، وَإِذَا سُقِيَ لَبَنًا فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلَّا اللَّبَنُ»[1]،واتا:ئەگەر یەکێ لەئێوە خواردنی خوارد، با بڵێ:" اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ "،واتا: خوایە گیان بۆ ئێمە بەرەکەتی تێدا بکە و لەمە باشترمان پێ بدە. ئەگەر شیریشی خواردەوە با بڵێ:" اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ "،واتا: خوایە گیان بۆ ئێمە بەرەکەتی تێ بکە و زیاتری کەی. هیچ شتێك نییە جێگەی خواردن و خواردنەوە بگرێتەوە مەگەر شیر نەبێ.

## بەش

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەرەتای شەودا (نبیذ)ی بۆ کراوە، لەبەیانییدا لێی خواردووەتەوە و شەوی دواتری و بەیانییەکی تر و شەوێکی تریش، بەیانیی بۆ عەسر، ئەگەر شتێکی لێ بمابایەتەوە بەخزمەتکارەکەی دەدا یان فرمانی دەدا برێژرێت[2].

نبیذ: ئاوێکە خورمای تێکەڵ دەکرێ و تێك دەدرێت، لەگەڵ خواردن و خواردنەوەدا دادەنرێت، سوودێکی زۆری هەیە لەزیاترکردنی هێز و پاراستنی لەشساغی، لەدوای سێ ڕۆژ نەیخواردووە لەترسی ئەوەی نەگۆڕێ بۆ ماددەی سەرخۆشکەر.

---

[1] - ترمیزی(٣٤٥٥) و ئەبو داوود(٣٧٣٠) و ئیبن ماجە(٣٣٢٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٠٤).

## ٤٣-ڕێوشوێنی لەبەرگ و پۆشاکدا

باشترین ڕێنمایی و بەسوودترین پۆشاك و نەعل و سووکترینی هەڵبژاردووە بۆ خۆی. بەرگی ئەردی و ئوزری بەزۆریی لەبەر دەکرد، دوو جۆر بەرگ و سووکترین بەرگن. کراسی لەبەر دەکرد، کراس شیرینترن بەرگ بوون بەلایەوە، قەمیسەکەی تاوەکو مەچەکی درێژ بوو، لەخوارەوەش تاوەکو پاژنە پێی بوو، لەپاژنە پێی شۆڕتر نەبوو، عەمامەکەی نە گەورە بوو نە بچووك، بەڵکو مامناوەند بوو، لەژێر مەلاشۆوە دەیخستەسەر.

لەسەفەردا هەمیشە خوف لەپێ دەکرد، یان لەزۆربەی کاتەکانیدا لەپێی دەکرد، چونکە هەردوو پێ پێویستیان پێ هەیە لەگەرما و سەرمادا بیانپارێزێ، لەمەدینەشدا هەندێ جار لەپێی دەکرد.

ڕەنگی سپی و عەبای ڕەش بەلایەوە شیرینترین ڕەنگ بوون.

## ٤٤-ڕێوشوێنی بۆ کاروباری نیشتەجێبوون

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە زانیی لەسەر ڕێی کاروانی سەفەرە و دونیا قۆناغێکە وەك ڕێبوارێك لای داوەتە لای و ماوەی تەمەنی تیادا دەمێنێتەوە و دواتر دەچێتە ئاخیرەت، ئەوە ڕێباز و ڕەوشتی ئەو نەبوو گرنگیی بداتە دروستکردنی خانوو، ڕازاندنەوە و فروانکردنی. بەڵکو باشترین خانوویەك بەلایەوە، ئەوە بوو لەسەرما و گەرما بیپارێزێ، لەدەرەوە نەبینرێت و کون و کەلەبەری تێدا نەبێ خشۆك و گیانلەبەر لێیەوە بێتە ژوورەوە، ئەوەندە بەرز نەبێ پڕ هەوا بێ و ئەوەندەش نزم نەبێ مرۆڤ ئازار بدات، بەڵکو مامناوەند بێ.

ئەوە بەسوودترین و چاکترین خانوو بوو، کەمترین سەرما و گەرمای تێدا هەبێ و ئەوەندە بەرتەسك نەبێ تیایدا ئارام نەبێ. لەناو خانووەکەدا سەرئاو نەبوو بۆنی

ناخۆش بێ، بۆیە خانووەکەی خۆشترین و پاکترین بۆنی هەبوو، بێگومان ئەو جۆرە خانووە، رێکترین و بەسوودترین و باشترین خانوون بۆ جەستە و پاراستنی تەندروستیی مرۆڤ.

## ٤٥-رێوشوێنی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ کاروباری خەو و بەئاگابوون

هەرکەسێ لەخەو و بەئاگایی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رابمێنێ، ئەبینێ رێکترین خەو و بەسوودترین خەو بووە بۆ جەستە و ئەنداماکانی جەستە و هێزی جەستە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەرەتای شەو دەخەوت، لەسەرەتای نیوەی دووەمی شەو هەڵدەستا و سیواکی دەکرد، دەستنوێژی دەشۆرد و بەئەندازەی ئەوەی خوا بۆی نووسیبوو نوێژی دەکرد، بەوە جەستە و ئەندامەکانی جەستەی پشکی خەو و پشوودانی وەردەگرت و پشکی وەرزش و پاداشتی خوایی وەردەگرت، ئەوەش ئەوپەڕی چاکیی دڵ و جەستە و دونیا و ئاخیرەتە.

بەئەندازەی پێویست دەخەوت، بۆ ئەوە رێگریی لەخۆی نەدەکرد و بەربەرەکانێی خەوی نەدەکرد کە جەستەی پێویستی بوو، کە دەخەوت بەلای راستدا دەخەوت، هەتا خەوی لێ دەکەوت یادی خوای دەکرد و بەتێرکردنی گەدە بەخواردن و خواردنەوە نەدەخەوت، راستەوخۆ لەسەر زەوی نەدەخەوت، جێگەی بەرزیشی نەبوو، بەڵکو جێ خەوێکی لەپێست دروستکراوی هەبوو کە ناواخنی ریشاڵ بوو، لەسەر سەرین پاڵ دەکەوت و هەندێجاریش دەستی ئەخستە ژێر گۆنای.

لەسەحیحەیندا هاتووە لەبەرائی کوڕی عازبەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ

اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ كَلَامِكَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ، مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ»[1]،واتا:ئەگەر چوویتەسەر جێگەی خەوتن، دەستنوێژێك بشۆرە دەستنوێژی نوێژ، پاشان بەلای راستدا بخەوە و پاشان بڵێ:" اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ كَلَامِكَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ، مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ"[2]،واتا: خوایە گیان من وا خۆمم رادەستی تۆ کرد، روومکردە تۆ، کاری خۆمم بە تۆ سپارد، پەنام هێناوە بۆ تۆ بەحەز و ناچارییەوە، هیچ پەناگەیەك نییە جگە لەپەناگەی تۆ، باوەڕم بەو کتێبە هێنا کە خۆت داتبەزاندووە، بەو پەیامبەرەی کە خۆت ناردووتە. ئەوە بکەرە کۆتا قسەی ئەو شەوەت، ئەگەر ئەو شەوە مردی، ئەوە لەسەر فیترەت مردووی.

## بەش

هەرچی رێباز و رەوشتی پەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) لەهەڵسان لەخەو، ئەوە لەگەڵ دەنگی کەڵەشێردا بەئاگا بوو، سوپاسی خوای دەکرد و تەکبیر و تەهلیلە و لێی دەپاڕایەوە، پاشان سیواکی دەکرد، پاشان هەڵدەستا بۆ دەستنوێژ شۆردن، پاشان بۆ نوێژکردن لەبەردەم خوای گەورە رادەوەستا و دەپاڕایەوە و بەحەز و ترسەوە تکای لێ دەکرد.

ئاخۆ لەسەرووی ئەمەوە، چی شتێکی تر هەیە بەسوود بێ بۆ پاراستنی ساغیی دڵ و جەستە و روح و هێز و خۆشیی دونیا و ئاخیرەت.

---

[1] - بوخاری(٦٣١١) و موسلیم(٢٧١٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٦٣١١) و موسلیم(٢٧١٠) ئیخراجیان کردووە.

## بەش

سەبارەت بەجووتبوون و توانای سەرجێی،ئەوە رێباز و رێنمایی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کاملترین رێباز و رێنمایی بوو کە لەشساغیی پێ دەپارێزرێ و چێژی لێ دێتەدی و خۆشیی دەخاتە دەروونەکانەوە، ئەو مەبەستەی پێ دێتەدی کە لەپێناویدا دانراوە. لەبناغەدا بۆ سێ مەبەستی بناغەیی جووتبوون دانراوە: پاراستنی وەچە، دەرکردنی ئەو ئاوەی کە بەهێشتنەوەی لەجەستەدا زیان دروست دەبێ، جووتبوون و چێژ وەرگرتن.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەفەرمووێ:«إِنِّي أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، وَأَنَامُ وَأَقُومُ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[1]،واتا: من ژن مارە دەکەم، ئەخەوم و هەڵدەستم، بەرۆژوو دەبم و رۆژووش دەشکێنم، هەرکەسێ سوونەت و رێبازی منی نەوێ، ئەوە لە من نییە.

هەروەها فەرموویەتی:«يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْفَظُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»[2]،واتا:ئەی کۆمەڵی گەنجان، کێ لەئێوە توانای هەیە با هاوسەرگیریی بکات، چونکە چاو دەپارێزێ و داوێن دەپارێزێت لەتاوان، هەرکەسێ توانای نییە با بەرۆژوو بێ، بۆی دەبێتە قەڵغان و پارێز.

کە جابر بێوەژنێکی مارە کرد، پێیفەرموو:«هَلَّا بِكْرًا تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ»[3]،واتا:بۆ کچێکت مارە نەکرد یاری و دەستبازیی لەگەڵدا بکەی و ئەویش یاری و دەستبازییت لەگەڵدا بکات.

---

[1] – بوخاری(٥٠٦٣) و موسلیم(١٤٠١) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٥٠٦٥) و موسلیم(١٤٠٠) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بوخاری(٥٢٤٧) و موسلیم(٥١٨) ئیخراجیان کردووە.

لەسەحیحەیندا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: «تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ»[1]،واتا: بۆ چوار شت ئافرەت مارە دەکرێت: بۆ سەروەتەکەی، بۆ بنەماڵەییەکەی، بۆ جوانییەکەی، بۆ ئاییندارییەکەی، ئاییندارەکە هەڵبژێرە دەوڵەمەند دەبی.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ"[2]،واتا:کچانێ مارە بکەن منداڵیان ببێ، چونکە لەئاخیرەتدا بەئێوەوە ئوممەتم زۆرتر ئەبێ.

## ٤٦-رێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەپاراستنی لەشساغی بەهۆی بۆنی خۆشەوە(عەتر)

لەسەحیحی بوخارییدا هاتووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆنی رەتنەکردووەتەوە[3].

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ رَيْحَانٌ فَلَا يَرُدَّهُ، فَإِنَّهُ طَيِّبُ الرَّائِحَةِ خَفِيفُ الْمَحْمِلِ»[4]،واتا: هەرکەسێ رەیحانەی پێ درا با رەتی نەکاتەوە، چۆنکە بۆنی خۆش و سووکە.

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)هاتووە فەرموویەتی:«إِنَّ لِلَّهِ حَقًّا عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ، وَإِنْ كَانَ لَهُ طِيبٌ أَنْ يَمَسَّ

---

[1] - بوخاری(٥٠٩٠) و موسلیم(١٤٦٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئەبو داوود(٢٠٥٠) و نەسائی(٣٢٢٧) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٩٢٩).

[4] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٥٣).

منْهُ»[1]،واتا: ماف و واجیبی خوایە بەسەر هەموو موسڵمانێکەوە لەهەموو هەفتەیەکدا ئەو موسڵمانە خۆی بشوات و ئەگەر عەتری هەبوو، لەخۆی بدات.

## ٤٧-ڕێبازی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لە پاراستنی تەندروستیی چاو

لەسووننەنی ئیبن ماجەدا هاتووە لەئیبن عەباسەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ڕەفعی دەکات: «خَيْرُ أَكْحَالِكُمُ الْإِثْمِدُ، يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ»[2]،واتا: باشترین کلێك چاوتانی پێ ڕەش بکەن، کلی(الْإِثْمِدِ)ە، بینین بەهێز دەکات و موو(برۆ)ش دەڕوێنێ.

## سێیەم: باسکردنی شتێ لەو دەوا و خواردنانەی بەتەنیا باسکراون لەسەر زمانی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم )

(إِثْمِد) بەردی کلی ڕەشەو لەئەسفەهانەوە دەهێنرێت، باشترین جۆری کلە، هەروەها لەڕووی مەغریبیشەوە دەهێنرێت، باشترین جۆری، ئەوەیە کە زوو ورد دەبێت،سەرەوەی بریسکەی دێت و ناوەوەی لووسە و هیچ پیسییەکی تێدا نییە.

بۆ ئەو ژن و مێردەی جووت دەبن، ئەگەر بیانەوێ پێش خۆ شۆردن دووبارە جووت بینەوە، داینا وە لەنێوان هەردوو جووتبووندا دەستنوێژ بشۆرن، هەروەك موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی ئەبو سەعیدی خودرییەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ»[3]،واتا: ئەگەر یەکێ لەئێوە لەگەڵ خێزانەکەیدا جووت بوو، ویستی جووتبوونەکەی دووبارە بکاتەوە، با دەستنوێژ بشوات.

---

[1]- بوخاری(٨٩٨) و موسلیم(٨٤٩) ئیخراجیان کردووە.

[2]- ئیبن ماجە(٣٤٩٧) ئیخراجی کردووە.

[3]- موسلیم(٣٠٨) ئیخراجی کردووە.

## بەش

لەسەحیحەیندا هاتووە لەجابرەوە، جولەکەکان ئەیانووت: هەرکەسێ لەپاشەوە ئەندامی نێرینەی بەئەندامی مێینەی خێزانەکەی بگەیەنێ و جووت ببێ،هەر منداڵێك لەو جووتبوونە بێتە دونیاوە خێل دەبێ، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾ البقرە: ٢٢٣ ،واتا:ژنەکانتان کێڵگەی خۆتانن جا تۆوەکانتان بووەشێننە ناو کێڵگەکانتانەوە(مەبەست چوونە لایانە)بەهەر شێوەیەك دەتانەوێ(لە شوێنی تایبەتی خۆی کە پێشەوەیە نەك دواوە).

لەلەفزی موسلیمدا هاتووە: «إِنْ شَاءَ مُجَبِّيَةً، وَإِنْ شَاءَ غَيْرَ مُجَبِّيَةٍ، غَيْرَ أَنَّ ذَلِكَ فِي صِمَامٍ وَاحِدٍ»[1]، واتا: ئەگەر ویستی دەتوانێ بەجۆری پاڵکەوتنی خێزانی لەسەر دەم لەگەڵ خێزانیدا جووت ببێ یان بەجۆری تر، بەڵام بەهەر جۆرێك بوو، دەبێ جووتبوونەکە لەرێی ئەندامی مێینەیەوە بێ کە شوێنی دروستبوونی منداڵە.

سەبارەت بە کۆم، ئەوە لەسەر زمانی هیچ پەیامبەرێك ئەو کارە حەڵاڵ نەکراوە و رێی پێ نەدراوە، هەرکەسێك شتێکی دابێتە پاڵ یەکێکی پێشین بەوەی لەرێی کۆمەوە لەگەڵ هاوسەری جووت بووبێ، ئەوە تێکەڵی کردووە و هەڵەی کردووە، لەترمیزییدا هاتووە: لەعەلیی کوڕی تەڵقەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: «لَا تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ، فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ»[2]،واتا: لەکۆمەوە مەچنە لای خێزانەکانتان، خوای گەورە لەوتنی حەق شەرم ناکات.

---

[1] – بوخاری(٤٥٢٨) و موسلیم(١٤٣٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] – ترمیزی(١١٦٤) ئیخراجی کردووە.

ئوتروج: لەسەحیحدا سەلماوە کە:لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْأُتْرُجَّةِ، طَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَرِيحُهَا طَيِّبٌ»[1]،واتا: نمونەی ئەو باوەڕدارەی قورئان دەخوێنێ، نمونەی ئوتروجە، تامی خۆشە و بۆنیشی خۆشە.

ئیزخیر(إذخِر): لەسەحیحدا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)کە لەمەککەدا بووە فەرموویەتی:"لا يُخْتَلَى خَلاَهَا"،واتا:گژو گیای مەککە نابڕدرێت. عەباس(خوای لێ رازیی بێ) وتی: ئەی پەیامبەری خوا تەنیا ئیزخیر نەبێ کە بۆ پرسە و مالآن ئەبێ. فەرمووی:"إِلَّا الْإِذْخِرَ"[2]،واتا:بەڵێ تەنیا ئیزخیر نەبێ ئەکرێ درەو بکرێت.

شووتی: ئەبو داوود و ترمیزی گێڕاویانەتەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە شووتی بەخورماوە خواردووە و فەرموویەتی:"نَكْسِرُ حَرَّ هَذَا بِبَرْدِ هَذَا، وَبَرْدَ هَذَا بِحَرِّ هَذَا"[3]،واتا: ساردیی ئەمە بەگەرمیی ئەمە ئەشکێنین و نایهێڵین، گەرمیی ئەمەش بەساردیی ئەمە ناهێڵین.

لەبابەت شووتیدا چەند فەرموودەیەك هاتووە، هیچیان ناسەلمێنرێت دروست بن تەنیا ئەو فەرموودەیەی سەرەوە نەبێ.

خورمای تازە: لەسەحیحدا سەلماوە: کە ئەبو ئەلهەیسەمی کوڕی ئەلتەیهان کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و ئەبو بەکر و عومەر(خوایان لێ رازیی بێ)

---

[1] – بوخاری(٥٠٢٠) و موسلیم(٧٩٧) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(١٨٣٣) و موسلیم(١٣٥٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] -ئەبو داوود(٣٨٣٦) و ترمیزی(١٨٤٣) ئیخراجیان کردووە.

بەمیوانیی چوونەلای، خورمای خەراڵی بۆیان هێنا، فەرمووی: "بۆ لەتەڕ و شلەکەت بۆ نەهێناین؟!"، وتی: حەزم کرد لەو تازەیەتان بۆ بهێنم[1].

پیاز: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم): "قەدەغەی کردووە کەسێ پیاز بخوات بێتە مزگەوت"[2].

لەسووننەندا هاتووە: کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کردووە هەرکەسێ پیاز و سیر دەخوات، بەلێنان بۆنەکەیان نەهێڵێ[3].

خورما: لەسەحیحدا سەلماوە لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: «مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ وَفِي لَفْظٍ: مِنْ تَمْرِ الْعَالِيَةِ لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ وَلَا سِحْرٌ»[4]، واتا: هەرکەسێ بەحەوت خورما بەیانیان بکاتەوە، لەلەفزێکی تردا بەحەوت خورمای عەجوە(الْعَالِيَةِ)، ئەوە لەو رۆژەدا هیچ ژەهر و سیحرێك کاریگەریی لێ ناکات. لێیەوە سەلماوە فەرموویەتی: «بَيْتٌ لَا تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ»[5]،واتا: ماڵێك خورمای تێدا نەبێ، خەڵکی ئەو ماڵە برسیین. هەروەها سەلماوە کە خورمای بەترێی خواردووە[6]، خورمای بەنانەوە خواردووە و بەتەنیاش خواردوویەتی.

هەنجیر: لەبەر ئەوەی هەنجیر لەخاکی حیجاز و مەدینەدا نەبووە، ئەوە لەفەرمودەدا باسی نەهاتووە، چونکە خاکێك بۆ هەنجیر لەبار بێ جیاوازە لەخاکی لەبار بۆ خورما، بەڵام لەبەر زۆریی سوودەکانی، ئەوە خوای گەورە لەقورئاندا سوێندی پێ خواردووە.

تەلبینە: پێشتر باسمان کرد، ئاوی جۆی هاڕاوە و سوودەکانیشمان باس کرد.

---

[1] -موسلیم(٢٠٣٨) و ترمیزی(٢٣٦٩) ئیخراجیان کردووە و لەفزەکە هی ئەوە.

[2] -بوخاری(٨٥٥) و موسلیم(٥٦٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٦٧).

[4] -بوخاری(٥٧٦٩) و موسلیم(٢٠٤٧) ئیخراجیان کردووە.

[5] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٤٦).

[6] -ئەبو داوود(٣٨٣٧) و ئیبن ماجە(٣٣٣٤) ئیخراجیان کردووە.

بەفر: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«اللَّهُمَّ اغسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ»[1]،واتا:خوایە گیان لەهەڵەکانم بمشۆرەوە بەئاو و بەفر و تەرزە.

لەم فەرموودەیەدا ئەمە تێدەگەین: هەموو شتێك بەدژەکەی چارەسەر دەکرێت و دەرمان دەکرێت، چونکە لەهەڵە و تاواندا گەرمی و گڕ هەیە، دژەکەشی بەفر و تەرزە و ئاوی ساردە.

سیر: لەڕگەز و هاوشێوەی پیازە، لەفەرموودەدا هاتووە:"هەرکەسێ پیاز و سیر دەخوات، بەلێنان بۆنەکەیان نەهێڵێ[2]. خواردنێکی بەدیاریی بۆ هێنرا سیری تیابوو، ناردی بۆ ئەبو ئەیوبی ئەنساری، وتی: ئەی پەیامبەری خوا خۆت حەزی پێ ناکەی و بۆ منی دەنێری؟ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنِّي أُنَاجِي مَنْ لَا تُنَاجِي"[3]،واتا: من لەگەڵ فریشتە دەدوێم.

ترێت: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[4]،واتا: فەزڵی عائیشە بەسەر ژنانەوە، وەك فەزڵی ترێتە بەسەر خواردنەکانی ترەوە.

ناوکرۆکی خورما(جُمَّارٌ): لەسەحیحەیندا سەلماوە: لەعەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ئەڵێ: لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم)دانیشتبووین، ناوکرۆکی دار خورمایان هێنا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً مِثْلَ الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ لَا يَسْقُطُ وَرَقُهَا. .."[5]،واتا: لەنێو درەختەکاندا درەختێك هەیە نمونەی پیاوی موسڵمان کە گەڵاکانی ناوەرێ...

---

[1] -بوخاری(٧٤٤٩) و موسلیم(٥٦٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٥٦٧).

[3] -بوخاری(٨٥٥) و موسلیم(٥٦٤) ئیخراجیان کردووە.

[4] -بوخاری(٣٧٧٠) و موسلیم(٢٤٤٦) ئیخراجیان کردووە.

[5] -بوخاری(٥٤٤٤) و موسلیم(٢٨١١) ئیخراجیان کردووە.

پەنیر: لەسووننەندا هاتووە لەعەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ئەڵێ: لەتەبوکدا پەنیرێ بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) هێنرا، داوای چەقۆی کرد، (بسم الله)ی کرد و کەرتی کرد. ئەبو داوود گێڕاویەتییەوە[1].

خەنە: پێشتر فەرموودەکانی تایبەت بەفەزڵی خەنە باسکران، پێویستی بەدووبارەکردنەوە نییە.

رەشکە: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەفەرموودەیەکی ئەبو سەلەمەوە ئەویش لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ، فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ»[2]،واتا:پابەند بن بەبەکارهێنانی رەشکە، دەرمانی هەموو دەردێکی تێدایە تەنیا مردن نەبێ. رەشکە لەزمانی فارسییدا پێیدەوترێت: شونیز.

ئاورێشم(حەریر): پێشتر باسمان کرد کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رێگەی دا زوبەیر و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بەکاریبهێنین بۆ ئەو خورانەی لەجەستەیاندا تووشی هاتبوون.

نان: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«تَكُونُ الْأَرْضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُبْزَةً وَاحِدَةً يَتَكَفَّؤُهَا الْجَبَّارُ بِيَدِهِ كَمَا يَكْفَؤُ أَحَدُكُمْ خُبْزَتَهُ فِي السَّفَرِ نُزُلًا لِأَهْلِ الْجَنَّةِ»[3]،واتا:لەڕۆژی قیامەتدا زەوی وەك یەك نان وەهایە خوای گەورە بەدەستی ئەمدیوو و ئەودیووی دەکات تاوەکو رێك بێتەوە هەروەك چۆن ئێوە لەسەفەردا وەها بە نان دەکەن، ئەوەش بۆ ئەوەی بیخاتە بەردەم ئەهلی بەهەشت.

---

[1]-ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٨١٩).

[2]-بوخاری(٥٦٨٨) و موسلیم(٢٢١٥) ئیخراجیان کردووە.

[3]-بوخاری(٦٥٢٠) و موسلیم(٢٧٩٢) ئیخراجیان کردووە.

خەڵ: موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەجابری کوڕی عەبدوڵڵەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازیی بێ) کە پەیامبەری خوا داوای چەوریی کردووە، ئەوانیش وتیان: تەنیا خەڵمان هەیە، بۆیە داوای کردووە بیهێنن، کە لێی دەخوارد ئەیفەرموو:"نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ، نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ"[1]،واتا:خەڵ باشترین شتێکە لەگەڵ نانداا بخورێت. خەڵ باشترین شتێکە لەگەڵ نان‌دا بخورێت.

ڕۆن: لەترمیزییدا هاتووە لەفەرمودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ ڕازیی بێ) بەمەرفوعی:«كُلُوا الزَّيْتَ وَادَّهِنُوا بِهِ»[2]،واتا: زەیت بخۆن و خۆتانی پێ چەور بکەن.

ئاڵتوون: ئەبو داوود و ترمیزی گێڕاویانەتەوە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ڕێگەی دا بەعەرفجەی کوڕی ئەسعەد لووتێك لەئاڵتووند بۆ خۆی دروست بکات، چونکە لەڕۆژی کیلابدا لووتی بڕا[3].

خورمای تەڕ و تازە:خوای گەورە بەمەریەم ئەفەرمووێ:﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ٢٥﴾ **مريم: ٢٥** ،واتا: قەدی ئەو دار خورمایەش بۆ لای خۆت ڕاوەشێنە خورمای تازە پێ گەیووت بەسەردا دەبارێت.

لەسەحیحەیندا هاتووە لەعەبدوڵڵەی کوڕی جەعفەرەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوام بینی(صلی الله علیه وسلم) ترۆزی بەخورمای تەڕ و تازە ئەخوارد[4].

لەسووننەنی ئەبو داوودا لەئەنەسەوە هاتووە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێش ئەوەی نوێژ بکات، بەچەند خورمایەکی تازە ڕۆژووی دەشکاند، ئەگەر

---

[1] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٠٥٢).
[2] -ئیبن ماجە(٣٣٢٠) ئیخراجی کردووە لەئەبو هورەیرەوە، ترمیزییش(١٨٥١) لەعومەری کوڕی خەتابەوە.
[3] -ئەبو داوود(٤٢٣٢) و ترمیزی(١٧٧٠) ئیخراجیان کردووە.
[4] -بوخاری(٥٤٤٠) و موسلیم(٢٠٤٣) ئیخراجیان کردووە.

خورمای تەڕ و تازە نەبوایە بەخورمای تر دەیشکاند، ئەگەر خورماش نەبوایە بەچەند قومە ئاوێك دەیشکاند[1].

ڕەیحانە: خوای گەورە ئەفەرمووێت:﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾ **الواقعة: ٨٨** ،واتا: ئەمجا ئەگەر ئەو(کەسەی لە گیانە لاّدایە)لەنزیکان بێ(لەخوا).

هەروەها ئەفەرمووێت:﴿ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ﴿١٢﴾ ﴾ **الرحمن: ١٢** ،واتا: دانەوێڵەی خاوەن کاو پەل و پۆدار و ڕەیحانە.

لەسەحیحی موسلیمدا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ رَيْحَانٌ فَلَا يَرُدَّهُ، فَإِنَّهُ طَيِّبُ الرَّائِحَةِ خَفِيفُ الْمَحْمِلِ، طَيِّبُ الرَّائِحَةِ»[2]،واتا: هەرکەسێ ڕەیحانەی پێ درا با ڕەتی نەکاتەوە، چۆنکە بۆنی خۆش و سووکە.

هەنار: خوای گەورە ئەفەرمووێت:﴿ فِيهِمَا فَٰكِهَةٞ وَنَخۡلٞ وَرُمَّانٞ ﴿٦٨﴾ ﴾ **الرحمن: ٦٨**، واتا: لەو دوو(باخەدا لەهەموو جۆرە)میوە و دارخورما و هەنارێکیان تێدایە.

باس دەکرێت لەئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) بەمەوقوفی و مەرفوعیی هاتووە:«مَا مِنْ رُمَّانٍ مِنْ رُمَّانِكُمْ هَذَا إِلَّا وَهُوَ مُلَقَّحٌ بِحَبَّةٍ مِنْ رُمَّانِ الْجَنَّةِ»،واتا: هەر هەنارێك لەم هەنارەی ئێوە، دەنکە هەنارێکی بەهەشتی تێدا دانراوە.

حەرب و کەسانی تر لەعەلییەوە باسیان کردووە وتوویەتی: هەنار بەتوێکڵە نەرمەکەیەوە بخۆن، چونکە خۆشەکەری پێستی گەدەیە.

زەیت: خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞ ﴾ **النور: ٣٥** ،واتا: خوا نور و ڕوناکیە

---

[1] -ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٣٥٦).

[2] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٥٣).

و ڕووناککەرەوەی ئاسمانەکان و زەویە وێنەی ڕووناککردنەوەی خوا وەك تاقێك وایە چرایەکی تێدا بێت ئەو چرایەش لەناو شوشەیەکدا بێت ئەو شوشەیەش وەك ئەستێرەیەکی گەش و پرشنگدار بێت(ئەو چرایە) دائەگیرسێت بە(ڕۆنی) درەختێکی زەیتونی بەفەڕو بەرەکەت کە نەڕۆژهەلاتی بێت، وە نەڕۆژئاوایی(سێبەر نایگرێ نەکاتی هەڵهاتنی خۆر لەکاتی ئاوابوونی)(ڕۆنەکەی ئەوەندە پاك بێت) نزیکە ڕۆنەکەی داگیرسێ با ئاگریشی بەر نەکەوێ.

لەترمیزی و ئیبن ماجەدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ ڕازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«كُلُوا الزَّيْتَ وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ»[1]،واتا: زەیت بخۆن و خۆتانی پێ چەور بکەن، چونکە لەدرەختێکی پیرۆزە.

بەیهەقی و ئیبن ماجەش گێڕاویانەتەوە لەئیبن عومەرەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: «ائْتَدِمُوا بِالزَّيْتِ وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ»[2]،واتا: زەیت بەکاربهێنن بۆ خواردن و خۆتانیشی پێ چەور بکەن، چونکە لەدرەختێکی پیرۆزە.

کەرە: ئەبو داوود لەسوونەنەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەهەردوو کوڕەکەی بوسری سولەمی وتیان:"پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هات بۆلامان، ئێمەش کەرە و خورمامان پێشکەش کرد، حەزی بەکەرە و خورماکە کرد"[3].

سیواك: لەسەحیحەیندا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە فەرموویەتی:«لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ»،واتا: ئەگەر

[1] -پێشتر باسکرا.
[2] -ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٣٨٢٧) و بەیهەقییش لە شعب الایمان٨/٩٢(٥٥٣٩).
[3] -ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٣٨٢٧).

زەحمەت و گران نەدەبوو بەسەر ئوممەتەکەمەوە، ئەوە فرمانم پێیان دەکرد بۆ هەموو نوێژێ سیواکیان بکردبایە[1].

هەر لەسەحیحەیندا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە شەو هەڵدەستا،سیواکی بەدەمدا دەهێنا.

لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە بەموعەللەقی لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ»[2]،واتا: سیواك دەم پاك دەکاتەوەو جێی ڕەزامەندیی پەروەردگاریشە.

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کە دەچووە ماڵەوە، سەرەتا سیواکی دەکرد[3].

فەرموودە زۆرە لەو بارەیەوە و بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)هاتووە لەسەرەمەرگدا داوای سیواکەکەی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری کردووە، بەدروست لێیەوە هاتووە فەرموویەتی:«أَكْثَرْتُ عَلَيْكُمْ فِي السِّوَاكِ»[4]،واتا: لەبارەی سیواکەوە زۆرم بۆ وتوون.

باشترین شتێك بۆ سیواك بەکاربهێنرێت، درەختی ئەراك و هاوشێوەکانێتی.

ماسی: ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیبن ماجە لەسوونەنەکەیدا فەرموودەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان گێڕاوەتەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ: السَّمَكُ وَالْجَرَادُ، وَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ»[5]،واتا: بۆمان حەڵاڵکراوە دوو مردارەوە بوو، دوو خوێن: ماسی و کولە، جگەر و سپڵ.

---

[1] -بوخاری(٨٨٧) و موسلیم(٢٥٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری موعەللەقی کردووە لەپێش فەرموودەی(١٩٣٤) و نەسائیش وەصلی کردووە(٥).

[3] –موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٣٥).

[4] –بوخاری ئیخراجی کردووە(٨٨٨).

[5] –ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٣٢١٨).

لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی جابری کوڕی عەبدوللەوە(خوا لەخۆی و باوکی رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەسێسەد سوارەوە ناردینی، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ئەمیرمان بوو، گەیشتینە کەنار دەریا، تووشی برسێتییەکی سەخت بووین هەتا ئەوەی بەناچاریی گەڵای دارمان دەخوارد، دەریا نەهەنگێکی بۆ خستینە کەنار پێیدەوترا: عەنبەر. نیو مانگ لەو نەهەنگەمان خوارد و چەورییەکەمان بەکارهێنا بۆ ئەوەی جەستەمان بەهێز بمێنێتەوە، ئەبو عوبەیدە باڵێك لەباڵاکانی هەڵگرت و پیاوێکی خستەسەر وشترەکەی خۆی و کردیە سێبەر و بەژێریدا رۆیشت[1].

برژاو: پەروەردگار لەبارەی میوانداریی ئیبراهیم لەمیوانەکانی ئەفەرمووێت: ﴿ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ ﴾ هود: ٦٩ ،واتا: ئەوەندەی نەبرد(ئیبراهیم)خێرا گوێرەکەیەکی برژاوی هێنا بۆیان.

لەترمیزییدا هاتووە: لەئوم سەلەمەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە لاشانێکی برژاوی نزیك خستووەتەوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم)، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لێیخوارد پاشان هەڵسا بۆ نوێژ و دەستنوێژی نەشۆرد، ترمیزی ئەڵێ: سەحیحە[2].

هەروەها لای ترمیزیی هاتووە: لەعەبدوللەی کوڕی ئەلحاریسەوە(خوای گەورەی لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لەمزگەوتدا لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) برژاومان خوارد[3].

---

[1] -بوخاری(٥٤٩٤) و موسلیم(١٩٣٥) ئیخراجیان کردووە.

[2] -ترمیزی(١٨٢٩) و نەسائی(١٨٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] -ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٣٣١١) و لای ترمیزیی نەمبینیووە.

هەروەها لای ترمیزیی هاتووە: لەموغیرەی کوڕی شوعبەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: شەوێکیان بوومە میوانی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)، فرمانی دا لاشانی مەڕێکیان برژاند، پاشان مەقاشێکی هەڵگرت و لێی پارچەی دەکرد بۆ من. ئەڵێ: بیلال هات و بانگی دا، مەقاشەکەی دانا و فەرمووی: "مَا لَهُ تَرِبَتْ يَدَاهُ"[1]، واتا: نەیهێشت لەچێشت خواردن ببینەوە.

چەوریی: لەموسنەددا لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە جولەکەیەك، پەیامبەری خوای دەعوەت کرد، نانی جۆ[2] و چەوریی تواوە و دوگی خستەبەردەم پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم).

لەسەحیحدا سەلماوە: لەعەبدوڵلای کوڕی موغەفیلەوە ئەڵێ: لەرۆژی خەیبەردا پارچە دوگێکم پێ درا، بۆ خۆم هەڵمگرت و وتم: سوێندبێ هیچی بەکەس نادەم. لامکردەوە بینینم پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێدەکەنی و هیچی نەفەرموو[3].

نوێژ: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ البقرة: ٤٥ ،واتا: پەنا ببەنە بەر ئارام گرتن و نوێژکردن(بۆ بە مەبەستەکانتان) وە بێگومان نوێژ(ئەرکێکی)گەورە و گرانە مەگەر لای ئەوانە نەبێ کە لەخوا ئەترسن و (خۆیان بەزل نازانن).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ البقرة: ١٥٣ ،واتا: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە پشت ببەستن بەخۆڕاگرتن و نوێژ(کردن)بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە.

---

[1] -ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١٨٨) و لای ترمیزیی نەمبینیووە.

[2] -ئەحمەد ئیخراجی کردووە٢٠/٤٢٤(١٣٢٠١).

[3] -بوخاری(٣١٥٣) و موسلیم(١٧٧٢) ئیخراجیان کردووە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ ﴾ طه: ١٣٢ ،واتا: (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم) فەرمان بدە بەئەندامانی خێزانەکەت بەنوێژکردن، وە خۆیشت خۆڕاگر و بەردەوام بە لەسەر بەجێ هێنانی ئێمە داوای ڕۆزیت لێ ناکەین بەڵکو ئێمە ڕزق و ڕۆزی تۆ دەدەین و سەرەنجامی چاك بۆ پارێزکاران و خواناسانە.

لەسووننەندا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەگەر کارێك سەرقاڵی بکردبایە و سەخت بوایە، دەچوو نوێژی دەکرد[1].

نوێژکردن رزق و ڕۆزیی دەهێنێ، لەشساغیی دەپارێزێ و ئازار و پیسی و دەرد ناهێڵێ، دڵ بەهێز دەکات و دەروون دەحەسێنێتەوە، تەمبەڵیی ناهێڵێ و ئەندامەکانی جەستە چالاك دەکات و هێز زیاد دەکات، سنگفراوانیی دەکات و خۆراك دەداتە روح، دڵ رووناك دەکات و روو سپیی دەکات و ناز و نیعمەت دەپارێزێ، نەگبەتیی ناهێڵێ و بەرەکەت دەهێنێ، مرۆڤ لەشەیتان دووردەخاتەوە و لەخوای گەورەی نزیکدەخاتەوە.

بەتێکڕا: نوێژکردن کاریگەرییەکی سەیری هەیە لەپاراستنی ساغیی جەستە و دڵ و هێزیاندا.

ڕۆژوو: ڕۆژوو، قەڵغانی مرۆڤە لەدەرد و نەخۆشییەکانی روح و دڵ و جەستە، سوودەکانی لەژمارە نایەن، کاریگەرییەکی سەیری هەیە لەپاراستنی لەشساغی و تواندنەوەی زیادەکانی جەستە و جڵەوکردنی دەروون لەخواردنی ئەو شتانەی زیانی پێ دەدەن، بەتایبەت ئەگەر بەڕێکی و مەبەست لەباشترین کاتە شەرعییەکانی خۆیدا ئەنجام بدرێت. بێگومان جەستەش پێویستی بە بەڕۆژووبوون هەیە، پێشتریش باسی هەندێ لەنهێنی ڕۆژوومان کردووە.

---

[1] ـ ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(١٣١٩).

بزن مژە: لەسەحیحەیندا سەلماوە: لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) کاتێ بزن مژەیەکیان هێنا بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و لێی نەخوارد، پرسیاری لێکرا: ئایە حەرامە؟ فەرمووی:"لَا، ولَكِنْ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ"، واتا: نە حەرام نییە، بەڵام لەخاکی قەومەکەمدا نییە بۆیە نایخۆم. بینی لەبەردەستیدا لێی دەخورا و تەماشای دەکرد[1].

لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئیبن عومەردا(خوا لەخۆی و باوکی رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«لَا أُحِلُّهُ وَلَا أُحَرِّمُهُ»[2]، واتا: نە حەڵاڵی دەکەم و نە حەرامی دەکەم.

بۆق: ئیمام ئەحمەد(بەڕەحمەت بێ) ئەڵێ: بۆق بەدەرمان دانانرێت، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهی کردووە بکوژرێت. مەبەستی ئەو فەرموودەیەیە کە لەموسنەدەکەی خۆیدا دەیگێڕێتەوە لەفەرموودەیەکی عوسمانی کوڕی عەبدولڕەحماندا(خوای لێ رازیی بێ) هاتووە، پزیشکێ ویستی بۆق تێکەڵ بەدەرمانی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بکات، بەڵام پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهیی کرد ئەو کارە بکات.

بۆن: سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:«حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمْ: النِّسَاءُ وَالطِّيبُ، وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ»[3]،واتا:لەدونیای

---

[1] - بوخاری(٥٥٣٧) و موسلیم(١٩٤٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٥٥٣٦) و موسلیم(١٩٤٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] - نەسائی(٣٩٣٩) ئیخراجی کردووە.

ئێوەدا سێ شتم بۆ خۆشەویست و شیرین کراوە: ئافرەت، بۆن، نوێژیشم بۆ بەسوکنایی کراوە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) زۆر بۆنی لەخۆی دەدا، زۆر رقی دەبوویەوە لەبۆنی ناخۆش. بۆن خۆراکی روحە کە هێزی پێ دەدات هەروەك بەخواردن و خواردنەوە، روح و جەستەی مرۆڤ هێز وەردەگرێت. خۆشەویستان زیاتر لەدەوری یەك کۆدەکاتەوە و حەز بەبینینیان دەکرێت.

هێشوو: خوای گەورە ئەفەرمووێت:﴿ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ﴿١٠﴾ ﴾ ق: ١٠ ،واتا: هەروەها دارخورمای بەرز و بڵند بە هێشووی تێك بەستراوەوە.

هەروەها ئەفەرمووێت:﴿ وَزُرُوعٖ وَنَخۡلٖ طَلۡعُهَا هَضِيمٞ ﴿١٤٨﴾ ﴾ **الشعراء: ١٤٨** ،واتا: لەناو کشتوکاڵی زۆر و باخاتی دار خورمای میوە گەیوودا.

موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەتەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) بەنێو باخی خورمادا تێپەڕبووم، بینی کۆمەڵێ کەس خەریك نێرو مێ کردنی خورمان، فەرمووی:"ئەوە چی ئەکەن؟" وتیان: لەنێری خورمای وەردەگرن و ئەیپرژێنن بەمێینەی خورمادا. فەرمووی:"وەها نازانم ئەوە پێویست بێ". ئەمەیان پێگەیشت و دەستیانهەلگرت، بەو هۆیەوە خورمای باش پێ نەگەیشت، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"ئەوە وتم گومانێ بوو، ئەگەر سوودی هەیە ئەنجامی بدەن، منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە، سەبارەت بەگومان، ئەوە هەندێجار دەیپێکی و هەندێجار نایپێکێ، بەڵام ئەگەر لەبارەی ئایینی خواوە قسەم بۆ کردن، ئەوە لەخۆمەوە قسە ناکەم"[1].

---

[1] –موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٣٦١).

عەجوە: لەسەحیحەیندا هاتووە: لەفەرموودەیەکی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە(خوای لێ رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی:«مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ مِنْ تَمْرِ الْعَالِيَةِ، لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سَمٌّ وَلَا سِحْرٌ»[1]،واتا: هەرکەسێ بەیانیی کردەوە بەحەوت خورمای عەجوە، ئەوە لەو رۆژەدا هیچ ژەهر و سیحرێك کاریگەریی لێ ناکەن.

لەسوونەنی نەسائی و ئیبن ماجەدا هاتووە: لەفەرموودەیەکی جابر و ئەبو سەعیددا(خوا لەهەردووکیان رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم):«الْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ، وَالْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ»[2]،واتا: عەجوە لەبەهەشتەوەیە، شیفایە بۆ ژەهر، دۆمەلانیش بەشێکە لە(الْمَنِّ –گەزۆ)، ئاوەکەی شیفایە بۆ چاو.

وتراوە: ئەم عەجوەیە تایبەتە بەعەجوەی مەدینە، یەکێکە لەجۆرەکانی خورما و رەهایانە بەسوودترین جۆری خورمای حیجازە، جۆرێکی بەخشندەی بەچێژ و پتەوە بۆ جەستە و هێز و نەرم و خۆشترین جۆری خورمایە.

عەنبەر: پێشتر باسمان کرد کە لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەکەی جابرەوە لەباسی چیرۆکی ئەبو عوبەیدەدا(خوای لێ رازی بێ) و ئەوەی بۆ ماوەی مانگێك لێیان خواردووە و بەشێ لەگۆشتەکەیان هێناوە بۆ مەدینە و لێیان ناردووە بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، ئەوەش بەلگە دەدات لەسەر ئەوەی حەلالیی ئەوەی لەدەریادا هەیە تەنیا تایبەت نییە بەماسییەوە و مردارەوەبووی دەریا حەلالە.

---

[1] –بوخاری(٥٧٦٩) و موسلیم(٢٠٤٧) ئیخراجیان کردووە.

[2] –نەسائی(٢٠٦٦) و ئیبن ماجە(٣٤٥٣) ئیخراجیان کردووە.

هەرچی عەنبەرە، ئەوە یەکێکە لەجۆرەکانی عەتر و بۆن، لەدوای میسك بەنرخترین بۆنە، هەڵەی کردووە ئەو کەسەی لەپێش میسك دایناوە و کردوویەتییە گەورەی بۆنەکان، بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە لەبارەی میسکەوە فەرموویەتی:"هُوَ أَطْيَبُ الطِّيبِ"[1]،واتا:بەنرخترین بۆنە.

عود: عودی هیندیی دوو جۆرە:

دانەیەکیان: لەدەرماندا بەکاردەهێنرێت کە قوستە(القُسط).

دووەم: بۆ بۆن بەکاردەهێنرێت و پێیدەوترێت(الأُلُوَّة). موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەئیبن عومەرەوە(خوایِ گەورە لەخۆی و باوکی ڕازیی بێ) کە بەئەلولە(بخوردی هیندی) بۆنی لەخۆی دەدا بەبێ تێکەڵکردنی بەبۆنی تر، هەندێجاریش کافوری تێکەڵ دەکرد و ئەیووت: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئاوەها بۆنی بەکاردەهێنا[2].

لێیەوە سەلماوە لەسیفەتی نازو نیعمەتی بەهەشتییەکان فەرموویەتی: «مَجَامِرُهُمُ الأُلُوَّةُ»[3]،واتا:بۆنی عودی هیندیی بەدەوریاندا بلاْودەبێتەوە.

باران: لەهەندێ شوێنی قورئاندا باس کراوە، ناوی لەسەر گوێ خۆشە و لای ڕوح و جەستە شیرینە، گوێ بەیادی و دڵیش بەناوهێنانی ئەگەشێنەوە.

شافیعی بەڕەحمەت بێ باسی کردووە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ:"لەگەڵ پەیامبەری خوادابووین(صلی الله علیه وسلم) باران گرتینی،

---

[1] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٥٢).

[2] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٥٤).

[3] -بوخاری(٣٢٤٥) و موسلیم(٢٨٣٤) ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەرگ و پۆشاکی خۆی گوشی و فەرمووی:"تازە لای پەروەردگارەوە هاتووە"[١].

سورەتی فاتیحا: دایکی قورئان، سبع المثاني و شیفای تەواو و دەرمانی بەسوود، روقیەی تەواو، کلیلی دەوڵەمەندی و سەرفرازی، پارێزەری هێز، لابەری خەم و پەژارەو ترس بۆ کەسێ رێزی ئەم سورەتەی زانیبێ و مافی خۆی دابێ و باش دابیەزاندبێتە سەر دەرد و ناخۆشییەکانی و شێوازی شیفا پێ وەرگرتنی زانیبێ، ئەو نهێنییەی شارەزابێ کە بەهۆیەوە دابەزیووە.

هاوەڵێ روقیەی پێ کرد، لەکاتی خۆیدا جێی گرت، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)پێیفەرموو:"وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟"،واتا: چۆن زانیت ئەوە روقیەیە؟![٢].

خوای گەورە یارمەتیی ئەو هاوەڵەی دا بەرچاوڕوون بێ بەنهێنییەکانی ئەو سورەتە، بەهۆی ئەوەی یەکتاپەرستی و ناسینی زات و ناو و سیفات و کرداری خوای تێدایە، هەروەها سەلماندنی شەرع و قەدەر و قیامەت و تەواوی دەسەڵاتی پەروەردگارێتی و خوایەتیی بۆ الله دەسەلمێنێ، تەواوی خۆڕادەستکردن بەخوای گەورە و تەواوی سوپاس و تەواوی چاکە لەدەست خوای گەورە دایە، هەروەها پێویستبوون بەخوای گەورە لەداواکردنی ئەو هیدایەتەی کە بناغەی بەختەوەریی هەردوو دونیایە، تەواوی بەرژەوەندییەکان بەوەوە پەیوەستە، عافێت و لەشساغیی تەواو بەوەوە پەیوەستە و لەسەر ئەوە وەستاوەتەوە، ئەوە بوو وەهای کرد ئەو هاوەڵە پێویستی بەدەرمان و چارەسەری تر نەبێ و خوای گەورە بەهۆیەوە دەرگاکانی چاکەی کردووەتەوە و هۆکارەکانی خراپەی پێ پاڵ داوە.

---

[١] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٨٩٨).

[٢] – بوخاری(٢٢٧٦) و موسلیم(٢٢٠١) ئیخراجیان کردووە.

قورئان: خوای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ **الإسراء: ٨٢** ،واتا: لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شیفا و میهرەبانی یە بۆ بڕواداران بەلاّم(هاتنی ئەم قورئانە)بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات جگە لە خەسارۆمەندی نەبێت.

(مِنَ)لەو ئایەتەدا بۆ روونکردنەوەی شتەکەیە(بَيَانِ الْجِنْسِ)ە نەك هەندەکی (التَّبْعِيضِ)، پەروەردگار ئەفەرموویێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ **یونس: ٥٧** ، واتا: ئەی خەڵکینە بێگومان بۆتان هاتووە ئامۆژگاری (قورئان) لەلایەن پەروەردگارتانەوە، وە شیفا و چارەیە بۆ ئەوەی لە ناو دڵ و دەرونتاندایە وە ڕێنمونی و میهرەبانیە بۆ بڕواداران.

قورئان شیفای تەواوە بۆ هەموو دەرد و نەخۆشییەکی جەستەیی و دەروونیی، دەرمانی دونیا و ئاخیرەتە. هەرکەسێ بەڕاست شیفای پێ وەربگرێ و بەڕاستی و ئیمان و قبوڵ و باوەڕی تەواو و مەرجەکانی جێبەجێ بوونی، شیفای پێ وەربگرێ، هیچ دەردێك بەرەنگاریی ناکات.

چۆن دەرد و نەخۆشییەکان بەرەنگاری فەرمایشتی خوای گەورە دەبنەوە کە ئەگەر دابەزاندبایەتەسەر چیاکان، لەتی دەکرد، یان دابەزاندبایەتەسەر زەوی و فرمانەکە بۆ زەویی بووایە، شەقی دەکرد. هەر نەخۆشییەکی دەروونی و جەستەیی هەبێ، لەقورئاندا بەڵگە و نیشانەیەك هەیە بۆ دەرمان و هۆکارەکەی و پاراستن لێی بۆ ئەو کەسەی، خوای گەورە تێگەیاندنی پەیامەکەی خۆی پێ بەخشیووە.

هەرچی دەرمانی دەروونە(دڵ)، ئەوە بەتێروتەسەلیی باسی دەکات و هۆکارەکانی دەردەدارکردن و چارەسەرکردنیشی باس دەکات، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿

﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ ﴾ **العنكبوت: ٥١** ،واتا: ئايا بۆ ئەوان بەس نیە کە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ، دەخوێنرێتەوە.

هەرکەسێ قورئان شیفای نەدات، خواش شیفای نادات.

ترۆزی: لەسوونندا هاتووە لەفەرموودەیەکی عەبدوڵڵەی کوڕی جەعفەرەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ترۆزی بەخورمای نەرمەوە دەخوارد[1].

قوست(قیست)کست:هەردووکیان یەك واتایان هەیە، لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسدا(خوای لێ رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم): «خَيْرُ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ»[2]،واتا:باشترین شتێك خۆتانی پێ چارەسەر بکەن، حیجامە و قوستی دەریاییە.

لەموسنەددا لەفەرموودەیەکی ئوم قەیسەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم):«عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ»[3]،واتا: پابەند بن بەبەکارهێنانی ئەم عودی هیندییەوە، حەوت شیفای تێدایە، یەکێك لەوانە کەلەکەی مرۆڤە.

قوست(قیست): دوو جۆرە: سپی کە پێیدەوترێ: دەریایی، ئەوی تر هیندی کە گەرمییەکەی توندترە، سپییەکە نەرمترە و سوودی هەردووکیان زۆر زۆرە.

[1] – بوخاری(٥٤٤٠) و موسلیم(٢٠٤٣) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٥٦٩٦) و موسلیم(١٥٧٧٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بوخاری(٥٦٩٢) و موسلیم(٢٢١٤) ئیخراجیان کردووە.

دۆمەڵان: لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) بەدروست هاتووە فەرموویەتی:"الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ»،واتا: دۆمەڵان بەشێکە لە(الْمَنِّ -گەزۆ)، ئاوەکەی شیفایە بۆ چاو. لەسەحیحەیندا ئیخراجیان کردووە[1].

کەباس(كَبَاثٌ): لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی جابری کوڕی عەبدوللەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ)ئەڵێ: لەگەڵ پەیامبەری خوادا بووین(صلی الله علیه وسلم) کەباسمان دەچنی و کۆدەکردەوە، فەرمووی:"عَلَيْكُمْ بِالْأَسْوَدِ مِنْهُ فَإِنَّهُ أَطْيَبُهُ"[2]،واتا: رەشەکانی کۆبکەنەوە خۆشترە.

کەباس: بەری داری ئەراکە.

کەتەم: بوخاری لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەعوسمانی کوڕی مەوهەبەوە ئەڵێ: چووینە لای ئوم سەلەمە(خوای لێ رازیی بێ) تاڵەموویەکی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بۆ ئێمە دەرکرد، خەنە و کەتەمی لێ درابوو[3].

لەهەر چوار سوونەنەکەدا هاتووە: لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:«إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ»[4]،واتا: باشترین شتێك کە مووی سپییتان پێ گۆڕیبێ، خەنە و کەتەمە.

لەسەحیحەیندا هاتووە: لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە ئەبو بەکر(خوای لێ رازیی بێ) خەنە و کەتەمی بەکارهێناوە[5].

---

[1] -بوخاری(٥٧٠٨) و موسلیم(٢٠٤٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] -بوخاری(٥٤٥٣) و موسلیم(٢٠٥٠) ئیخراجیان کردووە.

[3] -بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٨٩٧).

[4] -ئەبو داوود(٤٢٠٥) و ترمیزی(١٧٥٣) و نەسائی(٥٠٧٨) و ئیبن ماجە(٣٦٢٢) ئیخراجیان کردووە.

[5] -بوخاری(٣٩١٩) و موسلیم(٢٣٤١) ئیخراجیان کردووە.

تریَ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی کردووە لەناونانی تریَ(العنب)بە(كَرْم)، موسلیم لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە بەوەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"لاَ تَقُولُوا: الْكَرْمُ، وَلَكِنْ قُولُوا: الْعِنَبُ، وَالْحَبَلَةُ"، مەڵێن(الْكَرْمُ)، بەڵکو بڵێن(الْعِنَبُ، وَالْحَبَلَةُ)[1]. فەرموویەتی:"الكَرْمُ قَلْبُ المُؤمِنِ"[2]،واتا: بەخشندە و سەخاوەتی، دڵی مرۆڤی باوەڕدارە. لەبەر ئەوەی وشەی(كَرْم) بەڵگە دەدات لەسەر خێر و سوودی زۆر، ئەوە دڵی بەندەی باوەڕدار شایستەیە بەو ناوە نەك دار مێو.

گۆشت: پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ وَأَمْدَدْنَاهُم بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الطور: ٢٢ ،واتا: بەردەوام هەموو جۆرە میوە و گۆشتێکیان پێ دەدەین لەوەی ئارەزووی دەکەن.

هەروەها فەرموویەتی:﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الواقعة: ٢١ ،واتا:گۆشتی هەر باڵندەیەك کە حەزی لێ بکەن.

لەسەحیحدا لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە:«فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[3]،واتا: فەزڵی عائیشە بەسەر ژنانەوە، وەك فەزڵی تریتە بەسەر خواردنەکانی ترەوە. تریت: نان و گۆشتە.

گۆشت چەند جۆرێکە:

گۆشتی مەڕ: گۆشتی باڵ(دەست) سووکترین جۆری گۆشتە،لەسەحیحەیندا سەلماوە: گۆشتی دەستی مەڕ جێی سەرسامیی پەیامبەری خوا بووە(صلى الله عليه وسلم)[4].

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٤٨).

[2] – بوخاری(٦١٨٣) و موسلیم(٢٢٤٧) ئیخراجیان کردووە.

[3] -بوخاری(٣٧٧٠) و موسلیم(٢٤٤٦) ئیخراجیان کردووە.

[4] -بوخاری(٣٣٤٠) و موسلیم(١٩٤) ئیخراجیان کردووە.



گۆشتی ئەسپ: لەسەحیحدا سەلماوە لەئەسمائەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:لەسەردەمی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) ئەسپێکمان سەربڕی و خواردمان[١].

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە رێگەی داوە بۆ خواردنی گۆشتی ئەسپ و نەهی کردووە لەخواردنی کەر، لەسەحیحەیندا ئیخراجیان کردووە[٢].

گۆشتی وشتر: جیاوازیی نێوان رافیزە و ئەهلی سووننەیە، هەروەك یەکێکە لەجیاوازییەکانی نێوان جولەکە و موسڵمانان، رافیزەکان گۆشتی وشتر نابووت دەبینن و نایخۆن، بەڵام لەئیسلامدا حەڵاڵە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی لەمەدینە و سەفەریشدا خواردوویانە.

لەدوو فەرموودەی سەحیحدا کە دژیەکییان لەنێواندا نییە، هاتووە فرمانی داوە کەسێك گۆشتی وشتر بخوات، دەستنوێژ بشۆرێتەوە، دروست نییە ئەو دەستنوێژ شۆردنە بەدەستشۆردن تەئویل بکرێت و لێکبدرێتەوە[٣].

گۆشتی بزن مژە: پێشتر باسکرا.

گۆشتی کەروێشك: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەڵێ: کەرۆیشکێکمان لەشوێنی خۆی تار کرد، بەدوایدا رۆیشتن و گرتیان، ئەبو تەڵحە قاچێکی نارد بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، پەیامبەریش قبوڵی کرد[٤].

---

[١] -بوخاری(٥٥١٩) و موسلیم(١٩٤٢) ئیخراجیان کردووە.

[٢] -بوخاری(٥٥٢٠) و موسلیم(١٩٤١) ئیخراجیان کردووە.

[٣] -یەکەم لەفەرموودەیەکی جابری کوڕی سەمرە و موسلیم(٣٦٠) و کەسی تریش ئیخراجیان کردووە، دووەمیش لەفەرموودەیەکی بەرائدا ئەبو داوود(١٨٤) و ئیبن ماجە(٤٩٤) ئیخراجیان کردووە.

[٤] -بوخاری(٥٥٣٥) و موسلیم(١٩٥٣) ئیخراجیان کردووە.

گۆشتی كەرە كێوی: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەفەرموودەیەكی ئەبو قەتادەوە(خوای لێ رازیی بێ) كە لەعومرەیەكدا لەگەڵ پەیامبەری خوا بوون(صلی الله علیه وسلم)، كەرە كێوییەكی راوكرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی پێكردن لێی بخۆن لەكاتێكدا ئیحرامیشیان كردبوو، ئەبو قەتادە ئیحرامی نەكردبوو[1].

لەسووننەنی ئیبن ماجەدا هاتووە لەزوبەیرەوە ئەڵێ: لەكاتی خەیبەردا ئەسپ و كەری كێویمان دەخوارد[2].

گۆشتی كۆرپلەی سكی ئاژەڵ: پەسەند نییە چونكە خوێنی تێ زاوە، بەلاّم حەرام نییە، بەپێی فەرموودەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم):«ذَكَاةُ الْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ»[3]،واتا: گۆشتی كۆرپەلەی سكی دایك پاكە ئەگەر دایكەكە سەربڕابێ.

گۆشتی وشك: لەسووننەندا هاتووە لەفەرموودەیەكی سەوباندا ئەڵێ: بۆ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) شەك مەڕێكم سەربڕی و لەسەفەردابووین، فەرمووی:"گۆشتەكە چاك بكە"، لەو گۆشتەم پێ دەدا تاوەكو گەیشتینە مەدینە[4].

گۆشتی باڵندە: پەروەردگار ئەفەرمووێت:﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ **الواقعة: ٢١** ،واتا: گۆشتی هەر باڵندەیەك كە حەزی لێ بكەن.

---

[1] -بوخاری(٥٤٩٠) و موسلیم(١١٩٦) ئیخراجیان كردووە.

[2] -ئیبن ماجە ئیخراجی كردووە(٣١٩١).

[3] -ئەبو داوود(٢٨٢٨) و ترمیزی(١٤٧٦) و ئیبن ماجە(٣١٩٩) ئیخراجیان كردووە.

[4] - موسلیم ئیخراجی كردووە(١٩٧٥).

هەندێ باڵندە خواردنیان حەڵاڵە و هەندێکیان حەرامە. حەرامەکان بریتین لە: چڕنوکدارەکان نمونەی هەڵۆ و داڵو شاهین، ئەوانەش کە لاك و تۆپیو دەخۆن، نمونەی داڵ و لەق لەق و قەلەڕەش و قەلەباچکە و هاوشێوەکانیان، هەروەها ئەوانەش کە نەهی کراوە بکوژرێن نمونەی هودهود(پەپوسولەیمانە) و بازور، ئەوانەش کە فرمان دراوە بکوژرێن ئەوانیش خواردنیان حەڵاڵ نییە وەك قەلەڕەش و سورەداڵ.

باڵندە حەڵاڵەکان چەند جۆرێکی زۆرن:

لەوانە: مریشك: لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرمودەیەکی ئەبو موسادا(خوای لێ رازیی بێ) بەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گۆشتی مریشکی خواردووە[1].

کوولە: لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوافا(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) حەوت غەزامان کرد و کوولەمان دەخوارد[2].

شیر: خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ **النحل: ٦٦** ،واتا: بەڕاستی لە ئاژەڵ و ماڵاتیشدا بۆ ئێوە پەند و ئامۆژگاری هەیە لەوەی لە ناو سکیدایە بە ئێوەی دەنۆشین لە نێوان سروان(پیسی) و خوێندا شیرێکی پاکی بێ خەوشتان پێ دەنۆشێت.

خوای گەورە لەبارەی بەهەشتەوە ئەفەرمووێت:﴿ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ ﴾ **محمد: ١٥** ،واتا: چەندەها ڕووباری تێدایە لە ئاوی سازگاری تام و بۆن نەگۆڕاوە وە چەندەها ڕووبار لەشیر کە تامی نەگۆڕاوە.

---

[1] - بوخاری(٥٥١٨) و موسلیم(١٦٤٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٥٤٩٥) و موسلیم(١٩٥٢) ئیخراجیان کردووە.

لەسوونەندا بەمەرفوعیی هاتووە: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيه، وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ، وَإِذَا سُقِيَ لَبَنًا فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ إِلَّا اللَّبَنُ»[1]،واتا:ئەگەر یەکێ لەئێوە خواردنی خوارد، با بڵێ:" اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَأَطْعِمْنَا خَيْرًا مِنْهُ "،واتا: خوایە گیان بۆ ئێمە بەرەکەتی تێدا بکە و لەمە باشترمان پێ بدە. ئەگەر شیریشی خواردەوە با بڵێ:" اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ "،واتا: خوایە گیان بۆ ئێمە بەرەکەتی تێ بکە و زیاتری بکەی.

زۆر خواردنەوەی شیر زیان دەدات لەددان و پووك، بۆیە پێویستە دوای شیرخواردنەوە ئاو لەدەم رابدرێت. لەسەحیحەیندا هاتووە بەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) شیری خواردەوە، پاشان داوای ئاوی کرد و ئاوی لەدەم را دا و فەرمووی:"إِنَّ لَهُ دَسَمًا"[2]،واتا: چەوریی هەیە.

ئاو: کەرەستەی ژیان و گەورەی خواردنەوەکانە، یەکێکە لەپایە و راگرەکانی جیهان و پایەی بناغەیەتی، ئاسمانەکان لەهەڵمی ئاو دروستکراون، زەوییش لەسەرتوێژییەکەی،خوای گەورە گێڕاوێتی بەمایەی زیندوێتیی هەموو شتێك.

لەسەحیحەیندا هاتووە: لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«سَيْحَانُ، وَجَيْحَانُ، وَالنِّيلُ، وَالْفُرَاتُ كُلٌّ مِنْ أَنْهَارِ الْجَنَّةِ»[3]،واتا: سەیحان و جەیحان و نیل و فورات، هەموویان رووباری بەهەشتن.

---

[1] - ترمیزی(٣٤٥٥) و ئەبو داوود(٣٧٣٠) و ئیبن ماجە(٣٣٢٢) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٢١١) و موسلیم(٣٥٨) ئیخراجیان کردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٨٣٩).

ئاوی بەفر و تەرزە: لەسەحیحەیندا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە لەدوعای دەستپێکردنی نوێژدا فەرموویەتی:«اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ»[1]،واتا:خوایە گیان لەهەڵەکانم بمشۆرەوە بەئاو و بەفر و تەرزە.

ئاوی زەمزەم: گەورە و بەڕێز و خۆشەویسترین و بەنرخترین ئاوێکە لای خەڵکی، جبریل بەقاچی خۆی لێی دا ئاوەکە دەرچوو، خوای گەورە بۆ ئیسماعیلی هێنایە بوون تاوەکو لێی بخواتەوە[2].

لەسەحیحدا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە بەئەبو زەڕی فەرمووە کاتێك لەنێو کەعبە و دەوروبەریدا چل ڕۆژ ماوەتەوە بەدرێژایی شەو و ڕۆژ تەنیا ئاوی زەمزەمی خواردووەتەوە بێ هیچی تر، پێیفەرموە:"إِنَّهَا طَعَامُ طُعْمٍ"[3]،واتا: لەجێی خواردنە. موسلیم بەئیسنادی خۆی زیاتری کردووە:"وَشِفَاءُ سُقْمٍ"[4]،واتا: شیفای نەخۆشییە.

ئاوی دەریا: سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ»[5]،واتا: ئاوی دەریا پاکە و مردارەوەبوویشی حەڵاڵە. خوای گەورە ئەو ئاوەی گێڕاوە بەئاوێکی سوێری تاڵ بۆ بەرژەوەندیی تەواوی ئەوەی لەسەر ڕووی زەوییدایە لەمرۆڤ و ئاژەڵان.

---

[1] -بوخاری(٧٤٤) و موسلیم(٥٩٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] – عەبدولڕەزاق لەمصنف ٥/١١٨(٩١٢٤) و دارەقوتنی٣/٣٥٤ ئیخراجیان کردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٤٧٣).

[4] - تەیالیسی(٤٥٩) و ئیبن ئەبی شەیبە٣/٢٧٣(١٤١٣٢) ئیخراجیان کردووە.

[5] - ئەبو داوود(٨٣) و ترمیزی(٦٩) و نەسائی(٥٩) و ئیبن ماجە(٣٨٦) ئیخراجیان کردووە.

ميسك: لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەئەبو سەعیدی خودرییەوە، لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"هُوَ أَطْيَبُ الطِّيبِ الْمِسْكُ"[1]، واتا: بەنرخترین بۆنە.

لەسەحیحەیندا هاتووە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:بۆنم لەپەیامبەری خوا دەدا(صلى الله عليه وسلم) لەپێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ و لەڕۆژی قوربانییشدا پێش ئەوەی تەوافی کەعبە بکات، بۆنم لێ دەدا بەبۆنی میسك[2].

میسك پادشا و خۆشترینی هەموو بۆنەکانە، ئەو بۆنەیە وەك پەند دەهێنرێتەوە و مرۆڤی پێ دەشوبهێنرێت.

دار خورما: لەزیاتر لەشوێنێکی قورئاندا باسی هاتووە، لەسەحیحەیندا هاتووە لەئیبن عومەرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: لای پەیامبەری خوا بووین(صلى الله عليه وسلم) کرۆکی دار خورمایان هێنا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً مَثَلُهَا مَثَلُ الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ لَا يَسْقُطُ وَرَقُهَا، أَخْبِرُونِي مَا هِيَ؟"، واتا: لەنێو درەختەکاندا درەختێك هەیە وەك مرۆڤی موسڵمانە و گەڵای هەڵناوەرێ، کێ پێم ئەڵێ ئەوە چی دارێکە؟ خەڵکیی هەریەکەو ناوی دار و درەختێکی هێنا، ئەوە کەوتە دڵمەوە دار خورمایە، بەڵام روانیم لەهەموو ئەوانەی مەجلیسەکە منداڵترم، بێدەنگ بووم، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"ئەوە دار خورمایە". بۆ عومەرم باسکرد کە وەڵامەکەم زانیووە، ئەویش وتی: ئەگەر بتوتبایە لەفلان و فلانە شت بەلامەوە خۆشتر دەبوو[3].

---

[1] -موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٢٥٢).

[2] -بوخاری(١٥٣٩) و موسلیم(١١٩١) ئیخراجیان کردووە.

[3] -بوخاری(٥٤٤٤) و موسلیم(٢٨١١) ئیخراجیان کردووە.

لەم فەرموودەیەدا: مرۆڤی موسڵمان شوبهێنراوە بەدار خورما و خێر و بێری زۆری و بەردەوامیی سێبەر و بەرهەمی جوان و بەردەوامی.

یقطین: کولەکەیە، ئەگەرچی یقطین گشتگیرترە، لەزماندا هەموو رۆکێك دەگرێتەوە کە لقی(ساق)ی نەبێ، وەك شووتی و کاڵەك و ترۆزی و خەیار، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَأَنۢبَتۡنَا عَلَيۡهِ شَجَرَةً مِّن يَقۡطِينٖ ﴿١٤٦﴾ ﴾ **الصافات: ١٤٦** ،واتا: ڕووەکێکی کولەکەمان بەسەریدا ڕواند.

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەفەرموودەیەکی ئەنەسی کوڕی مالیکدا(خوای لێ رازیی بێ) بەوەی بەرگدوورێك دەعوەتی پەیامبەری خوای کرد(صلى الله عليه وسلم) بۆ خواردنێك، ئەنەس ئەڵێ: لەگەڵ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) رۆیشتم، کابرا نانی جۆو و شلەیەکی لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)نزیك کردەوە، کولەکەی تێدا بوو. ئەنەس ئەڵێ: بینینم پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کولەکەکانی دەخوارد و لەناو قاپەکەدا بەدوایدا دەگەڕا، بۆیە لەو رۆژەوە تاوەکو ئەمڕۆ حەزم بەکولەکەیە[1].

---

[1] -بوخاری(٥٤٣٦) و موسلیم(٢٠٤١) ئیخراجیان کردووە.

## بەشی چوارەم

## ڕێبازی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەقەزاوەتکردن و بڕیارداندا

### یەکەم: بەشێکی گشتگیر

ئەگەرچی بڕیارە تایبەتییەکانی تەشریعێکی گشتیین، بەڵام لێرەدا مەبەست بەم باسە تەشریعی گشتیی نییە، بەڵکو باسکردنی هەندێ ڕێباز و مامەڵەی پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم) لەو بڕیارە هەندەکییانەی کە لەنێوان دوو کەسی ناکۆکدا داوێتی. ئاخۆ حوکم و بڕیاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەنێو خەڵکدا چۆن بووە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بڕیاری گشتیی باس دەکەین.

#### ١- گلدانەوە لەبابەت تۆمەتدا

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) لەفەرموودەیەکی بەهزی کوڕی حەکیمەوە ئەویش لەباوکیەوە ئەویش لەباپیرەیەوە، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەتۆمەتێکدا ئەوی بەند کردووە[١].

#### ٢- بڕیاری لەبارەی چەتەو یاخییانەوە

بڕیاری داوە دەست و قاچیان ببڕدرێتەوە و چاویان هەڵبکۆڵرێت، هەروەك ئەوان چاوی شوانەکانیان کوێر کردبوو. هێشتی بەبرسی و تینوێتی بمرن هەروەك ئەوان وەهایان بەشوانەکان کردبوو[٢].

---

[١]– ئەبو داو(٣٦٣٠) و ترمیزی(١٤١٧) ئیخرلجیان کردووە.

[٢]– بوخاری(٦٨٠٢) و موسلیم(١٦٧١) ئیخراجیان کردووە.

## ٣- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی بکوژ و کەسوکاری کوژراوەوە

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە پیاوێك بانگەشەی ئەوەی کردووە پیاوێك براکەی ئەمی کوشتووە، کابرای بکوژ دانیپێدا نا، فەرمووی:"بیبە بیکوژە"، کە کابرا پشتی هەڵکرد، فەرمووی:"ئەگەر بیکوژێ، وەك ئەوە"، کابرا گەڕایەوە وتی: من بەفرمانی تۆ بردم. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"أَمَا تُرِيدُ أَنْ يَبُوءَ بِإِثْمِكَ وَإِثْمِ صَاحِبِكَ؟"[1]،واتا: ئەی ناتەوێ بە نەکوشتنی، تاوان نەخەیتەسەر خۆت و براکەت و چاکەت دەستکەوێ؟ وتی: بەڵێ بۆ نا، کابرای بەرەڵاکرد[2].

فەرمایشتی:"فهو مثلُه"، دوو بۆچوونی لەسەر هەیە:

یەکەم: ئەگەر بکوژ بکوژرێتەوە، مافی کوژراوی لەئەستۆ نامێنێ.

دووەم: ئەگەر بەئەنقەست براکەی نەکوشتبێ و ئەم بێتو ئەو بکوژێ، وەك ئەو دەستدرێژکارە.

## ٤- بڕیاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەتۆڵەکردنەوە لەو کەسەی جاریەیەکی کوشتبوو، چی کرد ئاوەهای پێ کرایەوە

لەسەحیحەیندا سەلماوە: جولەکەیەك لەنێو دوو تاشەبەردا سەری جاریەیەکی پان کردەوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کرد بەنمونەی کارەکەی خۆی، پێی بکرێتەوە[3].

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٦٨٠).

[2] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٦٨٠).

[3] - بوخاری(٢٤١٣) و موسلیم(١٦٧٢) ئیخراجیان کردووە.

لەم بڕیارەدا بەڵگەی ئەوە دەبینین کە پیاو لەتۆڵەی ئافرەتدا دەکوژرێتەوە، تاوانبار چی کردبێ ئاوەهای پێ دەکرێتەوە. کوشتنی رەشەکوژیی تاوانێکە کوشتنەوەی ئەنجامدەری، پێویستی بەمۆڵەتی کەسوکاری کوژراو نییە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەوەی نەگێڕایەوە بۆلای کەسوکاری ئەو ژنە خزمەتکارە و نەیفەرموو: ئەگەر ئەتانەوێ بیکوژن و ئەکەر ئەتانەوێ لێی ببورێن، لێی ببوورێن، بەڵکو یەکلایەنە کابرای کوشت.

## ٥- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەرانبەر بەکەسێ لەئافرەتێکی سکپڕی داو منداڵەکەی پێ لەبار برد

لەسەحیحەیندا هاتووە کە دوو ئافرەتی هوزەیل بووە شەڕیان، یەکێکیان پاڵی بەوی تریانەوە نا بەبەردێکەوە و ژنەکە و کۆرپەکەی سکی کوشت، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بڕیاری دا بە: پێدانی بەندەیەك یان هێنانەدیی منداڵێك، خوێنبایی ژنی کوژراویشی خستە ئەستۆی ژنەی بکوژ[1].

## ٦- بڕیاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بەسوێندخواردن لەوەی کەسێ نەزانێ بکوژ کێیە؟

لەسەحیحەیندا سەلماوە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە لەنێوان پشتیوانان و جولەکەدا، بەحوەیسییە و موحەیسە و عەبدولڕەحمانی فەرموو:"سوێند دەخۆن لەباری خوێنی کوژراوەکەتان؟"وتیان: شتێکە ئێمە نەمانبینیووە. فەرمووی:"جولەکە بەسوێندی پەنجا کەس خۆیان لەو کارە ئەستۆ

[1] - بوخاری(٦٧٤٠) و موسلیم(١٦٨١) ئیخراجیان کردووە.

پاك دەکەن"، وتیان: چۆن سوێندی خەڵکانێکی بێباوەڕ قبوڵ بکەین؟ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەلایەن خۆیەوە خوێنابایی دا[1].

## ٧- بڕیاری لەبارەی کەسێك باوەژنی خۆی مارە کردبوو

لەموعاویەی کوڕی قورە ئەویش لەباوکیەوە ئەویش لەباپیرەیەوە(خوای لێ رازیی بێ) بەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ناردی بۆ سەر کابرایەك باوەژنی خۆی مارە کردبوو، لەگەردنی دا و پێنج یەکی ماڵەکەشی برد" یەحیای کوڕی مەعین ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە سەحیحە[2].

لەسووننەنی ئیبن ماجەدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"مَن وَقَعَ علی ذاتِ محرم فاقتلوه"[3]،واتا:هەرکەسێ لەگەڵ مەحرەمی خۆی جووت بوو، بیکوژن.

## ٨- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەکوشتنی کەسێك کە تۆمەتبارکراوە بەدەست تێکەڵکردن لەگەڵ دایکی منداڵەکەی(أم ولد)ی، پاشان کە بێتاوانیی کەسەکە دەرچوو، بڕیارەکەی جێبەجێ نەکرد

لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە ئامۆزای ماریە تۆمەتبار کراوە بەپەیوەندی لەگەڵی، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی داوە بەعەلی کوڕی ئەبو تالیب(خوای لێ رازیی بێ) و پێیفەرموو:"اذْهَبْ فَإِنْ وَجَدْتَهُ عِنْدَ مارية، فَاضْرِبْ عُنُقَهُ"،واتا: برۆ ئەگەر لای ماریە بینیت، لەگەردنی بدە. عەلی هات و بینی لەبیرێکدایە خۆی فێنك دەکاتەوە، عەلی پێیووت: وەرە دەرەوە. بەدەستی گرتی و

---

[1] - بوخاری(٣١٧٣) و موسلیم(١٦٦٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] - ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٢٦٠٨).

[3] - ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٢٥٦٤).

دەری کردە دەرەوە، بینی ئەندامی نێرینەی نییە، بۆیە عەلی وازی لێهێنا و گەڕایەوە لای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئەندامی نێرینەی نییە[1].

ئەم بڕیارە لای زۆرێك کەس ئاڵۆز بووە، باشتر ئەوەیە بووترێت: پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فرمانی بەعەلی کرد بیکوژێ بۆ تەمبێکردنی(تعزین) لەبەر ئەوەی بوێریی کردووە بەتەنیا لەگەڵ(أم ولد)ی ماوەتەوە، کاتێك حەقیقەتی حاڵ بۆ عەلی روونبوویەوە، دەستیهەڵگرت لەکوشتنی. کوشتن بەتەعزیز وەك کوشتن نییە بەحەد، بەڵکو ئەو کارە بەپێی بەرژەوەندییە، بەرژەوەندیی هەبێ دەکوژرێت، نەبێ کوشتن نابێ.

## ٩- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەدواخستنی تۆڵەکردنەوە بەهۆی برینەوە تاوەکو چاك دەبێتەوە

لەموسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە لەفەرموودەیەکی عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەباوکییەوە ئەویش لەباپیرەیەوە: پیاوێك بەشاخێك لەئەژنۆی کەسێکی داو بریندای کرد، هات بۆ لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتی: تۆڵەم لێ بکەرەوە. فەرمووی:"هەتاوەکو چاك دەبێتەوە ئینجا"پاشان هاتەوە وتی: تۆڵەم لێ بکەرەوە، تۆڵەی لێ کردەوە. پاشان هاتەوە وتی: ئەی پەیامبەری خوا وا شەل بووم. پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"نەهیم کرد تۆڵەت لێ بکرێتەوە تاوەکو چاك دەبیتەوە، تۆ پێچەوانەت کرد، خوا دووربت بخاتەوە و شەلییت نەهێڵێ". پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی کرد تۆڵە لەکەسی بریندار بکرێتەوە تاوەکو چاك دەبێتەوە[2].

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(٢٧٧١).

[2] – ئەحمەد ئیخراجی کردووە٦٠٦/١١(٧٠٣٤).

ئەو بڕیارە ئەوە دەگەیەنێ، جائیز نییە لەکەسی بریندار تۆڵە بکرێتەوە تاوەکو حاڵی برینەکەی سەقامگیر دەبێ، یان سارێژبوون، یان گیرسانەوە لەسەر حاڵەتێك، جائیزە تۆڵەبکرێتەوە لەلێدان بەگاڵۆك یان شاخ و هاوشێوەکانی تر.

## ١٠-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەتۆڵەکردنەوە لەسەر ددان شکاندن

لەسەحیحەیندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسدا، کە کچی ئەلنەزر خوشکی ئەلڕەبیع زللەی لەجاریەیەك دا و ددانی شکاند، ناکۆکییەکەیان هێنایە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، فرمانی دا بەتۆڵەکردنەوە. ئوم ئەلڕەبیع وتی: ئەی پەیامبەری خوا، لەفلانە کچم تۆڵە دەکەیتەوە؟ نە سوێند بەخوا تۆڵەی لێ ناکرێتەوە. پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"سُبْحَانَ اللَّهِ يَا أم الربيع كِتَابُ اللَّهِ الْقِصَاصُ"،واتا: سبحان الله، ئەی دایکی ڕەبیع، قورئانی خوا تۆڵەکردنەوەیە. وتی: نە سوێند بەخوا هەرگیز تۆڵەی لێ ناکرێتەوە. بۆیە کەسوکاری جاریەکە لێی خۆشبوون و پارەیان لەجیاتیی وەرگرت، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ"[1]،واتا:لەنێو بەندەکاندا کەسی وا هەیە سوێند لەسەر خوا بخوات بۆ کارێك، خوا بۆی جێبەجێ دەکات.

---

[1] – بوخاری(٢٧٠٣) و موسلیم(١٦٧٥)ئیخراجیان کردووە.

**١١-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبارەی کەسێکەوە گازی لەدەستی کەسێکی تر گرتبوو، کە کابرای گاز لێگیراو ویستی دەستی خۆی دەرباز بکات، ددانی گازلێگر شکا**

لەسەحیحەیندا سەلماوە کە پیاوێك گازی لەدەستی کەسێکی تر گرتبوو، کابرای گازلێگیراو کە ویستی دەستی خۆی رزگار بکات،ددانی گاز لێگر شکا، بۆ ئەوە هاتنە لای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و ئەویش فەرمووی:"يَعَضُّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ، لَا دِيَةَ لَكَ"[1]،واتا: یەکێ لەئێوە کە گاز لەبراکەی دەگرێت وەك گازگرتنی کەڵ، کەسێك وەهای کرد، خوێنبایی نییە.

ئەم بڕیارە ئەوەی لەخۆگرت، هەرکەسێك لەدەستی ستەمکار خۆی رزگارکرد، لەوکاتەدا شتێك لەستەمکار رووی دا، دەستی یان شوێنێکی یان سەروەتێکی فەوتا، بەشتێکی لەنێوچووی ناگرنتیکراو دادەنرێت.

**١٢-بڕیاری پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەبارەی کەسێك کە تەماشایماڵێك بکات و لەماڵەکەوە بەردێك یان چڵێك بکرێتە بەچاویدا و کوێر ببێ، هیچ قەرەبوو و مافێکی نییە**

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«لَوْ أَنَّ امْرَءًا اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ، فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ»[2]،واتا: ئەگەر کەسێك بەبێ مۆڵەت تەماشای ماڵەکەتی کرد، بەبەردێ سەرت شکاند یان چاوت کوێر کرد، هیچ تاوانێکت لەسەر نییە.

---

[1] - بوخاری(٦٨٩٢) و موسلیم(١٦٧٣)ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٦٩٠٢) و موسلیم(٢١٥٨)ئیخراجیان کردووە.

## ١٢-بەش( کۆکەرەوە )

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڕیاری داوە ئەگەر ئافرەتی سکپڕ بەئەنقەست کەسێکی کوشت،ئەو ئافرەتە ناکوژرێ تاوەکو سکەکەی دادەنێ و کەسێك کۆرپەکەی لەئەستۆ دەگرێ.

بڕیاری داوە لەکوشتنی کوڕدا لەلایەن باوکەوە، باوکەکە ناکوژرێتەوە[١].

بڕیاری داوە کە باوەڕداران خوێنیان وەك یەکە، بۆ بێباوەڕێك، باوەڕدارێك ناکوژرێت[٢].

بڕیاری داوە ئەگەر کەسێ کوژرا، خاوەن کوژراو سەرپشکن، بکوژ بکوژرێت یان خوێنبایی وەریگرن[٣].

بڕیاری داوە لەبارەی خوێنبایی پەنجەکانی دەست و قاچ، بۆ هەر پەنجەیەك دە وشتر[٤].

بڕیاری داوە لەتۆڵەی هەر ددانێکدا بەپێنج وشتر، هەموو ددانەکان وەك یەکن[٥].

بۆ شکاندنی هەر ئێسقانێك و دەرکەوتنی ئێسقانەکە لەناو گۆشتدا پێنج وشتر تۆڵەکردنەوە هەیە.

بۆ دەستی ئیفلیج یەك لەسەر سێی دەستی ساغ وەردەگیردرێ، بۆ ددانی رەش ئەگەر بشکێنرێت، یەك لەسەر سێی ددانی ئاسایی وەردەگیردرێت[٦].

ئەگەر لووتێ ببڕدرێتەوە خوێنبایی تەواو وەردەگیردرێت، ئەگەر سەری لووت ببڕدرێت، نیوەی خوێنبایی وەردەگیردرێت[٧].

---

[١] – ترمیزی(١٤٠٠) و ئیبن ماجە(٢٦٦٢)ئیخراجیان کردووە.

[٢] – ئەبو داوود(٢٧٥١) و ئیبن ماجە(٢٦٨٥)ئیخراجیان کردووە.

[٣] – بوخاری(٢٤٣٤) و موسلیم(١٣٥٥)ئیخراجیان کردووە.

[٤] – ئەبو داوود(٤٥٥٦) و ئیبن ماجە(٢٦٥٤) و نەسائی(٤٨٤٣) ئیخراجیان کردووە.

[٥] – ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٢٦٥١).

[٦] –ئەبو داوود(٤٥٦٧) و نەسائی(٤٨٤٠) ئیخراجیان کردووە.

[٧] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٤٥٤٦).

بڕیاری داوە لەبریندارکردنی زمان و لێو و جووتە گون و ئەندامی نێرینە و چەتە و ڕێگری و هەردوو چاو و خوێنبایی هەبێ، بۆ یەك چاو نیوەی خوێنبایی، بۆ یەك قاچ نیوەی یەك خوێنبایی، هەر دەستێکیش نیوەی خوێنباییەك، بڕیاریشی داوە لەبری ئافرەت، پیاو دەکوژرێتەوە[1].

بڕیاری داوە لەسەر کوشتنی بەهەڵە، سەد وشتر خوێنبایی بدرێت[2]، جیاوازیی هەیە لەسەر تەمەنی ئەو وشترانە.

لەبارەی کوشتنی بەئەنقەستەوە بڕیاری داوە، ئەگەر کەسوکاری کوژراو بەخوێنبایی رازیی بن، ئەوە خوێنباییەکە سەد وشترە، سی وشتری حیقە و سی جەزەعە و چل وشتری خەلفە، لەسەر چی شتێك رێککەوتن، ئەوەیان بۆ هەیە لەبکوژی وەربگرن[3].

خاوەنانی هەر چوار سووننەنەکە گێڕاویانەتەوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی:«دِيَةُ الْمُعَاهَدِ نِصْفُ دِيَةِ الْحُرِّ»،واتا: کەسی پەیمانپێدراو لەنێو خاکی ئیسلام، نیوەی خوێنبایی کەسی ئازادی هەیە. لەفزی ئیبن ماجەش هاتووە:"بڕیاری داوە کە خوێنبایی ئەهلی کیتاب نیوەی خوێنبایی موسڵمانی هەیە، ئەهلی کیتاب جولەکە و گاورەکانن"[4].

لەبابەت نووسراوکارەوە(المکاتب)، ئەگەر کوژرا، بەئەندازەی ئەو نووسراوەی خوێنبایی کەسی سەربەستی پێ بدرێت، چی مایەوە دەدرێتە کۆیلەکە[5]،ئەڵێم: واتا: نرخەکەی.

---

[1] – نەسائی ئیخراجی کردووە(٤٨٥٣).

[2] –ئەبو داوود(٤٥٤١) و ترمیزی (١٣٨٧) ئیخراجیان کردووە.

[3] –ترمیزی(١٣٨٧) و ئیبن ماجە(٢٦٢٦) ئیخراجیان کردووە.

[4] – ئەبو داوود(٤٥٨٣) و ترمیزی(١٤١٣) و ئیبن ماجە(٢٦٤٤) و نەسائی(٤٨٠٦) ئیخراجیان کردووە.

[5] –ئەبو داوود(٤٥٨١) و ترمیزی(١٢٥٩) و نەسائی(٤٨١٠) ئیخراجیان کردووە.

## ١٤- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەر کەسێ دانی بەئەنجامدانی داوێنپیسییدا نابێ

لەسەحیحی بوخاری و موسلیمدا سەلماوە کە پیاوێکی موسڵمان هاتووە بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و دانی ناوە بەئەنجامدانی داوێنپیسییدا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) رووی لێ وەرگێڕا تا ئەوەی چوار جار شایەتیی لەسەر خۆی دا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"شێت نیت؟". وتی: نە. فەرمووی:"بۆ جارێك بەشەرعیی هاوسەرگیرییت کردووە؟ وتی: بەڵێ. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد لە موسەلا رەجم بکرێت، کە بەرد باران کرا هەڵهات، گرتیان و رەجم کرا تاوەکو مرد، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) بەخێر بۆی پاڕایەوە و نوێژیشی لەسەر کرد[١].

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە: ئافرەتە غامیدییەکە هات و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، من داوێنپیسییم کردووە لەو تاوانە پاکم بکەرەوە، بەڵام پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وەڵامی نەدایەوە، بەیانیی هاتەوە وتی: ئەی پەیامبەری خوا مەمگێڕەوە، وەك ماعز دەمگێڕیتەوە؟ سوێند بەخوا من سکپڕم. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"بڕۆ تاوەکو منداڵەکەت دەبێ". کە منداڵەکەی بوو بەمنداڵە قوماتکراوەکەیەوە هاتەوە. وتی: وا منداڵەکە لەدایك بوو. پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"بڕۆ شیری پێ بدە تاوەکو لەشیری دەبڕیتەوە". کە لەشیری بڕیەوە و منداڵەکە پارچە نانێکی بەدەستەوە بوو گەڕایەوە وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وا لەشیرم بڕییەوە و نان و خواردن دەخوات، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) منداڵەکەی دایە دەست پیاوێکی موسڵمان و پاشان فەرمانی کرد چاڵێکی بۆ بکەندرێ تاوەکو سنگی،

---

[١] بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٨٢٠).

فرمانی کردە خەڵك بەردبارانی بکەن، خالیدی کوڕی وەلید بەردێکی هێنا دای بەسەریدا و خوێن بەدەمووچاویدا فیشقەی کرد، قسەیەکی ناخۆشی پێوت، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"مَهْلًا يَا خَالِدُ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ تَابَهَا صَاحِبُ مَكْسٍ لَغُفِرَ لَهُ"،واتا: لەسەر خۆت بە ئەی خالید، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەم ئافرەتە تەوبەیەکی کردووە ئەگەر کەس باجگر بیکات، خوا لێی خۆش دەبێ. پاشان فرمانی پێدا و نوێژی لەسەر کرد و نێژرا[1].

لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی کەسێك کە داوێنپیسیی کردووە و بۆ جارێکیش هاوسەرگیریی شەرعیی ئەنجام نەدابوو، بەدوورخستنەوەی بۆ ماوەی ساڵێك و ئەنجامدانی حەد لەسەری[2].

## ١٥- بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەسەر ئەهلی کیتاب بەحوکمی ئیسلام لەبابەت حدودەوە

لەسەحیحەیندا سەلماوە: جولەکە هاتوونەتە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆیان باسکردووە کە ژن و پیاوێکی جولەکە داوێنپیسییان ئەنجام داوە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ؟"،واتا: لەتەوراتدا لەبارەی رەجمەوە هیچتان بینیووە؟ وتیان: نە، بەڵکو شەرمەزاریان دەکەین و جەڵد دەکرێن. عەبدواللەی کوڕی سەلام وتی: درۆتان کرد، لەتەوراتدا رەجم هەیە. تەوراتیان هێنا و پەڕەکانیان هەڵدایەوە و یەکێکیان پەنجەی خستەسەر ئایەتی رەجم و شاردییەوە، پاش و پێشی خوێندەوە و ئەوی لەو نێوەندەدا نەخوێندەوە. عەبدواللەی کوڕی سەلام وتی: دەستت هەڵبڕە. دەستی هەڵبڕی، سەیری کرد ئایەتی رەجمی تێدایە، ئینجا وتیان: ئەی

---

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٦٩٥).

[2]- بوخاری ئیخراجی کردووە(٦٨٣٣).

موحەممەد ڕاست دەکات، ڕەجمی تێدایە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) فرمانی کرد ئەو ژن و پیاوە ڕەجم کران[1].

ئەگەر ئەهلی زیمیی کێشەی خۆیانیان هێنایە لای ئێمەی موسڵمان، ئەوە بەحوکمی ئیسلام بڕیاریان لەنێواندا دەدەین.

## ١٦- پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە، هەرکەسێ دان بەوەدا بنێت لەگەڵ فلاَنە ئافرەت داوێن پیسیی کردووە، ئەو پیاوە حەددی داوێنپیسیی لەسەر جێبەجێ دەکرێت

لەسووننەدا هاتووە: لەفەرموودەیەکی سەهلی کوڕی سەعدەوە ئەڵێ: پیاوێك هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و دانی نا بەوەی لەگەڵ فلاَنە ئافرەتدا داوێنپیسیی کردووە و ناوی ئافرەتەکەی برد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ناردی بەشوێن ئافرەتەکەدا و لەو بارەیەوە لێی پرسی، ئافرەتەکە ڕەتیکردەوە داوێنپیسیی کردبێ، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پیاوەکەی جەڵد کرد و وازی لەئافرەتەکە هێنا[2].

## ١٧-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی جاریەیەك(الأمة) ئەگەر داوێنپیسیی بکات

بڕیاری داوە لەبارەی جاریەیەکی شوو نەکردووەوە بەجەڵدکردن[3].

خوای گەورە لەبارەی جاریەی شووکردووەوە فەرموویەتی:﴿ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ﴾ **النساء: ٢٥** ،واتا: پاشان

---

[1] -بوخاری(٦٨٤١) و موسلیم(١٦٩٩) ئیخراجیان کردووە.

[2] -ئەبو داوود(٤٤٦٦) ئیخراجی کردووە.

[3] -بوخاری(٦٨٣٧) و موسلیم(١٧٠٣) ئیخراجیان کردووە.

خراپەیەکی ئاشکرایان کرد(زینا) ئەوە نیوەی سزای ئافرەتە ئازادەکانیان لەسەرە(لێیان بدرێت کە پەنجا جەڵدە).

دەقێکە لەبارەی ئەوەی، ئەگەر لەدوای شووکردن، داوێنپیسیی کرد، سزای حەددی نیوەی ئافرەتێکی سەربەستی هەیە، بەڵام ئەگەر لەپێش هاوسەرگیری بوو، ئەوە فرمانی داوە جەڵد بکرێت، لەجەڵدکردندا دوو بۆچوون هەیە:

یەکەم: مەبەست پێی حەددە.

دووەم: مەبەست پێی تەمبێکردنە(تەعزیر) نەک حەدد.

## ١٨-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەحەددی تۆمەتبارکردن بەداوێنپیسی

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڕیاری داوە بەحەددی تۆمەتبارکردن بەداوێنپیسی، کاتێ خوای گەورە لەئاسمانەوە بێتاوانیی خێزانەکەی دەرکرد، فرمانی کرد بەجەڵدکردنی دوو پیاو و ئافرەتێک.

## ١٩-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبارەی کەسێکەوە ئایینی خۆی بگۆڕێ

بڕیاری داوە ئەو کەسە بکوژرێت کە لەئایینی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە[١].

## ٢٠-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبارەی کەسێک عەرەق بخواتەوە

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی کردووە چل لقی دارخورما و نەعل لەمەشروب خۆر بدرێت، ئەبو بەکریش(خوای لێ ڕازیی بێ) کاری بەو چل لێدانە کردووە[٢].

---

[١]-بوخاری(٣٠١٧) ئیخراجی کردووە.

[٢]-بوخاری(٦٧٧٣) و موسلیم(١٧٠٦) ئیخراجیان کردووە.

## ٢١-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی دز

بۆ دزینی قەڵغانێك کە نرخەکەی سێ درهەم بوو،دەستی دزی بڕیووە[١].

بڕیاری داوە بۆ کەمتر لەڕوبعە دیناریێ، دەستی دز نابڕدرێتەوە[٢].

بڕیاری داوە سەبارەت بەبڕینی دەستی ئافرەتێك کە قاپ و کەلوپەلی بەئەمانەت بردووە و پاشان حاشای لێکردووە[٣].

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی داوە بەئەنجام نەدانی حەددی دەستبڕین بەسەر تاڵانکەر(المنتهِب) و فڕێنەر(المُختلِس) و ناپاك(الخائن) کە ناپاکیی لەئەمانەت دەکات[٤].

فرمانی داوە هەرکەسێ بەرهەمی میوە و خورمای دزی، بۆ پێویستیی بوو خواردی، هیچی لەسەر نییە، ئەگەر لێی برد، دەبێ نمونەی ئەوەی پێ ببژێردرێتەوە و سزاش بدرێت[٥]، هەرکەسێ لەخەرمان شتێکی دزی و دزراوەکە نرخی قەڵغانێکی هەبوو، دەستی دەبڕدرێتەوە[٦].

بڕیاری دا بەبڕینی دەستی دزێك کە عەباکەی سەفوانی کوڕی ئومەییەی دزی لەمزگەوتدا و بەسەر سەفوانەوە بوو، سەفوان ویستی بیکاتە دیاریی بۆ کابرا یان پێی بفرۆشێ، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"هَلَّا كَانَ قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ"[٧]،واتا: بۆ پێش ئەوەی بیهێنی بۆلام، ئەوەت نەکرد.

---

[١]-بوخاری(٦٧٩٥) و موسلیم(١٦٨٦) ئیخراجیان کردووە.

[٢]-بوخاری(٦٧٨٩) و موسلیم(١٦٨٤) ئیخراجیان کردووە.

[٣]-ئەبو داوود(٤٣٩٥) و نەسائی(٤٨٨٧) ئیخراجیان کردووە.

[٤]- ترمیزی ئیخراجی کردووە(١٤٤٨).

[٥]-ئەبو داوود(٤٣٩٠) و ئیبن ماجە(٢٥٩٦) و نەسائی(٤٩٥٨) ئیخراجیان کردووە.

[٦]-ئەبو داوود(١٧١٠، ٤٣٩٠) و نەسائی(٤٩٥٨) ئیخراجیان کردووە.

[٧]-ئەبو داوود(٤٣٩٤) و ئیبن ماجە(٢٥٩٥) ئیخراجیان کردووە.

## ٢٢-بڕیاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی کەسێك قسە و جنێوی پێ بوتبایە لەموسلمان و زیممی و پەیمانپێدراوێك

لەسەر جنێوپێوتن و ئازاردانی، کۆمەڵێکی جولەکەی کوشت، لەڕۆژی فەتحی مەککەدا سەلامەتیی بەخەڵکیی دا تەنیا چەند کەسێك نەبێ کە پێشتر داشۆرین و قسەی ناخۆشیان پێ دەوت، دوو پیاو و دوو ئافرەت بوون. فەرمووی:«مَنْ لكعب بن الأشرف، فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ»[1]،واتا: کێ کەعبی کوڕی مالیك دەکوژێت، ئازاری خوا و پەیامبەرەکەی داوە. کەعب و ئەبو رافیعی کوشت.

لەدە و شتێ فەرموودەی سەحیح و حەسەن و مەشهوردا ئەو بڕیارە هاتووە و کۆدەنگیی هاوەڵانە.

هەرچی ئەوەی تۆڵەی نەکردووەتەوە لەکەسێك تانەی لەدادپەروەریتی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) داوە کە وتی:دادپەوەربە، تۆ دادپەروەرییت نەکرد. مەبەستی بوو بەم دابەش کردنەت خوات مەبەست نەبوو. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وازی لێهێنا و لەمافی خۆی خۆشبوو دەرهەق بەو قسەیە، بەڵام بۆ ئوممەتەکەی نییە دەستبەردای مافی موحەممەدی پەیامبەر بن(صلی الله علیه وسلم).

موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) لەسەرەتای کاردا لەمافی خۆی خۆشدەبوو لەبەر بەرژەوەندیی یەکدەنگی نەوەك خەڵکیی بلاوەی لێ بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی نەوترێ هاوەڵانی خۆی دەکوژێت، جا بۆیە هەموو ئەوانە تایبەت بوو بەژیانی پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم).

---

[1] ئەبو داوود(٤٣٨٦)ئیخراجی کردووە.

## ٢٣-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی سیخوڕەوە

سەلماوە لەبارەی حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەوە کاتێك سیخوڕیی لەسەرکرد،عومەر(خوای لێ رازیی بێ) داوای کرد بهێڵێ لەگەردنی بدات، بەلاَم پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) ریگەی نەدا و فەرمووی:"وَمَا يُدرِيكَ! لعلَّ اللَّهَ اطَّلع عَلَى أَهْلِ بدرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ"[1]،واتا:تۆ چوزانی ئەی عومەر! خوای گەورە لەئەهلی بەدر خۆش بووە و فەرموویەتی: چۆنتان بووێ ئەوە بکەن، من وا لە ئێوە خۆش بووم.

## ٢٤-بڕیاری پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی دیل

سەلماوە لەموحەممەدی پەیامبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) کە هەندێ دیلی کوشتووە، منەتی ئازادییشی خستووەتەسەر هەندێکی تر، هەندێکیانی بەرانبەر پارە و سامان ئازاد کردووە، هەندێکیانی بەدیلی موسڵمان ئاڵوگۆڕ کردووە، هەندێکی تری کردووەتە کۆیلە، بەلاَم دیارە پیاوی پێگەیشتووی نەکردووەتە کۆیلە.

## ٢٥-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی جولەکە

بەچەند بابەتێك بڕیاری لەسەر جولەکە داوە:

سەرەتای هاتنی بۆ مەدینە، پەیماننامەی لەگەڵیاندا بەست، پاشان بەنو قینوقاع دژی وەستانەوە، بەسەریاندا زاڵبوو، منەتی خستە سەریان، پاشان بەنو نەزیر شەڕیان کرد و بەسەر ئەوانیشدا سەرکەوت و دەریکردن، پاشان بەنو قورەیزە شەڕی کردن، بەسەر ئەوانیشدا سەرکەوت و کوشتنی، پاشان خەڵکی خەیبەر

---

[1]- بوخاری(٣٠٠٧) و موسلیم(٢٤٩٤) ئیخراجیان کردووە.

شەڕیان کرد، بەسەر ئەوانیشدا سەرکەوت، هەندێکی لێیان کوشت، ئەوانەی تریشی مایەوە کە خۆی ویستی لەوێدا هێشتی بمێننەوە.

کە سەعدی کوڕی موعاز لەبارەی بەنی قورەیزەوە بڕیاری دا جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و نەوەکانیان بکرێنە سەبایە و سەروەتەکانیان بەدەسکەوت ببردرێت، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەواڵی پێدا: ئەمە بڕیاری خوایە لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە[1].

ئەم بڕیارە ئەوە لەخۆدەگرێت: ئەوانەی لەپەیمانی خۆیان هەڵدەگەڕێنەوە، ئەو هەڵگەڕانەوە و هەڵوەشانەوەیە ژن و منداڵیشیان دەگرێتەوە.

## ٢٦-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەدابەشکردنی دەسکەوتەکاندا

بڕیاری داوە بۆ هەر سوارێك سێ پشك و بۆ پیادە پشکێك[2].

سەبارەت بەبڕیاری لەدەرکردنی خومسدا(پێنج یەك)، ئەوە ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: لەڕۆژی خەیبەردا سی و شەش سوار هەبوو، سەرەتا لەو دەسکەوتانەدا دوو پشك هەبوون و پێنج یەکی لێ دەرکرا و ئیتر بووە سوونەت[3].

لەبەشی وشتر و مەڕدا بۆ هەر دە دانەیەك وشترێکی دانا، ئەوە لەبابەت خەملاندن و دابەشکردنی ماڵ و سەروەتێکی هاوبەشدا.

بەڵام لەبارەی قوربانییەوە، جابر ئەڵێ:"لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) لەساڵی حودەیبییەدا حەوت وشتر و حەوت مانگامان کردە قوربانی"[4].

---

[1] - بوخاری(٣٨٠٤) و موسلیم(١٧٦٨) ئیخراجیان کردووە.

[2] - بوخاری(٤٢٢٨) و موسلیم(١٧٦٢) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بڕوانە سيرة ابن هشام٢/٢٤٤.

[4] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٣١٨).

ئەوە لەحودەیبییە، سەبارەت بەحەجیماڵئاواییش، هەر جابر ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فرمانی پێکردین لەوشتر و مانگانەدا هاوبەشیی بکەین، هەر حەوت کەسێك لەسەرێکدا هاوبەش بین"[1]، هەردووکی سەحیحە.

## ٢٧-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەسکەوتەکان هەمووی بۆ جەنگاوەر بێ

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە هەموو دەسکەوتەکان بۆ جەنگاوەر بێ[2] و پێنج یەکی لێ دەرنەکردووە، بەپێنج یەکیشی دانەناوە، بەڵکو بەبناغەی دەسکەوت دایناوە، ئەوە حوکم و بڕیاری بووە.

## ٢٨-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەو سەرووەت و سامانەی موسڵمانان کەوتووەتە لای هاوبەش پەیداکەران و دواتر موسڵمانان دەستیان بەسەرداگرتووە یان هاوبەش پەیداکەران لەسەری موسڵمان بوونە

لەبوخاریدا هاتووە: ئەسپێکی ئیبن عومەر(خوای لێ ڕازیی بێ) ڕۆیشت و کەوتە دەست دوژمن، پاشان لەسەردەمی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) کەوتە دەست موسڵمانان، کۆیلەیەك سواری بوو خۆی گەیاندە ڕۆم، دواتر کەوتە دەست موسڵمانان و لەسەردەمی ئەبو بەکردا(خوای لێ ڕازیی بێ)، خالید بۆی گەڕاندەوە[3].

بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) هاتووە:کۆچەران لەڕۆژی فەتحی مەککەدا داوای خانووەکانی خۆیان لێ کرد، خانووی هیچ کەسێکی

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٢١٣).

[2] - بوخاری(٣١٣٢) و موسلیم(١٧٥١) ئیخراجیان کردووە.

[3] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٣٠٦٧).

نەگەڕاندەوە. پێیووترا: بەیانی لەمەککە لەخانووەکەی خۆت دادەبەزی؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموی: «وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عقيل مَنْزِلًا»،واتا: عەقیل هیچ خانوویەکی بۆ بەجێهێشتووین[1]. سووننەت ئەوەی جێگیرکردووە ئەگەر بێباوەڕان و شەڕکەران بوونە موسڵمان، گرنتی ئەو شتانە ناکەن کە لەموسڵمانانیان لەنێوبردووە لەگیان و سەروەت و سامان، ئەو سەروەتانە ناگێڕنەوە کە داگیریان کردووە، بەڵکو هەریەکێ لەوان بووە موسڵمان، ئەوە بۆ خۆی دەبات، ئەوە بڕیاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بوو.

**٢٩-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەو شتەی بەدیاریی بۆی هاتبوو**

هاوەڵانی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)،خواردن و شتی تریان بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) دەهێنا، لییانی قبوڵ دەکرد و بەچەند قات پاداشتی دەدانەوە.

کە پادشایان دیارییان بۆ دەنارد، دیارییانی قبوڵ دەکرد و لەنێو هاوەڵانیدا دابەشی دەکرد و چی بیویستبایە بۆ خۆی هەڵدەگرت پێش ئەوەی دەسکەوتەکان دابەش بکرێن.

لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە: ئاورێشمێکی قۆپچە ئاڵتوونیی بەدیاریی بۆ هێنرا، لەنێو هەندێ لەهاوەڵاندا بەشی کرد، بەشێکی دانا بۆ مەخرەمەی کوڕی نەوفەل، لەگەڵ میسوەری کوڕیدا هات و لەدەرگا وەستا، وتی: بۆم بانگی بکە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گوێی لەدەنگی بوو، پێشوازیی لێکرد و فەرمووی:"يَا أبا المسور خَبَأْتُ هَذَا لَكَ"،واتا:ئەی باوکی میسوەر، ئەمەم بۆ تۆ خستبووە پەناوە[2].

---

[1]- بوخاری(١٥٨٨) و موسلیم(١٣٥١) ئیخراجیان کردووە.

[2]- بوخاری(٣٢٢٧) و موسلیم(١٠٥٨) ئیخراجیان کردووە.

فەروەی کوڕی نوفاسەی ئەلجوزامیی ئێسترێکی سپیی بۆ کردە دیاری،ڕۆژی حونەین پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) سواری بوو، موسلیم باسیکردووە[1].

بوخاری باسیکردووە: پادشای ئەیلە ئێسترێکی سپیی کردە دیاریی بۆ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، پەیامبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) بەعەبایەك (بوردەیەك)داپۆشی[2].

**٣٠-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەدابەشکردنی سەروەتەکاندا**

ئەو سەروەت و سامانانەی کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دابەشیکردوون: زەکات، غەنیمەت، فەیئ[3].

هەرچی زەکات و غەنیمەتە، ئەوە پێشتر باسمان کرد.

سەبارەت بەبڕیاری لەبارەی فەیئەوە، ئەوە لەسەحیحدا سەلماوە کە لەڕۆژی حونەیندا لەبەشی فەیئ، بەشی دڵڕگیراوانی داوە و هیچ شتێکی بەپشتیوانان نەداوە، کە پشتیوانان بۆ ئەوە گلەییان کرد، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«أَلَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاءِ وَالْبَعِيرِ، وَتَنْطَلِقُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَقُودُونَهُ إِلَى رِحَالِكُمْ، فَوَاللَّهِ لَمَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ»[4]،واتا: ئایە ڕازیی نابن خەڵکیی بەمەڕ و وشترەوە بڕۆن و ئێوەش پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خۆتان ببەنە لای کۆڵوبارەکانتان؟ سوێند بەخوا ئەوەی بەر ئێوە کەوتووە و پێی دەگەڕێنەوە، باشترە لەوەی ئەوان پێی دەگەڕێنەوە ماڵ و شوێنی خۆیان.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٧٧٥).

[2] – بوخاری(١٤٨١) و موسلیم(١٣٩٢) ئیخراجیان کردووە.

[3] ڤێء: دەسکەوتێکە بەبێ جەنگ لەبێباوەڕانەوە دەکەوێتە دەست موسڵمانان.

[4] – بوخاری(٣١٤٧) و موسلیم(١٠٥٩) ئیخراجیان کردووە.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە، خوای گەورە ئەو ڕێگەیەی داوە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) لەسەروەتی فەیئدا مامەڵە بکات کە ڕێگەی نەداوە کەسی تر بەو جۆرە بکات، لەسەحیحدا سەلماوە:"إِنِّي لَأُعْطِي أَقْوَامًا، وَأَدَعُ غَيْرَهُمْ، وَالَّذِي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الَّذِي أُعْطِي"[1]،واتا: من بەشی کۆمەڵێك دەدەم و بەشی کۆمەڵێکی تر نادەم، ئەوەی بەشی نادەم، بەلامەوە خۆشەویستترە لەوەی بەشی دەدەم.

ئەوەی کە ڕێنمایی و بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەڵگەی لەسەر دەدات، ئەوەی خەرجکردنی پێنجەیەکی وەك خەرجکردنی زەکات لێکردووە.

لەسەحیحەیندا هاتووە: لەعومەری کوڕی خەتابەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: سەروەتی فەیئ(بێ شەڕ دەسکەوتن)ی بەنو نەزیر کە خوای گەورە خستیەدەست پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بێ ئەوەی موسڵمانان سوار و پیادەی تێدا بەکاربهێنن، بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بوو، خەرجیی یەك ساڵ خێزانەکانی تێدا دەرکرد، لەلەفزێکدا هاتووە:"يَحْبِسُ لِأَهْلِهِ قُوتَ سَنَتِهِمْ، وَيَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي الْكُرَاعِ وَالسِّلَاحِ عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ"[2]،واتا: خۆراکی ساڵێکیانی بۆ گلدایەوە، ئەو دوای لەدابینکردنی چەك و ئەسپی جیهاد لەپێناو خوا خەرجکرد.

لەسووننەندا هاتووە: لەعەوفی کوڕی مالیکەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە دەسکەوتی فەیئی پێ دەگەیشت، لەو ڕۆژەدا دابەشی دەکرد، بەژندار و خاوەن کەسوکار دوو پشکی دەدا و بەکەسی سەڵتیش یەك پشك[3].

شەرعناسان لەبارەی فەیئەوە جیاوازن: ئایە موڵکی پەیامبەر بووە(صلی الله علیه وسلم) و چۆنی ویستووە مامەڵەی پێ کردووە، یان موڵکی نەبووە؟

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٧٠٣٥).

[2] – بوخاری(٤٨٨٥) و موسلیم(١٧٥٧) ئیخراجیان کردووە.

[3] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٩٥٣).

ئەوەی سووننەت و ڕێبازی بەڵگەی لەسەر دەدات، ئەوەیە بەفرمانی خوا مامەڵەی لەبارەوە کردووە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەوەی ڕاگەیاندووە کە فەرموویەتی:«وَاللَّهِ إِنِّي لَا أُعْطِي أَحَدًا وَلَا أَمْنَعُهُ، إِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ أَضَعُ حَيْثُ أُمِرْتُ»، واتا: سوێند بەخوا من لەخۆمەوە بەشی یەکێ نادەم و یەکێکی تر بێ بەش بکەم، من تەنیا دابەشکەرێکم و چی فرمانێکم پێ کرابێ، ئاوەها ئەکەم[1].

هەرچی زەکات و غەنیمەت و دابەشکردنی میراتە، ئەوە تایبەتە بەو کەسانەی دیاریی کراون و کەسی تر تیایدا بەشدار نابێ، ئەوەی بۆ سەرپەرشتیاری کاروباری موسڵمانان ناڕوون بووە لەمامەڵەکردن لەبارەی فەیئەوە، لەزەکات و غەنیمەت و میراتدا ناڕوونیی نەبووە. ئەگەر ناڕوونیی نەبووایە لەوبارەیەوە، ئەوە فاتیمەی کچی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داوای میراتی پەیامبەری خوای نەدەکرد لەوەی لەدوای خۆی بەجێیهێشتبوو، وەهای زانی لەوەدا وەك خاوەندارەکانی تر، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) خاوەنداریی ئەو باخ و شوێنەی کردووە و نەیزانی لەدوای پەیامبەری خوا، ئەو شوێنە دەبێتە سەدەقە.

---

[1] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٣١١٧).

**٣١- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەوەفاداربوون بەو بەڵێنەی بەدوژمنی دابوو، نەدەبوو نێردراویان بکوژرێت یان بەند بکرێت، ئەگەر ترسی هەبووایە لایەنی بەرانبەر لەپەیمانی خۆی پاشگەزبێتەوە، پەیمانی بۆ دەگەڕاندەوە**

لێیەوە سەلماوە کە بەدوو نێردراوەکەی موسەیلەمەی درۆزنی فەرموو کاتێک وتیان: موسەیلەمە پەیامبەری خوایە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«لَوْلَا أَنَّ الرُّسُلَ لَا تُقْتَلُ لَقَتَلْتُكُمَا»[1]،واتا: ئەگەر ئەوە نەدەبوو کە نێردراو ناکوژرێت، ئەوە هەردووکتانم دەکوشت.

لێیەوە سەلماوە ئەوەی کە بەئەبو رافیعی فەرمووە. کاتێک قورەیش ئەبو رافیعی نارد بۆ لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، ئەبو رافیع ویستی لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بمێنێتەوە و نەگەڕێتەوە لای قورەیش، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: «إِنِّي لَا أَخِيسُ بِالْعَهْدِ، وَلَا أَحْبِسُ الْبُرُدَ، وَلَكِنِ ارْجِعْ إِلَى قَوْمِكَ، فَإِنْ كَانَ فِي نَفْسِكَ الَّذِي فِيهَا الْآنَ فَارْجِعْ»[2]،واتا: من بێ پەیمانیی ناکەم، نێردراویش گل نادەمەوە، بەڵکو بگەڕێرەوە لای قەومەکەت، ئەگەر ئەو ئیمانەت بینی کە ئێستا لەدەروونتدا هەیە، ئەوە بگەڕێرەوە لای ئێمە.

قورەیش کە حوزەیفەی کوڕی یەمان و باوکیان دەستگیر کرد و ئازادیانیان کرد و بەڵێنیان لێیان وەرگرت، نابێ لەگەڵ پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) شەڕی ئەوان بکەن و لەدەرچووندا بوون بۆ بەدر، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"انْصَرِفَا، نَفِي لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ، وَنَسْتَعِينُ اللَّهَ عَلَيْهِمْ"،واتا: هەردووکتان بگەڕێنەوە و لەگەڵ ئێمەدا دەرمەچن، ئەو بەڵێنەی بەئەوانتان داوە پێیەوە وەفادارین، بۆ دژی ئەوان، ئێمە پشت بەخوا دەبەستین[3].

---

[1] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٧٦١).

[2] – ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٧٥٨).

[3] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٧٨٧).

## ٣٢-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی ئەو سەلامەتییەی پیاوان و ژنان بەکەسی تری دەدەن

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە فەرموویەتی:«الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ»[١]،واتا: موسڵمانان لەخوێن و گیاندا وەك یەكن، لەئەستۆگرتنی یەكێكیان دەكەوێتە ئەستۆی ئەوانی تریان. لێیەوە سەلماوە كە پەنا و سەلامەتیی دوو پیاوی داوە، بەهۆی ئەوەی ئوم هانیئی كچە مامی پەنای دابوون[٢].

## ٣٣-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی جیزیە و بڕی جیزیە و لەچی كەسێكیش وەردەگیرێت

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) جیزیەی وەرگرتووە لەخەڵكی نەجران و ئەیلە كە گاوری عەرەب بوون،هەروەها لەخەڵكی دومەتوئەلجەندەل كە زۆرینە عەرەب بوون، لەمەجوس و ئەهلی كیتابی یەمەنیشی وەرگرتووە كە جولەكە بوون، لەهاوبەش پەیداكەرانی عەرەب جیزیەی وەرنەگرتووە.

ئەحمەد[٣] و شافیعی[٤] ئەڵێن: تەنیا لەو سێ چین و توێژە جیزیە وەردەگیردرێت كە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) جیزیەی لێ وەرگرتوون، ئەوانیش بریتین لە: جولەكە و گاور و مەجوس.

كۆمەڵێكی تر وتوویانە: لەهەموو ئوممەتان جیزیە وەردەگیردرێت ئەگەر جیزیە بدەن، بەڵكو پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبتپەرستانی عەرەب جیزیە وەرنەگرتووە، چونكە پێش دابەزینی ئایەتی جیزیە، ئەوان بوونە موسڵمان.

---

١- ئەبو داوود(٢٧٥١) و ئیبن ماجە(٢٦٨٥) ئیخراجیان كردووە.

٢- بوخاری(٣١٧١) و موسلیم(٣٣٦) ئیخراجیان كردووە.

٣- اختلاف الأئمة لابن هبیرة٢/٣٢٦.

٤- الأم للشافعي٤/١٨٣.

سەبارەت بەبڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەئەندازەی جیزیەدا، ئەوە موعازی نارد بۆ یەمەن و فرمانی پێکرد کەسێکی باڵغی پێگەیشتوو دینارێ وەربگرێ یان بەرگی موعافیری ناسراو لەیەمەن، پاشان عومەری(خوای لێ رازیی بێ) زیاتری کرد، کردیە چوار دینار بۆ خاوەن ئاڵتوون و درهەمێك بۆ هەر پارەدارێ بۆ هەر ساڵێك. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەلاوازیی باری خەڵکی یەمەنی زانی، عومەریش(خوای لێ رازیی بێ) بەدەوڵەمەندیی و پارەداریی خەڵکی شام شارەزا بوو.

## ٣٤-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی ئاگربەست و شکاندنی

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خەڵکی مەککە رێککەوت بۆ دە ساڵ شەڕیان لەنێواندا روونەدات، هاوپەیمانانی قورەیش لەنەوەی بەکر لەگەڵ قورەیشدا چوونە نێو ئەو پەیمانەوە، خوزاعەی هاوپەیمانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)یش چووە نێو ئەو پەیمانەوە، بەلام هاوپەیمانانی قورەیش هەڵیانکوتایە سەر هاوپەیمانەکەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) و غەدریان لێ کرد، قورەیش بەو کارە رازیی بوو رەتی نەکردەوە، بەوە بوونە بێ پەیمان و ئەوەش هۆکار بوو تاوەکو پەلامار بدرێن بێ ئەوەی پێویست بکات پەیمانەکەیان بۆ بگێڕدرێتەوە.

لێیەوە سەلماوە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کاتێك هاتە مەدینە، رێککەوتنی لەگەڵ جولەکەدا ئەنجام دا، بەلام ناپاکییان بەرانبەر کرد و چەند جارێك لەپەیمانی خۆیان پاشگەزبوونەوە، لەهەموو ئەو جارانەدا شەڕی دەکردن و بەسەریاندا سەردەکەوت.

ئەم بڕیارەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ئەوانەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جائیزە پێشەوای موسڵمانان بۆ ماوەیەك کە خۆی بیەوێ لەگەڵ دوژمندا ئاشتەوایی بکات، جائیزە هەرچکاتێ ویستی، ئەو رێککەوتنە هەڵوەشێنێتەوە.

## دووەم: بەشی هاوسەرگیری

### بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی هاوسەرگیری و باسەکانی تایبەت بەوە

### ١- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی بێوەژن و کچ کە باوکیان بەمێردیان بدات

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) لەسەحیحەیندا سەلماوە: خەنسائی کچی خیدام باوکی بەمێردی دا و خەنسائیش بەو بەمێرددانە رازیی نەبوو، بێوەژن بوو، هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) بەشوودانەکەی رەتکردەوە[١].

لەسووننەندا هاتووە: لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ): جاریەیەکی کچ هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و بۆی باسکرد کە باوکی بەمێردی داوە و ئەمیش بەو کارە رازیی نییە، بۆیە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئەو جاریەیەی سەرپشك کرد[٢].

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە فەرموویەتی:"لَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ"،واتا: کچ بەمێرد نادرێ تاوەکو پرسی پێ نەکرێت و رازیی نەبێت. وتیان: ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پرس پێ کردن و رازیی بوونی چۆنە؟ فەرمووی:"أَنْ تَسْكُتَ"[٣]،واتا: کە بێدەنگ بوو، رازییە.

---

[١] – بوخاری ئیخراجی کردووە(٥١٣٨).

[٢] – ئەبو داوود(٢٠٩٦) و ئیبن ماجە(١٨٧٥) ئیخراجیان کردووە.

[٣] – بوخاری(٥١٣٦) و موسلیم(١٤١٩) ئیخراجیان کردووە.

## ٢- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی مۆڵەتدانی کچ لەبەشوودانیدا

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە بەوەی، لەبەشوودانیدا، پرس بەکچ دەکرێت.

لەهەر چوار سووننەکەدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«الْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ فِي نَفْسِهَا، فَإِنْ صَمَتَتْ فَهُوَ إِذْنُهَا، وَإِنْ أَبَتْ فَلَا جَوَازَ عَلَيْهَا»[١]،واتا: کچ لەبەشوودانیدا پرسی پێ دەکرێت، بێدەنگ بوو واتا رازییە، ئەگەر رەتیکردەوە، جائیز نییە بەزۆر بەشوو بدرێت.

## ٣- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی بەشوودان بەبێ ئامادەیی خاوەن ئافرەت(وەلی)

لەسووننەندا هاتووە لەفەرموودەیەکی عائیشە(خوای لێ رازیی بێ):«أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ نَفْسَهَا بِغَيْرِ إِذْنِ وَلِيِّهَا فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَإِنْ أَصَابَهَا فَلَهَا مَهْرُهَا بِمَا أَصَابَ مِنْهَا، فَإِنِ اشْتَجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَهُ»، واتا: هەر ئافرەتێك بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی(سەرپەرشتیارەکەی)، خۆی بەمێرد بدات، هاوسەرگیرییەکەی بەتاڵە، هاوسەرگیرییەکەی بەتاڵە، هاوسەرگیرییەکەی بەتاڵە، ئەگەر پیاوەکە لەگەڵیدا جووت بوو، ئەوە مارەیی بۆ هەیە، ئەگەر خاوەنیشی نەبوو، ئەوە سوڵتان خاوەنی کەسێکە خاوەن و کەسوکاری نەبێ. ترمیزی ئەڵێ: ئەم فەرموودە حەسەنە[٢].

لەهەر چوار سووننەکەدا هاتووە:«لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ»[٣]،واتا: هیچ هاوسەرگیرییەك بەبێ خاوەن و کەسوکار دانامەزرێت.

---

[١]- ئەبو داوود(٢٠٩٣) و ترمیزی(١١٠٩) و نەسائی(٣٢٧٠) ئیخراجیان کردووە.

[٢]- ئەبو داوود(٢٠٨٥) و ترمیزی(١١٠١) و ئیبن ماجە(١٨٨٠) ئیخراجیان کردووە.

[٣]- ئەبو داوود(٢٠٨٥) و ترمیزی(١١٠١) و ئیبن ماجە(١٨٨٠) ئیخراجیان کردووە.

## ٤- بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەهاوسەرگیریی دەسەڵات پێداندا( التفويض )

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) کە بڕیاری داوە لەبارەی پیاوێکەوە کە ژنێکی مارە کردبێ و مارەیی دیاریی نەکردبێ و نەچووبێتە لایەوە و بمرێ: مارەیی ژنانی تری بۆ هەیە بەبێ کەمکردنەوەیەك، میراتیشی بۆ هەیە، عیددەکەشی مانگێك و دە رۆژە[1].

## ٥- بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله لەبارەی مەرجەکانی هاوسەرگیری

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوَفُّوا مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ»[2]،واتا: مافدارترین مەرجێك، ئەوەیە پابەندبن بەبەجێهێنانی ئەو مەرجەی داوتانە بۆ حەڵاڵکردنی داوێنی خێزانەکانتان.

هەروەها فەرموویەتی:«لَا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا وَلِتَنْكِحَ فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا»[3]،واتا: نابێ هیچ ئافرەتێ داوای تەڵاقی خوشکەکەی(ئافرەتەکەی)تر بکات تاوەکو مێردەکەی بەتەنیا بۆ خۆی بمێنێتەوە، بەڵکو مێرد بکات و ئەو قەدەرەی بۆ هەیە کە بۆی دیاریی کراوە و نابێ زیان لەهەوێیەکەی بدات.

ئەم بڕیارە ئەوە لەخۆ دەگرێت، واجیبە پابەندبوون و وەفاداریی بکرێت بەو مەرجەی لەڕێکەوتنەکەدا هەبووە ئەگەر مەرجێك نەبێ بڕیاری خواو پەیامبەرەکەی کەنارخستبێت.

---

[1] – ئەبو داوود(٢١١٤) و ترمیزی(١١٤٥) و نەسائی(٣٣٥٤) ئیخراجیان کردووە.

[2] – بوخاری(٢٧٢١) و موسلیم(١٤١٨) ئیخراجیان کردووە.

[3] – بوخاری(٥١٥٢) و موسلیم(١٤٠٨) ئیخراجیان کردووە.



## ٦- بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی ژن بەژن

هەرچی ژن بەژنە(شغار)، ئەوە لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئیبن عومەرەوە بەمەرفوعی: «لَا شِغَارَ فِي الْإِسْلَامِ»،واتا: لەئیسلامدا ژن بەژنیی نییە. تیایدا هاتووە(الشغار): ئەوەیە پیاوێك، کچەکەی خۆی بداتە پیاوێکی تر بەمەرجی ئەوەی پیاوەکەی تر کچەکەی خۆی پێ بدات بەبێ ئەوەی مارەییان لەنێواندا هەبێ[١].

هەرچی هاوسەرگیریی مارە بەجاشە(الْمُحَلِّل)، لەموسنەد و ترمیزیی هاتووە لەفەرموودەیەکی ئیبن مەسعودەوە(خوای لێ رازیی بێ) وتوویەتی: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ»[٢]،واتا: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی کردووە لەو کەسەی ئافرەتێکی سێ تەڵاقەی کەوتوو حەڵاڵ دەکات بەمارەکردنی لەخۆی تاوەکو بۆ پیاوی تەڵاقدەر حەڵاڵی بکاتەوە.

هەرچی هاوسەگیریی کاتییە(موتعە-سیغە)، ئەوە لەسەحیحەیندا هاتووە لەعەلییەوە(خوای لێ رازیی بێ) بەوەی پەیامبەری خوا هاوسەرگیریی کاتی(مُتْعَةَ النِّسَاءِ)حەرام کردووە[٣]. ئەم حەرامکردنە لەدوای حەڵاڵ بوون رووی داوە.

بەڵام تێبینی هەیە: ئایە حەرامکردنێکی یەکجارەکییە یان حەرامکردنێکە نمونەی حەرامکردنی مردارەوە بوو کە لەکاتی پێویستدا ئاساییە؟ ئەمە ئەوەیە کە ئیبن عەباس تێبینی کردووە و بۆ پێویست،فەتوای حەڵاڵبوونی داوە، بەڵام کاتێك خەڵك لەوەدا زیاتر رۆیشتن و کاتی پێویستیان رەچاو نەکرد، لەو فەتوایەی پاشگەز و پەشیمان بوویەوە.

هەرچی هاوسەرگیریی کەسێکە لەئیحرامدا بێ، ئەوە سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) لەگێڕانەوەیەکی عوسمانی کوڕی عەفاندا(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:

---

[١]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤١٥).

[٢]- ئەحمەد ٧/ ٣١٤-٣١٥(٤٢٨٤) و ترمیزی(١١٢٠) ئیخراجیان کردووە.

[٣]- بوخاری(٤٢١٦) و موسلیم(١٤٠٧) ئیخراجیان کردووە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلَا يُنْكَحُ»[1]،واتا: کەسێ لەئیحرامدا بێ نە دەتوانێ ژن مارە بکات نە ژنیش بەشوو بدات.

سەبارەت بەمارەکردنی ئافرەتی داوێنپیس، ئەوە مەرسەدی کوڕی ئەبی مەرسەد ئەلغنەوی داوای مۆڵەتی کرد لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) تاوەکو عەناق مارە بکات کە ئافرەتێکی داوێنپیس بوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئایەتی سورەتی(النور)ی بەسەردا خوێند و فەرمووی:"لَا تَنْكِحْهَا"[2]،واتا: مارەی مەکە".

## ٧- بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی کەسێکەوە ببێتە موسڵمان و زیاتر لەچوار ژنی هەبێ یان دوو خوشکی پێکەوە کۆکردبێتەوە

ترمیزی لەئیبن عومەرەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) هێناویێتییەوە: غەیلان بووە موسڵمان و دە ژنی هەبوو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) پێیفەرموو:"اخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا"[3]،واتا: چوار ژنیان لێ هەڵبژێرە و ئەودوایان تەلاق بدە.

فەیروزی دەیلەمیی بووە موسڵمان و دوو خوشك هاوسەری بوون، پێیفەرموو:"اخْتَرْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ"[4]،واتا:کامەیانت ویست هەڵیبژێرە و دەستبەرداری ئەوی تر بە.

---

[1] – موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٠٩).

[2] – ئەبو داوود(٢٠٥١) و ترمیزی(٣١٧٧) ئیخراجیان کردووە.

[3] – ترمیزی(١١٢٨) و ئیبن ماجە(١٩٥٣) ئیخراجیان کردووە.

[4] – ئەبو داوود(٢٢٤٣) و ترمیزی(١١٢٩، ١١٣٠) ئیخراجیان کردووە.

## ٨- بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) سەبارەت بەکەسێك، ژنەکەی کردوویەتی بەمەرج بەسەریەوە ژنی دیکەی بەسەردا نەهێنێ

ئەوەی هاشمی کوڕی موغیرە داوای مۆڵەتیان کرد لەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) تاوەکو کچی ئەبو جەهل لەعەلی کوڕی ئەبو تاڵیب(خوای لێ ڕازیی بێ) مارە بکەن، بەڵام مۆڵەتی نەدان و فەرمووی:«وَاسْتَأْذَنَهُ بَنُو هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ أَنْ يُزَوِّجُوا عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ابْنَةَ أبي جهل، فَلَمْ يَأْذَنْ فِي ذَلِكَ، وَقَالَ: إِلَّا أَنْ يُرِيدَ ابن أبي طالب أَنْ يُطَلِّقَ ابْنَتِي وَيَنْكِحَ ابْنَتَهُمْ، فَإِنَّمَا فاطمة بَضْعَةٌ مِنِّي، يَرِيبُنِي مَا رَابَهَا وَيُؤْذِينِي مَا آذَاهَا، إِنِّي أَخَافُ أَنْ تُفْتَنَ فاطمة فِي دِينِهَا، وَإِنِّي لَسْتُ أُحَرِّمُ حَلَالًا وَلَا أُحِلُّ حَرَامًا، وَلَكِنْ وَاللَّهِ لَا تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ فِي مَكَانٍ وَاحِدٍ أَبَدًا»[1]،واتا: ئەوکاتە ڕێگە بەوە دەدەم کە کوڕی ئەبو تاڵیب کچەکەم تەڵاق بدات، فاتیمە پارچەپەکە لە من، خۆشحاڵم دەکات ئەو کەسەی خۆشحاڵی بکات و ئازارم دەدات ئەو کەسەی ئازاری ئەو بدات، ئەترسم فاتیمە لەئاینی خۆیدا بەفیتنەدا ببرێت، من حەلاڵ حەرام ناکەم و حەرامیش حەلاڵ ناکەم، بەڵام سوێند بەخوا، کچی موحەممەدی پەیامبەری خوا و کچی دوژمنی خوا هەرگیز لەیەك شوێندا کۆنابنەوە.

ئەم بڕیارە ئەوە لەخۆدەگرێت، ئەگەر پیاوێ بەڵێنی بەژنەکەی دا ژنی تری بەسەردا نەهێنێ، دەبێ پابەند بێ بەو بەڵێنەیەوە، جا ئەگەر بەڵێنی دا و ژنیشی بەسەردا هێنا، ژنەکەی دەتوانێ ئەو هاوسەرگیرییەی تری هەڵبوەشێنێتەوە.

---

[1] - بوخاری(٣٧٢٩) و موسلیم(٢٤٤٩) ئیخراجیان کردووە.

## ٩- بڕیاری خوای گەورە لەسەر زمانی پەیامبەرەکەی لەبارەی مارەکردنی هەندێ ئافرەت

خوای گەورە مارەکردنی ئەم ئافرەتانەی حەرامکردووە لەپیاو:دایکان، کچان، خوشکان لەهەموو جۆرێك(خوشکی باوکی و دایکی و شیری) و پوور(خوشکی باوك و خوشکی دایك) و برازا و خوشکەزا.

دایکی شیریی حەرام کردووە، ئەگەر ژنێك بەهۆی شیرەوە ببێتە دایکی، ئەوە مێردی ئەو ژنە دەبێتە باوکی، ئەوکات خوشك و برای ئەو ژن و پیاوە بۆی دەبنە خاڵۆ و مام و پوور، کچ و کوڕەکانی ئەو ژن و پیاوەش بۆ کەسەکە دەبنە خوشك و برا، ئا لێرەوە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڕیاری داوە:«يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ»[١]،واتا: چی ژن و ژنخوازییەك بەهۆی رەچەڵەکەوە حەرام بێ، بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبێ.

مارەکردنی دایکی ژن(خەسوو)ی حەرام کردووە، هەروەها کچی ژن بۆ زڕ باوك حەرامە، بووکیشی حەرام کردووە(ژنی کوڕ) و مارەکردنی باوەژن و باوەژنی باوکیشی حەرام کردووە.

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڕیاری داوە بەحەرامبوونی کۆکردنەوەی ژنێك و پووری لەیەك کاتدا[٢]. مارەکردنی ئافرەتی خاوەن مێرد حەرامە.

---

[١] – بوخاری(٢٦٤٥) و موسلیم(١٤٤٧) ئیخراجیان کردووە.

[٢] – بوخاری(٥١٠٨) و موسلیم(١٤٠٨) ئیخراجیان کردووە.

## ١٠-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم )لەبارەی دوو هاوسەرەوە یەکێکیان پێش ئەوی دیکەیان موسڵمان بووبێ

ئیبن عەباس(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) زەینەبی کچی بەهاوسەرگیریی یەکەم گەڕاندەوە بۆ ئەبی ئەلعاص کوڕی رەبیع و هیچیش رووی نەدا[١].

ئەوەی بڕیاری پەیامبەر بەڵگەی لەسەر داوە، ئەوەیە هاوسەرگیرییەکە راگیراوە(موقوف)ە، ئەگەر لەپێش تەواوبوونی عیددەی ئافرەتەکە پیاوەکە بووە موسڵمان، ئەوە ئافرەتەکە بەخێزانی دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر عیددەی بەسەرچوو، ئەوە ئافرەتەکە سەربەستە ویستی مێرد بکاتەوە و ئەگەر حەزیشی کرد ئەتوانێ چاوەڕێی مێردە بێباوەڕەکەی بکات، بەڵام ئەگەر پیاوەکە موسڵمان بوو، ئەوە هاوسەرێتی و پێویست بەدووبارەکردنەوەی هاوسەرگیرییەکە ناکات.

## ١١-بڕیاری پەیامبەر( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی دوورگرتن لەخێزان( العزل )

لەسەحیحەیندا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) لەجابرەوە ئەڵێ: لەسەردەمی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) دوورمان دەگرت لەجووتبوون لەگەڵ خێزان و قورئانیش دادەبەزی[٢].

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لێیەوە ئەڵێ:"لەسەردەمی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم)لەخێزانەکانمان دوورمان دەگرت و ئەو هەواڵە بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) گەیشت و نەهی لێ نەکردین"[٣].

---

[١]- ئەبو داوود(٢٢٤٠) و ترمیزی(١١٤٣) و ئیبن ماجە(٢٠٠٩) ئیخراجیان کردووە.

[٢]- بوخاری(٥٢٠٨) و موسلیم(١٤٤٠) ئیخراجیان کردووە.

[٣]- بوخاری(٥٢٠٧، ٥٢٠٨، ٥٢٠٩) و موسلیم(١٤٤٠) ئیخراجیان کردووە و لەفزەکە هی ئەوە.

## ١٢-بڕیاری پەیامبەری خوا لەجووتبوون لەگەڵ ئافرەت لەکاتی شیرداندا

سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:"لقد هَمَمْتُ أن أنهى عن الغِيْلَةِ حتى ذكرتُ أن الرومَ وفارِسَ يفعلونَ ذلك فلا يَضُرُّ أولادَهم"[١]، واتا:ویستم نەهی بکەم لەجووتبوون لەگەڵ خێزان لەکاتی شیردان، بەڵام باس کرا کە رۆم و فارس ئەوە دەکەن و زیان لەمنداڵی شیردەریان نادات.

## ١٣-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەدەستپێکردن و مانەوە لەگەڵ هاوسەراندا

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەئەنەسەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە وتوویەتی: بەشێکە لەسوونەت ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوژندا، حەوت رۆژ لای دەمێنێتەوە، ئەگەر بێوەژنیشی هێنا، سێ رۆژ لای دەمێنێتەوە پاشان شەوەکانیان لەنێواندا بەش دەکات. ئەبو قیلابە ئەڵێ: ئەگەر ئەتەوێ بڵێ: ئەنەس ئەمەی رەفع کردووەتەوە بۆلای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)[٢].

لەسەحیحەیندا هاتووە: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر ویستی سەفەری هەبوایە، لەنێو خێزانەکانیدا تیروپشکی دەکرد، کێ دەربچووبایە ئەوەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد[٣].

لەسەحیحەیندا هاتووە کە سەودە(خوای لێ رازیی بێ) رۆژی خۆی بەخشیووە بەعائیشە(خوای لێ رازیی بێ)، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) رۆژێکی بۆ عائیشە و رۆژێکیشی بۆ سەودە دانابوو[٤].

---

[١] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٤٢).

[٢] - بوخاری(٥٢١٣) و موسلیم(١٤٦١) ئیخراجیان کردووە.

[٣] - بوخاری(٢٥٩٣) و موسلیم(٢٧٧٠) ئیخراجیان کردووە.

[٤] - بوخاری(٥٢١٢) و موسلیم(١٤٦٣) ئیخراجیان کردووە.

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە، خێزانەکانی هەموو شەوێك لەو ماڵەدا کۆدەبوونەوە کە ئەو شەوە پەیامبەری خوای بۆ دەهات(صلی الله علیه وسلم)[1].

**١٤- پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم ) حەرامی کردووە کەسێ لەگەڵ ئافرەتی سکپڕدا جووت ببێ کە ئەو سکی پڕ نەکردووە**

سەلماوە لەسەحیحی موسلیمدا: لەفەرموودەیەکی ئەبو دەردائدا(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەلای ئافرەتێکی سکپڕدا تێپەڕ بوو لەبەردەم چوونە ژوورەوەی خێوەتێکدا، فەرموی:" لَعَلَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُلِمَّ بِهَا"،واتا: وەك دیارە ئەیەوێ لەگەڵی جووت ببێ. وتیان: بەڵێ. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَلْعَنَهُ لَعْنًا يَدْخُلُ مَعَهُ قَبْرَهُ، كَيْفَ يُوَرِّثُهُ، وهو لا يحل له؟ كيف يستخدمُه وهو لا يحل له؟"[2]،واتا: پێداگربووم لەوەی نەفرەتی لێ بکەم، نەفرەتییەك لەگەڵیدا بیخەمە گۆڕەکەیەوە، چۆن دەبێتە خاوەن ئەو منداڵەی ناو سکی ئەو ئافرەتە کە هی ئەو نییە، چۆن بەکاریدەهێنێ لەکاتێکدا بۆ ئەو حەڵاڵ نییە؟

ئەلعیربازی کوڕی ساریە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ، پەیامبەری خوا حەرامی کردووە هیچ کەسێ لەگەڵ سەبایەیەکی سکپڕدا جووت ببێ تاوەکو کۆرپەکەی دەهێنێتە دونیاوە[3].

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٦٣).

[2]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٤١).

[3]- ترمیزی ئیخراجی کردووە(١٥٦٤).

**١٥-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی پیاوێك جاریەكەی ئازاد بكات و ئازادبوونی بۆ بكاتە مارەیی**

لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە: كە خۆی سەفیەی ئازاد كردووە، ئازادكردنی بۆ كردووەتە مارەیی، بەئەنەس وترا: چی بۆ كردە مارەیی؟ وتی: ئازادكردنی بۆ كردە مارەیی[١].

**١٦-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەدروستی ئەو هاوسەرگیرییەی وەستاوەتەوەسەر مۆڵەت**

لەسووننەندا هاتووە: لەئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوكی رازیی بێ) كە جاریەیەكی كچ هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و باسیكرد كە باوكی بەشووی داوە و خۆی پێ پەسەند نییە و ناچارە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەرپشكی كرد[٢].

**١٧-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەهاوشانیی لەهاوسەرگیرییدا**

خوای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ **الحجرات: ١٣**

،واتا: ئەی خەڵكینە بێگومان ئێمە دروستمان كردوون لە نێر و مێیەك وە كردومانن بەچەند گەل و هۆزێكەوە تا یەكتری بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو كەسەتانە زیاتر لەخوا دەترسێت، بێگومان خوا زانا و ئاگادارە.

---

[١] - بوخاری ئیخراجی كردووە(٤٢٠١).

[٢] - ئەبو داوود(٢٠٩٦) و ئیبن ماجە(١٨٧٥) ئیخراجیان كردووە.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: «لَا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ، وَلَا لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ، وَلَا لِأَبْيَضَ عَلَى أَسْوَدَ. وَلَا لِأَسْوَدَ عَلَى أَبْيَضَ إِلَّا بِالتَّقْوَى، النَّاسُ مِنْ آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ»[1]،واتا: هیچ عەرەبێك فەزڵ و گەورەیی بەسەر عەجەمێکدا نییە و هیچ عەجەمێکیش فەزڵ و گەورەیی بەسەر عەرەبێکدا نییە، هیچ سپی پێستێك فەزڵی بەسەر رەشپێستێکدا نییە و هیچ رەشپێستێکیش فەزڵ و گەورەیی بەسەر سپیپێستدا نییە ئیللا بەتەقوا نەبێ، خەڵکیی لەئادەمن و ئادەمیش لەخۆڵە.

ترمیزی لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) گێڕاویەتییەوە فەرموویەتی:«إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ) ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنْ كَانَ فِيهِ؟ فَقَالَ إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[2]، واتا: هەرکەسێ داوای ژنی لێ کردن و لەئایین و خوڕەوشتی رازیی بوون، ژنی پێ بدەن، ئەگەر وا نەکەن ئەوە لەزەوییدا ئاژاوە و خراپەیەکی گەورە دروست دەبێ. وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ئەگەر شتێکی تێدا بێ چی؟ سێ جار فەرمووی: هەرکەسێ داوای ژنی لێ کردن و لەئایین و خوڕەوشتی رازیی بوون، ژنی پێ بدەن.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) زەینەبی کچی جەحشی قورەشیی لەزەیدی کوڕی حاریسەی خزمەتکاری خۆی مارە کرد، فاتیمەی کچی قەیسی فەهری قورەیشیی لەئوسامەی کوڕی زەید مارە کرد،خوشکی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی لەبیلالی کوڕی رەباح مارە کرد.

ئەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بڕیاری لەسەر داوە، ئەوە ئایین بەبناغەی هاوشانیی دادەنرێت، هیچ ئافرەتێکی موسڵمانی لەبێباوەڕێك مارە نەکرد، هیچ داوێنپاکێکی لەپیاوێکی داوێن پیس مارە نەکرد.

---

[1] - ئەحمەد٣٨/٤٧٤(٢٣٤٨٩).

[2] - ترمیزی(١٠٨٤) و ئیبن ماجە(١٩٦٧) ئیخراجیان کردووە.

## ١٨-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەلماندنی بژاردە بۆ ئافرەتێکی سەربەستکراو لای پیاوی کۆیلە

لەسەحیحەیندا سەلماوە کە بەریرە نووسراوی لەگەڵ کەسوکاری کردووە، هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) داوای نووسراوی سەربەستیی کرد. عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) وتی:ئەگەر خزم و کەسوکارت حەزیان کرد ئەوە ئازادت دەکەم و وەلائی تۆ بۆ من بێ، ئەوە ئەنجامی دەدەم. بەریرە ئەوەی بۆ کەسوکاری باس کرد و رەتیان کردەوە و وتیان دەبێ وەلائی بۆ خۆیان بێ، بۆیە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەعائیشەی فەرموو:"اشْتَرِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلَاءَ فَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ"[1]،واتا: بیکڕە و مەرجی وەلائیان بخەرە سەر، وەلاء بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات.

پاشان وتاری بۆ خەڵك دا و فەرمووی:"مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ، مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ، قَضَاءُ اللَّهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللَّهِ أَوْثَقُ، وَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ "،واتا: ئەوە کەسانێك چییانە کۆمەڵە مەرجێك دادەنێن کە لەقورئانی خوادا نییە، هەرکەسێ مەرجێ دابنێت و لەقورئاندا نەبێ، ئەوە بەتاڵە، ئەگەر کەسەکە سەد مەرجیشی هەیە، ئەوە بڕیاری خوا حەقترە، مەرجی خوا تۆکمە و بەهێزترە، وەلاء بۆ کەسێکە کۆیلەکە ئازاد بکات.

پاشان پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەریرەی سەربەست کرد لای مێردەکەی بمێنێتەوە یان هەڵیوەشێنێتەوە، بەریرە خۆی هەڵبژارد،بۆیە پێیفەرموو:"ئەو مێردی تۆ و باوکی کوڕەکەتە". بەریرە وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەمە فرمانە؟ فەرمووی:"نە، بەڵکو تکایە". بەریرە وتی: من پێویستم پێی نییە[2].

---

[1]-بوخاری(٢٥٣٦) و موسلیم(١٥٠٤) ئیخراجیان کردووە.

[2]-بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٢٨٣).

پێیفەرموو: "إِنْ قَرَبَكِ فَلَا خِيَارَ لَكِ"[1]،واتا: ئەگەر جیابوونەوەت هەڵبژارد، ئەوە مارەییت بۆ نییە. فرمانی پێ کرد عیددە بکات و گۆشتێ بکاتە خێر. پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لێی خوارد و فەرمووی:" هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ ولَنَا هَدِيَّةٌ"[2]،واتا:لەسەر ئەو سەدەقە پێویستە و بۆ ئێمەش دیارییە".

## ١٩-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم ) لەمارەیی زۆر و کەم، بڕیاردانی بەدروستیی هاوسەرگیریی

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بۆ هاوسەرەکانی خۆی، پێنجسەد درهەمی کردووەتە مارەیی[3].

عومەر(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:نازانم پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هیچ خێزانێکی مارە کردبێ و هیچ کچێکی بەمێرد دابێ زیاتر لەدوانزە ئوقیە. ترمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی( حەسەن سەحیحە) [4]. ئوقیەیەك: دوانزە درهەمە.

لەسەحیحەیندا هاتووە: ئافرەتێك هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) من وا خۆمم بەخشی بە تۆ. زۆر مایەوە. پیاوێك وتی: ئەی پەیامبەری خوا ئەگەر تۆ ناتەوێ، لە منی مارە بکە. پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:" هیچ شتێکت هەیە بۆی بکەیتە مارەیی؟". وتی: تەنیا ئەم رووپۆشەم هەیە. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"ئەگەر رووپۆش و پۆشتەماڵەکەتی پێ بدەی، بێ رووپۆش دادەنیشی،

---

[1] -ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٢٣٦).

[2] -بوخاری(٥٠٩٧) و موسلیم(١٥٠٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٢٦).

[4] -ترمیزی(١١١٤) ئیخراجی کردووە.

شتێکی تری بۆ بهێنە". کابرا وتی: هیچ شتێکی ترم نییە. پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم) فەرمووی:"ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش دەبێ". کابرا گەڕا هیچی نەدۆزییەوە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) فەرمووی:"هیچ سورەتێکی قورئانت لەبەرە؟"وتی: بەڵێ، سورەتی فلان و فلان، ناوی سورەتەکانی هێنا. پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) فەرمووی:"هەردووکتانم لەیەك مارە کرد بەو سورەتانەی قورئان کە لەبەرت بوو"[1].

هەرکەسێ وەهای باس بکات، کە ئەو فەرموودانەی ئێمە باسمان کرد تایبەتن بەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیە وسلم) یان هەڵوەشاونەتەوە یان تەنیا کاری خەڵکی مەدینەیە، ئەوە قسەیەکی بێ بەڵگەی کردووە. سەعیدی کوڕی موسەیبی گەورەی تابیعینی مەدینە، کچەکەی خۆی بەشوو داوە لەسەر دوو درهەم و کەسێ لەوەدا بەرپەرچی نەداوەتەوە، بەڵکو ئەو کارە لەکۆی چاکە و رێز و جوامێرییەکانیدا باس کراون. عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بەمارەیی پێنج درهەم ژنی مارە کردووە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیە وسلم) پەسەندی کردووە(ئیقرار).

**٢٠-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیە وسلم ) لەنێوان دوو هاوسەری ناکۆکدا**

ئەبو داوود لەسوونەنەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی عائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە حەبیبەی کچی سەهل خێزانی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بوو، سابت لێدانی کرد و هەندێ شوێنی شکاند، حەبیبە لەدوای نوێژی بەیانیی هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)، پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) بانگی سابتی کرد و فەرمووی:"خُذْ بَعْضَ مَالِهَا وَفَارِقْهَا"،واتا: هەندێ لەسەروەتی حەبیبە ببە و لێی جیابەرەوە. وتی: ئەی پەیامبەری خوا ئەوە دەبێ؟ فەرمووی:

---

[1] -بوخاری(٥٠٢٩) و موسلیم(١٤٢٥) ئیخراجیان کردووە.

"بەڵێ". وتی: من دوو باخم بەمارەیی پێ داوە. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"خُذْهُمَا وَفَارِقْهَا فَفَعَلَ"،واتا: هەردووکی وەرگرە و لێی جیابەرەوە. سابتیش ئەوەی کرد[1].

خوای گەورە بڕیاری داوە لەنێوان دوو هاوسەردا کە ناکۆکییان کەوتووەتە نێوانەوە و فەرموویەتی:﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾ النساء: ٣٥ ،واتا: ئەگەر ترسان لە تێکچوونی نێوانیان(ژن و مێرد) ئەوە ناوبژیوانێك بنێرن لەخزمی پیاوەکە و ناوبژیوانێك لە خزمی ئافرەتەکە ئەگەر(دوو ناوبژیوانەکە)ئاشتییان بوێت خوا نێوان ژن و مێردەکە چاك دەکاتەوە بەڕاستی خوا هەمیشە زانا و ئاگادارە.

## ٢١-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی خولعەوە

لەسەحیحی بوخارییدا هاتووە لەئیبن عەباسەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) کە ژنەکەی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی:ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سابتی کوڕی قەیس هیچ عەیبێکی لێ ناگرم لەڕەوشت و ئاییندارییدا، بەڵام من ناتوانم لەگەڵیدا بژیم و ئەترسم لەدوای موسڵمان بووم بێباوەڕبیم. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"تَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟"،واتا: مارەییەکەی(باخەکەی) بۆ دەگێڕیتەوە. وتی: بەڵێ.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"اقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً"[2]،واتا: مارەییەکەی(باخەکەی) وەربگرە و تەڵاقی بدە بە یەك تەڵاق.

---

[1]-ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٢٢٨).

[2]-بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٢٧٣).

## سێیەم: بەشی تەڵاق

## باسکردنی بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی تەلاقەوە

### ١- باسکردنی بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەتەلاقی کەسێك بەگاڵتە تەلاق بخوات، کەسێك عەقلی لەجێگەی خۆی نەبێ، زۆرلێکراو، ئەوەی لەدەروونی خۆیدا تەلاقی خواردبێ

لەسوونەنەندا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئیبن عەباسدا:«إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[1]،واتا: خوای گەورە قەڵەمی تاوانی هەڵگرتووە لەسەر سێ کەسی ئوممەتەکەی: کەسێك بەهەڵە کارێك بکات، شتی لەبیرچووبێتەوە، زۆری لێکرابێ. بوخاری لەسەحیحەکەیدا باسی کردووە لەعەلییەوە کە بە عومەری وتووە:"ئایە نازانی تاوان هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس: شێت تاوەکو عەقڵی بۆ دەگەڕێتەوە، منداڵێك تاوەکو پێدەگات، خەوتوویەك تاوەکو بەئاگادێتەوە"[2].

لەسەحیحدا هاتووە لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:«إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ تَكَلَّمْ أَوْ تَعْمَلْ بِهِ»[3]،واتا: خوای گەورە لەسەر ئوممەتەکەم بەتاوانی نانووسێ کەسێکیان لەدەروونیدا شتێك دروست دەبێ بەدەم نایڵێ یان کە نایکاتە کردەوە.

ئەم سوونەنانە ئەوە لەخۆ دەگرن، هەتا ئەوەی بەزمان نەوترێت لەتەلاق و ئازادکردن و سوێند و نەزر و هاوشێوەکانی تر، کەسەکە ناچار نین ئەنجامی بدات، بۆ ئەوانە نییەت بەس نییە، ئەوە بۆچوونی کۆڕایە(جمهور).

---

[1] -ئیبن ماجە ئیخراجی کردووە(٢٠٤٥).

[2] -بوخاری پێش فەرموودەی(٥٢٦٩) موعەللەقی کردووە و حاکم وەصلی کردووە٤/٤٢٩(٨١٦٨) و بەیهەقییش لە السنن الكبرى٨/٤٥٩(١٧٢١٠).

[3] -بوخاری(٦٦٦٤) و موسلیم(١٢٧) ئیخراجیان کردووە.

نهێنی بابەتەکە، جیاوازیی نێوان دوو کەسە، کەسێك وشەکە ئەڵێ و پێی شارەزایە و بڕیارەکەی نەویستووە، کەسێکیش مەبەستی وشەکە نییە و واتاکەشی نازانێ، جا ئەو پلەیەی کە خوا و پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) دایانناوە، چوار پلەیە:

یەکەم: مەبەستی حوکمەکە نەبێ و بەدەمیش نەیڵێ.

دووەم: مەبەستی لەفز و حوکمیشی نەبێ.

سێیەم: وشە و لەفزەکەی مەبەست بێ نەك حوکمەکەی.

چوارەم: لەفز و حوکمیشی مەبەست بێ.

دووانەکەی سەرەتا لەغون و گرنگ دانانرێن، بەڵام سێیەم و چوارەم گرنگ دادەنرێن، لەکۆی هەموو دەق و حوکمەکان ئەوە بەدەستهاتووە.

## بەش

سەبارەت بەتەڵاقی کەسی سەرخۆش، بەدروست لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) هاتووە کە فرمانی داوە بۆنی دەمی کەسێ بکرێ کاتێك دان بەوەدا دەنێ داوێنپیسیی کردووە، بەوە دانپێدانانەکەی وەردەگیردرێ یان نە.

لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە لەچیرۆکی حەمزەدا کاتێك دوو وشترەکەی عەلیی سەربڕی، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هات و لەسەر سەری ڕاوەستا و سەرزەنشتی کرد، تەماشایەکی پەیامبەری خوای کرد کاتێك سەرخۆش بوو وتی: ئێوە تەنیا کۆیلەی باوکمن. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە[١].

ئەو قسەیەی کە ئەو کردی، سەرخۆش نەبووایە، دەبووە هەڵگەڕانەوە و بێباوەڕیی، حەمزە لەسەر ئەو قسەیە سزا نەدرا.

---

[١]-بوخاری(٣٠٩١) و موسلیم(١٩٧٩) ئیخراجیان کردووە.

بەدروست لەعوسمانی کوڕی عەفانەوە(خوای لێ رازیی بێ) هاتووە: شێت و سەرخۆش، تەلاقیان بەدەست نییە[1].

## بەش

سەبارەت بەتەلاقدانی کاتی تووڕەیی، ئەوە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) ئەیفەرموو:«لَا طَلَاقَ وَلَا عِتَاقَ فِي إِغْلَاقٍ»[2]،واتا: لەکاتی تووڕەییدا تەلاق و ئازادکردن نییە.

سێ جۆر تووڕەبوون هەیە:

یەکەم: ئەوەی عەقڵ لەمێشکدا ناهێڵێ، بێ هیچ ناکۆکییەك ئەم تەلاقە ناکەوێت.

دووەم: تووڕەبوونێکی ئاسایی، ئەمە دەکەوێت.

سێیەم: کەسەکە تووڕەییەکی توندی گرتووە بەلام ئەوە نییە تەواوی عەقڵی پێوە نەهێشتبێ، بەلام کە تووڕەییەکەی دادەمرکێتەوە پەشیمانیی دەکێشێ، ئەم جۆرە جێی تێڕامانە و لەم حاڵەتەدا کەوتنی بەهێز دانانرێت، خواش زاناترە.

## ٢- بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەتەلاقی پێش هاوسەرگیری

لەسووننەندا هاتووە لەفەرموودەیەکی عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەباوکیەوە ئەویش لەباپیرەیەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:«لَا نَذْرَ لِابْنِ آدَمَ فِيمَا لَا يَمْلِكُ، وَلَا عِتْقَ لَهُ فِيمَا لَا يَمْلِكُ، وَلَا طَلَاقَ لَهُ فِيمَا لَا يَمْلِكُ»[3]،واتا: مرۆڤ نەزری لەسەر نییە لەشتێك کە نییەتی، ئازادکردنی کۆیلە لەسەر کەسێك نییە کۆیلەی نییە، تەلاقی کەسێك ناکەوێ کە ژنی نییە.

---

[1] -بوخاری بەجەزمەوە موعەللەقی داناوە پێش فەرموودەی(٥٢٦٩) و ئیبن ئەبی شەیبە وەصلی کردووە(گەیاندوویەتی)٤/٧١(١٧٩٠٨).

[2] -ئەبو داوود(٢١٩٣) و ئیبن ماجە(٢٠٤٦) ئیخراجیان کردووە.

[3] -ئەبو داوود(٢١٩٣) و ئیبن ماجە(٢٠٤٦) ئیخراجیان کردووە.

لەسووننەنی ئیبن ماجەدا لەمیسوەری کوڕی مەخرمەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: «لَا طَلَاقَ قَبْلَ النِّكَاحِ، وَلَا عِتْقَ قَبْلَ مِلْكٍ»[1]،واتا: لەپێش هاوسەرگیریی تەلاق بوونی نییە(ناکەوێ)، لەپێش خاوەندارییکردنی کۆیلە، ئازادکردنی کۆیلە بوونی نییە.

## ٣- حوکمی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەحەرامکردنی تەلاقی ئافرەتێ لەسووڕی مانگانەدا بێ، یان نیفاس و ئەوەی لەدوای پاکبوونەوە لەسووڕی مانگانە مێردەکەی لەگەڵیدا جووت بووبێ، حەرامکردنی سێ تەلاقە لەیەك کاتدا

لەسەحیحەیندا هاتووە کە ئیبن عومەر(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) لەسەردەمی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم) ژنەکەی تەلاق دا لەکاتێکدا لەسووڕی مانگانەدا بوو، عومەری کوڕی خەتاب(خوای لێ رازیی بێ) بۆ ئەوە پرسیاری لەپەیامبەری خوا کرد(صلی الله علیه وسلم)، پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لْيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِنْ شَاءَ يُطَلِّقُ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ"[2]،واتا: فرمانی پێ بکە ژنەکەی بگێڕێتەوە لای خۆی، هەتا لەسووڕی مانگانە پاك دەبێتەوە پاشان دەکەوێتە سووڕی مانگانەوە پاشان پاك دەبێتەوە، ئینجا ئەگەر بیەوێ تەلاقی نادات و لای خۆی ئەیهێڵێتەوە یان بیەوێ پێش جووت بوون لەگەڵیدا تەلاقی بدات، ئەوە ئەو عیددەیەیە کە خوای گەورە دایناوە ئافرەتی تێدا تەلاق بدرێت.

---

[1] -ئەبو داوود(٢١٩٠) و ئیبن ماجە(١١٨١) ئیخراجیان کردووە، بنچینەکەی لەسەحیحی موسلیمدایە(١٦٤١).

[2] -بوخاری(٥٢٥١) و موسلیم(١٤٧١) ئیخراجیان کردووە.

لای موسلیمیش هاتووە:«مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا أَوْ حَامِلًا»[1]،واتا: فرمانی پێ بکە بیگێڕێتەوە پاشان لەپاکبوونەوە یان سکپڕییدا تەڵاقی بدات.

لەلەفزێکدا هاتووە: لەئیبن عومەرەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) ئەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عومەر ژنەکەی لەکاتی سووڕی مانگانەدا تەڵاق دا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە بۆی[2].

ئەم بڕیارە ئەوە لەخۆ دەگرێت کە تەڵاق چوار جۆرە: دوو جۆری حەڵاڵە و دوو جۆری حەرامە.

دوو جۆری حەڵاڵ ئەمانەن: ئەوەیە پیاوێك ژنەکەی تەڵاق بدات لەکاتی پاکبوونەوە لەسووڕی مانگانە و لەدوای پاکبوونەوە لەگەڵیدا جووت نەبووبێ، یان ئەوەی لەکاتی سکپڕییدا تەڵاقی بدات و سکپڕییەکەی روون بێ.

دوو جۆرە حەرامەکەش ئەمانەن: لەکاتی سووڕی مانگانەدا تەڵاقی بدات، یان لەدوای پاکبوونەوەیەك لەسووڕی مانگانە تەڵاقی بدات کە لەگەڵیدا جووت بووبێ.

ئەمە لەتەڵاقدانی ئافرەتێك مێردەکەی لەگەڵیدا جووت بووبێ، بەڵام بۆ ئافرەتێك کە مێردەکەی نەچووبێتە لایەوە، جائیزە لەسووڕی مانگانە و پاکبوونەوەشدا تەڵاق بدرێت هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێت:﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً ﴾ **البقرة: ٢٣٦** ،واتا: گوناهتان لەسەر نیە ئەگەر ژنانێك تەڵاق بدەن کە هێشتا نەچووبنە لایان یا مارەییتان بۆ دانەنابن.

لەسووننەنی نەسائی و کەسی تردا هاتووە لەفەرموودەیەکی مەحمودی کوڕی لەبیدەوە ئەڵێ: هەواڵ درا بەپەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبارەی پیاوێك ژنەکەی بەسێ تەڵاقە تەڵاق داوە لەیەك کاتدا، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)

---

[1]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٧١/٥) ئیخراجی کردووە.

[2]-ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢١٨٥).

بەتووڕەییەوە هەڵسایە سەر پێ و فەرمووی:"أَيُلْعَبُ بِكِتَابِ اللَّهِ وَأَنَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟!"،واتا: یاریی بەپەرتووکی خوا دەکەن لەکاتێکدا من لەنێوتاندام؟! هەتا ئەوەی پیاوێك هەڵساو وتی: ئەی پەیامبەری خوا ئەو پیاوە بکوژم؟[1]

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئیبن عومەرەوە(خوا لەخۆی و باوکی رازیی بێ) کە پرسیاری لێکراوە لەبارەی تەلاقەوە، ئەویش وتوویەتی: تۆ یەك جار یان دوو جار ژنەکەتت تەلاق داوە، چونکە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئاوەها فرمانی پێکردووم، ئەگەر سێ تەلاقەت داوە، ئەوە لە تۆ حەرام دەبێ تاوەکو مێرد دەکات بەپیاوێکی تر، سەرپێچیی خوای گەورەت کردووە لەوەی لەبارەی تەلاقدانی خێزانەکەتەوە فرمانی پێکردووی[2].

ئەم دەقانە ئەوە لەخۆدەگرێت، دوو جۆر ئافرەتی تەلاقدراو هەیە: یەکێکیان لەدوای پاکبوونەوە لەسووڕی مانگانە جووتبوونی لەگەڵدا ئەنجام دراوە، یەکێکی تریان لەگەڵیدا ئەنجام نەدراوە، بۆ هەردو جۆر، جائیز نییە بەیەکجار سێ تەلاقە بدرێن. لەبارەی جۆری حەرامەوە جیاوازیی هەیە.

## ٤- پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڕیاری داوە ئەگەر ئافرەتێك سێ تەلاقە درابێ، بۆ پیاوی یەکەمی حەلاڵ نابێ تاوەکو مێرد بەپیاوێکی تر نەکات و پیاوی دووەم لەگەڵیدا جووت نەبێ

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە ژنەکەی رەفاعەی ئەلقورەزی هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، رەفاعە سێ تەلاقەی داوم، لەدوای ئەو مێردم کرد بەعەبدولڕەحمانی کوڕی زوبەیری ئەلقورەزی، ئەندامی نێرینەی وەك چمکی کراس خاوە. پەیامبەری

[1] -نەسائی ئیخراجی کردووە(٣٤٠١).

[2] -بوخاری(٥٣٣٣) و موسلیم(١٤٧١) ئیخراجیان کردووە.

خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:" لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رفاعة. لَا، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ"،واتا: وەك ئەوەی ئەتەوێ بگەڕێیتەوە لای ڕەفاعە نا، تاوەکو چێژ لەیەکتر ببینن[1].

## ٥-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەسەرپشککردنی خێزانەکانی، لەگەڵیدا بمێننەوە یان لێی جیاببنەوە

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: کاتێ فرمان کرا بەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) هاوسەرەکانی سەرپشك بکات، لە منەوە دەستییپێکرد و فەرمووی:"إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا، فَلَا عَلَيْكِ أَلَّا تَعْجَلِي حَتَى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ"،واتا: من شتێکت بۆ باس دەکەم، پێویست ناکات لەوەڵامی خۆتدا پەلە بکەی تاوەکو پرس بەدایك و باوکت دەکەیت. ئەشیزانی کە دایك و باوکم فرمانم پێ ناکەن لێی جیاببمەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾ **الأحزاب: ٢٨ – ٢٩** ،واتا: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەخێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دونیا و ڕازاوەی ئەوتان دەوێت دەی هەمووتان وەرن موتعەتان پێ بدەم(موتعە پارە و شتومەکێکە دەدرێتە ئافرەتی تەڵاقدراو) وە تەڵاقتان بدەم بە تەڵاق دانێکی چاك و بێ زیان. وە ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی دواییتان دەوێت ئەوە بێگومان خوا ئامادەی کردووە بۆ چاکەکاران لەئێوە پاداشتێکی گەورە.

---

[1] -بوخاری(٥٢٦٠) و موسلیم(١٤٣٣) ئیخراجیان کردووە.

منيش وتم: لەمەدا فرمان لەدایك و باوكم وەربگرم؟! من خوا و پەیامبەر و ئاخیرەتم دەوێ. عائیشە ئەڵێ: پاشان هاوسەرەكانی دیكەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) هەمان شتی منیان كرد و هیچ كەسێكیان تەلاقی هەڵنەبژارد[1].

## ٦-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) كە لەنێوان خۆی و پەروەردگاریدا هەبوو سەبارەت بەجاریە و هاوسەرەكانی

خوای گەورە ئەفەرمووێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ ﴾ **التحريم: ١ – ٢** ،واتا: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەكەیت كە خوا بۆی حەلاڵ كردویت(مەبەست پێی خاتوو ماریە بوو) تۆ ڕەزامەندی ژنەكانت دەوێ لەكاتێكدا خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە. بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەكەتان، خوا پشتیوان و دۆستی ئێوەیە وە ئەو زانا و كاردروستە.

لەسەحیحەیندا سەلماوە كە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەماڵی زەینەبی كچی جەحش هەنگوینی خواردووە، عائیشە و حەفسە وەهایان لێكردووە بفەرمووێ:جارێكی تر لەوێ ناخۆم[2].

لەسووننەنی نەسائیدا هاتووە لەئەنەسەوە(خوای لێ ڕازیی بێ): پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)جاریەیەكی هەبوو دەچووە لایەوە، عائیشە و حەفسە وازیان لێ نەهێنا تاوەكو لەخۆی حەرام كرد، بۆیە خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند[3].

---

[1] –بوخاری(٥٢٦٢) و موسلیم(١٤٧٧) ئیخراجیان كردووە.

[2] –بوخاری(٤٩١٢) و موسلیم(١٤٧٤) ئیخراجیان كردووە.

[3] –نەسائی ئیخراجی كردووە(٣٩٥٩).

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئیبن عەباسەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی لەخۆی حەرام کرد، ئەوە سوێندە و با کەفارەی سوێندەکەی بدات، چونکە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بۆ ئێوە پێشەنگی جوانە[1].

## ٧-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی پیاوێك بەژنەکەی بڵێ: بگەڕەوە لای کەسوکارت

لەسەحیحی بوخاریدا سەلماوە کە کچی ئەلجون کاتێك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) چووە لایەوە و ویستی لێی نزیکببێتەوە، وتی: بەخوا پەنات پێ دەگرم. پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)یش فەرمووی:"عُذْتِ بِعَظِيمٍ، الْحَقِي بِأَهْلِكِ"[2]،واتا: پەنات بەخوای گەورە گرت، بگەڕێرەوە لای کەسوکارت.

خەڵکی لەوەدا جیاوازبوونە، کۆمەڵێك وتوویانە: ئەوە تەڵاقدان نییە، جا نییەتی تەڵاقی هەبێ یان نە، ئەوە قسەی زاهیرییەکانە.

کۆڕای زانایانیش(جمهور)لەنێویاندا چوار پێشەواکە و ئەوانی تر ئەوەیە: بەڵکو ئەوە وشەو بێژەیەکی تەڵاقە ئەگەر کەسەکە نییەتی تەڵاقی هەبێ بەوتنی.

لەسەحیحی بوخاریدا سەلماوە کە باوکمان ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم ژنەکەی تەڵاق دا کاتێك ئیبراهیم بەژنەکەی ئیسماعیلی کوڕی وتبوو: بەئیسماعیل بڵێ: با دەرگای حەوشە بگۆڕێت. ئیسماعیل وتی: تۆ دەرگاکەی، ئەوە فرمانی پێکردووم لێت جیاببمەوە، خۆت بگەیەنە بەکەسوکارت[3].

---

[1]-بوخاری(٤٩١١) و موسلیم(١٤٧٣) ئیخراجیان کردووە.

[2]-بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٢٥٤).

[3]-بوخاری ئیخراجی کردووە(٣٣٦٤).

ئەو بێژەیە یەکێکە لەو بێژەییانەی لەسەردەمی نەفامی و ئیسلامدا وتراوە و دەوترێت، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەیگۆڕین، بەڵکو هێشتنیەوە و هاوەڵانیشی تەڵاقیان پێ داوە، بۆ ئێمەش پێشەنگن.

خوای گەورە باسی تەڵاقی کردووە، لەفزی بۆ دەستنیشان نەکردووە، زانیوێتی خەڵك شتانێك بەکاردەهێنن تەڵاقیان پێ مەبەستە، جا هەر بێژەیەك بۆیان بووە نەریت، بەبەکارهێنانی لەگەڵ نییەتدا تەڵاق دەکەوێت.

## ٨-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی زیهار و روونکردنەوەی ئەوەی خوای گەورە تیایدا داییەزاندووە، واتای ئەو گەڕاندنەوەیەش کە کەفارەت واجیب دەکات

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ المجادلة: ٢ – ٤،واتا: ئەوانەتان کە(ظهار) دەکەن لەگەڵ ژنەکانیاندا(پێیان دەڵێن وەك دایکمان وان) ئەوانە دایکی ئێوە نین، دایکی ئەوان هەر ئەو ژنانەن کە ئەوانیان لێ بووە وە بێگومان ئەوانە گوفتارێکی خراپی ناپەسەند دەڵێن و درۆ دەکەن وە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و لێبووردەیە.

ئەوانەی(ظهار) دەکەن لەگەڵ هاوسەرەکانیان لەپاشان پەشیمان دەبنەوە و(دەیانەوێت بچنە لایان)لەوەی کە ووتویانە(واتە خێرا تەلاقیان نادەن) ئەوە پێویستە بەندەیەك ئازاد بکەن لەپێش ئەوەی بەیەك بگەن(و بچنە لایان) ئەم کەفارەتەی(کە لەسەرتان پێویست کراوە) ئامۆژگاری دەکرێن پێی وە خوا شارەزا و ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن .

ئەمجا ئەگەر یەکێك(بەندەی)دەست نەکەوت ئەوە با دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت پێش ئەوەی بچنە لای یەك، ئەگەر یەکێك نەیتوانی(دوو مانگ بەڕۆژووبێت) ئەوە با نانی شەست هەژار بدات، ئەو(کەفارەتانە کە لەسەرتان پێویست کراوە) بۆ ئەوەیە باوەڕ بکەن بەخوا و پێغەمبەری خوا(ملکەچی فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا بن) وە ئەوانە سنووری خوان وە بۆ بێ باوەڕان هەیە سزای سەخت.

عائیشە ئەڵێ: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هەموو دەنگەکان دەبیستێ، خەولەی کچی مالیکی کوڕی سەعلبە بەگازندە و شەکواوە هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) منیش لەشانەوەی ژوورەکە بووم و هەندێ لەقسەکانیم گوێ لێ نەبوو کە دەیووت، کەچی خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند[1] .

## ٩-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسوێند خواردن لەنزیك نەکەوتنەوەی خێزان(ایلاء)

لەسەحیحی بوخاریدا سەلماوە لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سویندی خوارد لەهەندێ لەخێزانەکانی دووربگرێ، لەژوورێکی سەرەوەی ماڵی خۆی بۆ بیست و نۆ شەو مایەوە،پاشان دابەزی، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا تۆ سوێندت خوارد یەك مانگ نزیکی

[1] ـنەسائی(٣٤٦٠) و ئیبن ماجە(١٨٨) ئیخراجیان کردووە.

خێزانەکانت نەکەویتەوە! فەرمووی: "ئەم مانگە بیست و نۆ ڕۆژە"[1]، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ ﴾ البقرة: ٢٢٦ ،واتا: بۆ ئەوانە هەیە سوێند دەخۆن لەگەڵ ژنەکانیان دروست نەبن چاوەڕوانی چوار مانگ بکەن ئەمجا ئەگەر گەڕانەوە(بۆ لای ژنەکانیان) ئەوا خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

الإیلاء لەڕووی زمانەوانییەوە: واتا: سوێندخواردنی خۆبەدوورگرتن، بەڵام لەڕووی شەرعەوە تایبەت بووە بەسوێندخواردنی کەسێك لەجووت نەبوون لەگەڵ هاوسەرەکەی، خوای گەورە بۆ ئەمە چوار مانگی داناوە، ئەگەر چوار مانگەکە تێپەڕبوو دەبێ فیدیەی سوێندەکەی بدات یان ژنەکەی تەڵاق بدات. لەعەلی و ئیبن عەباسەوە بەناوبانگە کە ئەم کارە لەحاڵەتی تووڕەبووندا روو دەدات نەك رازیبوون، هەروەك لەحاڵەتی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ خێزانەکانیدا رووی دا، زاهیری قورئانیش لەگەڵ جمهوردایە.

### ١٠-حوکمی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم )لەبارەی لیعان

خوای گەورە ئەفەرموویت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور: ٦ – ٩ ،واتا: ئەو(پیاوانەی)بوهتان بۆ خێزانەکانیان دەکەن وە بێجگە لەخۆیان هیچ شایەتێکیان نیە ئەوە شایەتیدانی هەریەك لەوانە(بەم جۆرەیە) کە چوار سوێند بەخوا بخوات کە بێگومان ئەو لەڕاستگۆیانە(کە

[1] -بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٢٨٩).

دەڵێت خێزانەکەم بینیوە زینای کردووە). وە لەپێنجەم جاردا بڵێ نەفرەتی خوا لەسەر ئەو بێ ئەگەر درۆزن بێت ئەو ئافرەتەش(کە تاوانبار کراوە لەلایەن مێردەکەیەوە) سزای(زینای) لەسەر لادەبات بەمەی کە چوار جار سوێند بەخوا بخوات کە مێردەکەی لەدرۆزنانە(درۆ دەکات). وە لەپێنجەم جاردا(بڵێت)خەشمی خوای لەسەر بێت ئەگەر مێردەکەی لەڕاستگۆیان بێت.

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەفەرموودەیەکی ئیبن عومەرەوە کە فلأنی کوڕی فەلأن وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئەگەر یەکێ لەئێمە بینی خێزانەکەی بەدرەوشتیی دەکات چی بکات؟ ئەگەر باسی بکات، شتێکی گەورە و گرانە، ئاخۆ ئەکرێ بێدەنگیی لەسەر بکرێت؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بێدەنگ بوو وەلأمی نەدایەوە، دواتر هاتەوە لای پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەوەی لە تۆم پرسی، لەخۆمدا رووی داوە و گیرۆدەی هاتووم، بۆیە خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێ کردووە، بۆی خوێندەوە و ئامۆژگاریی کرد و بیریخستەوە کە سزای دونیا ئاسانترە بەراورد بەسزای ئاخیرەت.

وتی: نە، سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە درۆ لەسەر ژنەکەم ناکەم،پاشان ئافرەتەکەی بانگکرد و ئامۆژگاریی کرد و بیری خستەوە و هەواڵی پێ دا کە سزای دونیا ئاسانترە لەسزای ئاخیرەت. ژنەکە وتی: نە سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە درۆ دەکات، بۆیە بەپیاوەکە دەستیپێکرد، چوار شایەتیی دا بەخوای گەورە کە لەو قسەیەدا راستگۆیە و لەچوارەمدا وتی نەفرەتی خوای لەسەر بێ ئەگەر درۆ بکات. پاشان بەژنەکە شایەتیی دا و چوار جار خوای کرد بەشایەت کە پیاوەکە درۆ دەکات، لەپێنجەمدا بەوەی نەفرەتی خوای لەسەربێ کە پیاوەکە راست بکات، پاشان لەیەکی جیاکردنەوە[1].

---

[1] بوخاری(٤٧٤٨) و موسلیم(١٤٩٣) ئیخراجیان کردووە.

لەسەحیحەیندا هاتووە کە پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) بەو ژن و پیاوەی فەرمووە:"حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لَا سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا "،واتا: لێپرسینەوەتان لای خوایە ئەگەر یەکێکتان درۆ بکات، هیچ شتێکیشت بەسەریەوە نییە. کابرا وتی: ئەی پەیامبەری خوا چی شتێکم بۆ هەیە؟ فەرمووی:"لَا مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ أَبْعَدُ لَكَ مِنْهَا"[1]،واتا: هیچ پارە و مارەییەکت لەسەری نییە، ئەگەر تۆ راستگۆبی لەو سوێندەت، ئەوە ئەو مارەییەی داوتە بۆ ئەوەیە کە داوێنیت بۆ حەلاڵ بوو، ئەگەر درۆشت کردبێ، ئەوە دوورترە لەوەی لێی وەربگیردرێ بۆ تۆ.

لەلەفزێکدا بۆ هەردووکیان: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دوو ژن و پیاوی نەفرەت لەیەککەری لەیەك جیاکردەوە و فەرمووی:"وَاللَّهِ إِنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟"[2]، واتا: سوێند بەخوا یەکێکتان درۆ دەکات، کەستان هەیە تەوبە بکات؟

لەبارەی ژن و مێردێکی لەو جۆرەوە هاتووە: لەسەردەمی پەیامبەری خوادا(صلی الله علیه وسلم)پیاوێك ژنەکەی لیعان کرد، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەردووکیانی لەیەك جیاکردەوە و کوڕەکەی بەدایکەکەی دا[3].

## ١١-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبابەت گەڕانەوەی ڕەچەڵەکی منداڵ بۆ باوك ئەگەر ڕەنگی لەگەڵ باوکیدا جیاواز بێ

سەلماوە لەسەحیحەیندا کە پیاوێك پێی وتووە: ژنەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە- وەك ئەوەی ڕەتیبکاتەوە لەخۆی بێ-پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)

---

[1] -بوخاری(٥٣١٢) و موسلیم(١٤٩٣) ئیخراجیان کردووە.

[2] -بوخاری(٤٧٤٧) و موسلیم(١٤٩٣) ئیخراجیان کردووە.

[3] -بوخاری ئیخراجی کردووە(٥٣١٥).

فەرمووی: "وشترت هەیە؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی: "رەنگی وشترەکەت چۆنە؟" وتی: رەنگی سوورە. فەرمووی: "خۆڵەمێشیی تێدایە؟" وتی: بەڵێ. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "وهذا لعلّه أن یکون نزعَه عرق"[1]، واتا: ئەگەرێ ئەم منداڵەش بۆ رەنگ و سرووشتی رەچەڵەکی بگەڕێتەوە و ئەو رەنگەی تێدا هەبێ.

## ١٢-بڕیاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بەوەی منداڵ بەرهەمی جێگە و خەوتنە و سەبارەت بەوەی لەدوای مردنی باوکی، خراوەتە سەر ناوی باوکی

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەفەرموودەیەکی عائیشەدا(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس و عەبدی کوڕی زەمعە لەبارەی کوڕێك کەوتنە ناکۆکییەوە، سەعد وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئەمە برازامە، کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاسە پێی وتووم کە کوڕێتی، بڕوانە شێوەی.

عەبدی کوڕی زەمعەش وتی: ئەی پەیامبەری خوا ئەمە برازامە، کوڕی جێگەی باوکمە، پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم) تەماشای کرد بینی روون هاوشێوەی عوتبەیە، بۆیە فەرمووی: "هُوَ لَكَ يَا عبد بن زمعة، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سودة"[2]، واتا: بەشی تۆیە ئەی عەبدی کوڕی زەمعە، منداڵ بەرهەمی جووتبوونی شەرعییە و داوێنپیسیش شەرمەزاریی بۆ دەمێنێتەوە، تۆش ئەی سەودە لەبەرانبەری خۆت داپۆشە و حیجاب بکە. سەودە هیچ کات ئەو برایەی نەبینیبوو.

---

[1] -بوخاری(٥٣٠٥) و موسلیم(١٥٠٠) ئیخراجیان کردووە.

[2] -بوخاری(٢٢١٨) و موسلیم(١٤٥٧) ئیخراجیان کردووە.

## ١٣-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی ئەوەی کێ مافدارە بەدایەنی کردنی منداڵ

ئەبو داوود لەسوونەنەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەباوکیەوە ئەویش لەباپیرەیەوە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس: ((ئافرەتێك وتی: ئەی پەیامبەری خوا، ئەم کوڕەم لەسکی مندا بووە، مەمکم شیری پێ داوە و ژیاندوویەتی و کۆشی من پاراستوویەتی، باوکی تەڵاقی داوم و ئەیەوێ لە منی بسێنێ، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي"[1]،واتا: هەتا ئەوکاتەی مێردت نەکردووەتەوە، تۆ پێی مافدارتری.

لەبەرائی کوڕی عازبەوە ئەڵێ: "عەلی و جەعفەر و زەید سەبارەت بەکچی حەمزە کەوتنە ناکۆکییەوە. عەلی وتی: کچی ماممەو من پێی مافدارترم. جەعفەر وتی: کچی مامەو (پوورەکەشی)خوشکی دایکی خێزانمە. زەید وتی: برازامە، بەڵام پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) خستیە لای پوورەکەی(خوشکی دایکی) و فەرمووی:"الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الْأُمِّ"[2]،واتا:خوشکی دایك لەجێی دایکە.

خاوەنانی سوونەنەن لەئەبو هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە☹(ئافرەتێك هات و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، مێردەکەم دەیەوێ کوڕەکەم لێ ببات، ئاوی پێ داوم لەبیری ئەبی عەنبە و سوودی پێ گەیاندووم. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"اسْتَهِمَا عَلَيْهِ"،واتا: تیروپشکی لەسەر بکەن. مێردی ژنەکە وتی: کێ لەبارەی کوڕەکەمەوە مرو مشتم بکات؟ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ، وَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ"، واتا: ئەمە باوکتە و ئەمەش

---

[1] -ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٢٧٦).

[2] -بوخاری ئیخراجی کردووە(٢٦٩٩).

دایکت، کامەیانت دەوێ دەستی بگرە. کوڕەکە دەستی دایکی گرت و دایکەکە کوڕەکەی برد و ڕۆیشت. ترمیزی ئەڵێ: فەرموودەیەکی(حسن صحیح)ە[1].

## ١٤-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەخەرجیکێشانی هاوسەراندا، خەرجیی ئەندازە نەکردووە، بەڵکو ئەوەی بۆ نەریت گەڕاندووەتەوە

لەسەحیحەیندا لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) سەلماوە، هیندی کچی عوتبەی خێزانی ئەبو سوفیان بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی وتووە: ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە، ئەوەندەم پێ نادات بەشی خەرجیی خۆم و کوڕەکەم بکات بۆیە ناچارم بەبێ پرسی خۆی پارەی لێ ببەم، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: "خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ"[2]،واتا: ئەوەندەی لێ ببە بەشت بکات بەپێی نەریت.

لەسووننەنی ئەبو داوودا هاتووە لەفەرموودەیەکی حەکیمی کوڕی موعاویە، ئەویش لەباوکیەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ: هاتم بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتم: چی ئەفەرمووی سەبارەت بەژنەکانمان؟ ئەویش فەرمووی: «أَطْعِمُوهُنَّ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَاكْسُوهُنَّ مِمَّا تَلْبَسُونَ، وَلَا تَضْرِبُوهُنَّ وَلَا تُقَبِّحُوهُنَّ»[3]،واتا: لەو خواردنەیان پێ بدەن کە خۆتان دەیخۆن، لەو بەرگەیان بکەنە بەر کە بۆ خۆتان لەبەری دەکەن، لێیان مەدەن و قسەی ناشیرینیان پێ مەکەن و مەیان بوغزێنن.

ئەم بڕیارە لەلایەن پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم)، ڕێك و گونجاوە بەپەرتووکی خوای گەورە کە فەرموویەتی:﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ

---

[1] -ئەبو داوود(٢٢٧٧) و ترمیزی(١٣٥٧) و ئیبن ماجە(٢٣٥١) و نەسائی(٣٤٩٦) ئیخراجیان کردووە.

[2] -بوخاری(٥٣٦٤) و موسلیم(١٧١٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] -ئەبو داوود(٢١٤٤) و ئیبن ماجە(١٨٥٠) ئیخراجیان کردووە.

كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ **البقرة: ٢٣٣** ،واتا: دایکان شیر بدەن بە منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو(ئەمە) بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیری تەواو بدات لەسەر باوکەکەیە ڕۆزی و کاڵای دایکەکە بەباشی.

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) خەرجیی ئافرەتی وەك خەرجیی خزمەتکاری لێ کردووە، لەوەدا یەکسانی کردوون کە خەرجییەکەی نەخەملاندووە، ئەوەشی گێڕاوەتەوە بۆ نەریت و فەرموویەتی:«لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ بِالْمَعْرُوفِ»[1]، واتا:کۆیلە بەچاکە و بەپێی نەریت مافی خواردن و بەرگ و پۆشاکی هەیە.

## ١٥-ئەوەی لە پەیامبەری خواوە( صلی الله علیه وسلم ) گێڕدراوەتەوە لەوەی ئافرەت دەسەڵاتی ئەوەی هەیە داوای تەلاق بکات ئەگەر مێردەکەی نەیتوانی خەرجیی بۆ دابین بکات

بوخاری لەسەحیحەکەیدا گێڕاویەتییەوە لەفەرموودەیەکی ئەبو هورەیرەدا(خوای لێ ڕازیی بێ) ئەڵێ:پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:"أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ مَا تَرَكَ غِنًى"،واتا:باشترین خێر و سەدەقەیەك، ئەوەیە دوای هێشتنەوەی پێویستییەکانی خۆت و ئەوانەی خەرجییان لەسەر تۆیە، ببەخشی. بەلەفزێکی تریش هاتووە ئەفەرموێت:"مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ"،واتا: باشترین خێر و سەدەقەیەك، ئەوەیە دوای هێشتنەوەی پێویستییەکانی خۆت و ئەوانەی خەرجییان لەسەر تۆیە، ببەخشی،دەستی بەرز و باڵا باشترە لەدەستی نزم و بێ توانا، لەخەرجیی ئەوەوە دەستپێبکە کە پشت و متمانەی لەسەر تۆیە. ئافرەت ئەڵێ: یان خواردنم پێ بدە یان تەلاقم بدە، کۆیلەش ئەڵێ: خۆراکم پێ بدە و بەکارمبهێنە. کوڕ و منداڵیش ئەڵێ:خواردنم پێ بدە، تۆ

[1]-موسلیم ئیخراجی کردووە(١٦٦٢).

بەکێم دەسپێری؟ وتیان: ئەی ئەبو هورەیرە، ئەمەت لەپەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) گویێ لێبووە؟ وتی: نە، بەڵکو ئەمە هۆشیاریی ئەبو هورەیرەیە[1].

## ١٦-بڕیاری ڕێك و گونجاوی پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم )بەقورئان لەوەی ئافرەتی سێ تەلاقە دراو، خەرجی و شوێنی نیشتەجێبوونی بۆ نییە

لەسەحیحدا هاتووە لەعوبەیدوڵڵەی کوڕی عەبدوڵڵەی کوڕی عوتبەوە، کە ئەبو عەمری کوڕی حەفسی کوڕی موغیرە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەرچوو بۆ یەمەن، کۆتا تەلاقی نارد بۆ ژنەکەی کە فاتیمەی کچی قەیس بوو، یەك تەلاقی مابوو بۆی نارد، ئەلحاریسی کوڕی هیشام و عەییاشی کوڕی ئەبی رەبیعە بڕیاریان دا ژنەکە خەرجیی بۆ هەیە، بەڵام هەردووکیان بەژنەکەیان وت: سوێند بەخوا کاتێ خەرجییت بۆ هەیە کە سکپڕ بی، ژنەکە هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و قسەی هەردووکیانی بۆ باس کرد، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"خەرجییت بۆ نییە". داوای مۆڵەتی ڕۆیشتنی کرد، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی پێ دا، وتی: ئەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بڕۆم بۆ کوێ؟ فەرمووی:"بۆ ماڵی ئیبن ئوم مەکتوم". ئیبن ئوم مەکتوم نابینابوو، کە لەوێ خۆی گۆڕی، ئیبن ئوم مەکتوم نەیدەبینی، کە عیددەی تەواو بوو، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەئوسامەی کوڕی زەید مارەی کرد. مەروان، قەبیسەی کوڕی زوئەیبی ناردە لای لەبارەی ئەو فەرموودەیە لێی پرسی، ئەویش بۆی باسکرد، مەروان وتی: ئەم فەرموودەیەمان تەنیا لەژنێکەوە گوێ لێبووە، ئێمە قسەی خەڵك وەردەگرین کە کاری پێ دەکەن. فاتیمە کە ئەو قسەیەی مەروانی پێگەیشت وتی: قورئان لەنێوان من و ئێوەدا بێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿

---

[1] -بوخاری ئیخراجی کردووە(١٤٢٦، ٥٣٥٥).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١﴾ **الطلاق: ١** ، واتا: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) (تۆ و ئوممەتەکەت)هەر کاتێك ویستان ژنەکانتان تەلاق بدەن با تەلاقیان بدەن لەکاتی عیدەیاندا(ئەو کاتەی لەحەیز پاك بوونەتەوە و لەگەڵیاندا دروست نەبوون) وە عیدەی (ژنەکانتان)بەووردی بژمێرن وە لەخوا بترسن کە پەروەردگارتانە، ئەو ژنانە دەرمەکەن لەماڵەکانی خۆیان(تا عیدەیان تەواو دەبێت)ئافرەتانیش با دەرنەچن(لە ماڵەکانیان)مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن وە ئەوانە سنوورەکانی خودان، هەرکەسێك لەسنوورەکانی خوا دەربچێت ئەوە بێگومان ستەمی لەخۆی کردووە، تۆ چووزانی لەوانەیە خوا پێشی بهێنێت دوای ئەوە کارو بارودۆخێکی تر(و ژن و پیاوەکە بکەونەوە یەکتر و ئاشتیان ببێتەوە).

فاتیمە وتی:ئەمە بۆ پیاوێکە بتوانێ ژنەکەی بگێڕێتەوە، لەدوای ئەمە ئەکرێ چی رووبدات؟ ئێوە چۆن ئەڵێن: ئافرەتێ سکپڕ نەبێ خەرجیی بۆ نییە، لەسەر چی شتێك حسابی بۆ دەکەن؟![1]

نەسائی لەسوونەنەکەیدا ئەم فەرموودەیەی بەشێواز و لەفز گەلێکی جیاواز گێڕاوەتەوە، هەندێکیان ئیسنادی سەحیح و بێ تانەن، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێیفەرموو: «إِنَّمَا النَّفَقَةُ وَالسُّكْنَى لِلْمَرْأَةِ إِذَا كَانَ لِزَوْجِهَا عَلَيْهَا الرَّجْعَةُ»،واتا: ئافرەتێ خەرجی و شوێنی مانەوەی بۆ هەیە کە مێردەکەی بتوانێ بیگێڕێتەوە.

---

[1] -موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٨٠).

## ١٧-باسی ڕێك و گونجاوی ئەو بڕیارە بەقورئان

خوای گەورە ئەفەرموویت: ﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ۝١ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا۟ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ۝٣﴾ **الطلاق: ١ – ٣** ،واتا: تۆ چووزانی لەوانەیە خوا پێشی بهێنێت دوای ئەوە کارو بارودۆخێکی تر(و ژن و پیاوەکە بکەونەوە یەکتر و ئاشتیان ببێتەوە). ئەمجا کە گەیشتنە کاتی خۆیان(پاش تەلاقێك، یان دوو تەلاق)ئەوسا یان بیانهێڵنەوە بۆ لای خۆتان بەشێوەیەکی چاك) یان لێیان جیا ببنەوە بەباشی وە دوو شاهیدی دادپەروەر بگرن لەخۆتان کە لەبەر خوا ئەو شاهیدیە بدەن،ئەوانەی(باسکران پەندێکن)کە ئامۆژگاری ئەوانەی پێ دەکرێ کە باوەڕیان هەبێت بە خوا و ڕۆژی دوایی وە هەرکەسێك خواناس بێت، خوا دەرووی لێ دەکاتەوە. وە رزق و ڕۆزی دەدات لەلایەکەوە بەخەیاڵیدا نەهاتووە و بیری لێ نەکردووەتەوە وە هەرکەسێك پشت بەخوا ببەستێت ئەوە خوای بەسە، بەڕاستی خوا کار و فەرمانەکانی خۆی بەئەنجام دەگەیەنێت، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێ ئەندازەیەکی دیاریکراوی داناوە.

ئەمە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی جائیزە لەسەر دەرکردنی ئافرەتێك کە لەدوای تەلاق، مێردەکەی نەتوانێ لای خۆی گلی بداتەوە.

**١٨-باسكردنی بڕیاری گونجاوی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) بەقورئان، لەوەی پێویستە خەرجیی کەسوکار بکێشرێت**

نەسائی لەتاریق ئەلموحاربییەوە گێڕاویەتییەوە ئەڵێ: هاتمە مەدینە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەر مینبەر راوەستابوو ئەیفەرموو:«يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ: أُمَّكَ وَأَبَاكَ، وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ فَأَدْنَاكَ»[1]،واتا: دەستی بالاّ و بەخشەر باشترە لەدەستی نزم، لەوەوە دەستپێبکە کە پشت بە تۆ دەبەستن بیانژێنی، دایك و باوکت، خوشك و برات، پاشان نزمتر و نزمتر.

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پیاوێك هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، چی کەسێك لەپێشترە جوان مامەڵەی لەگەڵ بکەم؟ فەرمووی:"دایکت". وتی: پاش کێ؟ فەرمووی:"دایکت". وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی:"دایکت". وتی: پاشان کێ؟ فەرمووی:پاشان باوکت، پاشان ئەوەی خوارتر لەخزمایەتیت، پاشان ئەوەی خوارتر"[2].

پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەهیندی فەرموو: "خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ"[3]،واتا: ئەوەندەی لێ ببە بەشت بکات بەپێی نەریت.

لەسوونەنی ئەبو داووددا هاتووە لەفەرموودەیەکی عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لەباوکی ئەویش لەباپیرەیەوە ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلْتُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ، وَإِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ فَكُلُوهُ

---

[1] -نەسائی ئیخراجی کردووە(٢٥٣٢).
[2] -بوخاری(٥٩٧١) و موسلیم(٢٥٤٨) ئیخراجیان کردووە.
[3] -بوخاری(٥٣٦٤) و موسلیم(١٧١٤) ئیخراجیان کردووە.

منيئا»[1]،واتا:پاکترین و خۆشترین خواردنێك بیخۆن، ئەوەیە بەری رەنج و ماندوویەتیی خۆتان بێ، بەرهەمی منداڵەکانیشتان لەبەرهەمی خۆتانن،تۆشی گیانی بکەن.

هەموو ئەوانە راڤەی فەرمایشتی خوای گەورەیە کە فەرموویەتی: ﴿ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ ﴾ **النساء: ٣٦،** واتا: بەس خوا بپەرستن، وە هیچ شتێك مەکەن بەهاوبەشی هەروەها لەگەڵ دایك و باوکتاندا چاك بن وە لەگەڵ خزم و نزیکان و هەتیوان.

هەروەها فەرمایشتی:﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ ﴾ الإسراء: ٢٦ ،واتا:مافی خزمانت بدە.

خوای گەورە لەدوای دایك و باوك، باسی مافی کەسوکاری کردووە هەروەك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وەك یەکی لێکروون.

## ١٩-باسکردنی پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەوەی لەرێگەی شیرپێدانەوە حەرام دەبێ و ئەوەی حەرام نابێ، باسکردنی ئەندازەی ئەو شیرەی کەسەکە دەکاتە خوشك و برا، بڕیاری شیرپێدانی گەورە، ئایە ئەوە کاریگەریی هەیە یان نە؟

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەفەرموودەیەکی عائیشەدا(خوای لێ رازیی بێ) بەوەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ»،واتا: خوشك و برایەتیی دایك و باوکیی چی شتێك حەرام دەکات، شیرپێدانیش ئاوەهایە[2].

بەوە ئیبن عەباس وەڵامی پیاوێکی داوەتەوە کە دوو جاریەیەی هەبووە، یەکێکیان شیری بەکچێك داوە و ئەوی تریش شیری بەکوڕێك داوە، ئایە حەڵاڵە ئەو کوڕە، ئەو کچە مارە بکات؟ ئیبن عەباس وەڵامی دەداتەوە:بەڵێ، چونکە شیرپێدەر یەك کەس نییە[3].

---

[1] -ئەبو داوود(٣٥٣٠) و ئیبن ماجە(٢٢٩٢)، ئەحمەد١١/٢٦١،٢٦١-٢٦٢(٦٦٧٨) لەفزەکەش هی ئەوە.

[2] -بوخاری(٥٠٩٩) و موسلیم(١٤٤٤) ئیخراجیان کردووە.

[3] -ترمیزی ئیخراجی کردووە(١١٤٩).

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) لەپەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم):«لَا تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَانِ»[1]،واتا: یەك مژو دوو مژ، حەرامی ناكات.

هەروەها لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە: لەعائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: خوای گەورە سەرەتا لەقورئاندا: دە شیرپێدانی روونی بەحەرام دابەزاند، پاشان هەڵیوەشاندەوە بۆ پێنج جاری زانراو، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) كۆچی دوایی كرد و لەقورئاندا ئەوە دەخوێندرا[2].

لەسەحیحی ترمیزییدا سەلماوە لەفەرموودەیەكی ئوم سەلەمەوە(خوای لێ رازیی بێ) كە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«لَا يُحَرِّمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ إِلَّا مَا فَتَقَ الْأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ، وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ»،واتا: حەرام نابێت بەشیرپێدان مەگەر ئەوەی منداڵەكە لەمەمكی ئافرەتەكەوە تێر بێ و ئەوەش لەپێش لەشیربڕینەوە بێ. ترمیزی ئەڵێ:فەرموودەیەكی سەحیحە[3].

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەفەرموودەیەكی عائیشەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ:"سەهلەی كچی سوهەیل هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا بەهۆی ئەبو حوزەیفەوە سالم دەبینم دێتە ماڵ، چونكە هاوبەشێتی، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"أَرْضِعِيهِ تَحْرُمِي عَلَيْهِ"[4]،واتا: شیری پێ بدە بۆی حەرام دەبی.

---

[1]-موسلیم ئیخراجی كردووە(١٤٥٠).

[2]-موسلیم ئیخراجی كردووە(١٤٥٢).

[3]-ترمیزی ئیخراجی كردووە(١١٥٢).

[4]-موسلیم ئیخراجی كردووە(١٤٥٣).

عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) فرمانی بەکچە برازا و خوشکەزاکانی دەدا شیر بدەنە ئەوانەی عائیشە(خوای لێ رازیی بێ) حەزی دەکرد بیانبینێ، ئەگەر گەورە بن پێنج جار شیری پێ بدەن، دوای ئەوە ئەو کەسە عائیشەی ببینایە.

ئوم سەلەمە و تەواوی خێزانەکانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) رازیی نەدەبوون یەکێك بێتەلایان لەنێو بێشکەدا شیریان پێ نەدابووایە، بەعائیشەیان وت: سوێند بەخوا نازانین، رەنگە ئەوە تاکە مۆڵەتێکی پەیامبەری خوا بووبێ(صلی الله علیه وسلم) بۆ سالم نەك خەڵکی تر[1].

### ٢٠-باسی بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بەعیددە

خوای گەورە لەقورئاندا روون و تۆکمەو تەواو روونیکردووەتەوە، چوار جۆری باسکردووە کە ئەمانەن:

جۆری یەکەم: عیددەی ئافرەتی سکپڕی تەڵاقدراو بەدانانی سکپڕییەکە: تەڵاقی سێ بەسێ بێ یان ریجعە، یان مێردەکەی مردبێ، پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ ﴾ الطلاق: ٤ ،واتا: ژنانی سك پڕ(دووگیان) عیددەیان ئەو کاتەیە کە سکەکەیان دابنێن.

کۆڕای هاوەڵان بەوە بەڵگەیان هێناوەتەوە، ئافرەتێك سکپڕ بێ و مێردەکەی بمرێت، بەدانانی کۆرپەکەی، عیددەی تەواو دەبێ، ئەگەر کۆرپەکەی دابنێت و مێردەکەی لەسەر تەختی مردوو شۆر دانرابێ، عیددەی تەواو بووە هەروەك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەتوای ئەوەی بۆ سوبەیعەی ئەسلەمیی داوە[2].

---

[1] -ئەبو داوود ئیخراجی کردووە(٢٠٦١).

[2] -بوخاری(٥٣٢٠) و موسلیم(١٤٨٤) ئیخراجیان کردووە.

جۆری دووەم: عیددەی تەڵاقدراوێك كە لەسووڕی مانگانەدایە، سێ پاكبوونەوەیە لەسووڕی مانگانە هەروەك خوای گەورە ئەفەرموویێت: ﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ ﴾ **البقرة: ٢٢٨** ،واتا: ژنە تەڵاقدراوەكان دان بەخۆیاندا دەگرن تا ماوەی سێ حەیز.

جۆری سێیەم: عیددەی ئافرەتێ كە سووڕی مانگانەی نییە، ئەوە دوو جۆرە: تەمەن منداڵ كە هێشتا وە سووڕی مانگانە نەكەوتووە، بەتەمەنێك كە گەیشتووەتە تەمەنی بێ ئومێدی، خوای گەورە بەم فەرمایشتەی، ئەو دوو جۆرەی روونكردووەتەوە: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ ﴾ **الطلاق: ٤** ،واتا: ئەوانەی كە بێ هیوا دەبن لەكەوتنە حەیزەوە لە ژنانتان ئەگەر(دەربارەی زانینی عیددەیان)دوو دڵ بوون ئەوا عیدەیان سێ مانگە وە(هەروا) ئەوانەش كە(لەبەر منداڵی)هێشتا حەیزیان پێیدا نەهاتووە.

جۆری چوارەم: ئەوەی مێردەكەی مردووە، خوای گەورە بەم فەرمایشتەی، عیددەی ئەو ئافرەتەی دیاریی كردووە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ ﴾ **البقرة: ٢٣٤** ،واتا: ئەو پیاوانەی كە دەمرن لەئێوە و هاوسەران جێ دەهێڵن هاوسەرەكانیان دەبێت چاوەڕوانی بكەن چوار مانگ و دە شەو.

ئەمە ئافرەتی منداڵ و گەورەش ئەگرێتەوە، ئەوەی مێردەكەی چووبێتە لایەوە یان نەچووبێتە لایەوە، ئافرەتی سكپڕ ناگرێتەوە.

**٢١-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) بەتەواوکردنی عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو لەو ماڵەی کە مێردەکەی تیادا مردووە و ئەو تیایدا بووە، ئەمەش پێچەوانەی بڕیاری نییە لەبارەی دەرکردنی ئافرەتی بڕیار لەسەر دراو و چۆنی ویست عیددە بگێڕێت**

لەسووننەندا هاتووە لەزەینەبی کچی کەعبی کوڕی عوجرەوە ئەویش لەئەلفوریعەی کچی مالیکی خوشکی ئەبو سەعیدی خودرییەوە، کە هاتووە بۆلای پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و پرسیاری لێ کردووە بگەڕێتەوە لای کەسوکاری لەنەوەی خودرە، چونکە پیاوەکەی بەدوای کۆمەڵێ کۆیلەیدا دەرچووە، کە پییان گەیشتووە کوشتوویانە. ئەڵێ داوام لەپەیامبەری خوا کرد(صلى الله عليه وسلم) تاوەکو بگەڕێمەوە لای کەسوکارم، چونکە لەو ماڵەی منی تیا بەجێهێشت هیچ خەرجی و شتێکی بۆ بەجێنەهێشتبووم. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی"بەڵێ". منیش دەرچووم هێشتا لەنێو مزگەوتدا بووم بانگیکردم یان فرمانی بەکەسێکی تر کرد بانگیکردم، فەرمووی:"چیت وت؟". منیش باسەکەم بۆ دووبارە کردووە و چی بەسەر مێردەکەمدا هاتووە. فەرمووی:"امْكُثِي فِي بَيْتِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ"،واتا: لەماڵی خۆتدا بمێنەرەوە تاوەکو عیددەت تەواو دەبێت. ئەڵێ: چوار مانگ و دە ڕۆژ مامەوە. ئەڵێ: عوسمان هاتبووە خوازبێنیم، ناردی بەشوێنمدا و بۆ ئەوە پرسی پێکردم، منیش رازیبوونم دا و ئەویش بڕیاری لەسەر دا[1].

---

[1]-ئەبو داوود(٢٣٠٠) و ترمیزی(١٢٠٤) ئیخراجیان کردووە.

## ٢٢-باسکردنی بڕیاری پەیامبەری خوا( صلی الله علیه وسلم ) لەبارەی پرسەگێڕیی ئافرەتی عیددەبار، نەریکردن و سەلماندن

لەسەحیحەیندا[1] سەلماوە لەزەینەبی کچی ئەبو سەلەمەوە کە چووەتە لای ئوم حەبیبەی خێزانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کاتێك ئەبو سوفیانی باوکی کۆچی دوایی کردبوو، ئوم حەبیبە(خوای لێ رازیی بێ) داوای بۆنی زەردی خەلوقی کرد، جاریەیەك پێی چەوری کرد پاشان وتی: سوێند بەخوا پێویستم بە بۆن و ئەم شتانە نییە، تەنیا ئەوەیە گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) لەسەر مینبەر ئەیفەرموو: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»،واتا: ئافرەتێ باوەڕی بەخوا و رۆژی دوایی هەبێ، بۆی حەلاڵ نییە زیاتر لەسێ رۆژ پرسەبگێڕێ، تەنیا بۆ هاوسەرەکەی نەبێ کە چوار مانگ و دە رۆژ پرسەی بۆ دەگێڕێ.

زەینەب ئەڵێ: پاشان رۆیشتمە لای زەینەبی کچی جەحش کاتێك براکانی مردبوو، داوای بۆنی کرد، بەخۆیدا هێنا و پاشان وتی: سوێند بەخوا پێویستم بە بۆن و ئەم شتانە نییە، تەنیا ئەوەیە گوێم لەپەیامبەری خوا بوو(صلی الله علیه وسلم) لەسەر مینبەر ئەیفەرموو: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»،واتا: ئافرەتێ باوەڕی بەخوا و رۆژی دوایی هەبێ، بۆی حەلاڵ نییە زیاتر لەسێ رۆژ پرسەبگێڕێ، تەنیا بۆ هاوسەرەکەی نەبێ کە چوار مانگ و دە رۆژ پرسەی بۆ دەگێڕێ.

زەینەب وتی: گوێم لەئوم سەلەمەی دایکم بووم(خوای لێ رازیی بێ)ی ئەیووت: ئافرەتێك هات بۆلای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پەیامبەری خوا، کچەکەم، مێردەکەی مردووە، چاوی بەئێش هاتووە، ئەتوانێ کلی لێ بدات؟ فەرمووی"نە"دووجار یان

[1] -بوخاری(١٢٨٠، ١٢٨١، ١٢٨٢) و موسلیم(١٤٨٦، ١٤٨٧) ئیخراجیان کردووە.

سێ جار ئەوەی پرسی و پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەیفەرموو"نە"، پاشان فەرمووی:"إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ، وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ"،واتا: چوار مانگ و دە ڕۆژە، لەسەردەمی جاهیلییدا ساڵێك بوو.

زەینەب ئەڵێ: لەکۆندا ئافرەت ئەگەر مێردی بمردبایە، ئەچووە ژوورێکی بچووکەوە و بەرگێکی خراپ و شڕەتی لەبەر دەکرد و بۆن و هیچ شتێکی لەخۆی نەدەدا و نینۆکی نەدەکرد و ئاو بەر جەستەی نەدەکەوت تاوەکو ساڵێك تێدەپەڕی، پاشان گوێدرێژێك یان مەڕێ یان باڵندەیەك دەهێنرا و خۆی پێدا مەسح دەکرد و ئەو گیانلەبەرە دەمرد، پاشان ئافرەتەکە بەناشیرینترین و قێزەونترین و بۆگەنترین شێوە دەردەچوو لەو ژوورە، دەشۆردرا.

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئوم عەتییەوە(خوای لێ ڕازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:"لَا تُحِدُّ الْمَرْأَةُ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلَا تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلَا تَكْتَحِلُ، وَلَا تَمَسُّ طِيبًا إِلَّا إِذَا طَهُرَتْ نُبْذَةً مِنْ قُسْطٍ، أَوْ أَظْفَارٍ"[1]، واتا: هیچ ئافرەتێك زیاتر لەسێ ڕۆژ پرسە ناگێڕێت، جگە لەژنی مردووەکە چوار مانگ و دە ڕۆژ لەپرسەدایە، هیچ بەرگێکی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر ناکات و کل نادات و هیچ بۆنێك لەخۆی نادات، جگە لەوەی کاتێ پاکدەبێتەوە کەمێ قوست یان بخورد بەکاردەهێنێ.

لەسووننەنی ئەبو داوود هاتووە لەئوم سەلەمەی خێزانی پەیامبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی:«الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا لَا تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ مِنَ الثِّيَابِ، وَلَا الْمُمَشَّقَةَ، وَلَا الْحُلِيَّ، وَلَا تَكْتَحِلُ، وَلَا تَخْتَضِبُ»[2]، واتا: ئەوەی مێردی مردبێ، بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ و سوور و خشڵ لەبەر ناکات، کل نادات و خەنەش ناکات.

---

[1]- بوخاری(٣١٣) و موسلیم(٩٣٨) ئیخراجیان کردووە.

[2]- ئەبو داوود(٢٣٠٤) و نەسائی(٣٥٣٥) ئیخراجیان کردووە.

## ٢٣-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی( إستبراء )ەوە

لەسەحیحی موسلیمدا سەلماوە لەفەرموودەیەکی ئەبو سەعیدی خودرییەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی حونەیندا سوپایەکی نارد بۆ ئەوتاس و شەڕی بێباوەڕانیان کرد و بەسەریاندا سەرکەوتن، کۆمەڵێ سەبایایان دەستخست، کەسانێك لەهاوەڵانی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وەك ئەوەی هەستیان بەئیحراجی و شەرم کرد لەوەی ئافرەتانی هاوبەش پەیداکەر لەبەر مێردە هاوبەش پەیداکەرەکانیان دەبوورانەوە، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ۞ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ﴾ **النساء: ٢٤** ،واتا: ئەگەر عیددەیان تەواو بوو، بۆ ئێوە حەلاڵ دەبن[١].

هەر لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە: لەفەرموودەیەکی ئەبو دەردائەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەلای ئافرەتێکی سکپڕدا تێپەڕ بوو لەبەردەم چوونە ژوورەوەی خێوەتێکدا، فەرمووی:" لَعَلَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُلِمَّ بِهَا"،واتا: وەك دیارە ئەیەوێ لەگەڵی جووت ببێ. وتیان: بەڵێ. پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَلْعَنَهُ لَعْنًا يَدْخُلُ مَعَهُ قَبْرَهُ، كَيْفَ يُوَرِّثُهُ، وهو لا يحل له؟ كيف يستخدمُه وهو لا يحل له؟"[٢]،واتا: پێداگربووم لەوەی نەفرەتی لێ بکەم، نەفرەتێك لەگەڵیدا بیخەمە گۆڕەکەیەوە، چۆن دەبێتە خاوەن ئەو منداڵەی ناو سکی ئەو ئافرەتە کە هی ئەو نییە، چۆن بەکاریدەهێنێ لەکاتێکدا بۆ ئەو حەلاڵ نییە؟

لەموسنەد و سووننەنی ئەبو داوددا هاتووە لەفەرمودەیەکی ئەبو سەعیدی خودرییەوە(خوای لێ رازیی بێ)، بەوەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)

---

[١]-موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٥٦).

[٢]- موسلیم ئیخراجی کردووە(١٤٤١).

لەبارەی سەبایاکانی ئەوتاسەوە فەرمووی: «لَا تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ، وَلَا غَيْرُ حَامِلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً وَاحِدَةً»[1]،واتا: ئافرەتی سکپڕیان لەگەڵیدا جووت بوون ئەنجام نادرێ تاوەکو منداڵەکەی نەیەتە دونیاوە، ئەوەشی سکپڕ نییە دەبێ یەك سووڕی مانگانەی بەسەردا بێ.

[1]- ئەحمەد١٧/٣٢٦(١١٢٢٨) و ئەبو داوود(٢١٥٧) ئیخراجیان کردووە.

## چوارەم: بەشی کڕین و فرۆشتن

## بڕیارەکانی پەیامبەر( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی کڕین و فرۆشتن

### ١- بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی کڕین و فرۆشتنی حەرام

لەسەحیحەیندا سەلماوە لەفەرموودەیەکی جابری کوڕی عەبدوڵڵەوە(خوای گەورە لەخۆی و باوکی رازیی بێ) کە گوێی لەپەیامبەری خوا بوو(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:"إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ"،واتا: خوا و پەیامبەرەکەی حەرامیان کردووە فرۆشتنی عەرەق و مردارەوە بوو و بەراز و بت. وترا: ئەی پەیامبەری خوا ئەی چەوریی مردارەوە بوو چۆنە کە کەشتیی پێ چەور و ساف دەکرێ و پێستەی پێ چەور دەکرێت و خەڵکیی بۆ چرا بەکاریدەهێنن؟ فەرمووی:"نە، ئەوە حەرامە"پاشان فەرمووی:"قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ إِنَّ اللَّهَ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا جَمَّلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ"،واتا: خوای گەورە جولەکە بکوژێ، کە خوای گەورە چەوری و بەزی مردارەوە بووی لێیان حەرام کرد، جوانیان کردو پاشان فرۆشتیان و نرخەکەیان وەرگرت[١].

ئەو وشانەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، حەرامبوونی سێ شتی لەخۆ گرتووە: کۆمەڵێ خواردنەوە کە عەقڵ دەشێوێنن، کۆمەڵێ خواردن کە سرووشتی مرۆڤ دەشێوێنن و خۆراکێکی پیس بەجەستە دەدەن، کۆمەڵێ یارمەتیدەر کە ئایینی مرۆڤ تێکدەدەن و بۆ ئاژاوە و هاوبەش پەیداکردن، بانگەشە دەکەن.

---

[١]- بوخاری(٢٢٣٦) و موسلیم(١٥٨١) ئیخراجیان کردووە.

## ٢-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەبارەی نرخی سەگ و پشیلە

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەبی مەسعودەوە، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی کردووە لەنرخی سەگ و مارەیی داوێنپیس و پارەی سیحر و جادووبازیی[١].

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبو ئەلزوبەیرەوە ئەڵێ: پرسیارم لەجابر کرد لەبارەی نرخی سەگ و پشیلە و هاوشێوەکانیەوە وتی: پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کرد[٢].

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەفەرموودەیەکی رافیعی کوڕی خەدیج ئەویش لەپەیامبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: «شَرُّ الْكَسْبِ مَهْرُ الْبَغِيِّ، وَثَمَنُ الْكَلْبِ، وَكَسْبُ الْحَجَّامِ»[٣]،واتا:خراپترین دەسکەوتێك بریتییە لەکرێ و مارەیی بەدڕەوشتی، نرخی سەگ و دەسکەوتنی کەڵەشاخگر.

## ٣-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله عليه وسلم ) لەوەرگرتنی کرێی پەڕینی ئاژەڵی نێر

لەسەحیحی بوخاریدا هاتووە لەئیبن عومەرەوە، بەوەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی کردووە لەوەرگرتنی کرێی پەڕینی ئاژەڵی نێر[٤].

لەسەحیحی موسلیمیشدا هاتووە لەجابرەوە، بەوەی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) نەهی کردووە لەوەرگرتنی کرێی پەڕینی ئاژەڵی نێر[٥].

---

[١] - بوخاری(٢٢٣٧) و موسلیم(١٥٦٧) ئیخراجیان کردووە.

[٢] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٥٦٩).

[٣] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٥٦٨).

[٤] - بوخاری ئیخراجی کردووە(٢٢٨٤).

[٥] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٥٦٥).

### ٤-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله علیه وسلم ) لەفرۆشتنی ئاوی هاوبەش

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەجابرەوە(خوای گەورەی لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) نەهیکرد لەفرۆشتنی تۆوی ئاژەڵی نێرینە و فرۆشتنی ئاو بۆ کشتوکاڵ[١].

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) کە پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی:«لَا یُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِیُمْنَعَ بِهِ الْكَلَأُ»[٢]،واتا: نابێ ئاوی زیادەی لەبەر رۆیشتوو گل بدرێتەوە و نەهێڵرێ کەسی تر بۆ کشتوکاڵی بەکاریبهێنێ(یان لەوەڕگا).

### ٥-بڕیاری پەیامبەری خوا( صلى الله علیه وسلم ) لەڕێگردنی لەکەسێك شتێك بفرۆشێ کە نییەتی

لەسوونەن و موسنەددا هاتووە لەفەرموودەیەکی حەکیمی کوڕی حازمەوە ئەڵێ: وتم: ئەی پەیامبەری خوا، جاری وا هەیە کەسێك دێت داوای کڕینی شتێکم لێ دەکات لام نییە، پێیدەفرۆشم و دەچم لەبازاڕدا بۆی دەکڕم. پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم) فەرمووی:"لَا تَبِعْ مَا لَیْسَ عِنْدَكَ"[٣]،واتا: شتێ لات نییە مامەڵەی لەسەر مەکە.

### ٦-پەیامبەری خوا( صلى الله علیه وسلم ) نەهی کردووە لەکڕین و فرۆشتنی وردە بەرد( چەو ) و غەرەر( فرۆشتنی گۆترە و ناڕوون )

لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە(خوای لێ رازیی بێ) ئەڵێ: پەیامبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) نەهی کرد لەفرۆشتن بەهەڵدانی بەرد و فرۆشتنی گۆترە و ناڕوون(غرر)[٤].

---

[١] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٥٦٥).

[٢] - بوخاری(٢٣٥٣) و موسلیم(١٥٦٦) ئیخراجیان کردووە.

[٣] - ئەحمەد٢٤/٢٥(١٥٣١١) و ئەبو داوود(٣٥٠٣) و ترمیزی(١٢٣٢) و نەسائی(٤٦١٣) و ئیبن ماجە(٢١٨٧) ئیخراجیان کردووە.

[٤] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٥١٣).

لەسەحیحەیندا هاتووە لەئەبو سەعیدەوە ئەڵێ: پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) نەهی لێکردین لەدوو جۆر فرۆشتن و دەست لێدان: نەهی لێکردین لە(الْمُلَامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ). الْمُلَامَسَةِ واتا:پیاوێك بەشەو یان بەڕۆژ دەست لەقوماشێ یان بەرگێك دەدات و سەیری ئەم دیوو و ئەودیووی ناکات.

(الْمُنَابَذَةِ)ش: ئەوەیە پیاوێك بەرگی خۆی بۆ بەرانبەر هەڵدەدات، بەرانبەریش بەرگەکەی خۆی بۆ هەڵدەدات بێ ئەوەی تەماشای بکەن و رازیکردنی یەکتر بەدەستبهێنن[1].

فرۆشتن بەهەڵدانی وردە بەرد لێکدراوەتەوە بەوەی یەکێك بڵێ:وردە بەردێ هەڵبدە، بەردەکە کەوتە سەر هەر بەرگێك،ئەوە بەدرهەمێك دەبێتەماڵی تۆ.

هەروەها لێکدراوەتەوە بەوەی: وردە بەردێك هەڵدەدات، هەتاوەکو کوێ گەیشت، ئەوەندە لەو زەوییەی پێ دەفرۆشێت.

لێکدراوەتەوە بەوەی، چنگێ وردە بەرد هەڵدەگرێت و ئەڵێ: بەئەندازەی ئەو وردە بەردانەی لەدەستمدایە، کڕینم بۆ هەیە.

یان شتێکی پێ دەفرۆشێ و چنگێ وردە بەرد هەڵدەگرێت و ئەڵێ: بەئەندازەی هەر وردە بەردێك درهەمێکم دەوێ.

لێکدراوەتەوە بەوەی،یەکێکیان چنگە بەردێك هەڵدەگرێت و ئەڵێ: هەرکاتێ چەوەکە کەوت، کڕین و فرۆشتنەکە پێویست بووە.

لێکدراوەتەوە بەوەی، دوو کەس مامەڵە دەکەن، یەکێکیان ئەڵێ: کە وردە بەردەکانم فڕێ دایە لای تۆ، کڕین و فرۆشتنەکە دەکەین.

لێکدراوەتەوە بەوەی، ڕێ بەڕانە مەڕ دەگرن و یەکێك وردە بەردێك هەڵدەگرێت و ئەڵێ: بەر هەر مەڕێك کەوت، ئەوە بۆ تۆ بەفلانە نرخ.

هەموو ئەو شێوازانە فاسیدن، چونکە ئەوە لەخۆ دەگرن بەناڕەوا سەروەتی یەکێ دەخورێت، کارێکی مەترسیداری شێوەی قومارە.

---

[1] - موسلیم ئیخراجی کردووە(١٥١٢).

# پێڕست

## دووەم: بەشی نوێژ

## سێیەم: بەشی تەرم( الجنائز)

## چوارەم: بەشی زەکات



## پێنجەم: بەشی ڕۆژوو

## شەشەم: بەشی ئیعتیکاف( مانەوە لەمزگەوت )

## حەوتەم: بەشی حەج و عومرە

## هەشتەم: بەشی زیکر و یاد

## نۆیەم: بەشی جیهاد

دەیەم: بەشی مەغازی و نێردراوانی(بەشێوەی کورت) ٣٤٢

## بەشی سێیەم: پزیشکی پەیامبەرایەتیی

**دووەم بەشەکانی تایبەت بەرێبازی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) لەچارەسەکردنی بەدەرمانی روحانیی خوایی بەتەنیا و ئاوێتە کراو لەگەڵ دەرمانی سرووشتی**

## بەشی چوارەم

## دووەم: بەشی هاوسەرگیری

## سێیەم: بەشی تەلاق

٤- پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە ئەگەر ئافرەتێك سێ تەلاقە درابێ، بۆ پیاوی یەکەمی حەلاڵ نابێ تاوەکو مێرد بەپیاوێکی تر نەکات و پیاوی دووەم لەگەڵیدا جووت نەبێ ٥٧٠

٥-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسەرپشککردنی خێزانەکانی، لەگەڵیدا بمێننەوە یان لێی جیاببنەوە ٥٧١

٦-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە لەنێوان خۆی و پەروەردگاریدا هەبوو سەبارەت بەجاریە و هاوسەرەکانی ٥٧٢

٧-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی پیاوێك بەژنەکەی بڵێ بگەرەوە لای کەسوکارت ٥٧٣

٨-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی زیهار و روونکردنەوەی ئەوەی خوای گەورە تیایدا دایبەزاندووە، واتای ئەو گەڕاندنەوەیەش کە کەفارەت واجیب دەکات ٥٧٤

٩-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەسوێند خواردن لەنزیك نەکەوتنەوەی خێزان(إیلاء) ٥٧٥

١٠-حوکمی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەبارەی لیعان ٥٧٦

١١-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبابەت گەڕانەوەی رەچەڵەکی منداڵ بۆ باوك ئەگەر رەنگی لەگەڵ باوکیدا جیاواز بێ ٥٧٨

١٢-بڕیاری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) بەوەی منداڵ بەرهەمی جێگە و خەوتنە و سەبارەت بەوەی لەدوای مردنی باوکی، خراوەتە سەر ناوی باوکی ٥٧٩

١٣-بڕیاری پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لەبارەی ئەوەی کێ مافدارە بەدایەنی کردنی منداڵ ٥٨٠

## چوارەم بەشی کڕین و فرۆشتن



**پێڕست** 

تم بحمد الله

له دووعای خێر بێبەشمان مەکەن

في سبيل الله

٢٨ / ٨ / ١٤٤٤

لەم کتێبەدا

- یەکێك لە فەزڵ و بەخشش‌ەکانی خوای گەورە،ئەوەیە مرۆڤی موسڵمان لە هەموو کاروبارێکی ژیانی موحەممەدی پەیامبەردا (صلی الله علیه وسلم)، ڕێنمایی وەردەگرێت،سیفەتی هەڵسان و دانیشتن و لەخەو هەڵسان و شێوەی پێکەنین و خواپەرستیی ڕۆژ و شەوی فێر دەبێت. فێردەبێت چۆن تایبەتمەند بێ بە سیفەتی کەماڵ و گەورەیی.

-ژیان لەگەڵ پەیامبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) بەتێکڕای ورد و درشتەکانی ژیان .یارمەتیدەر دەبێ بۆ چاوکردن لەو پەیامبەرە و جێبەجێکردنێکی کردارانەی هیدایەت و ڕێنماییەکانی، وەك ئەوەی نەوەی یەکەم لەسەر دەستی پەروەردە بوون پێش قسەکردن، بە ئاکار و ڕەوشتیان، ئیسلامیان بڵاوکردەوە.

-زانایەکی پایەبەرزی وڵاتی شانشینی سعودیە بەناوی د.احمد بن عثمان المزید پوختەی کردووەتەوە تەحقیقی فەرموودەکانی کردووە.

ئیبن قەییم ئەلجەوزییە

ناوەندی ڕاقە

ناوەندی تیشک

facebook: Nawandi Tishk

ناونیشان سلێمانی بەرامبەر کاسۆمۆن
بازاری ئاوباریک دوکانی ژمارە(٦٩-٧٠)

نرخ: ١٣٠٠٠